# ناسنامەی حزبە کوردستانییەکان

## ڕەوتیان - ئایدیۆلۆژیان - هەڵسەنگاندنیان

مسعود عبدالخالق

# ناسنامەی

# حزبە کوردستانیەکان

## ڕەوتیان - ئایدیۆلۆژیان - هەڵسەنگاندنیان

مسعود عبدالخالق

هەولێر/٢٠١٤

## پیشەکی چاپی دوەم (دەزگای چاپ)

دوای ئەوەی (ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان)کەوتە بازارٍ ،بە خێرایی لەسەر هەردوو ئاستی ئاینی وئەکادیمی وەرگیرا،تەنانەت سەرۆکی هەرێم لە پیشانگای نێو دەولەتی وەك یەکەم کتیب هەلیگرت،گرنگی وگەرمی بازاڕی ئەو کتیبە و کتیبەکانی تری نوسەر لەوە دێت کە بەو پەڕی بێلایەنی ومیانڕەوی نوسرایتەوە ،لە کاتێکا عەلمانی کورد هەولیداوە کوردایەتی ونیشتمان پەروەری بێ ئاین بەرپا بکا ،لە بەرامبەریشدا ئیسلامی واهەبوە دەیەوێ ئایین بە تەواوی لە نیشتمان پەروەری جیا بکاتەوە ،لەو کتێبە هەر هەولی ئاشت کردنەوەی نێوانیان نیە بەلکوکەشفی کردوە کە سروشتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نێوان هەردوو لایە،کە تیایدا تیۆری نوێی هێنا کایەوە .

لە نێوان چاپی یەکەم ودوەم گۆڕانکاری فکری وسیاسی وفەرهەنگی گەورە بەسەر دیزاینی حزبە کوردستانیەکان داهات ،بەلام وەك ئەمانەتی زانستی دەستکاری ڕەوتی باسەکەمان نەکرد،کە گوزارش لەسەرەتای سەدەی بیستەم دەکا ،..لە کۆتایدا دوعای خیرمان بۆ بکەن چونکە نە نوسەرو نە ئیمەش چاومان لە قازانج نیە بەلکو زیاتر لەهەولی بلاو بوونەوەی ڕاستیەکانین.

-کتیبخانەی حاجی قادرکۆیی-

# دەروازەکان

لە دوای ڕاپەڕینی 1991 کۆمەڵێك نووسین لەبارەی مێژووی نوێی شۆڕش و حزبە کوردستانیەکان لەسەر شێوەی (بیرەوەری و ئەزموونەکانی کەسێتی) بلاوکراوە، هەرچەندە کەلێنێکی پڕکردۆتەوە، بەڵام بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی مێژوویئەکادیمی، ئەوا بەلایەنی کەمەوە سێ کەم و کوڕی لەزۆربەیان بە دی دەکرێت:

1- نووسینەکان زیاتر بریتییە لەو ڕووداوانەی کە نووسەر خۆی تیای بووە، واتە تەنها بەشێکە لە ڕووداوە مێژووییەکان نەك گشتی.

2- بەزۆری بە لای ئەو ڕووداوانەچوینە کە زیاتر لە خزمەت ئەو لایە بێ کە خۆی واتیایەتی.

3- خۆ ئەگەر بەشێکی تریش لەو نووسینانە هەوڵیان دابێ هەمەلایەن و زانستیانە بنووسنەوە، ئەوا لە سەردەمێکی باری دەروونی وا نووسرایتەوە کە کوردستان مەست ببوو بە دووبەرەکی و براکوژی و دەمارگیری حزبایەتی، تا ئەو ڕادەیە خەریك بوو حزبایەتی ببێتە عەشیرەتگەری و ڕێسای کۆنی کۆمەڵگەی بیابانی (انصرأخاك- الحزبي- ظالماأومظلوما) پەیڕەو بکرێ، ئیتر چی بکرایە لەلایەن حزبەکەی ڕاست و دروست بوو، لای بەرامبەریش هەر چەوت، پێوانەکان وەرگەرا بووحزبایەتیەکە ببووە ئامانجو کوردستان و نیشتمان و دادگەریش ئامرازی ئەو ئامانجە..، لەگەڵ دەیان دیاردەی دزێوی ترسناك تر، بۆیە نووسینەوەی مێژووی حزبە کوردستانیەکان و هەڵسەنگاندنیان لەژێر دۆخێکی سیاسی و دەروونی وا بابەتی و زانستی نابێ، هەم لەلایەن نووسەر هەم لەلایەن خوێنەر، بۆیە ئەو نووسینەمان دواخست بۆ ڕۆژگارێکی وەك ئێستا کە تاڕادەیەك لێی ڕەت بووینە، دەتوانین ئێستا بە دادگەرانەو زانستیانە ئەومێژووە بنووسینەوە، لێکی بدەینەوە، هەڵی سەنگێنین،.. دوور لە کاروکاردانەوەو لایەنگیری و چەواشەیی، تا نەوەی نوێ بەڕاستی و ساغی لە مێژوەکەیان بگەن و چەواشەکاری ئەوەندە لێیان کاریگەر نەبێ، چونکە ئەو نەوەیە تەواوبە ئاگا نیە لە شۆڕشی نوێ و ڕەوتی حزبە کوردستانیەکان،بۆ ئەوەش ڕێز لە خەبات گێڕ بگرێ و نەفرەتیش لە بەرژەوەندی پەرست و نیشتمان فرۆشان بکا.

لەو توێژینەوەیە هەرگرنگی بە ڕووداوەکان نادەین تیشك دەخەینە سەر لایەنی ئایدیۆلۆژی وڕێبازی فکری وفەلسەفی.. بۆ ئەوەی هەرلایە ناسنامەی حزبی خۆی لەمەدرەسەکانی عەولەمە (جیهانگیری) بەسانایی بدۆزیتەوە، هەڵبەتە نووسینەوەی مێژووی هەلوێست وڕووداوەکان کارێکی زانستی پەتیە، کەمتر گرفتدارە، هیچ کەس و لایەنێك نیە مێژوویەکی بێ نێگەتیڤی هەبێ، حزبی بوێر خۆی هەڵدەستێ بە نووسینەوەی ئەو نێگەتیڤانە بەتایبەتی لە ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەکان، بەداخەوە کەمتر ئەو بوێریە لە حزبە کوردستانیەکان بینراوە، ئەو بەشەی زیاتر دەمەتەقێ و گرفت هەڵدەگرێ (هەڵسەنگاندنەکانە) واتە لێکدانەوەی پاڵنەرو دیوی شاردراوەی ڕووداوەکانە، ئەوەیان دەکەوێتە ئەستۆی ریبازی سیاسی و ئایدیۆلۆژیا، هەرکەسیك، هەر لایەنێك بۆی هەیە دید و تەرازووەکی جیای هەبێ، لێرەدا هەوڵ دەدەین دەرگا داخراوەکانی هەردوو بەش والا بکەینەوە کە خزمەت بە میللەت و خودی ئەو لایەنانەش بێ و هەم دروستکردنەوەو دارِشتنەوەی کەسێتی تاکی کورد بێ کە چەواشەکاری دایرِزاندووە.

هەموو لایەکیش هەمیشە قایل نیە بەو جۆرە دەستکاریەش، پێی وایە دەبێ هەموو کەس بە تەرازوو و چاویلکەی ئەو دنیا و کوردستان ببینێ، ئەوە یان ترۆکی دیکتاتۆریەتە، هەرچی واشی بۆ بنووسێ ئەوا قەڵەمێکی دووڕوو و بەرژەوەندی پەرستە لە ریزی (وەعازولسەلاتین )ە، جێگەی متمانە نابێ لەلایەن میللەت و ڕۆشنبیران و هەتا لەلای خۆشیان، دەبێتە هاندەرێکی نێگەتیڤ و لە کۆتایدا دەردەکەوێ دوژمنی هەموو لایەکە، هەڵبەتە لەو نووسینە هەوڵ دەدەین دۆستی هەموو لایەك بین لە سنوری مومکین.

ئەوەی زۆر گرفتە،(شەفافیەت) نەبووەو بەڵگەنامەی بێلایەن نیە لەبارەی ڕووداوەکانی کوردستان، برِیاری ئەو ڕووداوانەش لە پەنا شاخێك دروست کراوە یان لە پشت دەرگایەکی داخراو، با ئەو گومانەش نەبەین بۆ لای دوژمنانی داگیرکەر، هەرچەندە پاکانەشیان بۆ ناکرێ. لەهەمووی ئالوز تر ئەوەیە راستی رووداوەکان جارِنەدراوە، بینیومانە لە چەند سەعاتێك دا ڕووداوێك واگۆرِدراوە تا ڕادەی پێچەوانە، جا لەنێوان ئەو ڕاکێش و داکێشەی لایەنە ناکۆکەکانی کوردستان ئەرکێکی قورسە بتوانین ڕاستەقینە بدۆزینەوەو هەموو لایەکیش پێی قایل بن، جا ئەوە هەر لەنێوان حزبە کوردستانیەکان نەبووە، داگیرکەرانیش ئەرشیفێکی چەواشەی بۆ ڕووداوەکان هەردەم ئامادە بووەو دەبێ.

ئەو حزبە کوردستانیانەو سەرکردەکانیان خاوەنی خەباتی شاخ و تەنگانەکانن، جێگەی ڕێزن، بەڵام هەڵسەنگاندن مانای تەنها پۆزەتیڤانە نیە، بۆیە دەرخستنی ڕەخنە و کەم و کوڕیەکانیان مانای سفرکردنی مێژوویان نیە، مانای تۆژینەوەیەکی زانستیە و بەس، دەوڵەمەندکردنی ئەزموون و کەلتووری سیاسی میللەتەکەمانە.

کەواتە ئەو بابەتە گەلێ دووردرێژ دەبێ، بەڵام هەوڵمان داوە زۆرترین مانا لە کەمترین پانتایی و ووشە کۆکەینەوە، بۆیە زۆر خەست و تێك ئاڵاو دەبێ، تکا وایە خوێنەر بەوردی و لەسەرخۆیی بیخوێنێتەوە.

تیبینی: ئەو توێژینەوەیە لە 2007 تەواو کراوە ،لەدواییدا پیداچوونەوەیەکی خێرایی بۆ کراوە ، بۆیە ئەو گۆڕانکاریانەی لەدوای ئەو بەروارانە لە خودی حزبە کوردستانیەکان هاتونە دی تا چاپ کردنی لە 2014 لیرەدا هەقی خۆی پێ نەدراوە.

**سروشتی بابەتەکە**کورتەباسێکی زۆر بەخێرایی:

1- دروستبوونی هەریەکە لە حزبە کوردستانیەکانە.

2- ڕەوتی گەشەکردن و قۆناغەکانیان، تـا سـەرهەڵدانی معـارەزەی کوردسـتانی کـە خۆی لە لیستی گۆڕان و لایەنە ئیسلامیەکان دەدا قۆناغێکی نوێیـە لـە دەرفـەتێکی تـر هەلوەستەی لەسەر دەکەین.

3- سەرکردەو کەسایەتیە بەکارەکانیان.

4- ناسنامەی هەر حزبێك لە مەدرەسەکانی فکری و سیاسی جیهانی.

5- ئەو گۆڕانکاریە فکریانەی بەسەر ئەو ناسنامەیەدا هاتووە.

6- خالە لاواز و بەهێزی هەر حزبێك لە سەرتاسەری ڕەوتیاندا.

7- ئەو گیروگرفتانەی ئێستایان لە هەورازی عەولەمەدا.

8- نەخشەی سیاسی داهاتووی کوردستان.

لەبەرکورتیەکەی واچاکە بەسەرنج بخوێندرێتەوە .

## مانای حزبە کوردستانیەکان:

مەبەست لێیان ئەو حزبانەی لەدوای 1975 دروست بـوون لـە کوردسـتان، سـنووری چالاکیان تەنها کوردستانە، کۆتایی ناوەکەشی بە کوردستان هاتووە، ئەو زاراوەیەی (حزبە کوردستانیەکان) لەدوای بەرپاکردنی بەرەی کوردستانی لە 1988/5/7 سـەری هەڵـدا، لەدوای ڕاپەڕینیش پەرەی سەندبۆ ئـەو مانایـەی ئێسـتای، بـەپێێ ئـەو پێناسـە (بـەرەی تورکمانی)ی ئیستا و(ح ش ع) و(یەکگرتوو)ی جـاران و هەنـدێ حزبـی تـر کـە بارەگـای سەرەکیشیان لە کوردستانە بە حزبی کوردستانی ناژمێررێن، بۆیە باسیشمان نەکردوون، تا یەکگرتوو و حزبی شیوعی لەدوای ڕاپـەڕین بەڕاشـکاوی بوونـە کوردسـتانی ئینجـا لـەو مێژووەوە لە چوارچێوەی حزبە کوردستانیەکانن.

# بەشی یەکەم

## سەرەتایەکی مێژوویی بەرەو حزب

### 1 –1 مێژووی کۆمەڵ بەخێرایی:

سەرەتای مێژوو لەلایەن زانستەوە لێڵە،هەرچەندەمادیەکان (هیرۆدتس 484- 425 پ.ز) بە (باوکی مێژوو) دەناسن و زانیاریەکانی سەرەتایی تەنها لەوانە وەردەگرن، واشی بۆچووینە کە مێژووی کۆمەڵ لە ئەلقەی وەرچەرخانی مەیموون بۆ ئادەمیزاد دەست پێدەکا[1]، ئێستا ئەو بۆچوونە لاواز و دەستکورت بووە لەڕووی زانستی.

هەرچی مدرسەی ئاینیشە، ح.ئادەم بە سەرەتای مێژوو دەناسێ،بە پێی (**بداية والنهاية–ابن الكثير**)ح ئادەم ڕۆژی جومعە دروست کراوە[2]، یەکەم جارلە شاری غوکلاندیهند[3] نەوەکانی بەسەر زەویدا بڵاوبوونەوە،هەندێك مێژووی دابەزینی بۆ 35- 40 سەدە پ.ز. دەگێڕنەوە،یوشر ولایتفوت دەڵێن ژیان لە 4004پ.زدەستی پیکردووە،ووردترلە 13/ئوکتوبەری/4004پ.ز سەعات 9ی بەیانی[4] دەستی پیکرد!!، هەرچی (ئاشۆس)ە دەڵێ لە نێوان ڕۆژی هەینی دابەزینی ح ئادەم وهەینی تۆفانی ح نوح 2200 سال و26

---

[1] بڕوانە :انجلز-ديالكتيك الطبيعة–دور العمل فی تحول القرد الى انسان ص194-208، هەروەها تشارلز داروين - اصل الأنواع ،هەروەها سلامة موسى-طريق الطويل نحو الإنسان.

[2] لە احمد بن حنبل دەگێڕیتەوە : گوایە ڕۆژی شەمە خۆڵوخاك دروست کراوە، یەك شەمە شاخ وکێو، دووشەمە دارو درەخت، سێشەمەخراپە کاری، چارشەمە ئاگروڕووناکی، پێنج شەمە گیان لەبەر، ڕۆژی هەینی لە نێوان عەسرتا عیشا ح ئادەم دروست کراوە .

[3] بڕوانە (معجم ديانات وأساطير العلمية...، ج3 ص150 )دەلی: لە بناری شاخی هیمالایەی هەرەبەرزی جیهان دابەزیتە سەرزەوی.بەڵام هنری فورستر دەلێ: لە غوکلاندی هند .

[4] بڕوانە :داروين- اصل الانواع ص35

سالو 23 ڕۆژ و4 سەعاتە[1]!، (لە کتیبی کنزربا  سابیئەکان  نیوانی ادم ونوح زۆر زیاترە —کتاب الپانی)) ,لەو نێوانەچەند نەوەیەکی تەمەن درێژ بەسەر زەوی پەرش وبڵاو بوون ،تەورات بەووردتر مێژوی تۆفانەکەدەگێریتەوە بۆ 17/ 2/600ی تەمەنی(ح نوح)[2] د احمد سوسە دەلیٚ بە پێی تەورات لە3000پ- زلە تەمەنی 600سالەی ح نوح تۆفانەکە ڕوویدا [3]،بەڵام خۆم بە ووردیم لەتەورات کۆلیەوە دەرکەوت ئەو قەبلاندنەی (د.احمد سوسە) هەلەیە،ڕاستیەکەی بە پێی تەورات کە لە(سفر التکوین اصحاح 5)باسی دەکا لە قەبلاندنەکەی(ئاشۆس) نزیك بوو لەگەڵ کەمێك جیاوازی ،دەرکەوت ئەو ماوەیە بریتیە لە:2251سال و2مانگ و17 ڕۆژ[4]،بەڵام وا پێدەچی زۆر زیاتر بیٚ ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینەقورئان و تەورات دەردەکەویٚ تەمەنی نەوەکان گەلیٚ دوورو درێژ بووە[5]،

---

[1]بروانە:لقطة العجلان مما تمس إلى معرفته حاجة الإنسان  - الملك محمد صديق حسن خان

[2]ـ بروانە: تەورات ـ سفر التكوين (اصحاح6-9).

[3]تاريخ حضارة وادى الرافدين ص203 .

[4]ئەوەی بیەویٚ ئەو حیسابە بکا ئەوەی خوارەوە دەقی تەمەنەکانە کە لە تەورات هاتوە لە (اصحاح 5 سفر التکوین):

**1هذا كتاب مواليد ادم.يوم خلق الله الانسانعلى شبه الله عمله 2 ذكرا وانثى خلقه وباركهودعا اسمه ادم يوم خلق 3 .وعاش ادم مئة وثلاثينسنة وولد ولدا على شبهه كصورته ودعا اسمه شيثا 4.وكانت ايام ادم بعدما ولد شيثا ثماني مئة سنةوولد بنين وبنات 5 .فكانت كل ايام ادمالتي عاشها تسع مئة وثلاثين سنة ومات 6 وعاش شيثمئة وخمس سنين وولد انوش 7 .وعاش شيث بعدما ولدانوش ثماني مئة وسبع سنين وولد بنين وبنات 8 .فكانت كل ايام شيث تسع مئة واثنتي عشرة سنة ومات 9 وعاش انوش تسعين سنة وولد قينان 10 .وعاش انوش بعدما ولد قينان ثماني مئة وخمس عشرة سنة وولد بنينوبنات 11 .فكانت كل ايام انوش تسع مئة وخمسسنين ومات 12 وعاش قينان سبعين سنة وولدمهللئيل .**

**13وعاش قينان بعدما ولد مهللئيلثماني مئة واربعين سنة وولد بنين وبنات 14 .فكانت كل ايام قينان تسع مئة وعشر سنين ومات 15 وعاش مهللئيل خمسا وستين سنة وولد يارد 16 .وعاش مهللئيل بعدما ولد يارد ثماني مئة وثلاثين سنة وولد بنين وبنات 17 .فكانت كل ايام مهللئيل ثماني مئة وخمسا وتسعين سنة ومات 18 وعاش يارد مئة واثنتين وستين سنة وولداخنوخ 19 .وعاش يارد بعدما ولد اخنوخ ثماني مئةسنة وولد بنين وبنات 20 .فكانت كل ايام ياردتسع مئة واثنتين وستين سنة ومات 21 وعاش اخنوخخمسا وستين سنة وولد متوشالح 22 .وسار اخنوخ معالله بعدما ولد متوشالح ثلث مئة سنة وولد بنين وبنات 23 .فكانت كل ايام اخنوخ ثلث مئة وخمسا وستين سنة 24 .وسار اخنوخ مع الله ولم يوجد لان الله اخذه 25 وعاش متوشالح مئة وسبعا وثمانين سنة وولد لامك 26 .وعاش متوشالح بعدما ولد لامك سبع مئة واثنتينوثمانين سنة وولد بنين وبنات 27 .فكانت كل ايامتوشالح تسع مئة وتسعا وستين سنة ومات 28 وعاشلامك مئة واثنتين وثمانين سنة وولد ابنا 29 . ودعا اسمه نوحا.قائلا هذا يعزينا عن عملنا وتعب ايدينا من قبل الارض التي لعنهاالرب 30 .وعاش لامك بعدما ولد نوحا خمس مئةوخمسا وتسعين سنة وولد بنين وبنات 31 .فكانت كلايام لامك سبع مئة وسبعا وسبعين سنة ومات 32 وكان نوح ابن خمس مئة سنة وولد نوح ساما وحاما ويافث.**

[5]سەیری( العهد القدیم - سفرتکوین (5) بکە، لە قورئانیش باس لە تەمەن درێژی ئەو نەوانەی ئەو سەردەم دەکا، سورەتی (المۆمنون) ئایەتی/29  سورەتی (هود) ئەیاتی (44)

دوای له تەمەنی601له جودی گیر بۆوه*، جارێکی تر لەو کوردستانه له دەوروبەری شاخی جودی ژیان دەستی پێکردۆتەوه،یەکەم ئاوەدانیش هەر لەکوردستان لەبناری جودی لەسەر دەستی ح نوح بەناوی (هەشتایان- گوزارش لەو 80کەسەی لەگەڵی دابوون)[1]، به پێی هەندێ سەچاوه یەکەم شار له نێوان 3000 بۆ 5000سال پ ز دروست بوه[2]،پێشوو تر وا دەزانرا یەکەم شارو یەکەم شارستانی له خوارووی عێراقی ئیستا لەسەردەمی سۆمەریەکان بوه،کەچی بەپێی دوادۆزینەوەی تیمێکی(ئەمریکی وسوری)هاوبەش به سەرپەرشتی (مگوایرگیپسۆن)ی شوینەوارناسی له (پەیمانگای‌ئۆرینتال)ی شیکاغو له سالی 1999 دەرکەوتدەکەوێته سەرووی ڕۆژهەلاتی سوریای ئیستا به ناوی (گرده حموقار-نزیك جودی)،ئیتر ئەوه سەرهەڵدانی شارستانیشه ،هەموو ئەو شارستانی وچرا ڕووناکانەی قولایی مێژوو یەکەم جارله ڕێگەی هۆکاری دەرەکی و پەیامی ئاسمانی‌یەوه بنڕێژ کراون، ئینجا درێژەیان بەخۆداوه، وەك : یۆنانیەکان ،رۆم ،بابلیەکان ،چینیەکان ،هندیەکان ،میسریەکان،مایا،...)،زۆربەشیان به شێوەیەك له شێوەکان دەوڵەتێکی خواییان بۆ خۆ دروست کردوه تا دەسەلاتیان به هێز بێت،وەكتەنزیرەك بۆ هاوتایی پاپاو ئیمپراتۆردەیانگوت: هەروەك مرۆڤ لەدوولای مادی

---

*به ووردی لەو مێژوانەم کۆلیەوه دەرکەوت له تەوراتیان وەرگرتووه، ئیبن حەزم له کتیبی (الملل والأهـواء والنحـل) بـه توندی رەدی ئەو جۆره زانیارانەی تەوراتی داوەتەوه بەلام لەو زانیاریانه بی دەنگ بووه ،له (بدایه والنهایه )ی ابن کـثیر ژمێریەکی کردوه نزیکه لەو قەبلاندنه، بەلام ئیبن خلدوون وەك تەوراتی باس کردوەودەلیٚ:(( **واعلم أنّ نوحا صلوات الله عليه بلغ عمره يوم الطوفان ستمائة سنة، عاش بعد الطوفان ثلثمائة وخمسين سنة، فكانت جملـة ذلـك تسـعمائة وخمسين سنة. ألف سنة إلا خمسين. وهـذا نـص المصـحف الكـريم، وكـذا وقـع في التـوراة بعينـه**))– تـاريخ ابـن خلدونج2ص37 .

[1]معجم ما استعجم ج1ص344،معجم البلدان المادة:ثمانين، ابن كثير له(بداية والنهاية) بەدریژی باسی کردوه، بةفةرمودةش لةلايةن ابن عباس باس كراوة.

[2] برِوانة: مشكلات السكان —دارين تومسن ص171

وروحی پیك هاتوه دەبێ دەسەلاتیش لەو دوولایە پێك بێت، ئایین وپاپا بۆ روحی مرۆڤ ودەوڵەت وئیمپراتۆریش بۆ جەستەکەی.

،ئەو جۆرە دەسەلاتە سیۆکراسی پێ ووتراوە ، یان مۆڵەت پێ دراو( divine right at the king)، هەرچەندە عەلمانیەتی ئیستا دەیەوێ ناسنامەی مێژووی خۆی بگێڕێتەوە سەر لاتینی کۆن گوایە کەلتووری یۆنان بناغەی ئاینی نەبێ، کەچی بە ووردبوونەوە دەبینین هەتا شارستانی (یۆنان)یشبناغەکانی ئاینی ئاسمانیە، ناوی یۆنانیشی لە(یونس)پێغەمبەرهاتووە[*]، هەریەکە لەئەنکلامیدیس و فیساگۆرس (581- 497 پ ز) لە سەر دەستی پیغەمبەران (ح داود و حسلیمان )دەرسیان خویندووە[*]،زیاتر لەوەشزۆربەی شارستانی ویاسا کۆنەکانیش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕشی پێغمبەرێك هاتوە،لە سەر ئەو بنچینەیە دەبینین شارستانی رۆم ویۆنان ومیسرو چین ومیزۆپۆتامیا ..بەرهەمی پێغەمبەرانن بەوشێوەیەی خوارەوە : بناغەی ئیمپراتۆریەتی رۆمیش هەروا لە باپیرە گەورەیان کە ناوی (روم بن عیسو بن اسحاق النبی )ە[3]،شریعەتی حەمورابی درێژ کراوەی شریعەتی ح ئیبراهیمە ،بە پێی (پەیمانگای ئیسلامی بریتانی — زانستەکانی بەراوردی ئاینی )ئەوا حەمورابی 300 سال دوای ح ئیبراهیم هاتوە لە 1870 پ ز ،بۆیەش بەشی زۆری مادەکانی شریعەتی حەمورابی لەتەورات و ئینجیل وشریعەتی ح ئیبراهیم وهەندێکیشی لە ئاڤیستای زەردەشتی دەچێ ، هەندێکی لەگەڵ

---

[1] بڕوانە: 1- ئینجیل-مت 12: 40 :(لانە کما کانیونانفي بطن الحوت ثلاثة ایام وثلاث لیال هکذا یکون ابن الانسان في قلب الارض ثلاثة ایاموثلاث لیال) 2- لە تەوراتیش:یونان 1: 17(واما الرب فاعدّ حوتا عظیما لیبتلعیونان.فکانیونانفي جوفالحوت ثلاثة ایام وثلاث لیال) .

[5] بروانە : الملل والنحل ..ص 67- 72 .هەر بۆیەش مەدرەسەو پەیڕەوی فیساگۆرس لەهەمووان ئاینی تر بوە .

2 جان جاك رۆسۆ- العقد الاجتماعی — ص201

[3] بروانە : لسان العرب —ابن المنظور ج1ص1260 مادە: روم .

قورئانیش لێك نزیکە[1]، لە سەر ئەو بنچینە قوولە ڕۆسۆ دەلێت یەکەم دەسەلات وشارستانی ئاینی بوە[2].

یاسای گەشەکردنی کۆمەڵ وادەخوازێ کە جیهان بەرەو تێکەڵاً بوون و پێشکەوتن و فراوانبوونی عەقڵیبڕوات، (ئەوەیان بنەمایەکی عەولەمەیە لە خودی مێژوو)، هەربۆیەش لە سەرەتای کۆمەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پەیامبەران هاتوون، بۆ هەموو گۆشەیەکی جیهان، تا کۆمەڵ گەیشتە قۆناغێکی پێشکەوتوو و ئامادە بەرەو جیهانگیری، ئیتر دوا (پێغەمبەر د.خ) و بەدوا پەیڕەوەوە نێردرا بۆ هەموو جیهان لە هەمووسەردەمێك و بە بەرنامەیەکی ژیانی تەواو، لێرەوە مێژووی ڕاستەقینەی کۆمەڵ دەست پێ‌دەکا، کۆمەڵێك گۆڕانکاریشی لێ هاتەدی، لەوانە: دەسەلاتی هۆکاری دەرەکی گواسترایەوە بۆ ناوەکی، لە پەیامیشەوە گواسترایەوە بۆ عەقڵ، لەهێزی ماسولکەشەوە خزا بۆ هێزی فکر.. کاریگەری سروشتیش زیاتر کەوتە دەست کۆمەڵ، لەگەڵ زۆر گۆڕانی تر کە تا ئێستاش بەخێراتر هەر بەردەوامە.

هاتنی ئیسلام وەرچەرخانێکی بنەڕەتیە لەمێژووی گشت مرۆڤایەتی، هەر لە چینەوە تا ئەوروپا، ئەوروپییەکان دان بەوە دەنێن کە ڕابوونی ئەوروپی لەدوای سەدەکانی

---

[1] توێژەران زۆر لای لە یەکچوو لە نێوان تەورات و یاساکانی حمورابی وشریعەتی ح ئیبراهیم دۆزیتەوە ،هەندێکی بە نمونە لێرە تۆمار دەکەین کە لە (مەوسوعەی بریتانی)مان وەرگرتوە : یاساکانی ژ:196،195،129،8...وەکو ئایەتەکانی (21- 37- خروج)،(22- 22- تثنية)،(15- خروج)،(20- 24- لاوین)...لەگەڵ زۆری تر ،هەر ئەو دەقەی هەردوولاش بە نمونە تۆماردەکەین : قانون حمورابی رقم129- إذا قبض على امرأة مضطجعة، مع سيد فيجب عليهم أن يوثقوهما ويلقوهما في الماء. ويمكن لزوج المرأة أن يبقي زوجته على قيد الحياة إذا رغب، كما يمكن للملك أن يخلّي حياة أمته. التوراة: وإن أخذ رجل يضاجع امرأة متزوجة فليمُت كلاهما. (تثنية 22:22) ، لە قورئانیش زینای پیاو ژنی بە هاوسەری ئەو سزایە هەیە ، لە ئاڤێستای زەردەشتیش سزای ژنی مێردار لە زینا هەر ئەوەیە ، هەموو ئەوانە بەلگەن کە هەمووی لە ڕەچەلەکدا لە پەیام هاتوون دوای بەرەبەرە دەستکاری کراون .

[2] جاك رۆسۆ-فی العقد الإجتماعی ص201

(16..)ز لەژێر کاریگەری و دەروازەی ئەندەلوس وعوسمانیەوە بووە، بەسەرهاتی ئەو (سەعات)ەی کە بەدیاری بۆ شای فەرنسی(شارلمان) ناردرا لەلایەن هارونئەلرەشید بەناوبانگە ویل دیورانت لە (قصە الحضارة )تۆماری کردووە، بەڵامواچاکە دەقی نامەی (شا جۆرج) تۆمار بکەین(لە مەوسوعەی جودیمان وەرگرتوە) کە بۆ (هیشامی سێیەم) ناردووە، چۆن داوای فێرکردن و پەرەپێدانی لێدەکا:

((لە شای ئینگلترا (جۆرج)ەوە بۆ خەلیفەی موسوڵمانان لە شانشینی ئەندەلوس، خاوەن شکۆ (هشامی سێیەم)ی پایەبەرز.. دوای سڵاوو رێز: گوێبیستی باڵایی خوێندن و زانستی و پیشەسازی بوویمە لای جەنابتان، تکامانە نەوەکانمان بێبەش نەکەن لێی، ئەوا شازادە خانم (دوبانت)ی خوشکەزام بەخۆیی و دەستەیەك لە کچە ماقوڵانی ئینگلترا و بەدیاریەکی سادەشەوە نارد، دەخوازین بە زانست و زانیاریەوە بگەرێنەوە لامان، تا نەوەکانمان فێر بکەن.))- خزمەتکارتان —جۆرج- [1]

خەلیفەش قایل بوو لەسەر بودجەی (بیت المال) فێر بکرێن.

دوایی ئەو دۆخە وەرگەرا، شارستانی ئیسلام دواکەوت و ئەوروپا پێشرەوایەتی وەرگرت، دنیای سەرمایەداری لێ هاتەدی، لە کاروکاردانەوەکەش دا کۆمەڵێك مەدرەسەی فیکری و سیاسی لێ پەیدابوو، سەرەکیەکەیان مدرسەی مارکسیەت بوو کە لە ساڵی 1917لە سەر دەستی لینین شۆڕشی ئۆکتۆبەر و سەربازگەی دژ بە ڕۆژئاوای لێ دروست بوو، خەریك بوو هەمووجیهان بە ئەمریکاشەوە هەڵلوشێ دوای لەکۆتایی سەدەی ڕابووردوو ئەزموونەکەی تێك ڕووخاو لەو ساتیەوە ئەمریکا بە تاك جە مسەری سەرکردایەتی جیهان دەکا.

## 1– 2 گەشەی کۆمەڵ:

هەموو لایەك کۆکن لەسەر شێوەی گەشەکردنی کومەل، بەڵام ڕاوبۆچوونی جیاجیای فەلسفی و زانستی و ئەنسرۆپۆلۆجی سەبارەت بە (بزوێنەرەکەی) هەیە، هەر بە کورتی چەند بۆچوونێك لەگەڵ خاوەنەکانی تۆمار دەکەین:

[1]تێبینی: دوای لێکۆڵینەوە لەکتێبی تر دەرکەوت ئەو دیاریە زێڕ بووە.
بۆ زیاتر لەو جۆرە بابەتە سەیری ئەو کتێبانە بکە:1- قصة الحضارة. ویل دیورانت.2- بناء الإنسانية: بریڤولت.3- هەروەها کتێبەکانی (دوزی، سارتۆن، شارلز سنر، ریتژار کۆل...).

1- مارکسیەکان: پێیان وایە ڤاکتەری ئابووری (بزوێنەر)ەو خۆی لە (ململانێی چینایەتی) دەنوێنێ.

2-نەفسانیەکان: دەڵێن (هەست بە نوقستانی دەروونی) فاکتەری گەشەی کۆمەڵە.

3- جوگرافیناسەکان: ڤاکتەری جوگرافی و ژینگە.

4- دوهرنگ: چەوسانەوە.

5- هیگل : سەلبیات، (دیالیکتیك).

6- کارلیل: ژیرەکان سەرچاوەی گەشەن.

7- دیکارت : پێویستی دایکی داهێنانە

8- توینبی : التحدی والاستجابه.

9- فرۆید : جنس .

10- ابن خلدون : ئاین و پەیوەستی خوێنی.

11- نەتەوەگەریەکان: ململانێی نەتەوەیی.

12- سەرمایەداری ئێستا و (هندیگتۆن): ململانێی شارستانیەکان.

... لەگەڵ زۆر وردەبۆچوونی تریش.

زۆربەی ئەو بۆچوونانە سەرچاوەکانی دەگەڕێتەوە بۆئەو دوو تیۆرە زانستییە:

1/ تیۆری گەردوونی هەتاهەتایی و بێسنور،کە بە (کون الساکن)ناو بانگە — دەهریشی پێ دەووتری.

2/هەردوو تیۆری گەشەسەندنی داروینی و کۆمەڵایەتی، لەگەڵ بیرۆکەی (هەڵهێنان- تولد الذاتي).

ئەو بیرۆکانە زۆر کۆنن، گەردوونیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش بەتلیمۆس (90-168ز)، ئەوی تریش بۆ (ئەنکسیمۆندری 650 پ.ز). کە ئێستا هەڵە دەرچوون.

**<u>رای ئاینی</u>**هەموو بوونەوەر لە گۆڕان دایە، بەڵام لەگەشەکردن نیە، کۆمەڵ و ئادەمیزاد تاکە بوونەوەرێکن (مسەیەر) نین و سەربەستیەکیان هەیە، هەم لە گەشە و گۆڕانیشدان، بەهۆی گەشە و فراوان بوونی عەقڵ، بۆیە ڤاکتەری گەشەی کۆمەڵ بەڕوانگەی ئاینی و ئیسلام بە دەر نیە لە مرۆڤ خوی، واتە ئەو فاکتەرانەی وەك ئابووری، جنس، نەتەوایەتی، جوگرافی، ژینگەیی،... هەریەکە کاریگەری هەیە، بەڵام سەرچاوە

نیە، لەکۆتاییەکەی کۆمەڵ و ئادەمیزاد خۆیان سەرچاوەو بەرپرسی ئەو گەشە و گۆڕانەن ((ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم))[1].. لەڕاستیدا زۆر لە زاناکانیش لەدوایدا هاتونە سەر ئەو ڕایە لەوانە (ئاینشتاین، بافلۆف،...) هەتا (لینین)یش دەڵێ: (گەلان مێژووی خۆیان دروست دەکەن..).

بەڵام لە دوای هەموو ئەوانە وەك علی کوڕیئەبوو تالب وەسفی مێژوو وژیانی دونیا بە گوفەك دەکا، کاتێ چاوی بە گوفەکێك کەوت و ووتی (هذا ما کنت تتنافست علیە بالأمس )،ئەو وەسفە بۆ ئیستاش هەر ڕاستە، گوفەك بریتیە لە سەرجەم پاشەڕۆی بەشەریەت لە ژیانەکانی مادی وشارستانی هونەری وسیاسی وزیندەگی، تەواو دروستە ئەوەی دوێنیی ئێمە شەڕمان لەسەر کردووە ئەوڕۆ گوفەکە تەنها بەرهەمی عەقل دەمێنێتەوە ئەوەی تر گوفەکە .

## 1- 3باسێکی مێژوویی کورد

لەپێش (ح.نوح) تەنها چەند نەوەیەکی تەمەن درێژ بە چەندین سەدە دەگەیشتەوە سەر (ح.ئادەم)[2]،لەدوای ئادەم (شیس ) دێت هەموو مرۆڤایەتی ئیستا لە شیسن،وادیارە قابیل وهابیل نەوەیان نەماوە [3]، تۆفانەکەی نوحیش سەرتاسەری بوو، هەندێك پێیان وایە ئەو تۆفانە محەلی بووە هەموو جیهانی نەگرتۆتەوە، ساغ بوونەوەی ئەو دووڕایە بەلایەکدا پەیوەندیەکی توندی بە کوردۆلۆژی هەیە، چونکە ئەگەر تۆفانەکە جیهانی بێت ئەوا مانای وایە :1- چۆن هندستان لانکی یەکەمی مرۆڤایەتیە ئەوا کوردستانیش لانکی دووەمی مرۆڤایەتیە 2- ئەوەش دەسەلمێ کە کورد(بە ڕەهایی) کۆن ترین میللەتن لەسەر خاکی خۆیان وبنەچەی کوردیش بە ناوو خاکەوە (جودیە) نەك (زاگرۆس)،لەوەوەش بۆقازانجی کورد زانیاریەکانی قورئان چاکترە کە دەڵێ لە (جودی) پاپۆڕەکە گیرسایەوە[4] ،کەچی تەورات لە (سفرالتکوین- ئەسحاحی 8) دەڵێ لەڕۆژی 601/7/17ی تەمەنی نوح

---

[1]سورە (الرعد) ئایەتی (11)

[2]ئیبن کەسیر لە فەرمودەیەك وەری گرتوە( بدایە والنهایەص113)دەلێ بە10 سەدە .

[3]هـ س - ص110

[4]سورەتی (هود) ئایەتی (44)

لەئــەرارات گیرســایەوە[1] ،هــەروەهاکتێبی (حضــارة وادی الرافــدین) و(موســوعة العربیــة المیسرة) وزۆری تر ئەو ڕایەیان هەیە کەدەکاتە خاکی ئەرمەن .

هەرچی تۆفانەکەشە گوایەلە 17/ 600/2ی تەمەنی( ح نوح)[2]بووە, (رالف لینتون)لە کتیبی (شجرة الحضارة)دەلێ لە 3500پ ز تۆفانەکی سەرانسەری لە جیهان روویدا،ئەوباسەلەزۆربەی کتێبە ئاینیەکانی جیهانیەوەك (ئینجیل،تەورات، مانۆی هندی،زەندە- ئاڤێستا ، چیسالپۆکی مەکسیکی، کتێبی هیندیە سوورەکان- پۆپۆل ڤۆنخ...)،هەروەها لە کتیبەکانی سۆمەری و شارستانی تریش )[3] هاتووە، واتە جیهانی بووە، لە تەورات بە ڕوونتر باس لەوە دەکا کە کەس لە سەر زەوی نەماوە، دەلێ:(لأن میاهها کانت علی وجە کل الأرض )[4]،(فمحا الله کل قائم کان علی وجه الأرض )[5]،لە ئینجیلی برناباش بە جیهانی وەسف کردوە:( **فبسبب الشهور إن الطوفان ، حتی أن العالم هلك أمام رحمة الله ولم ینج إلا نوح وثمانون شخصا بشریا فقط)**[6] ، لەسەرچاوە ئاینیەکانی ئیسلامیش باس لەوە دەکا کەس لەسەر زەوی نەما،ابن کثیر دەلی:(ولم یبقی علی وجە الأرض ممن کان بها من الأحیاء عین تطرف ،ولا صغیرة ولا کبیر )[7]. ئیبن

---

[1]( 3 ورجعت المیاه عن الارض رجوعا متوالیا.وبعد مئةوخمسین یوما نقصت المیاه 4 .واستقر الفلك فیالشـهر السـابع في الیوم السابع عشر من الشهر علی جبال اراراط)– کتاب المقدس (العهد القدیم) سفر التکوین(اصحاح 8).

[2]بروانە : تەورات- سفر التکوین (اصحاح6- 9) . **لـە هەنـدی شـوین لـە (11 بـۆ 12):في سـنة ست مئة من حیاة نوح في الشهر الثاني في الیوم السابع عشر من الشهر11في ذلك الیوم انفجرت کل ینابیع الغمر العظیم وانفتحت طاقات السماء 12 .**

[3]بۆ زیاتر سەرنج بدە کتێبی :(کۆنترین نهێنیەکانی مێژوو)- ئەلسکاندر گەربۆڤسکی.

[4]توراه- سفر التکوین- 8

[5]العهد القدیم –تکوین 8،7

[6]ئینجیل برنابا-الفصل 115 (ئایەتی 5–7) .

[7]البدایه والنهایه ج1ص122

**سەلاحی شارەزوریش دەلیت هەموجیهانی گرتەوە ناوی ناوە (تۆفانی گەورە)هەرچی تۆفانی بچوکە تەنها میسری گرتۆتەوە [1] .**

**دیارە بەپێی قورئانی پیرۆز لەشاخی جودی[2]کوردستان گیرساوەتەوە، هەندێکی تر زیاتر ووردەکاری دەکەن بە پێی نزارگەکانی مسیحی وموسولمان و یەزیدی ئەوا لە لوتکەی نیڤاتی[3] جودی چەقیوە،کەواتە جارێکی تر مێژووی مرۆڤایەتی لێی دەستی پێ‌کردۆتەوە،کوردستان لانەی مرۆڤایەتی ئێستایە، بەپێی هەندێ سەرچاوە شاری (شەرناخ) کە لە نزیك (جودی)یە مانای (شاری نوحە)،هەروەها ئیبن عەباس دەلێ لە بناری چیای جودی ح نوح شارێکی دروست کرد تا ئێستاش ماوە بە ناوی هەشتیان *،بە پێی (بدایە والنهایە) هەرچی لەسەر زەویە ئێستا نەوەی (سام وحام ویافث)ی کوڕانی نوحن [4]، ئەوزانیاریە لەتەورات وەرگیراوە :(هؤلاء الثلاثة هم بنو نوح ومنهم انتشر كلسكان الأرض)[5]پرسیار لە ڕاستی ئەو زانیاریە هەیە: ئەی نەوەی ئەو 80کەسە چی بەسەرهاتوە کەلەگەڵ ح نوح بوون،بۆیە وا پێناچێ ئەوەی ئیستای سەر زەوی هەمووی بۆ ئەو 3کەسە بگەڕێنەوە ، بە پێی ئیبن خەلدوون و هەندێ سەرچاوەی تر ڕەچەلەکی کورد دەباتەوە نزیك نەوەکانی نوح بەو شێوەیە:إلاَّ أنّ الجرامقة من ولد كاثر. وقد قيل أنّ الكرد والدَّيلم من العرب. وهو قول مرغوبٌ عنه، وقال ابن سعيد كان لأشوذ أربعة من**

---

[1] ابن صلاح الشهرزوری —نزهه الارواح وروچه الافراح فی تاریخ الحکماو والفلاسفه — تعلیق:السیدخورشید احمد, وزاره المعارف الهندیه ,گ1 1976م ج1ص59.

[2] بەشیکیش پشتیان بەستوە بەهەندی زانیاری تر ودەلین تۆفانەکەش گوایە تەنها میزوبوتامیای گرتووتەوە لە شاخی ئەرارات گیرسایتەوە لە 7\17 ی هەمان سالی سەروو، ،قورئان وهەموو زانیارەکانی سەردەم دەلێن لە جودی گیر بووە.

[3] بروانە: واسیلی نیکیتین —کوردو کوردستانل121(لەناو یەزیدیەکان سەربردەیەکی زیادەی تر هەیە دەلێن :دوای بەرێکەوتنی پاپۆری (ح نوح)کونێکی تێ بوو، ئاوی لێهاتە ژوور زۆر ترسان بەڵام مارێك هات و سەری خۆی بە کونەکە وەناو ئاوەکەی بڕی ...بۆیە تائیستاش مار لای یەزیدی خۆشەویستە.

*هەشتیان واتە هەشتا ئەوەش گوزارش لەو 80 کەسە ناسنامە جیاجیایانە دەکا کەلەگەڵی بوون ، ابن عباس دەڵێ 80 کەس بووینە.

[4] البدایە والنهایە ج1ص124

[5] -العهد القدیم(توراة)- سفرتکوین 9-19

**الولد: إيران ونَبيط وجرموق وباسل. فمن إيران الفرس والكرد والخزر، ومن نبيط النبط والسريان، ومن جرموق الجرامقة وأهل الموصل، ومن باسل الديلم وأهل الجبل. قال الطبري: ومن وُلْدِ أرفخشذ العبرانيون[1].**

لەدوای تۆفانەکە بێجگە لە مێژووی میللەتە باڵادەستەکانی وەك فارس و ڕۆم و ئاشوری و بابلی و یۆنانی، ئەوانی تر زۆر لێڵە،بە پێ ئەو هەموو داکۆکیەی کە لەلایەن ئەکادیمیای نوێی کورد لەوە دەکرا کە ئەسلی کورد ئیزیدی بن،تەنانەت (مسعودبارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان)چەند جار ئەوەی دووبارە دەکردەوە یان کوردئەسلی نیە یان ئەسلەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئیزیدی،بۆیە تەقەلامان دا تا لە (مەسحەفی ڕەش )و (کتابی جلوە)ئەسلێکی بە دەق بدۆزینەوەکەچی پێچەوانەی دەرکەوت کە ئیزیدی لەگەڵ کورد لە (ح ئادەم)یش لێكجیان (أناأخلق‌آدم‌وحواءوأجعلهم‌بشرا ومنهم‌يكون‌من‌سر آدم‌شهر‌بن‌سفر ومنه‌يكون‌ملة‌على‌الأرض‌وثم‌ملة‌عزرائيل‌أعني‌طاووس‌ملك وهي‌ملة‌اليزيدية )[2] ،بەڵام بە مسۆگەری سەرۆکی هەندێ دەسەڵات(بە میدیاشەوە)کورد بووینە بەرەچەڵەك نەك بە کیان و هەستی نەتەوایەتی، هەڵبەتە سەردەمی ئیمپراتۆری بووە، زۆربەشیان لە ئەسڵدا درێژکراوەی پەیامێکی ئاسمانی بووبنە،لە مێژووی نیمچە سیاسی کوردی ئەو جۆرە دەسەڵاتانە تا (4500) ساڵ لەمەوبەر قووڵ دەبێتەوە لە (...لولو، گوتی،جوتی،ماد، کاردۆخی، کاردوو...) بەپێی سەرچاوە مێژووییەکانلە (تاريخ الطبری)و زۆر سەرچاوەی تر دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ساسانیەکان (ئاردەشیر)ە بەرەچەڵەك کورد بووە، {بەپێی ئەو نامەیەی بۆی هاتبوو لە (ئۆردوانی پێنجەم)[*]ئەوە ناوەڕۆکەکەیتی:إذ ورد عليه رسول الأردوان بكتاب منه فجمع أردشير الناس لذلك وقرأ الكتاب بحضرتهم فإذا فيه إنك قد عدوت طورك واجتلبت حتفك أيها الكردي المربى في خيام الأكراد من أذن لك في التاج الذي لبسته والبلاد التي احتويت عليها

---

[1] تاريخ ابن خلدون ج2ص10

[2] بروانە(مصحفالأسود) تایفەی ئیزیدەکانمان دوو کتێبی پیرۆزیان هەیە،مەسحەف وجلوە،جلوە 5 بەشە لە بەشی یەکەم ڕەچەلەکی(ملك تاوس)ی ڕوون کردۆتەوە.

[*] ئۆردوانیش سەرکردەیەکی ناوچەی شاخاوی (إقليم جبال) بوە دوا سەرکردەی (ئەشکاتیکان) بوو .

وغلبت مولكها وأهلها ومن أمرك ببناء المدينة التي أسستها في صحراء يريد جور مع أنا إن خليناك وبناؤها فابتن في صحراء طولها عشرة فراسخ مدينة وسمها رام أردشير وأعلمه أنه قد وجه إليك ملك الأهواز ليأتيه به في وثاقفكتب إليه أردشير إن الله حباني بالتاج الذي لبسته وملكني البلاد التي افتتحتها وأعانني على من قتلت من الجبابرة والملوك وأما المدينة التي أبنيها وأسميها رام أدرشير فأنا أرجو أن أمكن منك فأبعث برأسك وكنوزك إلى بيت النار الذي أسسته في أردشير خرة}[1]، هەر لەو سەرچاوەیە لە سەر زاری ئەردەشێر گواستراوەتەوە و دەڵێ : من ئامۆزای ئەو (دارا)یەی شای فارسم کە ئەسکەندەر کوشتی[2] ،هەروەها کریم خانی زەندیش هەر کورد بوە ..لەوسەردەمی وەك ئیستا نەبووە تا پەیوەندیەکی سیاسی ویاسایی ڕوون لە نێوان نیشتمان(هەرێم) ونەتەوە(گەل) ودەسەڵاتی سیاسی هەبێ،بۆیە ئاسایی بوو دەسەڵاتێك هەبێ لەسەر نیشتمانێکی تر وبەسەرۆکایەتی یەکێك کەلەڕەگەزی ئەوانیش نەبێ، وەك زۆربەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکانلەوانە ئەسکەندەری مەکدۆنی دامەزرێنەری یۆنان ودەسەڵاتی لە بابل وشارەزوور بووەلەوێش مردووە، عوسمانی خەلکی تۆران وناوچەی نزیك چینن دەسەڵاتیان لەئەنادۆل وئۆروپا بووە، سەلاحەدین لەمیسرو جزیرە، ..هتد بۆیە مەرج نیە دەسەڵاتێك لەکوردستان حوکمی کردبێ کورد بووبێیان پیچەوانە، ئەوانە بەئاسانی ناسەلمێندرێن، هەربەنمونە لەلایەك عەرەبەکان دەڵێن ئاشوریو سۆمەری باپیرانی ئیمەن[3]لەولایەش کوردیش دەلێن سۆمەری کوردن[4]، کەچی وانەوەیان ماوە نەکوردن ونە عەرەبیشن، بۆیە زەحمەتە بسەلمیندرێ میدیەکانیش کورد بووبن، سەرەڕای ئەو ڕاستیانەی سەرووش ئینجا میدیەکان دەسەڵاتیان زیاتر لەناوچەی ئێرانی ئێستابووە،تائێستاش میرنشینەکی بچووکیش لەئاسیا ماوە بەناوی میدیا، ئیتر کوا بەڵگەی راستەقینە کە ئەوانە کورد بووینە، مادام بەناوی کورد وکوردستان نەبووبێبەزەحمەت ئەو ناسنامانە

---

[1]تاریخ الطبری ص390 ،هەروەها لە (کامل فی التأریخ- ابن اثیر)یش دەقی ئەو نامەبلاوکرایتەوە .

[2] تاریخ الطبری ص389

[3]بروانە :ا د احمد سوسە- حضارة وادی الرافدین.

[4]بروانە : عبدالله ئوجلان - من الدولة الكهنة السومرية نحو الحضارة الديمقراطية .

دیاری دەکرێ،هەتا پاش ئیسلامیش دەوڵەتی ئەیوبی و ئیمارەتەکانی کوردی و ڕاپەڕینەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمیش بەناوی نەتەوایەتی و نیشتمانی کوردستان نەبووە، ئەوەش نەك کورد بەڵکوهەموو میللەتان وابووینە پەیوەستە بە قۆناغی مێژووی خۆی، پێناسی کۆن و ناوەڕاست و ئێستا و داهاتووی نیشتمان و نەتەوە گۆڕاوەو دەگۆڕێ، جاران بەو پارچە موڵکەی خۆیان وتووە (مەفتەن) دوای دێیەکەو ناوچەی خێڵەکەیان( لەعرەبی دیرە- لەکوردیش هۆبە)ی پێ دەووترێ، ئەوڕۆش بە نیشتمانی نەتەوەیی دەووتری، لە سەردەمی خیلافەت بە خاکی هەموو ئیسلامیان وتووە (دارالإسلام )[1]، ڕەنگە لە داهاتوو و لە (عەولمە) بە هەموو سەرزەوی بگۆترێ نیشتمان، بۆیە زۆر چەوتن ئەوانەی بە پێناس و واقعی ئێستا دادگایمێژووی رابردوو و داهاتووی ڕووداوەکان و کەسایەتیەکانی کوردی دەکەن.

ئەوەی ڕوونیشە لەپێش ئیسلام ئەو کوردستانە کەوتبووە نێوان ڕۆم و فارس، هەرجارەی یەکێکیان داگیری دەکرد و سەرانە و زۆرداری و بێکاری و ڕفاندن...بە سەردا سە باندبوو .

هەروەها لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ڕێبازی (مازدەك) و (مانی)یان لەنێو بڵاوکرابۆوە، جۆرە لیبرال دیموکراسی و سۆشیالیستیەکی کۆمەڵایەتی و جنسی وابوو کەس خاوەنی خاوخێزانی خۆی نەبوو، مافی کچێتی و شەوی یەکەمیش (jus primae nocti)بۆ میرەکان بوو[2]، خەڵکی کورد لەوپەڕی باری ئابووری کۆمەڵایەتی و سیاسی خراپ دابوو، زۆر پەرۆشی ڕزگارکەرێك بوون، بۆیە هەر ناوبانگی ئیسلام و دادگەریەکەیان بیست، خەڵکە ژیرەکانیان هەر لەساڵی (14- 16)ی کۆچی لەسەر دەستی(گابانی کوردی)[3]ڕێکخستنەکانی ئیسلامیبەنهێنی بەکوردستان بڵاوکردەوە، هەربۆیەش لە جەنگەکانی ئیسلام دژی فارس و ڕۆم لە کوردستان هیچ بەرگریەکی وای سوپای ئیسلام

---

[1]بۆ زیاتر بڕوانە : مەوسوعەی جودی ..نووسەر

[2]ئەو نەریتە لە جیهان بڵاو ببۆوە وبنچینەیەکی ئاینیشی پێدرابوو ،لەڕێی ئەو مەزهەبە هاتە کوردستانیش بڕوانە کتێبی gorg orwell nineteen Eight fowr p67

[3]بۆ زیاتر بڕوانە :شەرەفنامە-ل93

نەکرا، بەپێچەوانەوە بەپێی ڕێکەوتنەکانی گاوانودوایش (سەعدلەگەڵ دێلم)کـەبووە هـوی سەرکەوتنیان بەسەر سوپای روستەم و ئیتر سوپای ئیسلامی لەئیراق لەژێر دەسـتی کـورد بووە، لە هەندێ شوێن دەبووە ڕاپەڕین (لە وانە ناوچەی شـارەزوورە)لەدژی زۆرداریـەکانی فارس، چونکە ئیسلام هێزێکی داگیرکەر نەبوو، بەڵکو بەرنامەیەکی هەمەلایـەنی ژیـانی پێبوو، مەبەست گەیاندنی بەرنامەکـە بـوو، بەپێچـەوانەی سیسـتەمی ئیمپراتۆریـەتی و نەریتی پەلاماری و زاڵی ئـەو سـەردەم. بۆیـە لـەدوای ئیسـلام بوونیـان خۆیـان دەبوونـە خاوەنی، ئەگینا لە دروستکردنی دەوڵەتی مەدینە تەنیا (2000) موسـڵمانێك هـەبوو، چۆن بەشی هەموو دنیای کرد.

هەریەکە لە مرتەزاموتەهییری لە کتیبی (الحجاب) وویل دیورانت لە(قصة الحضارة)باسیان لـە کیسـرای ئـەو سـەردەم کـردووە، چـۆن خـاوەنی 3000ژن بـووە[1]، ئینجـا نامـەی بۆکیخوایەکانی نـاردووە تیایـدا وەسـف ونیشـانەی ئـافرەتی بۆنـاردوون تـا لەسـەر ئـەو وەسفەزیاتر ئافرەتی بوبنیرنبەکوردستانیشەوە، هەندێ لـەو وابەسـتەکوردانەش لـە مـیر و سیخوڕەکانی هەوڵی بـەرگریان داوە،وەك سـەروك جاشـەکانی ئیسـتا، لێـرەوەوە هەنـدێ لەنووسەرە عەلمانیەکان تەقەلایان داوە بۆ پاساوی عەلمانیەتی ئێستایان بیسەلمێنن کە ئـەو سوپایەی ئیسلامیش هەر داگیرکەر بووە، پێسـتێکی نووسـراویان دروسـت کـردووە (کـە ئێستا لە مەتحەفی بەریتانیایە) گوایە باس لە زوڵم و زۆری سوپای ئیسلام دەکات.. بـەڵام بە پشکنینێکی سەرەتایی دەردەکەوێ کە وەك مەسەلەی (انسان پلتداون) تەزویرەو بەس، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە ووشەکانی سەر ئەو پێستە دەبینی زۆربەی لە نـەریتی شـین گێڕانی ئافرەتـانی دەرسـیم وەرگـیراوە (هورمزگـان رمـان، ئـاتران کوڤان...هتـد)، ئـەو هەڵبەستە لە کتێبی (بەیتار نووری دەۆسیمی) تۆمارکراوە.

باشترین بەڵگەش بۆ خۆشەویستی خەڵکی کوردستان بۆ ئیسلام ودوور لە توبزیایـەتی، ئەوا:

1- یەکسەر ناوی منداڵەکانی کورد لەو سەردەمی تا ئێسـتاش هـەموو بـووە (محمـد، عمر، علی، عوسمان...هتـد.) کەچـی ناوێـك نـەبووە (یـەزدەجورد) یـان (هەرقـەل) وەك

---

[1] سینۆهەی پزیشکی تایبەتی فیرعەون لەکتێبەکەی دا لە بەسەرهاتەکانی خۆی لە کاتی سـەردانەکانی بۆ وولاتی فارس باس لەوە دەکا کەگەیشتە لای کیسرا بینی یەك باخچە ئافرەتی هەیەو پێی ووتبوو تا مێوانمی برۆ ژنەك لەو ژنانەی من لە باخچە هەلکرەو ئیتر ئەویش هەلی گرتبـوو ...چـیرۆکەکە دوورو درێژە لە خۆی بیخوێنەوە .

ئێستاش نیە بەناوی (ئەتاتۆرك) یانە(صدام) یان (بهلوی) یان (لینین) یان (ماركس)(بوش)...هتد.

2- لە كوردستان دیاردەی هەڵگەڕانەوە هەرگیز ڕووی نەداوە نە لەكاتی بەهێزی ئیسلام و نە لەكاتی بێهێزییەكەشی.

3- ئەو هەموو سەركردەو والی و زانا و هونەرمەند و ڕۆشنبیری لێ پەیدابوو.

4- تا ئێستاش ناسنامەو كەلتووری میللەتی كورد هەر ئیسلامە، لەگەڵ بێهێزی ئیسلامیش.تائەو ساتەش ئاینی ئیسلام لەگەڵ بێ خاوەنیشی هیشتا زورلەپێش مدرسە عەلمانیەكانە كە دەسەڵاتیشی لە پشتە، هەربەنمونەیەكی بەراورد، ئەومیللەتە سالێ جارێك 30 رۆژ بوو ئەو ئیسلامە بە رۆژی دەبێ، كەچی هەمووعەلمانیەتی كورد هەمووعەلمانیتی سەرزەویو عەلمانیەتی جنیش بێنە یارمتەی ناتوانن والەو میللەتە بكەن تەنها سەعاتیك بو سەركردەیەكی عەلمانی وەك ماركس،میكافیلی، روسو، میشیل عەفلەق ...بەرۆژی بن، كەواتە لەكونەوەو ئیستاش كلیلی گۆڕان ئاینە نەك ئایدیولوژبیای بەشەری، ئەو ئاینەش لەلای كوردان بە جیدی تر وەرگیراوە، بەو شێوەیە كورد مێژووی ڕاستەقینەی بۆ دروست بوو، سەرەڕای بەدكاری هەندێ لە خەلیفە و سوڵتانەكان، بەڵام كورد شەخصیەت و دەسەڵاتێكی زۆری پەیداكرد و لە بوارەكانی ئابووری و زانستی و سیاسی كۆمەڵایەتی و هونەری و عەسكەری سایكۆلۆژی و شارستانی بوژایەوە تا ئەو ڕادەیە بۆ یەكەم جار سەركردایەتی جیهانی كرد لە دەوڵەتی (ئەیووبی) بۆ ماوەی سەدەیەك.

دەبێ ئەوە بزانین تا سەدەی (19- 20) هەستی نەتەوایەتی نەبووەو نە پێویستیش بووە، بەڵام خەڵكانێكی بەتوانا بووینە بۆیە دەوری گرنگیان وەرگرتووە و تەنانەت (تەیموری لەنگ) لە بیرەوەریەكانی خۆی دەڵێ: (لە بەغدا بەرەو شام بەرێ كەوتن، ئامۆژگاریان كردم كە خۆم لە خێڵە كورد و دورزەكان لادەم، خۆشم لێ لادان)، لە كۆنەوە مەسەلەیەكی یۆنانی هەبووە بەناوی (گرێی كۆرتیون) واتە گرێكوێرە، ناویان لەكورد نابوو (گرێی كۆرتیون)، دەیان ووت هەرچی بیەوێ گرێكوێرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بكاتەوە و بەسەریدا زاڵ بێت، ئەوا دەبێ یەكەم جار لەگەڵ كورد ڕێك كەوێ، هەروەك ئەسكەندەری مەكدۆنیش (بەرای یۆنانیەكان)بەهۆی كردنەوەی (كۆرتیون)ی كورد بەسەر ئەو ناوچەیە زاڵ بووە، هۆلاكۆش زۆر بەزەحمەت هەولێری داگیركردو ئینجا وارێك كەوتن هەولێر

بە70000میسقال زیوبداتەوە سەرکردە کوردەکان وجارێکی تر هۆلاکۆ نەیەتەوە ئەو ناوچانەی کورد[1]،پێشوو تریش سەلجوقیەکان بە هۆی رێکەوتنیان لەگەڵ کورد توانیان ئەو جەنگە سەرکەوتوانە لەگەڵ رۆم بکەن ،ئینجا رێکەوتنی کورد وعوسمانی ئەو تەوژمەی بە عوسمانی داو لە سەڵتەنەتەوە وەرچەرخا بۆ خیلافەت وئەو تەمەنە درێژەی بە خۆدا، لە کۆتایشدا عوسمانی کە ڕووبەڕووی کورد بۆوە بەرەبەرە لاواز بوو تا ڕووخانی .

بەم شێوەیە کورد لە سەردەمی خیلافەت سنووری بوونی گەشایەوە، لەپشت تەورێزدا دەستی پێدەکرد بۆ گەیلان و خوار بەدرەوجەسان[2] و خوارووی موصڵ و بەشێکی گەورەی سووریای ئێستا و ناوجەرگەی ئەنادۆڵ[3]، هەروەك لە نەخشەی عوسمانی سالی1893و نەخشەی1896ی ئیداری بەشی ویلایەتەکانی ئاسیا دەردەکەوێ،لە بەندی یەکی رێکەوتنامەی ئەرزەرۆمی(1823/7/28)، هەروەها ( لەبەندەکانی 62- 63- 64رێکەوتنەکەی سیڤەر)یش دوای لە لیژنەکەی تەحکیمی ویلایەتی موسڵیش ئەو سنوورە بۆ کورد دەستنیشان کراوە تادەسەڵاتیخیلافەت مابوو،دوای هاتنی عەلمانیەت سنووری کوردستان تەسك بۆوە بۆ نیوە وەك ئێستا دەیبینین، هەربەردەوامە لە بەتورك* و بەعەرەب کردن، کورد هەتا لە بارە هەرەخراپەکانی خیلافەتی عوسمانیش پایەی باشیان هەبوو (وەزیر، سەرۆکی شورا، سەفیر و والی وسەدری ئەعزەمو شێخ الاسلام...هتد.) هەتا لە زەمانی (ملکی)یش شەخصیەتی کورد و بوونەکەی بەهێزتر بوو تا لە زەمانی (کۆماری).بەو شێوەیە تا عەلمانیەت تۆختر بوو، چارەنووسی کورد ڕەشتر بووە .

---

[1]کوردو کوردستان –ڤاسیلی نیکیتین ل534

[2]سەرنج بدە (إبن بەتووتە ) کاتی لە بەسرە بەرەو شیراز دەروا، لە رێگا مێوانی خێلە کوردەکان بووە، یاقوت حمویش لە (معجم البلدان )باسی پێکهاتەی نێو شاری حلە دەکاو دەلێ:ئەو دووپێکهاتە لایەکیان کوردن لایەکەی تر پێیان دەووترێ(اهل الجامعين)و زۆربەی جار ناکۆکن لەگەڵ یەك .ئیتر ئەوە سنووری کوردستان بووە .

[3]بروانە: سیاحەتنامە،شەرەفنامە،معجم البلدان، إبن بەتووتە ...بۆ ئەو مەبەستە توێژینەوەیەکی خۆمان بەناوی (کوردستانیەتی کەرکوك بەپێی بەلگەنامە نێودەولەتیەکان) بخوێنەوە .

*یەکەم پرۆسەی بەتورك کردن لەلایەن ئتحاد الترقی کراوە، بەرەسمیش لەسالی 1923بەپێی بڕیاری ژ:1505زەویەکانی شیخ وسەرۆکەکان سترێنرانەوە بۆ مهاجیرە تورکەکان –بۆ زیاتر بڕوانە : ..الحركە الكورديە المعاصرە –ص484

سەرەتای مەینەتییەکانیشی لە پەیمانە نهێنیەکەی 1916ی سایکس- پیکو - سازانۆڤ دەستی پێکرد [1] و لە (لۆزان 1923) دابەشیەکە پەیڕەو کرا بە دەست خۆشی سۆڤیەت و عەلمانیەتی ناوچەکە،مێژووی ڕاستەقینەی مەینەتی لە 3/ئادار/1924 دەستی پێکرد، ئەو ڕۆژەی (مستەفا کەمال) بڕیاری (نەمانی خیلافەت) و لێك جیاکردنەوەی (ئاین لە سیاسەت)ی دایە دەنگدانی پەرلەمان، تاریکەشەو باڵی بەسەر میللەتی کورد کێشا، هەردوو مقەسی دەرەوەو ناوەوە جەرگی کوردیان بڕی[2].

بەکورتی مێژووی‌مەینەتی کورد لەو ساتیەوە دەست پێ‌دەکات کە باری جیهانی و ناوچەکە بەوشێوەیە بوو:

1/کۆتایی هاتنی خیلافەت.

2/سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی‌جیهانی یەکەم(1914- 1918) و داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن ئینگلیز و فەڕنسا.

3/هاتنی فکری عەلمانی و نەتەوەگەری.

4/پەیڕەوکردنی (سایکس- پیکۆ) و دابەشکردنی میراتی خیلافەت و دروست کردنی دەوڵەتە نەتەوەییەکان (وەك عێراق و سوریا و تورکیا و...هتد.).

+ ئەم دوو هەنگاوە مێژووییە: داگیر و دابەشکردنی کورد و پەیدابوونی فکری عەلمانی بەتایبەتی فکری مارکسی کارێکی زۆری هەیە لەسەر پەیدابوون و ناوەرۆکی ئایدۆلۆژیەتی حزبە کوردستانی یەکان وەك لەدواییدا باسی دەکەین .

## 1– 4/بناغە مێژووییەکانی دروستبوونی حیزب

ئێمە ناتوانین بە وردی لە واتای _(حیزب) بگەین، ئەگەر لە پرۆسە مێژوویەکەی دروست بوونی نەگەین، لەگەڵ ئەم پرسیارانە:

بۆچی حیزب بەدرەنگی مێژووەو دروست بوو، بۆ لە سەرەتادا نەبووە؟

---

[1]هەرچەندە لە هەردوو جەنگ لەگەڵ محمدپاشای گەورە وشێخ عبیداللە هەست بە هاریکاریەکی نێو دەوڵەتی کرا دژبەکورد بەڵام ئەوەیان لە سایکس پیکۆ بەدەستی کلیمنسوری فەرەنسی لەسەر مێز نەخشە کێش کراو درابە هەردوو نوێنەرانی بریتانی وفرنسی .

[2]بۆ زیاتر و وردتر لەشارەزابوون لە عولمەنیەت و مەینەتی کورد بگەڕێتەوە سەر پەرتوکی (ڕۆڵی عەلمانیەت ل دروست بوونی مەینەتی کورد)

پەیوەندی چیە لەنێوان دیاردە مێژووییەکانی کۆمەڵایەتی و دەزگا سیاسیەکان؟

ڕەوتی مێژووی کۆمەڵ و جەمسەرەکانی لە کام لا بۆ کام لا دەخزێت لەودەزکایانە: خێڵەکی، نەتەوایەتی، چینایەتی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی...؟ وە مانای چی دەگەیەنێ؟

کامیان ستونین و کامیان ئاسۆیین؟

ئایا ڕەوتی مێژوو لە ستوونی بەرەو ئاسۆییە یان بە پێچەوانە؟

ئایا حیزب توخمێکی ئاسۆییە یان ستوونی یە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە و گەیشتن بە فکرەی حزب پیویستمان بەو چەند خاڵانەی خوارەوە هەیە:

## 1- سەرەتای کۆمەڵ :

زۆر هەوڵدراوە بەدروستی دیمەنێکی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و شێوەی ژیان و ئیدارە و ئاین و ئەخلاق و باری سیاسی و ئابووری ئادەمیزادی کۆن بدۆزرێتەوە، هەر زانا و مەدرەسەیەك بە دیدی خۆی ڕوانیەتی، بەتایبەتی (مورگان- لە کتێبی:المجتمع القدیم) و (ئەنجلس- لە کتێبی أصل العائله والملکیه الخاصه والدوله)و زۆری تریش پێیان وابووە کۆمەڵگە لە سەرەتادا کۆمەڵە نەفەرێکی ڕاوکەری بێ سەروبەر و بێیاسا و بێ جێ و ڕێ و خێزان بووینە، منداڵ بەدایکی ناسراوە (ئەو دایك سالاریەی کە ئێستا هەندێ عەلمانی کوردستانیش بانگەشەی بۆ دەکەنەوە لەو بۆچوونە هەڵدەقووڵێ)[1]، ئەو بۆچوونە لە دواییدا لە ڕووی زانستی شکستی هێنا، هەرچەندە بەشێك لە زانایانیش پێیان وابوو (ڕژێم) و خێزان و بنکە و سەروو هەر هەبووە، بەڵام ڕای ئیسلام هەر ئەوە بووە لەڕێی (پەیام) و (حرام و حلال) بناغەی هەموو یاسا و ئیدارە و شارستانیەك دامەزراوە، دیارە نکوڵی لەوەناکرێت کە کۆمەڵە خەڵکێك کە لە ڕووناکی پەیام یاخی بووینە لە تاریکی ژیاون، ڕیبازی تەتەوریەکان هەردەم ئەو دیاردە شازانە (تعمیم) دەکەن، بەڵامهەموو لایەك کۆکن لەسەر ئەوەی ژیانی سەرەتای زۆر سادە بووە، ئادەمیزاد هەموو ئیعتمادێکی لەسەر

---

[1] بڕوانە:مقدمة فی انثروبولوجیة الإجتماعیة ص31-..، هەروەها بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (جۆن ماکلنین- الزواج البدائی) ،(داروین-اصل الانواع) ،(باخۆفن -حق الام) ،(جون ماکین-الزواج البدائی) ،(هنری مین-القانون القدیم) ،..

سروشت بووه، پەیوەندی هەرەفراوان و توندوتۆڵەکە پەیوەندی خێزانی بووه بە بنەماڵە، ئەو پەیامە بووه هوی ئەو ئادەمیزادە کۆنەی لە درندە کردۆتە هاریکار و ڕەوشت دار، پەیامەکانیش لە ئاستی بنەماڵەو ناوچەیەکی بچووك بووه، ئینجا دوای چووه ئاستی خێڵ و ناوچە و کۆمەڵگا، پەیامەکان فراوان تر بوون چاکتر لە:

1- ئەحوال شەخصی 2- ئەحوالی خێزانی، 3- ئەحوالی بنەماڵە، 4- پەیوەندی بنەماڵە بە بنەماڵەیەکی تر، ئینجا بە خێڵەوە.. تا دوای بۆ هەمووجیهان.

بڕوایەکەش هەر خواپەرستی و یەك خوایی بووه واتە (دین التوحید) نەك وەك (مارکسیەکان، دانتی، فیۆرباغ، بەشێکی زۆر لە فەیلەسوف و زاناکان) وای بۆچووبوون گوایە ئاینی سەرەتایی (فرەخوایی) بووەئینجا وەرچەرخاوە بو یەك ئاینی، لەوەش زیاتر( د جورج حنا) دەڵێ یەهودی یەکەمین ئاینە کە تاك خواییە[1]،بەلام( ولیام شمید) دوای پیچەوانەی سەلماند و ووتی یەکەم جار یەك خوایی بووە ئینجا زۆرداری بەشەر فرە خوایی هێنا کایەوە[2].

بەو شێوەیە لە سەرەتای تەمەنی کۆمەڵگەفاکتەرە کۆمەلایەتی و ستونیەکان کاریگەر بووینە، فاکتەر ئاسۆیی و عەقڵیەکان لاواز بووینە، ئەرکی پەیام بە کورت و پوختیی بریتی بووە لە خێراکردنی وەرچەرخانەکانی فاکتەر ستونیەکان بۆ عەقڵی و ئاسۆییەکان، حزبایەتی ئەو سەردەم زادەی عەقڵنەبووە، حزبایەتیەکی پەیامی بووە، بۆیە ناونرابوو (حزب الله)، حزبی بەرامبەریش ڕەگەزی و پەلامار و دڕندەیی بووە، بۆیە ناوی (حزب الشیطان) بووە، چونکە (شەیتان) یەکەم بانگێشەی ڕەگەزایەتی و ڕەچەڵەکایەتی کردووە کە وتی (ڕەچەڵەکی من لە ئاگرە و ئی ئادەم لە قوڕ).

## 2- فەلسەفەی پێشکەوتن:

: کۆلەگەی بنچینەیی فەلسفەی مادی بریتیە لەجولەی مادە،ئەو جولەیەش مانای گەشەو پێشکەوتن وەرگرێ،فیگۆ یەکەم فەیلەسوف بوو ئەو جۆرە جولەو گەشەیەی بە (سپرینگی) لە خواروو بۆ سەروو وەسف کرد،شۆبنهاوەر: دەلێ سروشت مادەیە،مادەش تەنها ئەو کاتە مانای دەبێ کە گەشە بکاو

[1] قصة الإنسان ص75

[2]بروانه :الاسلام والعلمانیه ....ص18

بەرهەمی هەبێ بۆیە سروشت بە تێکڕایی لەگەشەی بێ ووچانە[1]،ئـەنجلس بـەڕەهایی تـر دەڵێ: ئەو گەشـەیەی بـەهۆی پرۆسـەی(نفی النفـی) دێتـە دی ئەوەگەشـەیەکی کراوەیـی پێشکەوتوو دەبێت[2] ،هەموو ئەوانە لە فلسـفەی هیگـل لـە ریسـایەکی فلسـفی موکـوم کۆکراوە بە ناوی جولەی دیالکتیکی (بوون —دژ-پێکهاتەکی بالاتر) یـان (الشـیئ، ضـده، مرکب الأعلی-Theses - untiTheses- synTheses)[3].

پێشـکەوتن سـیفەتێکی تایبەتیـە بـە ئـادەمیزاد ((هـو الـذي أنشـأکم مـن الأرض واستعمرکم فیهـا)) هود:61. بە پێچەوانەی ڕای سەرجەم (مادیـەکان) سروشـت و مـادە دەگۆڕێن، بەڵامپێش ناکەوێ، واتە ئاسن نابتە زێڕ لەخۆوە، ئـاو لـەخولی سـوڕانی نابتـە جیوە، درەختیسێو نابتە مۆز، ئەو تێڕوانینانە هەڵە دەرچوون، ویستیان بـەهۆی پرۆسـەی (گەشەسەندن و پێشکەوتنی سروشت) تەفسیری گەردوون و پەیدابوونی ژیـان و کۆمـەڵیش بکەن بێ بوونی دروستکەر، گوایـە چـەند یاسـایەکی سروشـتی بـابۆلۆجی ئـەو ئەنجامـە دەدات، وەك یاسایی:

1- ناکۆکی(التناقض) .
2- نفي النفي .
3- وەرچەرخانی گۆڕانە چەندایەتیەکان بۆ چۆنایەتیەکان.
4- هەڵهێنان.
5- گەشەی هەڵبژاردنی سرووشتی.

ڕاستیەکەی ئەوەیە ناکۆکی و پێشکەوتن لە سروشت نیە ((ما تری في خلـق الـرحمن من تفـاوت))سورە الملك:3. گۆڕانێکی بازنەیی داخراو هەیـە، واتـە دەجوولـێ، هـەر بـۆ نموونە لـە ئـاو (شـلە- هـەڵم- سـەهۆڵ- شـلە)، ڕوەك (دەنکۆڵـە- شـەتل- بـەر- دەنکۆڵە)، هـەتا لایـەنی بایەلۆژیەکـەی ئـادەمیزادیش هـەروا بازنەییـە (ئـادەمیزاد- نوتفە- کۆرپەلە- منداڵ- پێگەیشتوو- ئادەمیزاد).

---

[1] المثالیة الألمانیة ص255

[2] فریدریك انجلس- انتی دوهرینك- ص162-163

[3] جون لویز- مدخل الی الفلسفة- دار الحقیقة بیروت،ترجمة:انور عبداللة،ط2 ص193-194

(لامارك) خۆیشی و (داروین)یش لەوە بەهەڵەدا برد گوایە ئەو پرۆسە بازنەییە ئەگەر زۆرجار دووبارە بێتەوە لەو بازنەیە دەردەچێت،داروین ووتی ئەوەی بە دەستکرد بەماوەیەکی کورت دەکرێ هەلبژاردنی سروشتی بەماوەیەکی درێژ پێی دەکرێ [1] بەلاّم ئێستا لەدوای دۆزینەوەی (ئەندازەی جینەکان —**الهندسة الجينية)**هیچ گومانی زانستیش نەما کە ئەو پرۆسەیە ملیۆن ملیۆن جار دووبارە بێتەوە لە بازنەکە دەرناچێت و ئاوەکە نابنە نەوت و گەنمەکە نابتە گوڵەبەرۆژە، ئادەمیزاد نابتە (جن) یان (کەڵەشێر) یان گیاندارێکی نوێ، بۆیە سیفەتی پێشکەوتن پڕ بەمانای عەقڵی ئادەمیزاد دێت، کاتێ (سلبی و ئیجابی) و (خێر و شەڕ)، (چاك و خراپ)، (خۆش و ناخۆش)، (حەسانەوە و ماندووبوون)، (چەوسانەوەو دادگەری)، (برسی و تیری)، (هەق و ناهەق)... مانایان هەبێت ئینجا پێشکەوتن مانای دەبێت، لە خراپەکان بەرەو چاکەکان، واتە بۆ ئادەمیزاد لە سواریەوە بۆ ئۆتۆمبیل و فڕۆکە پێشکەوتنە، ئیجابیە، خۆشە، بەلاّم بۆ ڕووەك، شاخ، ئاو... چەوسانەوە و دادگەری و هەق مانای چ دەبەخشێت و چ پێشکەوتنێکە؟ دوای لەسەر چ پێوانەیەك (زێڕ) لە (ئاسن) پێشکەوتووترە؟ ئەوە تەنها پێوانەی (نسبی) مرۆڤە. کەواتە تەنها کۆمەڵگەیە پێشدەکەوێ بەهۆی عەقڵ و داهێنانەکانی، ئەویش هەردوو هۆکاری دەرەکی و ناوەکی بە نۆرە کاریگەری بنچینەییان دەبێ لەسەر ڕەوتی پێشکەوتنەکە، کاتێ هۆکارە ناوەکیەکان نورەیان دێت لە قۆناغەکانیجوامیریگەشە و پێشکەوتن دەبنە بنچینە،ئا لێرەوەشزەمینەی حزبایەتی لە گەشەی کۆمەڵگە چەکەرە دەبێ،وەك لە دوای دەردەکەوی.

## 3- کاری هۆکارەدەرەکی و ناوەکیەکان لەسەر گەشەکردن:

لەراستیدا ئادەمیزادیش وەك کۆمەڵ زۆر ڕاوبۆچوونی لەسەرەلەبارەی : ئاخۆ کام ئەندامی لەشی بزوێنەرەکەیەتی، ئیدی هەر لە (گەدە، جنس، مانەوە- بقاء، خوێن، ڕەچەڵەك، دەوروبەر، هەست بە ناتەواوی، پایە، سامان، پێشبڕکێ- منافسە، خۆدەرخستن، عەقڵ....) تا دەگاتە (سروشت) وەك ڕوونیشە ئیسلام (عەقڵ) بە هۆکاری

[1] تشارلز داروین- اصل الأنواع ص105

بنچینەیی دەزانێت، هـەر سـەرنجێکی سـادەش ئـەوەتا هـەموو ئـاژەڵ گـەدە و جـنس و دەوروبەر و... هەیە، کەچی گەشەسەندنی نیيە.

کۆمەڵ و ئادەمیزادیش بەتاکو کۆ هۆکارەکانی گەشەسەندنی دووبەشی سەرەکین:

أ- کۆمەڵە هۆکاری دەرەکی.

ب- کۆمەڵە هۆکاری ناوەکی.

جا (ئایدیالیەکان- مثالیین)[1] پێیان وایە هۆکـاری دەرەکـی بنچـینەیە، مادیـەکانیش (بەتایبەتی مارکسیەکان) بەپێچەوانەی یەکەم لایان وایە هۆکـارە ناوەکیـەکان بنچـینەیە ودەرەکیەکانتەنها یارمەتیدەرێکە،هەرچی نەخشەی فکری ئیسلامیشە بەو شێوەیە:

أ- هۆکارە دەرەکیی و ناوەکیەکان لە هـەر پرۆسـەیەکی گەشەسـەندن لـە سـەرەتا تـا کۆتایی لە پلەی پێویستە (عامل ضروری)، هیچیان بەتـەنها (هۆکـاری کۆتـای- عامـل الکافی) نیە.

ب- لە سەرەتادا هۆکارە دەرەکیەکان بنچینەن تا ئەو پرۆسـەیە بـەردەوام بێـت زیـاتر ئەکەوێتە سەر هۆکاری ناوەکی و تا لە کۆتاییدا (بنچینەییایەتیەکە) لە هۆکاری دەرەکـی دەسێنێتەوە.

واتە هۆکارەکان خۆشیانچەسپاو نـین و دەگـۆڕێن بەرێژەیـەکی پێچـەوانە هەریەکـەیان پێوەریشە بۆ ئەوەی تر- وەك مەسەلەی بری وبە تالی بەرداخەکە - جا ئەگـەر ئـەو رێـژە بگۆڕێ بـەرەو پـڕی ئـەوا بەتاڵیەکـەی کـەم دەبێتـەوە ئـەوەیان (هۆکـاری دەرەکیيـە) و (پڕبوونەکەش ناوەکیيە).

با بزانین ئەو ڕێسا سروشتیانە چەندە لەسەر کۆمەڵیش پەیڕەو دەبێ.

## 4- کۆمەڵ و ئادەمیزاد

**أ-** کۆمەڵ: ئەو ڕێسایانەی سەرەوە تەنیا فەلسەفی نین، بەڵکو یاسای ئەنسـرۆپۆلۆژی و زانستی و مێژوویشن، بەپێی ئەو ڕێسایانە کۆمەڵ بە پرۆسـەیەکی ئـاڵۆزی فرەئاڕاسـتەدا گۆڕاوەو وادەگۆڕێ، دەتوانین لەسەر ئەو بنچینەیە زیاتر دڵنیابین کە باری کۆمەڵی کۆن لـە سەرەتادا بەو شێوەیە بووە (لەڕووی هۆکارە دەرەکیەکان):

1- زۆری پەیام و (موعجیزەی) هەستیاری.

[1] بە هەڵە لەپێش شۆڕشی ئێرانی1979 فکری ئیسلامی لەسەر ئەو مەدرەسە فکریە حساب کرابوو.

2- کاری سروشت لەسەر کۆمەڵ زیاتر بووە لە ئێستا.

3- پێویستی تاك و خێزان بە بنەماڵە و خێڵ بۆ پارێزگـاری لـە دوژمـن و کارەسـاتە سروشتی‌یەکان و فاکتەر دەرەکیەکان زیاتر بووە.

4- ئاسۆی فکری کۆمەڵایەتی تەسك بووە، چونکە هەرزنجیرە دیاردەیەکی سروشـتی و کۆمەڵایەتی دووبارەبۆوەی بەمیراتی فکری بۆ دەماوە.

5- ئەندازەیەك لـە قەدەغـەو (حـرام و حـلال)ی هـەبوو بـەپێی کۆمەڵـە ڕێسـایەکی ئەخلاقی کە لە پەیامەوە بۆی مابۆوە. ئەگەر ڕاستەوخۆش پەیام نەبووبێ.

6- هێزی ماسولکە (یەکلاکەرەوە) تر بووە لە هێزی (عەقڵ).

بەڵام دوای گۆڕان گەشەسەندنی کۆمەڵ، ئێستا لەڕووی هۆکاری ناوەکی بەو شێوەیە:

1- پچڕانی پەیامی ئاسمانی و بوونی بە یەك بەرنامەی چەسپاوی سەرتاسەری.

2- کەمتر ئیعتمـاد لەسـەر ڕەوتـی سروشـت،و پەیـدابوونی کارکـەری نـاوەکی وەك (پیشەسازی و کارخانە و دەزگا و...) پەیوەندی جارانی کۆمەڵ لەگەڵ سروشت ڕاسـتەوخۆ بوو، بەڵام ئێستا ئەو پەیوەندی‌یە بەهۆی ئامێر و ئامرازە، لە ئەنجامـدا زیـاتر کـۆنترۆڵی سروشت کراوە،ئەوەش مانای سیفەتی بوونی مرۆڤ بە(خلیفـە) لەسـەر زەوی ،تـەنها سـەر زەوی،وێچووی پەیوەندی یەزدان بە بوونەوەرە کە ڕاستەوخۆ نیە،بـەڵکو لـەڕێی یاسـاکانی سروشتە(کە لە قورئان بە زاراوەی —امـر-گوزارشـی کردوە)،ئـاواش مانای(خلیفە)ایـەتی مرۆڤ ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ سروشت کارنـەکا بـەڵکو لـە ڕێـی ئامراز،لەگـەڵ زیـاد بوونی ئامراز زیاتر کۆنترۆڵی سروشت دەکا بـەڵام هـەرگیز ناگاتـە کـۆنترۆڵی تـەواو،ڕێك ئەوسنورە بریتیە لە مەوداومەدای شارستانی مرۆڤ .

3- گەشەی ئینتمای مرۆڤ بۆ کۆمەڵە بەشەریەکان لە خێزان بـۆ بنەماڵـە بـۆ خـێڵ و نەتەوەو وابەرەو جیهان گەرێتی (عەولمە) بەرێوەیە.

4- ئاسۆی گشتی فکری کۆمەڵایەتی زۆر فـراوان بـووە لـە بازنـەی تەسـکی نیمچـە میرات وستونیەوە دەرچوو بەتەواوی پێی ناوەتە فاکتەر ئاسۆییەکان.

5- هێزی ماسولکە ئێستا یەکلاکـەرەوە نی‌یـە بەڵکووەرچـەرخا بوچـالاکی عـەقڵ و نەخشە و بەرنامە و پلان...

6- کۆتایی هاتنی (موعجیزە) و کارتێکەرە هەستیەکان و وەرگەڕانی بۆ چالاکی و بەڵگەی عەقڵی، واتە گۆڕان لە فاکتەر کۆمەڵایەتی و ستونیەکان بەرەو ئاسۆیی و سیاسی.

**ب- ئادەمیزاد:** پنچینەی ئەو گۆڕانکاریەی مێژووی کۆمەڵ لە تاك دەست پێدەکات و دوای کۆمەڵیش بە دەوری خۆی جارێکی تر کار لە ئادەمیزاد دەکاتەوە، بەو شێوە ماکینەی گۆڕان و گەشەسەندن دروست دەبێت، ئەو گەشەسەندنە دەپێورێ بە بڕی هەڵوەشاندنەوەی ئینتمایە ستونیەکان بەرەو ئینتمایە ئاسۆییەکان، ئادەمیزاد خۆی پێکهاتووە لە کۆمەڵێك ئینتمای ستونی و ئاسۆیی :

1- پەیداکەر(مکتسب) ئاسۆییە، وەك بوونی لە ئاینێك و کۆمەڵەیەکی سیاسی و مەدرەسەیەکیفکری ...

2- میراتیەکان،ستونیە، بوونی لە بنەماڵەیەك و خێڵێك و نەتەوە و خاکێك و نەژاد و جنسێك..،ئەوانە میراتین و بەدەرە لە ویست و ئارەزووەکانی خۆی،گۆڕان وگەشەی کومەڵ مانای گۆڕانی فاکتەرە ستونیەکانە بەرەو ئاسویی، بابزانین ئەو گۆڕانکاریە مێژووییەی لە سەرەتای کۆمەڵی کۆنەوە بەسەر ئادەمیزاد داهاتووە چەندە ئەو راستیە دەسەلمێنێ، تا ئەوڕۆ سەرەنجامەکانی بەو شێوەیە:

1/ لەڕووی فسیۆلۆجیەوە، لە جەستەوە بۆ فکر.. واتە بڕێك ووزەی ماسولکەی گۆڕاوە بۆ ووزەی فکری. لە ئینتمایەکانی میراتەوە (وەك بنچینەی ناسنامەی) گۆڕاوە بۆ ئینتماییەکانی وەرگیراو(مکتسب)، واتە جاران ئینتماییەکانی بنەماڵەیی و خێڵەکی زاڵ بوو بەسەر ئینتماییەکانی فکری و سیاسی، ئێستا گۆڕاوە تا ڕادەیەکی زۆر هێزی ئەو ئینتمایە هەڵوەشایتەوەو شلۆق بووە.

2/ لە ئاستی کۆمەڵایەتیەوە بە تەریبی لەگەڵ (گۆڕانەکانی ناوەکی تاك) ئەو وەرچەرخانانە هاتۆتە دی،هەموو زانا و پسپۆڕەکان ڕێکن لەسەری، بەڵام هەریەکە بەجۆرێك گوزارشی دەکەن،هەنێکیان هەڵدەبژێرین:

- ابن خلدون: بداوە- خێڵەکی- دەوڵەت.
- مارکسیەت: کۆمۆتی سەرەتایی-بەندایەتی-دەرەبەگی- سەرمایەداری- سۆشیالیستی- شیوعیەت.
- ئۆگست کۆنت: لاهوتی- میتافیزیکی- زانست

- فریزەر: جادوو-  ئایین-  زانست .
- کۆندرسیی: قۆناغی سروشتی(مرۆڤی سەرەتابی)- قۆناغی بە خێو کردن- کشت وکالی- شارستانی (یۆنانی)- شارستانی رۆمانی- قۆناغی ناوەڕاست (مەسیحی)- دەرەبەگایەتی- داهێنانی چاپ- شۆرشی فەرنسی- دواقۆناغکە مرۆڤبەتەنیادەستی بە گەشە کرد.
- تۆینبی:هاتنەکایەوە- گەشە- داڕووخان- پارچە پارچە بوون- وێران
- تەتەوریەکان: دڕندانەیەتی-  خێڵەکی-  ئیمبراتۆریەتی-  پادشایەتی-  کۆماری.
- ئیسلام: نبوە-  راشدین-  میرات-  دیکتاتۆری(جبری)-  گەڕانەوە بۆ ئیسلام (راشدین).

ئەو بۆچوونانە سەلامەت نین لە تێبینی و سەرنجی یەکتر، بەڵام ئەوەی لامان گرنگە بەڕوونی دەردەکەوێت کە ئینتیمای ئادەمیزاد بەرەبەرە لە میراتەوە بەرەو موکتەەسبە، لە تەسك بۆ فراوان، لە فسیۆلۆجیا بۆ ئایدیۆلۆژیا، لە ڕەچەڵەك بۆ فیکر، لە کلاسیکەوە بەرەو مەدەنیەت.. بەکورتی لە ئینتمایە کۆمەڵایەتیەکان بەرەو ئینتیمایە سیاسیەکانە، واتە لە ستونیشەو بەرەو ئاسۆیی، تاپێشکەوێت ئینتمای نوێی زیادکردووەودەکا، باڵاترین ئینتمای مومکین (مەبادیئە-  سیاسەتی ئەخلاقی) کە ئەوەش (فیترە)ی راستەقینەی ئادەمیزاد و نزیکترین وێستگەیە لە پەیام، کە هەر لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە ئەو مەبادیئانەی بۆ ئادەمیزاد و کۆمەڵ داڕشتووە، بەو شێوەیە گەشەکردنی سروشتی کۆمەڵ و ئادەمیزاد بەرەو دادگەری و بڕواییە، لەوەوە ئیسلامی و زانایانی ئیسلام وای بۆ دەچن سێکوچکەی (شەرەیعەت-  فیترە-  عەقڵی راستەقینە) یەکتر پاسادان دەکەن، ئەوەش چارەنووسی هەموو ئادەمیزادە لەسەر ئەو زەویە ((ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادي الصالحون)) یەکەم (حتمیە تاریخیە) کە قورئان پێشبینی کردووە کە سەرەنجامی جیهان بەرەو ئاین و بیروڕایە.

بەم شێوەیە بەرەبەرە کۆبوونەوەی (کوتلە بەشەریەکان) لەسەر بنچینەی خوێن و ڕەگەز و کۆمەڵایەتی کلاسیکی دەگۆڕێت بۆ کۆبوونەوە لەسەر بنچینەی سیاسی و بیروباوەڕ و ئاین و دەستووری ئاسۆیی هەروەك لە تویژینەوە نوێکانیش وای لی دەخوینریتە وە، هەتا لە تیوری (ململانێی شارستانی) هندکتونیش.

## 1– 5 فکرەی حیزب:

ئادەمیزاد بەهۆی پەیام بووە ئەندامێکی کۆمەڵایـەتی، بەڵامـلـە سـەرەتادا لەشـێوەی ڕەوەی لێکدابڕاوبووە ، بۆیە ئینتمایەکان لەهەرەچـاکیدا کۆمەڵایـەتی ڕووت بـووە، هـەر پـەیامی لێ پچـڕابێت ئـەوا گەڕاوەتـەوە سـەر ئینتمایـە سروشـتیەکەی بـەپێی قۆنـاغی پێشکەوتنی کۆمەڵ، بەگشتی بیناوگەشە کردنـی کومەلایـەتی بریتیەلەهەلۆەشـاندنەوە و وەرگێڕانی ڤاکتەر و ئینتیمایە ستونیەکان بەرەو ئاسۆیی، هەرکاتێ ئەو کۆڵەگانـەی بینـا لاببرێ بەخێرایی لە ئاسۆییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ستونیەکان، واتە فاکتەر کۆمەڵایەتییەکان زیاتر پانتایی مێژوویی کۆمەڵیان داگیرکردبوو و زاڵتریش بوینە.

بۆیە تا ئامڕازی هات وچۆ و بیستن و بینین گەشەی نەکرد ئینتیمایـەکان نەگۆڕان،ئـەو هەنگاوانـەش لـە سـەرەتای سـەدەی (19) بەرەبـەرە لـە ئینتیمـای دەڤـەری(محلی) بـۆ ئینتیمای جیهانی(عەولەمە) جولا،ئەو توپەلە بەشەریانە تێکەڵ بوون و بوو بە کۆمـەڵێك ئەلقەی یەکتربڕ (نەك تەماس) وەك خێڵ و نەتەوە و نەژاد و چین و توێژ و تایفـە و ڕەش و سپی و ئایینی جیاجیا و دەستە و کۆمەڵەی فکری لێك جیاجیا و پێشە و پسپۆڕی جیـا.. لەیەك کاتدا ئادەمیزادێك ئینتیمای بۆ زنجیرەیەك ئەلقەی کۆك و ناکۆك بو دروسـت بـوو، لەکاتێکـدا کـوردێکی هـەژار ناکۆکـە لەگـەڵ عـەرەبێك، بـەڵام یەکدەگرنـەوە دژی دەوڵەمەندێکی کـورد و عـەرەب، ناکۆکـە لەگـەڵ ئەمریکیـەکی ڕەش لەسـەر بنچـینەی جوگرافی و نەژادیوئاینی، بەڵام کۆکن دژی سـەرمایەدارەکی هاوبـەش، نـاکۆکن لەگـەڵ تورکێك بەڵام کۆکن لەسەر بنچینەی ئایین.

بەو شێوەیە کورد خۆبەخۆش کۆکن لەسـەر کوردایـەتی و نـاکۆکن لەسـەر خێڵـەکی و چـینایەتی، کـۆکن لەسـەر ئـاین و چـاکە و خراپـە و دادگـەری، بـەڵام نـاکۆکن لەسـەر ئامڕازەکان و ڕێبازەکانی گەیشتن بەو دادگەریە.. ئەو دۆخە لەناو هەموو میللەتێك هەیە، هەر بەو شێوەش میللەتێك لەگەڵ میللەتێکی تر و هەمووڵەگەڵهەموو[1]، ئەو ئەلقە کـۆك و ناکۆکانە یەکسان نین لە هەر زەمان و زەمینێك، ئەلقەو ئینتمایەك گەشتر و سەرەکیترە

---

[1] بۆ ئەوەی هەمـوو جیهان لە عـاملێك کۆك بن تەنها عـاملی ئایدۆلۆژیایە ئـەویش تـەنها ئـاینی یـە، ئەگینا هەر عـاملێکی تر بهێنی شمولی بەشێك لە کۆمـەڵ دەکـات، یـەکێ لـە سەرچـاوەکانی هێـزی رابوونی ئیسلامی نوێ ئەو پرۆسەیە لە عەولەمە.

لـەوانی تـر، بۆنمونـە لـە کوردسـتان بـەهۆی سـتەمی داگـیر و دابەشـکردنی خاکەکـەی "کوردایەتی "یەکە ئەلقەیەکی چالاکترە، بۆیە هەست و سۆزی کوردانەکـەی لـە سـەرووی چینایەتی و نەژادی و تارادەیەك خێڵەکی و دەڤەریشە ...، لە ئـەفریقاش ڕەش بەرامبـەر سپی، لە ئەوروپا جوو بەرامبەر مەسـیحی یـان کرێکـار بەرامبـەر سـەرمایەدار، لەگـەڵ ڕۆژانە تێکەڵاْ بوونیان بە یەکتر ئەو هەستە جیایانە زیاتر دەوروژێ.

ئالێرەدا فکرەی حزب گەڵاڵە دەبـێ.. چـۆن؟ تـا کێشـەی خـێڵ و بنەماڵـە بـوو ئـەوا پەیوەندییە خزمایەتیەکە ڕوون بـوو، پێویسـتی بـە کۆکردنـەوە و ناونووسـین و ڕێنمـایی نەبوو، بەڵام لە نەتـەوە و چـین و ئـاینێکی گشـتی (نـەك ئـاینێکی بـە بەرنامـە) هـیچ پەیوەندییەکی وا توندی ڕێکخراو نیە کۆیان بکاتەوە، تەوجیهیان بکات، یـەك دەنـگ و یەك ڕایان بکات، بەو شێوەیە فکرەی حزبوەك بیویستیەکی میزوویهاتە کایەوە.

## 1- 6/پێناسەی حیزبی سیاسی :

زۆر پێناس هاتووە بۆ حزب، هـەر مەدرەسـە و ڕێبـاز و ئایدۆلۆژیـەك بەدیـدەجیهانی یەکانی بۆ کێشەکانی کۆمەڵ پێناسەکانی دارشتووە، بەڵامهەمووی کۆکن کـە بەرهـەمی چالاکی فکریە.دەتوانین بلێین حزب بریتیە لە:

(یەکگرتنی ئارەزوومەندانەی کۆمەڵە خەلکێکی هاوبڕوایە، لەپێناو چـەند ئامـانجێکی هاوبەشی دوورونزیك)،بناغەکەی لە گرێبەندی فکری وسیاسی یەوە دیت .

چەند پێناسێکی جیاجیای تر تۆمار دەکەین کە هەریەکـە گـوزارش لـە مەدرەسـەیەك دەکا بەتایبەتی مەدرەسەی لیبرالی دیمکراسی ڕۆژئاوای ئێستا:

1- پێناسی دۆڤرجە (خاوەنی کتێبی الاحـزاب السیاسـیە): حـزب بریتیـە لـە کۆمەڵـە خەڵکێکی یەکگرتوو لەسەر بنچینەی سیستەمێك.
2- پێناسی (فرانسۆ گۆجیل): ئەو کۆمەڵـە خەڵکـە ڕێکخـراوەن، بەشـدارن لـە ژیـانی سیاسی کردن بۆ وەرگرتنی دەسەڵات یان بەشێك لێی.
3- بۆردو : بەوانە دەوترێ حزب کـە هـاوبیری سیاسـی بـن و بیانـەوێ دەسـت بەسـەر دەسەڵات بگرن یان کار لە بڕیارەکانیان بکەن.[1]

[1]بۆ زیاتر بڕوانە کتێبەکانی: أ- (النظم السیاسیة) ب- (علم السیاسة)

4- فەرهەنگی (oxford): ڕێکخراوێکی سیاسیە، هاوبەشن لە بڕوا و ئامانج و دەنگدان لە هەڵبژاردنەکان.

5- زۆربەی فەرهەنگە باڵاکانی عەرەبیش لەژێر کاریگەری فەرهەنگی ڕۆژئاواییی توخمەکانی (دەسەڵات، یەکێتی، هەڵبژاردن)یان کردۆتە بنچینەی حزب، لەوانە: (موسوعة العلم الإجتماعي)، (موسوعة السياسية الميسرة)، (قاموس سياسي)...

6- هەرچی پێناسی مارکسی و چەپیەکانە ئەوا زۆر راشکاوانە توخمی (دیکتاتۆری پرۆلیتاری) دەخەنە ناو پێناسەکانیان کە لەدوایدا تەنها (دکتاتۆریەکە) بۆ (پرۆلیتاریە) بووە نەریتی سیاسی و دەستوری وڵاتەکانیان یان بەلای کەمەوە دەبەستنەوە بەچینایەتی وەك لەو پێناسەی قاموسی سۆڤیەتی وا هاتووە (**تنظيم سياسي يوحد الممثلين الاكثر نشاطا لطبقة معينة ويعبر عن مصالحها ويقودها في الصراع الطبقي**)[1].

7- نامۆترین پێناس لەبارەی حزب پێناسی (حزبی بەعس)ە لە فەرهەنگەکەیان (تعريفات ببعض المصطلحات) هاتووە: حزب بریتیە لە کۆبوونەوەی خەڵکانێك لەنێو بەرنامەیەك بۆ دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات و ڕاپەڕاندنی دەوڵەت بەپێی ئەو بەرنامەیە بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی[2].

زۆربەی حزبە نەتەوەگەریەکان پێناس و سروشتێکی وەك ئەو پێناسەی حزبی بەعسیان هەبووە، بەشی هەرەزۆری حزبە کوردستانیەکانیش بەپێناسی مارکسیانە و نەتەوەگەریانە کاریگەر بووینە.

هەرچی پێناسە کۆنەکانە زیاتر لەژێر کاریگەری ئەدەبیاتی ئیسلامی بووە، ئەوا زۆربەی حزب بە (کۆمەڵە خەڵکێك) ناوبردووە، لەوانە (قاموس المحيط)ی فیروز ئابادی، هەروەها ابن اعرابی (حزب)ی یەکسان کردووە بە (جماعە)، هەرچی (لسان العرب)ە دەڵێ: (حزب جماعة من الناس، على قوم تشاكلت قلوبهم وأعمالهم فهم أحزاب) لەو سەردەمی بەو کۆمەڵە خەڵکە وتراوە کە بۆ ئیشێك وا ئامادەن نەك مانای ڕەچەڵەکی و نەتەوەیی هەبێ.

---

[1] قاموسی السیاسی – بونوفارسوف – ترجمە عبدالرزاق الصافی ص108

[2] تعريفات ببعض المصطلحات السياسية – المادة:حزب ،لە دیباجە کورتەکەی دەستوری حزبی بەعس وا هاتوە:حزبالبعث العربي الاشتراكي حركة قومية شعبية انقلابية .

لە نێو عوسمانیش بە پێی یاسای (الجمعیات)کە لە 1909/8/3 دەرچوو لە مادەی (3)وای پێناس کردووە:جەمعیەت ئەو کۆمەڵە کەسانەن کەبە هەمیشەیی یەکیان گرتووە بۆ یەکخستنی زانیاریەکانیان بێ ئەوەی مەبەستیان قازانج دابەش کردن بێت [1].

ئەوەی روونە چەند توخم و بنچینەیەکی جیا جیا هەیە تاك تاك و پێکەوە دەبنە بنەمای حزبی، وەك:

1- بەرژەوەندی چینایەتی و زیاتر ئێستا بەرژەوەندی تایبەتییە، لەسەر شێوەی یەکدەنگی هەڵبژاردن بۆ دەزگا سیاسی و دەسەڵاتەکان.
2- پایەوپوول، وەك حزبە دەسەڵاتدار و دیکتاتۆرەکان.
3- بەرگری لەخۆ، وەك ململانێی نەتەوە و نەژادە جیاجیاکان.
4- بیروباوەڕ، وەك حزبە ئیسلامیەکان و حزبە مارکسیەکان و هەندێ حزبی رادیکالی تر.

کەواتە توخمەکانی (بەرژەوەندی، ئیمتیاز، بەرگری، بیروباوەڕ) بەرێژەی جیاجیا ناسنامەی هەر حزبێك دیاری دەکەن.

وەك دەردەکەوێت ئەو ئامانج و بنچینانە هەمووی بوزەتیف وخێر نییە، هەروەك یەکگرتن(التعاون) هەیە لەسەر خێرە، هەشە لەسەر شەڕ((وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان)) لەسەر ئەو بنچینەیە پەیدابوونی حیزبی سیاسی پێشکەوتن و وەرچەرخانێکی مێژوویی ئادەمیزادە لە ئینتمای بایەلۆجی میراتی- ستونی بۆ ئینتمای ئایدیۆلۆژی- ئاسۆ یی، بەڵام کاروانی (خێر و شەڕ)، (سەلبیات و ئیجابیات)، (ڕەنجدەر و ڕەنجبەر)، (داگیرکەر و ڕزگاریخواز)، (هەق و ناهەق).. بە جمکی دەهێنێ، بۆیە لەگەڵ پەیدابوونی یەك شێوە نییە، چەندین جۆرە.

---

[1] بڕوانە :د. کیالی -الموسوعة السیاسة - المادة :الجمعیات

## 1- 7 جۆرەکانی حیزب:

1- حیزبی نەتەوایەتی، زۆرن لە جیهانی سێیەم و لە کوردستانیش.
2- حزبی نەژادی، هەردوو حزبی کۆماری و دیمکراسی ئەمریکی و لەهەندێ شوێنی تر هەیە، بەرەی تورکمانی و حزبی عەرەبی و مەسیحی وا خەریکن سەرهەڵدەدەن، بەڵام لە کوردستان هیشتا نییە .
3- حزبی ئومەمی، حیزبە شیوعیەکان، لە کوردستان هەیە.
4- حزبی دیمکراسی، زۆر بڵاوە لە جیهان، ناوەندەکەی لە ئەوروپایە، ئێستا لە کوردستان بەشی هەرەزۆری خۆی بەو جۆرە دەزانێ.
5- حزبی سۆشیالیستی، زۆرن لە جیهان، لە ئەوروپا (سۆشیال دیموکراتەکان) و لە تورکیا و سوریا و عێراقیش زۆر شوێنی تر هەیە، لە کوردستانیش (ی.ن.ك) و (ح.س.د.د) زەق تر سەر بەو مەدرەسەن.
6- حزبی خێڵەکی، ترازێکیدەگمەنە، زەقترین نموونە (حزبی ئەنکاشا)یە لە خوارووی ئەفریقا، نوێنەرایەتی خێڵی (زۆلۆ) دەکات بە سەرکردایەتی (بۆتەلێزی)، لە کوردستانیش بەلاوازی هەیە.
7- حزبی ئاینی تێکەڵێو، لەجیهان زۆرن، حزبە مەسیحی* و دیموکراسی و سۆشیالیستەکان و (حزبی یەهودی و هندۆس)...، لە کوردستانیش هێشتا نەخەملێوە، جگە لە حزبە مەسیحیەکان، بەڵام کوردستانی نین، عێراقین.
8- حزبی دەسەڵات، لە هەموو شوێنێك هەیە، بێ مەبادیئە، هەندێ جار حزبی مووچە و پایەی پێدەگوترێ.
9- حزبە ئیسلامیەکان، لەبارێکی هەڵکەوتووی بەرەو گەشەن لەجیهانی ئیسلام و لە کوردستانیش هەیە.

## 1- 8 چەند دابەشیەکی پێچەوانە:

چەند جۆرە حیزبێك هەیە بەدیلی یەکترن لە هەموو بوارەکان، وەك:

*لەنێو مەسیحی تەنها(کالفن)یەکان داوایان دەکرد کە ئاینی مەسیحی بەبێ شریك پیادە بکرێ .

- حزبه ڕادیکاڵەکان و حزبه پارێزگاریەکان، یەکەمیان خاوەن بەرنامەی گۆڕینی ڕیشەییە و دووەمیان پارێزگاری لە واقعەکە دەکات.

- حزبه میکاڤیلیەکان و حزبه مەبادیئیەکان، یەکەمیان فرت و فێڵ و نەجەسپاوی و بەرژەوەندی پەرستی وهەموو جۆرە ئامرازێك بەڕەوا زانین، دووەمیان حزبی ڕاستگۆیی و یەکێتی گۆتە و کردەوەو بەڵێن و مەبادیئە.

- حزبه عەلمانی و حزبه ئاینییەکان، یەکەمیان لەدۆخی هەرەنەرمیەکەی ئایین لە ژیان و دەوڵەت جیادەکاتەوە و سەربەستیەك بە ئایین دەبەخشێت لە چوارچێوەی دەستور، ئاینیش وەك پەیوەندی یەکی سادەی‌نێوانتاك و خوا دەخوینیتەوە، دووەمیان ئایین بە تاکە سەرچاوەی دەستوری وڵات و پەیڕەوی حزبەکە دەزانێت بۆ ڕەوتی تاك و کۆمەڵ و تەواوی ژیان.بەکورتی لە یەکەما ئاین پاشکۆی بەشەرە لە دووەما ئایین پێشەنگی بەشەرە.

- حزبه چەپڕەو و ڕاستڕەوەکان، ئێستا بەرەو کۆتایین، بەکورتی یەکەم گوایە نوێنەری هەژاران و دووەمیش دەوڵەمەندان.

کەواتە هەموو جارو لەهەموو دۆخێك حزب بە دیاردەیەکی دروست وەسف ناکریٚ ،گەلیٚ جار دەبتە هۆی پەرتەوازەیی وپشێوی ،بۆیە (ج واشنتن) یەکێکە لەوانەی زۆر بە توندی دژ بە بەرپا کردنی حزب حزبانیٚ وەستاوەو بە ئامرازی گەندەلی وتێك دان وڕێگە کردنەوە بۆ دەستی دەرەکی حیسابی کردوون ، بە هەمان شێوە معمر قەزافی لە(کتاب الأخضر)دەلیٚ حزبایەتی خیانەتە،بەهەمان شێوە لە ئێرانیش دیموکراسیەکی بیٚ حزبایەتی پەیڕەو دەکەن ،لە کتێبە ئاینیەکانی تریش بەزۆری حزب بە کۆمەلێکی بیر تایبەت ونەیار بە (ئەمری واقیع) هاتوە ،لە هەندێکیشیان زیاتر بە سەلبی هاتوە ،لەوانە ابن تیمیە لە کتێبی (السیاسە الشرعیە ..)تەنها لەدوو شوێن باسی حزبی لێکردووە لەهەردووکیان بە سەلبی وئەوەش دەقەکانیەتی :.. من قتل الطوائف الممتنعة عن شرائع الإسلام فإن هؤلاء قد تحزبوا لفساد النفوس والأموال..، لە شوێنێکی تریش:..وهؤلاء الملوك والرؤساء المفسدون، كفرعون وحزبه[1].

[1] شيخ الإسلام ابن تيمية-السياسة الشرعية.. ص20، ص34

## 1- 9 یەکەم حزب لەکێ پەیدابوو؟

دیارە فەیلەسوف و زانایانی ئەوروپی وا فێر بوون کەمتر حساب بۆ خەڵکی تر بکەن، هەموو دۆزینەوە و (ژمارە پێوانەییەکان) بۆ یەکەم کەسی ئەوروپی دەگێڕنەوە،: هیرۆدتس- باوکی مێژوو، ئەبیکرات- باوکی پزیشکی، سیۆکریتشس -باوکی هونەر،هیرکلیتس- باوکی دیالکتیك،ئیکلیدو فیساگۆرس باوکی ئەندازەو ژمارە، سترابۆ- باوکی جوگرافیا، تالیس وبیتلیمۆس -باوکی گەردووناسی، ئەفلاتوون وئەرستۆش - باوکی کۆمەڵێك لقی زانستی تریان پێ بەخشراوە،..لە مێژووی نویش خڕیەتی زەوی و ناوەند نەبوونی لە گەردوون بە شۆڕشێکی زانستی ئەوروپی دەزانن کە لە سەدەکانی (16- 17) لەلایەن (کۆپەرنیکۆس- گالیلۆ- کپلەر- جۆردانۆ..) دەستی پێ کرد، کەچی زۆر لەپێش ئەوان لە کتێبەکانی ئیسلام هاتووە بەتایبەتی (ئەلبیرۆنی نیوە تیرەی زەوی دۆزیتەوە)،معجم البلدانی یاقووت حموی، هەروەها بەرگی (10)ی ( تەفسیری روح البیانی پرسوی) وزۆرسەرچاوەی تر .

لەدیاردەی پەیدابوونی حزبیش پێیان وایە فکرەی حزب یەکەم جار لە ئەوروپا سەری هەڵداوبەوشێوەیەی خوارەوە: لە سەرەتادا کۆمەڵە خەڵکێك یەك ڕادەبوون بەرامبەر هەڵبژاردن و دوای لەناو پەرلەمان (فراکسیۆ نی رای جیاجیا) دروست دەبوو، بەرەبەرە حزبی لێ چەکەرە بوو. بەو شێوەیە مێژووی حیزب بەو تەرازوەی ئێستای لە دەوری ساڵانی (1850ز) دەست پێدەکات،[1] لەوەیان هەمووسەرچاوەکانی جیهانی کۆکن لەسەری، هەروەك (موسوعە علم الاجتماع) دەڵێ: (هەتا ساڵی 1850 لەهیچ وڵاتێك بەو مانا و پێناسەی ئێستا حزبایەتی نەبووە)، ئەگینا دەستە و یانە و کۆبوونەوە هەبووە، بەشێکی تر دیاردەکانی دژایەتیکردنی پادشاکانی ئەوروپایان کردووە بە تایبەتی لە سەدەکانی (16)بەدواوەناویشیان هەڵگرتبوو بەناوی (وێك) و (تۆڕی)* وەك حزب

[1] موریس دیفریجة -الأحزاب السیاسیة-تعریب:عبدالحسن سعد، ط2 \1977م، دار النهار للنشر ص6.

*لەسالی 1680 دابەشیەك دروست بوو لەنێولایەنگرانی پالێوراوەکانی بەریتانی، بەجۆریك بازرگان وپیشە سازو تەکنۆکرات وبرجوازیەکان بەگشتی کەچینێکی زیاتر کراوەو پێش کەوتوو بوون کەوتنە لایەك وپێیان دەووترا وێگ، چینی دووەمیش زیاتر پیك هاتبوو لە دەرەبەگ و مەلاك و پیاوانی ئاینی

وابووە،نیکۆلا میکافیلی لە ڕەوتی باسی (میرنشینە ئاینیەکانی ئیتالیا)دەکا وناوی دوو حزب دەبا بەناوی(ئۆرسینی) وحزبی (کۆلۆنا)[1]،باس لە سەرەتایەکی تری حزب دەکرێ لە نێوان (22-27)ی مایۆ 1875 لەکۆنگرەی غوتا هەردوو بالی کریکارانی ئەلمانیا(پارتی کریکارانی دیموکراسی)بەسەرۆکایەتی پیپل و(یەکێتی کریکارانی ئەلمان)ی لەسالّی یەکیان گرتەوە بوە (پارتی کریکارانی سوشیالیستی ئەلمانیا)،بەلاّم بە ووردبونەوەی زیاتر لە تەرجەمەو سەردەمی باسەکەی کە پێشسالاّنی 1854 بوە مانای حزبی ئیستا نادا،لەئەمریکاش لەنیوەی سەدەی حەڤدەم (تۆماس جیفرسۆن) وەك دامەزرێنەری حزبی دیمکراسی دەژمێردرێ،بەلاّم (موسوعة عربیة العالمیة) ئەو تەقەلایە و تەقەلایەکانی (ئەندرۆجاکسن) بۆ سەرۆکایەتی لە (1828) بەناوی دیمکراسی دەلّێ حزبی نەبووە هەر لایەنگرانی بە"دیمکراسی"یەکان ناوزەد بوون،بەلاّم بە پێی (الموسوعە السیاسیە)یەکەم حزب لە جیهان حزبی دیموکراسی ئەمریکی بە سەرۆکایەتی جیفرسونی سەرۆك کۆماری ئەمریکی لە نێوان (1801-1809).

وا دەردەکەوێ حزبایەتی لە رۆژئاوا زادەی ململانێی هەلّبژاردن بووە، بەلاّم دوای لەسەر دەستی سۆشیالیستەکان و ئینجا شیوعیەکان و خودی (لینین) گەشەو بازی پێدراو ناوەندیەتی و دیسپلینی و مەکتەب سیاسی* بۆ داهێنرا.

کەواتە بەدلّنیاییەوە حزب لە ئەمریکا لەپێش ئەو مێژووە هەبووە، بەلاّم لەناو قورئانی پیرۆز بەڕوونی باسی (حزب الله)و (حزب الشیطان) کراوە، بەڕای ئیسلامیەکان و زانایانی ئیسلام دابەشی کۆمەلّگەی مەکە و مەدینە حزبایەتی بووە، بە لایەنگرانی ئیسلامیان وتووە (حزبی محمد)، ئیتر(حزبی موشریك) و ڕەگەزی و ئاینی و عەشایری.. هەموو نوێنەریان لە (دار الندوة) هەبووە، لە قورئانیش بە (أحزاب) ناوی بردوون ((ولما رأى

---

کەبەرگری و پاریزگاریان لە داب ونەریتی رەسەنی بەریتانی دەکردپێیان دەووتن تۆری، لەدوای چاکسازیەکانی 1830- 1884 هەردوو حزبی لیبرال(ئەحرار ) وپاریزگارانی لێ خەملّی ، هیچ دوور نیە ئەو زاراوەیەی لەکوردی وەك جوێن دەلّێن: (هەی تۆڕی) لەوەوە هاتبێ .

[1]نیکۆلا میکافیلی- الآمیر-ص114

*لەسالی 1923 بۆ یەکەم جار لینین مەکتەبی سیاسی داهێنا

المؤمنون الأحزاب..))، به‌شێوه‌یه‌ك (حزب الله) ئه‌و كۆمه‌ڵه خه‌ڵكه و ئه‌و حزبه سیاسیه‌یه كه به‌رنامه‌ی په‌یام بوه ، حزبی شه‌یتانیش ئه‌و حزبانه‌ن كه له به‌رنامه‌كانیان (حه‌ڵاڵ و حرام)ی ده‌ستكردی ئاده‌میزادی تێدایه‌و ڕاسته‌وخۆ یاناڕاسته‌وخۆ ناگه‌ڕێته‌وه سه‌ر په‌یام، یان به‌ساده‌تر بڵێین، هه‌ره چاكه‌كانیان هاوبه‌ش(شریك) بۆ شه‌ریعه‌ت په‌یدا ده‌كات و شه‌ریعه‌تی لا تاكه سه‌رچاوه نیه، به‌و شێوه‌یه حزبایه‌تی مێژووی كۆنتری پێده‌درێ، به‌شێكی تر بزوتنه‌وه‌ی ماسۆنی و یانه‌كانی به كۆنترین حزب پۆلین ده‌كه‌ن[1]، زیاتر ڕه‌گ وریشه‌ی ئاینی هه‌یه، بۆیه به‌رده‌وام به چالاكیه كانی (ته‌بشیری )و ماسونیه‌تیشووتراوه حزبایه‌تی، به‌شێكی تر (فریسین)و(صدوقین)كه‌له‌دژی بانگه‌وازی مه‌سیحیه‌ت بوون به حزب ناوی ده‌به‌ن،ئه‌و كۆمه‌ڵه‌یه‌ی فیساگۆرس له ئیتالیای كۆندروستی كرد[2] ئه‌ویش نزیكه له حزب .

به هه‌رحاڵ ئه‌گه‌رمێژووی یه‌كه‌م حزبیش له ئه‌ورپا نه‌بێت، سه‌رهه‌ڵدانی عه‌لمانیه‌ت و حزبه فاشی و نازی و میكاڤیلیه‌كان له‌وێ هاتوون، له‌هه‌مان كاتدا حزبه دیمكراسی و سۆشیالیستی و شیوعیه‌كانیش هه‌ر له‌وێ هاتوون.

به‌و ماناو پێناسه نوێیه‌ی، یه‌كه‌م حزبی كاریگه‌ری عه‌لمانی به‌بۆنه‌ی 100ساڵی شۆڕشی فرنسی له 1889/7/14 دروست بووه له جیهانی ئیسلامی به‌ناوی (اتحاد التعالي والترقي)[**]،كه‌چی هه‌ریه‌كه له حزبی ئومه‌ی میسری 1907، حزبی تونس **الفتاة**له 1908 و حزبی احرار به یه‌كه‌م حزب دانراون له‌لایه‌ن فه‌رهه‌نگه‌كانی وه‌ك (موسوعة العربية العالمية) و (موسوعة العربية الميسرة).

به‌پێی (موسوعة العربية العالمية)یه‌كه‌م حزبیش له‌عێراق، (حزب الحر العراقي 1922)بووه.. به‌ڵام ئه‌و فه‌رهه‌نگانه زیاتر مه‌به‌ستیان حزبی ره‌سمی بووه، ئه‌گینا پێش ئه‌و مێژوانه حزبی تر هه‌بووه، یه‌كه‌م بزوتنه‌وه‌ی سیاسی له ژێر په‌رده (علم السوريه)بووه له 1857، له‌عێراقیش (حزبی نه‌هزه‌ی) له ساڵه‌كانی 1918 دروست بووه، دژی داگیركاریبریتانی به‌ناوه‌رۆكێكی ئیسلامی، له پێش ئه‌و میزووه‌ش حزبی تری وه‌ك حزبی

---

[1]هه‌ندێ سه‌رچاوه شای ڕۆمان هیرۆدۆس ئه‌كریا له 44پ زبه‌و دامه‌زرێنه‌ره ده‌زانن.

[2]الموسوعة الفلسفية ص 353.

[**]هه‌رچه‌نده (عوسمانی لاو) له 1865 دروست بووه،به‌ڵام ئه‌وه حزب وبزوتنه‌وه‌ی سیاسی نه‌بووه، زیاتر معاره‌زه‌و چاكسازه‌كانی عوسمانی بووینه، دوای اتحاد الترقی لێدروست بوو .

ئیسلامی بە سەروکایەتی **محمد** داغستانیوحزبیکی ئیسلامی تر لە سلیمانی لەگـەڵ شـیخ **محمود** بووە، جگە لە حزبی (یەکێتی **محمد**)ی —نورسی .

بەڵام لە قوناغی نویدا چەند کاریگەریـەکی تـری سـەرەکی هەیـە بـو سـەر هەڵـدانی حزبایەتی لە کوردستان، بو بەشی داهاتوو .

# بەشی دووەم

## گەشەی مەینەتی کورد- کاریگەرییە سیاسییەکانی

## 2- 1 سەرەتای مەینەتی

بەڕاستکردنەوەی چەند تێگەیشتنێکی هەڵە دەست پێدەکەین، باوی وەرگرتووە زۆربەمان واتێگەیشتوون کە کورد چەندین سەدە و بگرە هەزاران ساڵە دەچەوسێتەوە .

ئەو نەوانەی دوای سەدەی بیستەمی (دابەش و داگیری کوردستان)ئاوا یان کوردستان بینیوە و بۆ یە بە هەلە دەچن، بەڵام گرفت لەوەیە بەشی هەرەزۆری نووسەر و سیاسەتمەدار و مێژوونووسانیشمان لە سەرەتای لێدوان و نووسینەکانیان لەبارەی کێشەی کورد بەو بۆچوونە چەواشەیە دەست پێدەکەن، بەشێك لەوانە وەك توێژینەوەی زانستی لێی بەهەڵەدا چووینە لەژێر کاریگەری خەستی سەردەمی ئێستا، بەشەکی تر بە پاڵنەرێکی ئایدیۆلۆجی وای بۆدەچێ، گوێ ناداتە ڕاستی و ناڕاستی ئاخۆ سەرنجامەکانی چییە و لەخزمەت کێ دەبێ. مەزنترین خزمەت بە داگیرکەران دەکا و پاکانەشە بۆ داگرکردنەکانیان. مادام کورد هەزاران ساڵ بێت هەروا ژێردەستە و داگیرکراو بێت، کەواتە:

1- وڵاتانی داگیرکەر و نەتەوەکانی سەردەست چ تاوانیان نیە و مافی کوردیان زەوت نەکردووە، مێژووی کوردی بە چارەڕەشی و ژێردەست نووسیوە،هە روەك سەرۆکی فرنسی لەو بۆچوونە جەوتە را ووتی :ئەوە مێژووە زوڵمی لە کورد کردووە نەك ئیمە!!

2- ئەو بۆچوونە زۆر سەرەنجامی تریشی هەیە، لە هەمووی گرنگتر مانایەك بۆ خەباتی کوردایەتی نامێنێ و ئەو خوێن و ئارەق و فرمێسك ڕشتنە.. بۆچی؟

3- جۆرە (عەبەسیەك) دەبێتە پەیڕەو، ئیتر ناهەقی نووسەری کتێبی (سەگوەڕ)[1] نەبووە کە شۆڕشی کوردایەتی بە سەگوەڕین لەقەڵەم دابوو لە ساڵی 1982، کە نووسەر خۆشی پێشمەرگە بوو.

4- مانای وایە هەموو ئەو سەرچاوانەی کوردیان بە (قورەیش العجم )و ناوبانگی بەرگری وکەڵە پیاوی ...هەمووی هەڵەیە بەڵکوو کورد میللەتیکی بێ غیرەت وریسواو مل کەچ بووە ...

راستیەکەی وانیە، نەك کورد، هیچ چەوسانەوەو کێشەیەکی (نەتەوایەتی) لەپێش سەدەی (19) لەو جیهانە نەبووە، سەرنج بدەهەتا عەرەبیش کە زیاتر دەمارگیری نەتەوەگەریان لە میللەتانی تر هەبووەو هەیە، کەچی مێژوونووس و جیهان بینە نەتەوەگەریەکانی وەك (ساطع العصري،محمد عزة دروزة، بطرس بستاني، میشیل عفلق..) شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی عەرەبیان هەتا چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمیش بە نەتەوەیی لەقەڵەم نەداوە.

هەریەکە لە شۆڕشی ئەمریکی 1776و فەڕنسی 1789، هەڵمەتەکانی ناپلیۆن، تەقەلاکانی بسمارك بۆ یەکخستنەوەی ئەڵمانیالە1871، مازینی لە 1872 بۆ ئیتالیا ،دروست بوونی هەندێ دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپا، جەنگی جیهانی یەکەم1914- 1918،، ( 14)بنەماکانیویلسۆنلە1918، شۆڕشی ئۆکتۆبەر1917، بەڵێنەکانی جۆرج،و داننانی خیلافەتی عوسمانی(نەك تورانیەکان) بە سەربەخۆیی گەلان.. لەگەڵ زۆر ڕووداوی تر کاریگەریان بەرەبەرە دروست کردبوو لەسەر بیری نەتەوەگەری لەنێو توێژی ڕەوشەنبیرانی جیهانی، هەرچی لەجیهانی ئیسلامیە تا ئینقلابە تۆرانیەکەی 1908 لەدژی خیلافەت و بانگێشەی تورکایەتیان نەکرد،ئینجا نەتەوەکانی تریش لێیان بەئاگا هاتنەوە، کەواتە لەپێش ئەو مێژووە بیری نەتەوەیی و خەبات لەپێناویدا نەبووە، حزبی نەتەوەیی و دەوڵەت و ئیمپراتۆریەت و ڕاپەڕینیش بۆ ئەو مەبەستە نەبووە، هەتا سەدەی (19) لەئەوروپا و سەرەتا سەدەی بیستەمیش لە جیهانی ئیسلامیدا، لەگەڵ چەند دیاردەیەکی مێژوویی تر پێکەوە سەریان هەڵدا لەوانە:

---

[1]لە بنەچەدا لە پرۆتۆکۆلی ژ:19ی (بروتوکولات حکماء الصهیون)شۆرش بە سەگوەڕ واهاتوە:ان الثورة لیس أکثر من نباح کلب علی فیل، ففي الحکومة المنظمة تنظیماً حسناً من وجهة النظر الاجتماعیة لا من وجهة النظر إلی بولیسها، ینبح الکلب علی الفیل ...

عەلمانیەت،نەتەوەگەری، دەوڵەتی هاوچەرخ، حزب، کۆماری، پێشەسازی،...لەگەڵ زۆر دیاردەی تری سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانی تر، هەموو ئەوانە لەڕەگ و ڕیشەدا بۆ ڕێکەوتنی وێستیڤالیا 1648 دەگێڕنەوە.

کوردیش لەپێش سەدەی بیستەم نە بەناوی کورد و کوردستان کێشەی هەبووە، نە بەو ناوەشی چەوساوەتەوە، نە سەرکردە و میرنشین ودەوڵەت و ئەیوبییەکانیش بەناوی کوردایەتی بووینە، سەرەتای مێژووی کێشەی نەتەوایەتی، کوردایەتی، مێژووی سیاسی کورد، سەرکردایەتی کورد، حزبی کوردی، ئامانجی کوردستانی..، بۆ دوای ساڵانی 1908 دەگێڕنەوە کە فکری عەلمانی نەتەوەگەری زاڵ بوو بەسەر بیری عوسمانلی لە خیلافەتدا[1]،بەپێی (میر جەلادەت خان )تا پاش جەنگی جیهانی یەکەم ئینجا زاراوەی وەك کوردستان باشوروکوردستانی رۆژئاوا ..بەکارهێنران[2] .

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە : أ- کورد و کوردستان، محمد امین زکی بەگ، ب- کورد وکوردستان فی الوثائقالبریطانیة... لەگەڵ زۆر سەرچاوەی تر.بۆ زیاتر دڵنیا بوون بڕوانە ئەو بەڵگەنامەیەی وەزارەتی دەرەوەی بریتانی کە بۆ یەکەم جارە بڵاوی دەکەینەوە دەری دەخا تا ئەو مێژووە باسی کوردایەتی نەبووە : FO 195/2317ملحق في تقرير السيد هيرد، 3 كانون الثاني1909

أقام النادي الكردي في الجامع الكبير حفلا كبيرا وذات مراسيم عديدة.حضر الحفل كل الدراويش في المدينة. فحال وصول الدراويش الىالمسجد يؤدون قسم الولاء للسلطانعبد الحميد والشريعة.كما قدم الواليخطبة قصيرة وعزفت الفرقة الموسيقية العسكرية قطعامختارة.ومن ثم تم التوقيع على وثيقة الولاء للسلطان والشريعةالمحمدية من قبل 3000شخص من الحضور. ولأجل إعطاءهذه الوثيقة الجدية والمصداقية دعى النادي الكردجميع الاغواتوالشيوخ في الولاية لهذا اللقاء.وكان عدد الحاضرون يتجاوز 10آلاف شخصا...أن لهذا الاجتماع مغزى واضحا وهو ان الناديالكردي أقوى بكثير من فرع الاتحاد والترقي في ديار بكرالذيبدأيفقد الكثير من اتباعها هنا.وفي الخامس من هذا الشهر غادر حاجي مقصود بيك دياربكر متوجها الى مكة، وحسب المعلومات الموجودة عند روجسيدشيان، هناك مؤتمر تعقد هناك لنقبتءء الاشراف في الامبراطورية العثمانية لمناقشة الاوضاع الجديدة في الدولة العثمانية. وحسب رأي روجسيدشيان دروغومان( مترجم- القنصل الرسمي) أن النمو الكبير للحركة الكرديةمؤخرا يعود الىعدم تحمس الكرد للنظام الجديد. وان سببذلك يعود الى المرارة الكبيرة التي سببتهالهم القانون المدني المطبق هنا. ليس هناك أي شك بأن الترويج للشريعة يرضي أكثرية الجماهير الكردية الجاهلة. يقول أعضاء النادي الكردي هنا بأنهم استلموا توجيهات من الفرع الرئيسي فب القيادة في استنبولبأقامة علاقات ايجابية مع النصارى. ولكن التوجه الاسلامي المحافظ للنادي لا يساعد على اقامة علاقات من هذا النوع.

لم يتمبعد استدعاء الدفتردار من ويرانشهر الذي لم يقم لحد الان بتوزيع الحبوب والمواد العذائية للمتضوريين جوعا هنا. وقد قام مترجم القنصل بالفات نظر الوالي الى هذه المسألة ووعد الاخير بأرسال الاوامر الصارمة للدفتردار بتوزيع تلك الاعانات للمحتاجين. فقبل ان أغادر طمئنني الوالي بأن المعلومات التي أرسلت الى الدفتردار واضحة وصريحة وطلب مني ان أعلمكم بذلك. وكما أشتكى

راستە چەوساندنەوە و پەلامار و داگیرکردن و مـاف زەوت کـردن هـەبووە لـە هـەموو جیهان، بە هەموو ئاراستەو ئاراستەیەکی پێچەوانە، بـەزۆری تیـژی بنەماڵـەی بنچـینەی بووە لە کێشەکان، جار جار بە پاڵپشتی ئاینی کلاسیکیش، بۆیە زۆربـەی ئیمپراتۆرەکـان یان بەناوی بنەماڵە یان بەناوی زێد(مسقط رأس) ناوبانگ و ناسنامەیان دەڕۆیشت.

سەرەڕای سەلبیات و ئیجابیاتیانبەڵام ئەمەوی و عەباسی بەناوی عەرەبی[2] و لـەپێناو عەرەبایەتی نەبووە، هەروەك عوسمـانلی بـەناوی تـورك و لـەپێناوی تورکایـەتی نـەبووە، ئاواش ئەیووبی بەناوی کورد و لەپێناوی کوردایەتی نەبووە و نەدەشیا ببێ، ئەو وولاتانەی عـەرەب و تورکیـای ئیسـتا زادەی ئەمـەوی عەباسـی و عوسمـانی نـین، وەك روونـە

---

سعادة الوالي وبقوة عن تصرفات هذا المسؤول الحكومي الفاقد لكل القيم. وعبر سعادة الوالي عن اسفه لعدم قدرته على احالته الى محكمة رغم وجود الادلة ضده لآن الدفتردار تعين هنا من قبل الساطة المركزية في اسنتنبول.. وهناك احتمال طاتما بقي الدفتردار فيقوم بأعاقة توزيع الحبوب والاعانات. وبما ان موسم نشر بذور الحنطة قد مضى فيعني ذلك بقاء معظم الاراضي الزراعية في ويرانشهر غير مزروعة هذا العام. وهذا مما يعقد ويضاعف مهمة لجان الاغاثة والاعانات في السنة القادمة. هذا لو فرضنا فعلا قيام الحكومة بتوزيع الاعانات. علما ان قسما من الثروة الحيوانية ستموت في الشتاء وستتعرض قسما آخر للسلب والنهب.

كما الحق السيد روجسيديان نسخة من التقرير الموجه من وزير الحربية الى الفريق (مشير) نائب القائد العسكري في الولاية. والى نائب الوالي المؤرخ في 12 |كانون الثاني |1908 والتي وعدت فيها الحكومة الف ليرة عثمانية لكل من يستطيع القاء القبض على ابراهيم باشا المللي.كما نصت البرقية المذكورة على اعلان العفو العام لآنصار ابراهيم باشا الذين يقومون بتسليم أنفسهم وأسلحتهم للحكومة. ولكن لا يبدو هناك فرق واضح بين القبائل المساندة للتمرد والقبائل الغير المساندة له. وفي الحقيقة عانت القبائل الغير المساندة للتمرد الكثير لآنها لم تكن تملك السلاح للدفاع عن نفسها. وعرض السيد روجردشيان نسخة من التقرير الذي ادعى بأنه لم يره منه من قبل رغم أنه سمع عن التقرير من قبل. وعلق قالا "ان هناك عدة وثائقمن هذا القبيل التي لم استطيع لحد الان رؤيتها ومن الممكن انها سرقت أو ضاعت."وضع عبدالكريم بيك، رئيس عشيرة ميران ورئيس فصيلة القوة الحميدية في تلك العشيرة رهن الاعتقال وهو موجود حاليا في الثكنة العسكرية. وبما ان لعبد الكريم الكثير من الاعداء والقليل من الاصدقاء، فأنه من المتوقع ان يلق أشد العقوبات كجزاء لجرائمه الكثيرة.

المخلصدبليو. ب. هيرد

[1] بروانە :گۆڤاری مێژوو—ژ:2ل412

[2] زۆر جار باس لە هەردوو زاراوەی(موالی وشعوبی) دەکـرێ وەك بنچـینەی نەتەوەگـەری بـۆ عـەرەب وعروبیایەتی، بەڵام ئیبن خەلدوون ئەو مەسەلانەی یەك لا کردۆتەوە و دەڵێ ڕەگەزپەرستیەکەی ئەمەوی بۆ خێڵەکی قوڕەیش بوو نەك عەرەبیایەتی، ڕەنگە ئەو تیۆرەی ئیستاش لە ناو فقهی ئیسـلامی مـاوە کە دەڵی قورەیش لەلای خواوە بەرزترن لە خەڵکی ترکاریگەری ئەو سەردەم بێت، چـونکە کاریگـەری ئەدەبیاتی ئەمەوی تا ئەو ساتەش لە ناو فیقهەوە ماوەو زۆر سەلبیشە مەگەم زانایەکی ئاینی بە هێز ئەگینا کەمتر هەستی پێ دەکەن وا دەزانن بەشێکە لە شریعەت!

هەمووئەوانە لەلایەن رۆژئاواوە بۆیان دروست کراوەبە پێی سیستەمی ئینتـداب، هەرچـی تورکیاشە بە پێی بنەمای(10 و12)ی چواردە خالەکەی ویلسونی 1918[1] و دوای لـە کۆنگرەی سیڤەرهەرە دوایـش بـەپێی مەرجـەکانی لـوزانی 1923 دروسـت بـووە نـەك لەعوسمانی بەڵکو لەدژی عوسمانی دروستبووە، ئیتر ئێستا نابێ عەرەب و تورك و کـورد و غەجەر و باسك و بەربەر... گلەیی لە مێژوویان بکەن و بە واقعـی ئێسـتایان دادگارییـان بکەن، چەند هەڵەیە.

هەروەك هەڵەشە ئەگەر نەوەی عەولەمی داهاتوو ئێمـە دادگـایی بکـەن بڵـێن ئەوانـە عەولەمی نەبووینە و هەر خەریکی نەتەوەگەری تەسکی نەفامی بووینە.

ئەو قۆناغانە (بە نەبوونی بەرنامەیەکی ئاسۆیی ڕاست و دروست) مێژوو دەیانهێنێتـە بەرهەم، ئەو نەوانـەی زادەی ئەوقۆناغانـەن کـەمتر لێـی بەرپرسـیارن، کەواتـە ئـەوکاتی سەردەم سەردەمی سیستەمی دەسەڵاتی بنەماڵەیی بـووە بـەناوی ئیمپراتۆریـەت بـە دوو نیشانە:

1- پیرۆزیایەتی ئیمپراتۆر[2].

2- میراتی دەسەڵات.

3- نەبوونی پەیوەنـدی لـە نێوانیشـتمان ونەتـەوەو دەسـەڵاتبۆیە زور ئاسـایی بـوو ئەسکەندەریمەکدونی حوکمی بابـل بکـا، صـلاح الـدینی کـورد حـوکمی میسـر بکـا، عوسمانی حوکمی ئەوروپا بکا، کەلە دوای لەسەردەمی نەتەوەگەریەتی دەوڵەتی هاوچـەرخ هەریەکە لە هەرێم(نیشـتمان) وگەل(نەتـەوە)و دەسـەڵات بوونـە سـێ کۆڵەگـەی یاسـایی بۆدروست بوونی دەوڵەت بە پێی (قانون الدولی )ئیتر هیچ گەلێك حوکمی گەلێکی تر ناکا و نەقانونی نە سیاسی قەبوول ناکریو بە داگیرکەر دەژمیرریت.

سیسـتەمی ئیمپراتـوری هـیچ تەرازوویـەکی سیاسـی و بڕوایـی و کۆمەڵایـەتی و ڕەگەزی... نەبووە، جگە لە (کێ لامە و کێ دژمە)، ئیتر ئەو بنەمایانە جـار وایـە- لـە سەلبیاتەکانیدا - خودی بنەماڵەی ئیمپراتۆریشی گرتۆتەوە، پێچەوانەش بە پێچـەوانەوە، جۆر و چەوساندنەوەکانی ئەو سەردەم (بێجگە لـە دەسـەڵاتی سیاسـیش) بـەو دابەشـیانە دەهاتـە دی: دەسـەڵات و بێدەسـەڵات، دەوڵەمەنـد و هـەژار، ڕەش و سـپی، ئەسـڵی و

[1]بروانە دەقی بنەماکانی ودرۆ ویلسن.

[2]ئیمپراتۆر وشەیەکی یۆنانی کۆنە یەکەم جار ڕۆمانەکان بەکاریان هێناوە بەناوی (سەرکردە).

غەوارە، زۆر و کەم، پیاو و ژن، بێگانە و خۆماڵی، هاوکاری دەسەڵات و رکەبەران، ئاینی سەردەستە و ژێردەستە، بنەماڵەی گەورەو بچووك، خێڵ و هۆزی گەورە و بچووك، شێخ و مسکێن، کارکەر و خاوەن کار،... بەڵام دابەشی سیاسی نەتەوایەتی تیا نەبووە هەتا قۆناغی خۆی هات، بەو شێوەیە ئەگەر خەلیفە و سوڵتان و والیەکانیش هەمووی پیاوچاك نەبووبن و خەڵکیان چەوساندبێتەوە لە عەرەب و تورك و کورد و ئەلبان و چەرکەش و... ئەوا بەناوی نەتەوەیی هەرگیز نەبووە، دەبێ پسپۆڕان بەوردی ناسنامەی دیاردە مێژووییەکان دەستنیشان بکەن، تێکەڵی یەکی نەکەن، خیلافەتی عوسمانلی جیایە و حوکمی ئیتیحادی و کەمالی و تۆرانیە عەلمانیەکان جیایە، بنەمای ئیسلامی جیایە و بانگێشە تورکایەتی و عەرەبایەتی جیایە.. عبدالحمید جیایە و مستەفا کەمال جیایە، هەتا سوارەی حەمیدی سەردەمی عبدالحمید و سەردەمی ئیتحادیەکان لێك جیان کە بە دەگمەن لێك جیاکرایتەوە، کەچی لە هەموو ڕووەکانی بڕوایی، کۆمەڵایەتی، پاڵنەرەکان، ئامانجەکان، بەکارهێنەرەکانیان، سەرکردەکانیان، هەتا ناویشیان لێك جیابووە، بەشی دوایی بەناوی سوارەی حمیدی نەبووە بەناوی (افواج خفیفە) بوو، ئەو (افواج)ەی سەردەمی بەعس لەناو کوردان لەو ناوە هاتبوو، بەداخەوە نووسەرانی عەلمانی کورد وا بەوردی ئەو دیاردە مێژووییانەیان لێك جیانەکردۆتەوەو، بۆیە تائێستاش سەرکردایەتی کورد بەوردی ناحەزی خۆی پێ دەستنیشاننەکراوە، نە دەروازەکانی ڕزگاریشی پێ دۆزراوەتەوە نە خاوەن ستراتیژیەتیشە.

سەرنج بدە لە گوڵانی (ژ:268 ) بەپێنووسی (سلام عبداللە- کە وەزیرێکی حکومەتی هەرێم بوو)، لە وەسفی (مستەفا کەمال)دا دەڵێ: تورکیای لە تاریکی گواستەوە بۆ ڕووناکی!

## 2 -2 مەینەتی دابەش و داگیری کوردستان:

بەشی زۆری نووسەر و مێژوونووسانمان و هەتا لە پرۆگرامی خوێندنی باڵای ئێستای کوردستانیش بە دەروازەیەکی زۆر چەوت دێنە ناو باسی کێشەی سیاسی کورد، یەکەم دابەشی سیاسی کوردستان بۆ جەنگی چالدێرانی نێوان عوسمانلی و سەفەویساڵی 1514ز دەگێڕێتەوە، دەبنەوە پشتیوانێکی ئەو بۆچوونە چەوتەی کە لەسەرەوە

باسکرا،لە سیستەمی ئیمپراتۆرەکان (لەوانـەش میرنشـینە کوردیـەکان و ئەیوبیـەکان..) سنوری نەتەوەیی و جوگرافی و ڕەسمیان نـەبووە، هەڵبەتـە هـەتا توانـای فـراوان بوونیـان هەبووبێ پێشڕەویان کردووە، لە شوێنیك وەستاون کە چیتر نەیانتوانیوەبچنە پـێش، ئـەوە سیفەتی ئیمپراتۆریەکان بووە، سنوریان لەژێر پێی دواسـەربازیان بـووە، ئینجـا چـالدێران جەنگێك بوو بە درێژایی بەیەککگەیشتنی عوسمانلی و سەفەوی لە کەنداوی فارسـەوە هـەتا دەریای قەزوین، لەو جەنگەدا تورکمان و فارس و عەرەبیش دابەش بوون، کـوا ئـەو کاتـە تورکمان هەبووە نەك هەر کورد.

دوای چەند جاری تر نەخشەی ئەو ناوچانە بەپێی توانای ئیمپراتۆریەکان گۆڕاوە، ڕەنگە مێژووی 1852/8/29 ڕاستتر بێت، کاتێ گەشتی لیژنەی هاوبەشی ئێرانـی عوسمـانی ڕوسـی بـەریتانی لـە کەنـداوی فارسـەوە دەسـتی پێکـرد هـەتا سـەرووی ئـەرارات بـۆ دەستنیشانکردنی سنوری نێوانیان و مۆرکردنی ڕێککەوتن، یان ڕێکەوتنەکـەی 1823ی نێوانیان کە بە ڕێکەوتنی ئەرزرۆم ناسرا.[1]

خۆ لەساڵی 1905 عوسمانلی ناوچـەی کوردسـتانی ئێرانـی هـەموو گرتـەوە، واتـە لەپاش و پێشچالدێران کوردستان دابەشکرایەو یەکی گرتۆتـەوە و بـە ئاراسـتەی جیاجیـا وەك میللەتانی تری جیهان، جا بۆ ئەو چـالدێرانە بوویتـە سـەرەتای مەینـەت و دابەشـی کوردستان، (تۆماس بوا) لە کتێبی بەناوبانگی (تأریخ الاکـراد) لـە ل191- 193 زۆر دووره لەو بۆچوونە و دەڵێ: لەدوای چالدێرانیش کورد لـەبارێکی دەسـەڵاتداری زۆر چـاك بووینە، چـەندیندەوڵەت و ئیمـارەتی بـەهێز و سـەربەخۆ و سـوپا و ئەنجومـەن و سـکەی تایبەتیشیان هەبووە، نیشانەی هەرەگەورەی سەربەخۆییان ئەوە بـووە وەك (تۆمـاس بـوا) دەڵێ، لەجیاتی (خەلیفە) دوعا بۆ (میر)ی کورد دەکرالە گوتاری ئـایینی هەینیـدا، ئـەو ڕاستیە زۆربەی مێژوونووسە بیانی و کۆنەکانی ئیسلامی و کـوردی دووپـاتی دەکەنـەوە، هەموو عەرەب 63 میرنشین ودەوڵەتیان هەبووە لەدوای ئیسلام بوون کەچی کـورد 64ی هەبووە[2]، ئەو بارودۆخە سـەربەخۆییەی کـورد بـەردەوام بـوو هـەتا سـەرووبەری دارمـانی

[1]کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی، جەلیلی جەلیل، ل254- 258.

[2]لەو بارەیەوە **ئەسیری** دەڵێت:

باسی ئەحوالی وولاتی ئەمریکا بۆ دەکەی

باسی مازی وحال وئیستقبالی سۆرانی بڵێ

چەند حوکمدارت لەبەدلیس وبۆتان بووە

خیلافەت و سەرهەڵدانی بەرەبەرەی فکری نەتەوەگەری وعەلمانی لەنێو عوسمانیدا، کە لـە سەرەتای سەدەی (19) دەست پێدەکا بەناوی (چاکسازی)، لـە سـاڵانی 1865 زیـاتر ئاشکرا بوو بە دروستکردنی (کۆمەڵەی تورکی لاو- جوان تورك)ی عەلمانی ودوای دروست بوونی (إتحاد الترقی )لە 1889ز لەیادی 100سالەی شورشی فرنسیدا، ئینجـا گرتنـە دەسەلاتییان لـە سـاڵی 1908 و تـا لـە سـاڵی 1924 بـە یـەکاری خیلافەتیشـیان هەڵوەشاندەوەو لەجێیدا کۆماری عەلمانی تورکیان دروسـت کـرد بـە ڕابەرایـەتی کـەمال ئەتاتۆرك.

کەواتە ئەو مێژوەی دابەشی کورد لە چالدێران هەڵەیـە، بـەڵکو ڕاسـتیەکەی ئەوەیـە کورد و کوردستان لە ڕێکەوتنەکەی سایکس- پیکۆ 1916 دابەشکرا، دوای لەکۆنگرەی قاهیرەی1921و لوزانی 1923 پەیرەو کراو دابەش کرا .لەگەڵ نەخشەکەی ئـەتاتورك تێکی کـردەوەو کـوردیش کەوتـە ژێردەسـتە و مەینـەتی، ئـەوەی دەیـەوێ بـەوردی لـە بناغەکانی کێشەی کوردی بگات، با لەو نێوانە بەخەسـتی بکۆڵێنـەوە، وەلامـی هـەموو پرسیارە نەمرەکانی دەست دەکـەوێ، بـەڕوونی دەردەکـەوێ کـە سـەرکەوتنی عەلمانیـەت بەسەر خیلافەت گورزێکی کوشندە بوو هەم لە ئیسلام و هەم لە میللەتی کوردیش، بۆیـە بە سروشتی خۆی کێشەی کورد دەبێتە کێشەیەکی ناوەروك ئیسـلامی مـادام دژەکـانی و دۆستەکانیان، ڕێگا و ئامڕازەکانیان، دەروازە و کلیلەکانی، خاڵی لاواز و بەهێزیان، یـەك کلیل و یەك چارەنووسە،هەر بۆیەش بەدەگمەن میللەتێکی ترنیە ئەوەندە لایەنە نیشتمانی و نەتەوەییە دڵسۆزەکانی و ئیسلامیەکانی کوردستان لێك نزیك بن ئەگەر بزانن، لەکاتێکا ئەو لێك نزیکیـە بـەو پلەیـە لـەنێوان نەتەوەگەریـە تورکـەکان و ئیسـلامیەکانیان نیـە، هەروەها لەنێوان عەرەبە نەتەوەگەری و ئیسلامیەکانی ئەوانیش نیە.

زیاتر بۆ ئەو مەبەستە چەند خـاڵێکی بـەراوردی خێـرا لـەنێوان بـاری سیاسـی کـورد لەپێشخیلافەت و دوای خیلافەت هەڵدەبژێرین، یان بە مانایەکی تر باری سیاسی کورد لە سەردەمی خیلافەت و لە سەردەمی عەلمانیەت.

---

گەر بەوە عیلمت نیە پاشای بابان بڵێ
هەروەها **حاجی قادر** دەڵێ :
کوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازاد وسەربەخۆ بوون
سولتانی مولك ومیللەت صاحێبی جەیش و عیرفان

## 2- 3 کورد لە پێش و پاش خیلافەتدا

هـیچ گومـانی نیـە جـاران کـوردیش وەك میللـەتانی تـر پڕوشـکی زۆرداریـەکانی پێگەیشتووە، لەوانەش لەلایەن هەندێ سـوڵتان و مـیر و خەلیفـە و والی بـەدکار، بـەڵام ئەوەی نەگۆڕە ئەوەیە ئەو زۆرداریانە نەتەوەیی نەبووینە، بەو مانایەی نەتەوەی سەردەست نەتەوەی بن دەست بچەوسێنێتەوە، مێژوونووسانی بیـانی و ئیسـلامی و کـوردی و هـەتا پسپۆڕانی سەردەمیش کۆکن کە بەشی هەرەزۆری پانتایی مێـژووی خیلافـەتی ئیسـلامی (بەهەموو سەلبیاتەکانیشیەوە) وا ڕەخساوە کە کوردەکان لە ناوچەکانی خۆیان باڵادەسـت و سەربەخۆ بووبن و گەلی جـاریش دەسـەڵاتیان بـۆ دەرەوەی کوردسـتانیش جـووە، شـێخ الاسلامی عوسمانلی (خواجە سەعەدین) لە (تاج التواریخ) دەڵێ: ((کورد هـەر سـەربەخۆ بووینە، ئەگەر ئـەو کێشـە ناوخۆییـەیان نەبوایـە ئـەوا فـارس و هـەموو جیهـان لێیـان دەترسـا))، لـە شـەرەفنامە ولـەزۆر سەرچـاوەی تـرو بەڵگـە نامـەکانی بەریتانیباسـی مـۆرکردنی ڕێکەوتننامـەی شـیخ ئیدریسـی بەدلیسـی وسـوڵتان سـەلیمی یەکـەم لەسـالی1514لەگـەڵ عوسمـانلی دەکا،دووئـەنجامی گرنگیلـی هاتـە دی:1- بەهۆیەوەبەغـداو قـاهیرە گـیرا لەلایـەن عوسمـانی و هێزەکـانی کـوردی و بـووە هۆیگواستنەوەی خیلافەتو بەیعەت لە(المتوکل علی الله) بۆسولتان سلیم ئیتر عوسمانی لە سەلتەنەتەوە گواسترایەوە بۆ خیلافەت .2- بەهۆی هەمان ڕێکەوتن سیستەمی ویلایـات بەرقەرار بوو،ئیتر کورد هەر خاوەنی دەسەڵاتبووە.

لە نووسینەکانیمحمد امین زکی بەگ هـاتووە: ((حکومـەتی عوسمـانی بـە واسـیتەی دامەزراندنی بەعزێ حکومەتی محەلی قەومی کوردی بە تەواوی لەخۆی ڕازی کردبـوو))[1]، (تۆماس بوا)ش دەڵێ: ((بەدرێژایی تەمەنی خیلافەت کوردەکان سەربەخۆ بووینـە، جگـە لە هەندێ دۆخی تایبەتی و هێرشەکانی دەرەکی نەبێ))[2].ئەو دۆخانەش ئـاوا لـە کتێبـی (الملل والنحل والاعراق) ل271 باس کراوە: ((فقد اکتفی معظم خلفاء في دولتين الأموية والعباسية الولاء من القبائل الكردية دون ممارسة حكم المباشر عليهم))،زیاتر لـەوە دەڵـێ زیاتر لە 13 سەدە بوو کوردستان هەرێمێکی ئـازادو سـەربەخۆو یەکپارچـە بـوو تـا لـە

---

[1]محمد امین زکی بەگ- خولاسەی تاریخی کوردو کوردستان ل161

[2]توماس بوا- تاريخ الأكراد ص191-193

ڕێکەوتنی سایکس پیکۆ دابەش کرا ،کەواتە ئەو ڕێکەوتنامەی کوردو سولتان درێژەی هەبووەو کوردیش قازانجی لێ کردووە هەروەك لەڕاپۆرتی بەریتانی –کۆلۆنیل ئیفلینستۆن هاتووە ودەڵێ‌ئەو ڕێکەوتنەی کوردو عوسمانی تا ساڵی 1826ی‌خایاند وە بووە هۆی دروست بوونی 11 ئیمارەتی تر[1].

هەموو ئەوانە و زۆر زانیاری تریش لەگەڵ شایەدی‌یەکەی ( دکتۆری بەیتار نوری دەرسیمی) تێك دەکاتەوە کە دەڵێ: ((بەدرێژایی مێژووی خیلافەتدەرسیم سەربەخۆ بووەو بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1936ز لەسەر دەستی (عەلمانی تورکی کەمالی) هاتن و داگیریان کرد))[2].

کەواتە لەدوای نیوەی سەدەی (19) تا 1908 لەوێش تا 1924 لەگەڵ سەردەمی خیلافەت لێك جیان،هەروەك شێخ سعید نەورەسی دەڵێ ئەو تاوان وچەوتیانەی ئیتحادیەکان دەیکەن ناکەوێتە ئەستۆی سوڵتان، دوعایەکی پشێمان بوونەوە لە خۆی دەکاو دەڵێ : ئەی سەعید ژەهری دیکتاتۆری عەلمانیەت بکێشە دژی سولتان قسەت دەکرد،بۆیە هەموو سبەینان هەڵدەستا دوعای بۆ سولتان عبدالحمید ووحیدالدین دەکرد [3]، ناکرێ هەمووی لەسەر خیلافەت حساب بکرێ بەتایبەتی لەدوای 1908.

بۆ زیاتر چەند بەراوردێکی خێرا لەنێوان باری سیاسی کورد لە سەردەمی خیلافەت و دوای هاتنی عەلمانیەت بەکورتی دەنووسینەوە:

1- کورد وەك میللەتێکی ڕەسەن لەگەڵ کاروانی میللەتانی ناوچەکە بوو ئەگەر لەپێش تریش نەبووبێ، بەڵام لەدوای خیلافەت لە کاروان بەجێما، میللەتان هەموو سەربەخۆ وبوونە خاوەن دەوڵەت کەچی کورد کەوتە ژێردەستان و گەلێ جار بەمێوان ژمێرراوە، هێندەی ستەملێکراوە ویژدانی بێ‌ویژدانانیشی هەژاندووە.

2- بەدرێژایی خیلافەت خاوەن میرنشینی بەهێز و مەزن بووینە و جار جار حوکمیان پەڕیتەوە بەغدا و شام و هەتا لبنانیش، جگە لە ئەیوبیەکان کە میسر و شام و لیبیا و یەمەن و ناوچەکانی نێوانیشیان حوکم کردووە، کورد لەبەر لێهاتوویی و دەسەڵاتیان بەپانتایی نیشتمانی ئیسلام لەجیهان سەرکردە و والییان لێ هەبووە، تا ئەو دواییەش لە

---

[1] کەمال مەزهەر- کوردوکوردستان لەبەلگەنامە نهێنیەکانی بەریتانی ل222

[2] دەرسیم لەمێژووی کوردستان، ل 15 .

[3] بڕوانە : الكورد والدولة العثمانية ص336- 337 هەروەها سيرة الذاتية لسعيد النورسی ص76

سسەردەمی حوکمی عبـدالرحمن بابـان والی بەغدلەلایەیـەن خـۆی دیـاری دەکـرا، بۆیـە ئێستاش لە هەموو جیهانی ئیسلامی بنەماڵەکانیان ماون، هەتا لە دواساتی خیلافەتیش کە بـە (نـەخۆش)[1] نـاوی ڕۆیشـتبوو، کەچـی سـەرۆکی ئەنجومـەنی دەوڵـەت، سـەرۆکی ئەنجومـەنی ئـەعیان، وەزیـری دەرەوە، هەریەکـە لـە (سـید عبـدالقادر شەمزینی،شـیخ عبیداللە، شەریف پاشا...) هەروەهاشیخ الاسلام کە دووەم دەسەڵات بووە لەدوای خەلیفە بەزۆری لەدەست سێ بنەماڵەی بەدلیسیەکان، حەیدەریەکان، ئامێدیەکان بووە.

بۆیە هەردەم ئیتیحادی و کەمالی و تۆرانیەکانی عەلمانی نەتەوەگەر گوتاری سیاسـیان لەدژی سوڵتان عبدالحمیـد و خیلافـەت لـەناو تورکـان ئـەوە بـووە کـە خیلافـەت لـەژێر کاریگەری و خزمەتی کوردانەو، نمونەیان بە (ابراهیم پاشا میللی)ی کـورد دەهێنـاوە کـە چۆن دەسەڵات و سامانی لە سەرووی خەلیفەشە.

کەچی لەدوای داڕمانی خیلافەت و سەردەمی عەلمانیەت، کوردستان پارچەپارچە کـراو ڕۆژی ڕەشی هات و هەر بەشی سوتان و وێران و... تا ئەنفال و کیمیایش.

3- بۆ یەکەمجار دیاردەی تەعریب، تەتریك[2] و ڕاگوازتنەوەی نەتـەوەیی، جینۆسـاید، قەدەغەکردنی زمـان،... بەسـەریدا سـەپێنرا،هەمان پـرۆژەی(ارض بلاشـعب لشـعب بـلا ارض-کـە لـەکۆنگرەی لنـدنی 1840درا بالمرسـتۆن )دژ بـەکورد پـەیڕەو کرا،بـۆ ئـەو مەبەستە لایەك لە نامەیەکی جمال عبدالناسربۆکندی سـەرۆکی ئـەمریکا بڵاودەکەینـەوە لەبارەی (بە یەهودی کرنی فلستین) زۆر وێچووی تەعریبی کوردستانە،لەنامەکە هاتوە:(قد اعطى من لایملك وعدا لمن لایستحق،ثم استطاع اثنان(من لایملك) و(مـن لایسـتحق)بالقوة والخدیعة ان یسلبا صاحب الحق الشرعی حقه فیما یملکه وفیما یستحقه)[3]، ئەو کوردسـتانە فراوانەی سەردەمی خیلافەت کەلە نزیك کەنداوی فارسی دەسـتی پـێدەکرد بـەخوار(جبل حمرین)- یان وەك ئیبن خەلدون بە جبل الاکراد ناوی بـردووە- بـەڕووباری فـرات بـەرەو دەریـای سـپی دەڕوا هـەتا ئـەنادۆڵ، لـەوێش بـەرەو ئـەرمینیا[4]، ئـەو نەخشـەیە هـەتا

---

[1] یەکەم کەس ناوی لە عوسمانی نا (رجل المریض- پیاوە نەخۆشەکە) نقولا قەیسەری روسی بوو .
[2] یەکەم پروسەی پاکتاوی رەگەزی لە لایەن أنور باشای(اتحاد الترقی )کرا.
[3] فلسطین فی الرسائل عبدالناصر وکندی ص22
[4] بۆ زیاتر لەو نەخشەیە بڕوانە (شەرەفنامە) ل117- 128، هەروەها سەرنجی نەخشەی کوردسـتان لە (شەرەفنامە) ل128، هەروەها کتێبی (کوردو کوردستان- محمد أمین زەکی بەگ).هەروەها بەندی 62ی سیفر .هەروەها بنوارە:قاموس الأعلام، سیاحەتنامە، ابن بەتووتە، ( معجم البلدان)ی یاقووت

لەدواساتی مەرگی کوردستانیش لە سیڤەر و دوایش لە لیژنەی (تەحکیمی موسڵ) هەروا بە فراوانی هاتبوو، کەچی لەدوای مەرگی خیلافەت و هاتنی عەلمانیەت و داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن بەریتانیا و فەرەنسا و لە سەرووشی لەلایەن ڕووسیا و دابەشکردنی میراتی خیلافەت و بێبەش کردنی کورد، ئەوا سنووری کوردستان[1] هەروا بچووك دەبێتەوە، ئێستا لەنیوەی ئەو کوردستانەی ئەوسا بچووکترە، تەنانەت لە بەشی عێراقی حکومەتی بەعس لە ساڵانی دوای هەشتاکان هەموو کوردستانی لە 90کم[2]کۆکردبۆوە، تا ئەو ساتەشهەروا بچووك بوونەوە بەردەوامە.

4- لە سەردەمی خیلافەت ڕەگەز و نەتەوەی تر لەناو کورد دەتوایەوە، هەروەك (تۆماس بوا) لە ل197 کتێبی (تأریخ الأکراد) و راپۆرتی لیژنەی (تەحکیمی موصڵ)هاتوە:تورك و عەرەب و ڕەگەزەکانی تر هاتوونە لەناو کورد توانیەوە، سەرنج بدە (سەید) ڕەچەڵەك عەرەبن، لەنێو هەموو میللەتان بە ئیمتیازەوە ماوون، بەڵام لەناو کورد توانیەوەو زۆربەی سەرکردەی کوردایەتی لەوان بووە، تەنانەت زۆربەی سەرچاوەکان

---

حموی ...هەروەها بڕوانە دوا نەخشەی ئیدارەی عوسمانی بەشی ئاسیا سالی 1893 تیایدا دەردەکەوێ کوردستان چەند جار لە عێراقی عەرەبی گەورەترە .

[1]سنوری کوردستان ئەو کاتی دووقاتی ئیستا بوو لە زۆر سەرچاوە پێشانی داوە بەلام لەو دێرە شیعرەیقانیع دەری دەبڕین :

بەڵێ سنوری بەبێ زیادو کەم
بۆت بەیان دەکەم بەبێدەردوخەم
بە پێی نوسینی جوگرافیاکان
تەرەفی غەربی بۆت ئەکەم بەیان
لە کێوی تۆروس تا ئەسکەندەروون
هەتا بەحری ڕەش بێ چەندو چوون
تەرەفی شمال هەر لەبەحری ڕەش
هەتا ئەردەهان بەبێغەل وغەش
لە ئاردەهان بۆ ئاوی ئاراس
ئەمە شیمالە بە عیلمی قیاس
تەرەفی شەرقی لە کێوی ئەلوەند
تا گۆلی وورمیێبەبێچوون وچەند
لەکێوی ئەلوەند تا جەبەل حەمرین
ئەهواز وشەنگار پارچەی نەسیبین
ئەمە جنووبە چاکی بزانە
ناو ئەو سنورە خاکی کوردستانە

بنەماڵەی بەدرخانەکان دەدەونەوە سەر خالید کوڕی وەلید[1]، زۆر عەشیرەتی تری کوردی لەبنەچەدا عەرەب بووینە لە نێو کورد تواینەوە ، باری سیاسی کورد وابووە شانازی بەخۆی کردووە،وەك قانیع دەڵێ:

**بەدەستی خۆم نیە وەللا لە دیوانی خوا کوردم**

**لە ناو شێخ وبەگ ومیرو مەلا وشاهو گەدا کوردم**

**تەماشای جەوهەری من کەی ئەزانی ئاشکرا کوردم**

کەچی ئێستا هەم خاك و هەم تاکی کوردە دەتوێتەوە هەتا لەناوچەرگەی کوردستانیش. سەرنج بدە لەناو شاری هەولێر، لەژێر سایەی فەرهەنگی شکست و (تقزم الثقافي)دا کورد توایتەوە، وا مەسیحیە کوردەکانیش بەرەو جیابوونەوەی فەرهەنگ و ئینتما بەرێوەن بۆ سەر فەرهەنگی ترن، کە جاران هەروەك لە ڕاپۆرتی لێژنەی (تحکیمی موصل 1925 ل52)* هاتووە ((کەمایەتیە ئاینیەکان لەنێو کوردان لە هەموو میللەتانی تر بە ئاسایی تردەژین و بەشێکن لێیان)).... لە ژێر ئەو رەوشە سیاسی وئیداری ودەستورە ڕەگەزپەرستیە بەرە بەرە سنوری کوردستان بچوك دەبۆوە سنوری ئیستای کوردستان ڕێك نیوەی سنوری کوردستانی سەدەی(19)یە[2]،ئینجا میللەتی کورد لە پێشکەوتن وپەرەپیدان بێ بەش دەبوو وەك بێ بەش بوە،هەولّدراوە لەژێر سایەی گوتاری بێ گیانی(برایەتی) کورد بوون شەرم بێت کە دەروازەیەکی سایکۆلۆژی مەترسیدارە بۆ توانەوە..وەك سەرەنجامێکی لۆژیکی شۆرش وبەرگری هەلدەگیرسێ ،کەچی دەیدەنە پاڵ فاکتەری دەرەکی .

---

[1]بۆ زیاتر بڕوانە ڕۆژانەی( نۆییل) ،هەروەها کەمال مەزهەر —کوردو کوردستان لەبەلگەنامە نهێنیەکانی بەریتانی ل103

*لەراپۆرتە ئینگلیزیەکە ل 52

[2]هەروەك ئەو سنورە لە نەخشەی عوسمانی سالی[1893]و نەخشەی1896ی ئیداری بەشی ویلایەتەکانی ئاسیا دەردەکەوێ،هەروەهالە بەندی یەکی رێکەوتنامەی ئەرزەرۆمی (1823/7/28)، هەروەها ( لەبەندەکانی 62- 63- 64رێکەوتنەکەی سیڤەر)یش دوای لە لیژنەکەی تەحکیمی ویلایەتی موسلّیش ئەو سنوورە بۆ کورد دەستنیشان کراوە.

5- دەسەڵاتی کورد لە سەردەمی خیلافەت گەلێ زۆر بووە، جگە لەوەی والی و سەرکردە و بەرپرسان لەوان بووە، ئینجا وەك میللەتیش قورساییەکی زیاتریان لە میللەتانی تورك و عەرەب و ئیتر هەبووە، هەتا لەدواساتەکانیش، سەرنج بدە: دوای ئەوەی لە کۆنگرەکانی (بەرلین) و (سان ستیڤانۆ) 1878ز لە بەندەکانی 16- 61) بەسەر عوسمانلی سەپێنرا، کە مافی سەربەخۆیی بدرێتە ئەرمەنی، ئەوا سەرکردەکانی ئەرمەن گەڕانەوە بۆ کۆنگرە و پێیان ڕاگەیاندن ئەگەر سەرانی کوردیش قایل نەبێ، بەتەنها عوسمانلی ناتوانێ سەربەخۆییمان بدەنێ، چونکە زیاتر کورد لەنێو دەسەڵاتی خیلافەتدەسەڵاتدارن، هەتا (معارەزە)ی عوسمانلیش هەر زۆربەی کورد بوینە، دامەزرێنەرانی (ئیتحاد الترقی) زۆربەی کورد بوینە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە کورد دەسەڵاتدار بوینە، بۆیە هەم لەناو عوسمانلی و هەم لە دەرەوەیان سەرکردە بووینە.

جا بڕوانە ئەوکاتی خەڵکی تر داوای مافی نەتەوایەتی و سیاسیان لەکورد کردوە، کەچی لە سەردەمی عەلمانی و فکری نەتەوەگەری هەر کوردە و مافی خورایە و هەتا زمانیشی لێ قەدەغەکراوە و لێقەوماوە و بە (يتيم الامة الاسلامية) ناوبراون، لەکاتێکا لە سەردەمی خەلافە لەبەر ڕێزی کورد بە (قورەیشی عەجەم)[1] بەناوبانگ بوو. کەی ئەو دوو دۆخە وەك یەکە.. (هل يستويان)؟

لەگەڵ زۆر خاڵی تری بەراوردی گرنگ و زەق هەیە، کەواتە مێژووی مەینەتی کورد لەنێوان 1908- 1924، ئەگەر بەوردی بەدوای بگەڕێین:

## 2– 4 مەینەتی سیاسی کورد:

لەدوای ئەو ڕاست و ڕوونکردنەوانەی سەروو دەرکەوت کە تەمەنی کێشەی سیاسی نەتەوەیی کورد لە سەدەیەك تێناپەڕێ، بە کورت و پوختەیی لەو سەردەمە دەست پێدەکا کە گەلانی ناوچەکە هەریەکە بوونە خاوەن دەوڵەتی سەربەخۆ لەسەر نیشتمانی نەتەوەییان، بەپێی پلانی ئیمپریالیزمی و بڕیارەکانی:بنسن 1915، سایکس- پیکۆ 1916، سان ڕیمۆ 1920،، قاهرە1921، لۆزان1923،... کوردیان بێبەش کرد، واتە نەخشەك هاتە دی دژی خیلافەتی ئیسلام لەولایەش دژی کورد، سەرکردە کوردەکانی

---

[1] شفاء العليل ص3 هەروەها شەرەفنامە ل132 پێشەکی.

عەلمانیش هەڵخەڵەتێنران، ئیتر لە کاروان بەجێما.. چۆن بوو؟ وە بۆچی؟ وە لە ئەستۆی کێدایە؟

بۆ تێگەیشتن و وەڵامی ئەو پرسیارە نەمرانە، واچاکە ڕووخساری سیاسی ئەو سەردەمەی کە کوردی تیا بێبەش و هێتیم کرا بەکورتی بەو شێوەیە بوو:

1- لەکۆتایی جەنگی جیهانی 1914- 1918 و بەسەرکەوتنی هاوپەیمانان (ئینگلیز، فەڕەنسا، ئەمریکا) بە سەرەکی و لەولایەش ڕوسیا لەگەڵیان، تەوەری دۆڕاویش لەو جەنگە ئەڵمانیا و عوسمانلی بووکە بە(دول المرکز)ناو برا بوون.
2- لاوازبوون و داڕمانی خیلافەت کە لە ناوەڕاستی سەدەی 19 دەست پێدەکا، لە ساڵی 1924 بە یەکجاری هەڵوەشێنرایەوە.
3- سەرهەڵدانی فکرەی نەتەوەگەری و عەلمانی و بزوتنەوەی دەستوور و(مەشروتیەت) کۆمەڵگەی مەدەنی و سیستەمی کۆماری و ئەدەبیاتی شۆڕشی فەڕەنسی و بیری لیبرال دیموکراسی.
4- وەرچەرخانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی و دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و دەڤەری، وەك تورکیا، عێراق، سوریا..
5- پەیدابوون وجم و جۆلی سێتەوەرەی ئایدیۆلۆجیای ناشیۆنالیزمی (1- زایۆنی 2- تۆرانی 3- عروبی) لەناوچەکە.
6- سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر 1917 و سەرهەڵدانی شیوعیەت.

ئیتر دەتوانرێ بەرپرسیاریەتیمێژوویی کێشە و مەینەتی کورد بەئاسانی دیاری بکرێ، لەنێوانە مێژووییەکەی،لە مەدرەسەو ئایدیۆلۆجیاکە،لە تەوەرەکانی جیهانی، ئیقلیمی، ناوەکی... با بیخەینە ژێر میکرۆسکۆب، بۆ زیاتر (تشخیص) لەگەڵمان بن بۆ لایەك لەو سەربردەیە:

**سەربردەکەی:**کورد هەروەکو عەرەب و تورك و چەرکەس و ئەلبان و میللەتانی تر لەژێر سایەی سیستەمی (لامرکزی) و (ولایاتی) عوسمانلی بووەئەگەر باشتریش نەبووبێ، بەگشتی خیلافەت وەك سیستەمی ئیمپراتۆری نەبووە، دەسەڵات هەر لەدەستبنەماڵەیەك و نەتەوە و ڕەچەڵەکێك نەبووە، کەواتە جگە لە ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و ئەیوبی و سەفەوی، ئەوا لەژێر سایەی نامەرکەزی خیلافەت، هەر میللەتە و کیانی خۆی هەبووە بەپێی (سیستەمی ویلایات) وا بەشێکی لێ هەڵدەبژێرین:

(عبادلـه) لـه ئیشـبیلیه (1023- 1091)، عامریـه لـه (بلنسـیه (1021-1085)، مرابطون لـه سـەرووی ئـەفریقا (1056- 1146)، فاتمیـه لـه قـەیرەوان (969- 1171)، مەمالیکەکان (1250- 1517)، بنەماڵـەی محمـد عـەلی لـه میسر (1805- 1925)، تایەریه لە خوراسان (820- 872)، سەفاریه لە قـارس (868- ...) سـامانیه لـه تورکسـتان و فـارس (874- 999)، سـەلجوقیەکان لـه خواروی ئاسـیای ڕۆژئـاوا (1037- 1300)، زەنکیـەکان لـه شـام و میزۆپۆتامیـا (1125- 1250)، ئەرتەکی له دیاربەکر (1101- 1311)، خانـەکانی مـەغۆل (1206- 1349)، هـەروەها جەلایـەکان، شـاهەکان، تەیموریـەکان، غەزنەویـەکان، غوریەکان، سولّتانەکانی هند و ئەندەنوسیا و فیلیپین.. لەگەڵ دەیان دەوڵەتی تـری کـورد کە زانراون پێویست بەتۆمارکردن ناکا.

لەو سەردەمی کە سەردەمی نەتەوەگەری نەبووە، مەرج نەبووە دەسەلاّتداران لە نەتەوەی خۆیان بووبێ، سەرنج بدە مەمالیکەکان خەڵکی قەوقاز بووینە یان ئەوروپا حوکمی عەرەبیان کردووە،تەنانەت (داودباشا کە خەلکی تەفلیسە)کڕین وفروشتنی بی دەکراله بەغدا دوای بوە گەورەی عەرەب لە بەغدا، کورد حوکمی عەرەب و تورك و فارس و خەڵکی تری کردووە، تا ئەو دواییەش محمد علی پاشا حوکمی میسر و وڵاتانی عەرەبی کردووە، کەچی عەرەب نەبووە (کورد بووە یان چەرکەسی)، پیاوێك بەناویعبدالرحمن کوڕی ڕۆستەم (فارس بووە یان کورد)* لەدەست زۆرداری میرەکانی فارس جێگای لەهیچ شوێنێك نەبوویتەوە، هەلاّتووە بۆ مەغریبی عەرەب، کەچی لەوێ دەوڵەتێکی بەناوی (ڕۆستەمی) دروست کردووە نزیکەی سەدەیەکی خایاندوە. لە و هەموو جۆرە حوکمی یەکتر کردنەدا کەمتر خەڵکی تر حوکمی کوردیان کردووە، هەر خۆی حوکمی خۆی و خەڵکی تری کردووە، واتە باری سیاسی سەردەمی خیلافەت زیاتر لە قازانجی بووە. (ئەگەرپێوانەی نەتەوەییش بەکاربهێنین)ئینجا کوردستان نەکویلایەت ئیالەتیشی[1] هەبووە، یەکیان بەناوی کوردستان، بەڵام (د.عوسمان عەلی) لە کتێبە بەنرخەکەی (دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة) دەڵێ: لە ناوەڕاستی سەدەی 19 لەلایەن

---

*لەبەر ئەوەی ئەودووئەگەرەی دەلێین چونکە لەنووسینەوەکانی مێژوو زۆر جار مێـژووی کـوردیش بـە ئەنقەست لەسەر فارس حساب دەکری .

[1]ئیالەت لە چەند ویلایەتێك پێکدێت، لەسەردەمی عوسمانی ناوچەکانی دەرسیم، مـوش، دیـار بـەکر یەکەم جار بە کوردستان ناو برا —بڕوانە : نیکیتین ل115 .

بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی بەهەمموو ئەو ناوچانەی کوردی وتراوە کوردستان، هەروەك (مام جەلال) لە مرافعاتەکەی لە بەغدا بەکاری هێنا بۆ سەروەری ئەو ناوەی کوردستان کە نەتەوەگەریە عەلمانیە عەرەب و تورکەکان پێی بێزار دەبن و بەکاری ناهێنن،لە رێکەوتنامە نێو دەوڵەتیەکان ناوو سنوری کوردستان بەشێك بوو لەمادەکانی،لە بەشی یەکەمی رێکەوتنی ئەرزەرۆم[1] ،ئینجا رێکەوتنی برلینی 1880 و تادەگاتە بەشی سێیەمی سیڤەر ، ڕێکەوت نیە لە مێژوودا هەر باری ئیسلامی راستەقینە لەق بووبێ باری سیاسی کوردیش لەق بووە پێچەوانەش بە پێچەوانەوە، لە ناوەڕاستی سەدەی (19) بەرەبەرە کاریگەری شۆڕشی فەڕەنسی و بیری عەلمانیەت کەوتە ناو بەرپرسانی عوسمانلی، گۆڕانکاری پەیدابوو لە پەیکەری ئیداریش، بزوتنەوەی داواکاری دەستوری بەناوی( مەشروتیەت) پەیدابوولە 1875، ئینجا بە (مرکزی) کردنیولایەتەکان[*]

دروستکردنی ئەنجومەنی نیشتمانی بەناوی (مەبعوسان)لە 1876... شان بەشانی ئەو گوڕانانە عوسمانی لاو لە 1865 دروست بوو دوای بووە تورکیای لاو، تا لە 1889 /7/14 ئیتحاد تەرەقی لەیادی 100سالەی شورشی فەڕەنسالێی جاڕ درا، بەرەبەرە لەگەڵ ئەو هەنگاوانەی لاوازبوونی خیلافەتو جێگیربوونی بنەماکانی عەلمانی باری کوردیش تێکچوو، ئەو دۆخەی هەر دژی کورد نەبوو زۆربەی میرنشین و حکومەتی ویلایەتەکانی تری عەرەبی چەرکەسی و ئەلبانی و ئۆروپی و هەتا ئیماراتە تورکەکانیشی

[1] ئەو رێکەوتنە لە 1823/7/28کرا، پێك هاتبوو لە 7 بەش ،لە بەشی یەکەم باس لەکوردستان وسنورەکەی دەکا دەلێ دەچێت نزیك بەغدا .

[*] لەزۆر سەرچاوە باس لە بوونی پەیوەندیەکی ئالۆزی نێوان میسری (محمد علی پاشا- کە وامەزەندە دەکرێ کوردبوو یان چەرکەسی بووبێ)لەگەڵ میرمحمدی میری سۆران وئێران ووبەریتانیا، بەپێی کتێبی (الدولة العثمانية —د محمد الصلابی )هەر لەو کاتی (دەکا سەرەتای سەدەی 19 )ئینگلیز بەلێنی بەکورد داوە بۆ بوون بە دەوڵەت، چونکە زۆر پێویستی بەهەردووڕووباری دجلەو فرات بوو بۆ هات وچۆی هند، ئینجا بریتانیا لە سەرەتای سەدەی بیست گرنگی بە نەوت دا، جاران مەکینەکانی بە خەلووز ئیشی دەکرد، لەراستیدا لە پێشهەمووان یاقووت حەمەوی لە (معجم البلدان )باسی نەوتی کوردستانی لە خانقین بەگرنگی کردووە، لە سالی 1897یەکەم جار رۆژئاوایەکان باسی ئەو نەوتەیان کردەوە ...، لەهەمموو ئەو پەیوەندیانە بۆمان دەردەکەوێ کە:1- بۆچی عوسمانی ومیری سۆران بەشەرهاتن 2- بۆچی سیستەمی ویلایەت هەلوەشایەوە 3- مەسەلەی مەلای خەتێ لەو دۆزە زۆر دوورە .بۆزیاتر بروانە :کوردو کوردستان —ڤاسیلی نیکیتین ل543، هەروەها: الاسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة .هەروەها نووسینێکی( پ ی سەلام ناوخۆش) لەگۆڤاری ستاندەر .

گرتەوە (ئیمارەت ئەرزەڕۆم بەنمونە)، کاردانەوەی یەکەم ڕاپەڕینی (شێخ عبیداللە نهری) لەو گۆڕانکاریە نوێیە هات، بۆوە هۆی چەکەرەبوون و گەشەی بیری نەتەوەیی لەنێو ڕەوشەنبیرانی کوردیش،لەگەڵ زیادبوونی دەسەڵات و چالاکی عەلمانیە ئیتحادیەکان و باری سیاسی کورد زیاتر دژوار بوو، تا لە ئینقلابەکەی 1908 ئیتحادیەکان لەدژی خیلافەت و هێشتنەوەی سوڵتان عبدالحمید بەشێوازی (مەلەکی دەستوری) ئەوا بەتەواوی بەرنامەی نەتەوەگەری عەلمانی ئیتیحادیەکان ئاشکرا و پەیڕەو کرا، هەرچەندە عەلمانیە کوردەکان زۆر پێی دڵخۆش بوون بە دروشمەکانی (یەکێتی، ئازادی، چاکسازی)، لەسەر ئاستی جیهانیش کۆنگرە و ڕێکەوتنەکان بەردەوام بوون بۆ پشتگیریکردنی بیری عەلمانی نەتەوەگەری لە ناوچەکە و دابەشکردنی خیلافەتی عوسمانی، زەقترینیان (سایکس-پیکۆ- سازانۆڤ 1916) کە ئەو دابەش و نەخشەیەی ئێستای ناوچەکەی لەسەر داڕژرا و کوردستان پارچەپارچە کرا.

لەنێو جەرگەی خیلافەتیش کێشەی نێوان باڵی عەلمانی بە سەرکردایەتی (تەلعەت پاشا، ئەنوەر پاشا، جمال پاشا)لەگەڵ تیکرای ئیسلامیەکانکەخۆی لە زانکۆی ئیسلامی دەدۆزیەوە، لەدوایی کەوتە دەستی مستەفا کەمال و مەڵبەند و پایتەختیشی کەوتە ئەنقەرە لەساڵانی دوای 1918، لەگەڵ باڵی خیلافەت کە پایتەختی هەر لە ئەستەمبوول بوو، بەو شێوە بووە دوو حکومەت و دوو بڕیار و دوو هەڵوێست و ڕێنمایی و دابەش.

ئالێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێ کە چۆن (مەینەتی کورد) دروست بوو و کێ لێی بەرپرسیارە:

<u>ئەنقەرەی عەلمانی یان ئەستەمبۆلی ئیسلامی؟</u> وە چەندە عەلمانیەکانی کورد لێی بەهەڵەدا چوون.

لەگەڵ سەرهەڵدانی بیری دەوڵەتی نەتەوەیی لەپێش جاڕنامە (14)خالەکەی ویلسون لە1918، دوایبەڵێنەکانی لوید جۆرج، بەڵێنەکانی ماکماهۆن بۆ عەرەب لە1916، بنەماکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر1917، دواییەکەش مادە (22)ی (عصبە الامم) لە1920، لەپێشهەموو ئەوانە ئەستەمبۆل (بەپێچەوانەیئەنقەرە) دانی بە مافی گەلان نا، هەروەك پێشتریش لەگەڵ کورد لەو بارەیە ڕێککەوتبوون، ڕەگ وریشەی دەگەڕێتەوە بو

ڕێکەوتنەکەی (بدلیسی- سولتان ) لە1514[1]،سولتان عبدالحمیدیشلەگەڵ ئەمیر عوسمان و بنەماڵەی بەدرخان بۆ سەربەخۆییڕێکەوتنیان هەبوو وەك باسمان کرد،[2] سەرلەنوێ لەسەرەتای سەدەی بیستەم سوڵتان محمد واحدالدین وفرید پاشای سەرۆك وەزیر (هادی پاشا)یان بەنوێنەر نارده لای (سید عبدالقادر شەمزینی) و (شریف پاشا)[*] سپاردەی سوڵتانی بۆ هێنان کە بریتی بوو لە داننان بە کوردستانێکی سەربەخۆ و مۆریشیان کرد[3]، ئینجا هەمان نوێنەری سوڵتان چوو لە (سیڤەر)یش بۆ کورد بەندەکانی (64،63،62) مۆرکرد[4]، بەیتار دەرسیمی لەسەر زاری (سید عبدالقادر) دەگێڕێتەوە

---

[1] عوسمانیەکان ئەو ڕێکەوتنامانایان مۆر کردوە:العثمانیةالبندقیة– 1416(• العثمانیةالبیزنطیة (1420(• العثمانیةالبندقیة (1479(• إسطنبول(1533) • أماسیا(1555) • فرحاتباشا (1590(• زیتفاتوروك(1606) • نصوحباشا (1612(• سراو(1618) • معاهدةخوتین (1621(• قصرشیرین (1639(• ڤسڤار(1664) • بوجاش (1672)• كارلوفجة(1699) • إسطنبول(1700) • بروت(1711) • پساروفچا(1718) • إسطنبول (1724)• أحمدباشا (1732(• إسطنبول(1736) • بلغراد(1739) • كردن(1746) • كيتشوككاينارجي (1774(• أينالیكقوق (1779(• زشتوفي(1791) • یاش(1792) • معاهدةطرابلس• تونس(1797) • العریش (1801)• القلعةالسلطانیة (1809(• بوكرش(1812) • أرضروماالأولى (1823(• إدرنة(1829) • كوتاهیة (1833)• هنكارإسكله سي (1833(• بلطةلیمان (1838(• لندنللمضائق (1841(• أرضرومالثانیة (1847(• باریس (1856)• سانستیفانو(1878) • برلین(1878) • إسطنبول(1885) • القسطنطینیة(1888) • إسطنبول (1897)• اوشي(1912) • لندن(1913) • إسطنبول(1913) • أثینا(1913) • هدنةمودروس (1918(• سیفر (1920) ، سود لة موسوعة البریطانیة وەرگیراوە .

[2] بڕوانە :محمد امین زکی بەگ- خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان ل229.

[*] شریف پاشا زیاتر مەیلی عەلمانی هەبووە بەڵام بۆ کیشەی کورد دلسۆز بووە، بۆیە لە گەل لایەنی ئیسلامی کورد نزیك بووە،زاوای سعید حلیم پاشای سەرۆك وەزیرانی عوسمانی بوو، بە پێی( زنار سلۆپی )شریف پاشا لە لایەن زانایانی ئیسلامی کوردی وەك شیخ سعیدی پیران وسعیدی نەورەسی و شیخ محمود وشیخ عبدالقادری شەمزینی.. کرا نوینەری کورد لە کۆنگرەکانی دەرەوە، هەروەها بە پێی ئەو بەڵگەنامانەی بەریتانی :14536- 252811\ h30(دەقی ئەو بەڵگە نامەیەمان لایە ) وزۆری تر ئەوە دەسەلمێنی کە شێخ عبدالقادر شریف پاشای بە ڕەسمی وەك نوێنەری کورد بە جیهان ناساندووە.

[3] لەبەلگەنامەکانی بریتانی ئەو ڕاستیانە هاتوون، وادیارە سەرۆك وەزیرانی عوسمانی لەگەڵ بریتانیاش قسەیان کردووە کەسەربەخۆیی بدەنە کورد –بڕوانە :کردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی ص338 –ئەوجۆرە دان پێهێنانە دەگمەن بووودان بەمیللەتانی عەرەب نەهێنراوە ئاوا بەئاشکراو بەبەلگە نامە .

كە لە بنەڕەتا سوڵتان ڕازی بووە کوردستانی سەربەخۆ و ئازاد دابمەزرێ.[1] سەرکردەکانی کورد بوونە دوو ڕای جیا، عەلمانیەکان کە بریتی بوون لە ( حسن خەیری، برنجی زادە، زولفی بەگزادە، ئیسحاق سکوتلی، د.عبداللە جودت، بەشێك لە بنەماڵەی بەردخانیەکان...هتد) هەریەکە لە فەترەیەك و بەجۆرێك لایەنگیری و یارمەتیدەری ئەنقەرە بوون، لەگەڵ ئەوەی ئەنقەرە ئەو مۆرکردنەی (هادی پاشا)[3]ی لەپاش وپێشسیڤەر بە مەرگی تورکیای نوێ لەقەڵەم دابوو. بەشی دووەمیش لایەنی ئیسلامخوازەکان بوون، کە بریتی بوون لە (سید عبدالقادر شمزینی، شێخ سعید پیران، مەلا سلیم، شێخ سعیدی نورسی، شێخ عبدالسلام بارزانی...هتد.) ئەوانە بەجیاجیاپێیان وابووە مافی کوردیان لە ئەستەمبۆل بەدیدەکرد. تکایە سەرنج بدە ئەو خشتەیەی بەراوردی نێوان ئەنقەرەو ئەستەبۆل .

ئەو کێشەیە پەڕیەوە نێو کوردستانی خوارووش، هەروەك (رفیق حلمی) لە (یاداشتاکانی) دەڵێ:لە لایەن شیخ محمود فەروەیەك بەدیاری بۆ سولتان دیاری کرابوو لە پاداشتی چاکەکانی بە سەربەخۆیی کوردستان، ئێمەش دڵمان بە مستەفا کەمال لە ئەنقەرە خۆش بوو، سەردانی ئەستەمبۆلمان گۆڕی، فەروەکەشمان بەدیاری بۆئەتاتورك برد وپشتمان لە ئەستە مبۆل کرد، هەرچەندە یەکەم دان پیاهێنان بە حکومەتی شیخ محمود لەلایەن عوسمانیوئەستەمبول بوو لە ڕێی ئەوبروسکەیەی علی ئیحسان پاشالە1918/10/30، ئەودوو ڕاییە پەڕیەوە ناو عەشایرەکانیش، بۆیەلە پەیماننامەی هۆزانی[4] دەرسیم لە 1917/11/15 پێنج پرسیاریان ئاڕاستەی مستەفا کەمال کرد لە ئەنقەرە ئاخۆ ڕژێمی عەلمانی کەمالیش وەك ئەستەمبۆل ئامادەیە سەربەخۆیی بدا، لەودەمە مستەفا کەمال دەڵێ: بەڵێ، سەدجار بەڵێ! ئیتر ڕێز و چالاکی عەلمانیە کوردەکان زیاتر بوونە پاڵپشتی ئەنقەرە، لە ئەنجومەنی نیشتمانی ئەنقەرە (بەدیلی شورای عوسمانی ئەستەمبۆل) 72 نوێنەری کوردی تیابوو، بەرەبەرە ئەنقەرە بە یارمەتی

---

[1]دەقی ڕکەوتنامەکە لە کتێبی(دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر) بخوێنەوە .
[2]بڕوانە (درسیم لە مێژووی کوردستان) ل145.
[3]ناوی هادی پاشا لە بەڵگە نامەکەی سیڤەر بە ئینگلیزیەکەی هەیە .
[4]سێو کەرت کردن بەگرێبەستی توکمە حساب بوو لە پەیماننامەی هوزەکان لە دەرسیم .

ڕاستەوخۆی کورد و وڵاتانی سەرکەوتوو خۆی دروست و پتەوکرد و ئەستەمبۆلیشی لاواز کرد[1].

## خشتەی بەراورد بۆ کێشەی کورد

## هەڵوێستی خیلافەت و عەلمانی تۆرانی

| دەسەڵاتی ئەنقەرە ی عەلمانی(ئەتاتورك) | دەسەڵاتی خیلافەت لە ئەستەمبۆل |
| --- | --- |
| 1- بیرێکی عەلمانی نەتەوەگەری تۆرانی.<br>2- بنەماکانیان دژ بە ئیسلام و کورد بوو<br>3- ڕێککەوتنی سیڤەر و مادەکانی 62 و63و 64 بە مەرگی تورکیای نوێ ژمێرکردوە<br>4- هیچ ڕێکەوتنێکی مۆرکراوی نەبوو لەگەڵ کورد، هەر بەڵێنی زارەکی بوو.<br>5- بواری هیچ چالاکیەکی سیاسی و ڕەوشەنبیری کوردی نەدەدا.<br>6- لۆزانی هێنادی.<br>7- دوای هەموو کوردی قڕکرد.<br>8- سەرەنجام ئەنقەرە سەرکەوت و میللەتی کورد کەوتە ئەو مەینەتیە تا ئێستا<br>9- ناو وزمانی کوردو کوردستانی قەدەغە کرا | 1- بیرێکی ئیسلامی عوسمانی بەلاوازی.<br>2- دژایەتی کوردی تیا نەبوو.<br>3- سیڤەری مۆرکرد<br>4- ڕێکەوتنی دووبەدوو و نێودەوڵەتیشی مۆرکردبوو بۆ سەربەخۆیی کوردستان<br>5- چالاکی سیاسی و ڕەوشەنبیری حزبی هەموو لە ئەستامبۆل بوو<br>6- بەشداری لۆزان نەبوو تەنها لەسیڤەر بەشداری کرد<br>7- لەگەڵ کەوتنی ئەستەمبۆڵ هەموو حزب و ڕۆژنامە و ناوەندە کوردیەکانی لێ داخرا<br>8- هەتا خیلافەت مابوو کورد سەربەخۆ بوو، ئەگەر خیلافەت سەرکەوتبایا ئێستا کوردستان لەریزی میللەتان بوو.<br>9- نەك ویلایەت هەتا ئیالەتیش بە ناوی کوردستان بووە[2] |

1بۆ زیاتر شارەزابوونی ڕۆڵی کورد لە تورکیا سەیری رۆلی کورد لەدروستبوونی کۆماری تورکیا بکە.... دیدار عوسمان

[2]بڕوانە نەخشەی عوسمانی سالی 1893- ویلایەتەکانی بەشی ئاسیا .

ئیتر بەئاشکرا ئەنقەرە جارِیدا کە برِیارەکانی خیلافەت لە ئەستەمبۆل (بەتایبەتی لەبارەی کوردستانێکی سەربەخۆ) یاسایی نیە و سیڤەریشی بە مەرگی تورکیای نویٚ لەقەڵەم دا، کەوتە تەقەلا بە هاوبەشی لەگەڵ کوردە عەلمانیەکان و فەرِەنسا و بەریتانیا، کۆنگرەی لۆزانی 1923 هێنا دی، لەو کۆنگرەیەدا نوێنەری کورد (شریف پاشا) و نوێنەری ئەستەمبۆل (هادی پاشا) دەرکران، لەجیاتیان (عصمت ئینینۆ)ی نوێنەری ئەنقەرە بەشداری پێکرا، عصمت ئینینۆ دوو کوردیشی لەگەڵ خۆی بۆ کۆنگرەکە هێنابوو بەناوی (برنجی زادە، زولفی بەگزادە) و لەویٚ بەناوی کورد داوایان لە کۆنگرە کرد کە (گوایە) کورد سیڤەری ناویٚ و نایەویٚ لە تورکیای نویٚ جیاببێتەوە لەو مۆرکردنەی لەگەڵ ئەستەمبۆل پەشیمانن، لە ئەنقەرەش (حسن خیری) نوێنەری دەرسیم و سەرۆکی فراکسیۆنی کورد(کە لە72ئەندام پێکهاتبوو) بەبیٚ تەل بەناوی هەموو کورد بروسکەی پشتگیری بۆ لۆزان لێدەدا لەدژی سیڤەر و ئەستەمبۆل، بەو شێوەیە لۆزان جێی سیڤەری گرتەوەو مافی کوردیشی تیانەما و لە ئاستی جیهانی سووتا.

لە ئیقلیمیش ئەنقەرە زیاتر زاڵ بوو بەسەر ئەستەمبۆل و لەساڵی 1922 برِیاری کۆماری عەلمانی تورکیا درا، لە دەستوری تورکیای نویٚ(ANA YASA)لە مادەکانی 64 تا 68 تەنها نەتەوەی تورکی تیا تۆمارکرا،دەقی مادەی 66ئاوادەلی:

## Türk vatandaşlığı

MADDE 66. – Türk Devletine vatandaşlık bağı ile bağlı olan herkes Türktür. Türk babanın veya Türk ananın çocuğu Türktür. (Son cümle mülga: 3.10.2001 ـ 4709/23 md Vatandaşlık، kanunun gösterdiği şartlarla kazanılır ve ancak kanunda belirtilen hallerde kaybedilir. Hiçbir Türk، vatana bağlılıkla bağdaşmayan bir eylemde

bulunmadıkça vatandaşlıktan çıkarılamaz. Vatandaşlıktan çıkarma ile ilgili karar ve işlemlere karşı yargı yolu kapatılamaz[1].

لە 1924/3/3 بە یەکجاری خیلافەت هەڵوەشایەوەو ئەستەمبۆلیش کەوتە دەست عەلمانی نەتەوەگەری تورکیا بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال، ئیتر بڕیاری توند و سەخت بۆ ئیسلام و کورد دەرچوو، هەموو جۆرە چالاکی و دیاردەیەکی ئیسلامی قەدەغەکرد وەك پۆشاکی ئیسلامی و خوێندنگاکانی مزگەوت و گۆڕینی پیتی قورئانی بەپیتی لاتینی[2]، لابردنی شەریعەتی ئیسلامی و هێنانی بنەماکانی عەلمانیەت.. هاوشانی ئەو هەنگاوانەش دەستکرا بە داخستنی هەموو دام و دەزگا سیاسی و ڕەوشەنبیرییەکانی کوردی و ڕۆژنامەکانی کە زۆربەی لە ئەستەمبۆل بوون، هەروەك محمد أمین زکی بەگ دەڵێ: ((هەموو ئەو حزب و جەمعیەتانەی لە سەردەمی ئازادی خیلافەت دروستکرابوو وەك کورد تعالی و ترقی جمعیتی، کورد نشر معارفی جمعیتی، جمعیتی هیڤی، هەروەها بلاوکراوەو ڕۆژنامەکانی: کوردستان- مدحت بدرخان، ڕۆژی کوردستان، ژین، کوردستان- پیرەمێرد، پێشکەوتن، بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان.. هەموو دادەخران لەگەڵ گەیشتن و زیادکردنی دەسەڵاتی کەمالیەکان))، ئیتر دەست بە پاکتاوی ڕەگەزی کوردی کرا، پرۆسەی سەربازی و جینۆسایدی کورد کرا.. جل و بەرگ و زمانی کوردیش قەدەغە کرا، هەتا کار گەیشتە ئەو کوردە عەلمانیانەی کە پشتگیری کەمالیەکانیشیان کردبوو، زۆربەی لەسێدارەدران، بەڕاستی ڕۆژی ڕەشی کورد هات بۆ یەکەمجار هەڕەشە بۆ سەر کیانی سیاسی کورد دەستی پێکرد، بۆیەکەم جار لەمێژووی کورد ڕووبەرووی پاکتاوی رەگەزیو جینوساید بوویەوە، هەردووکیان لەسەر دەستی عەلمانی، یەکەمیان لەلایەن ئەنوەر پاشا دووەمیان لەلایەن کمال ئەتاتورك، ئینجا عەلمانیە کوردەکان گەڕانەوە لای سەرکردە ئیسلامیەکان و دانیان بە شکستی بەرنامە و پرۆژەکەی خۆیان هێنا و شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران دەستی پێکرد، دروشمی (یان گەڕانەوەی خیلافەت یان کوردستانێکی سەربەخۆ) هەڵگیرا، لەوساتیەوە شۆڕشەکانی کورد داوای ئەو مافە دەکەنەوە کە لە

---

[1] بڕوانە: siyasi rehber بەشی ana yasa دەقی دەستوری هەمووارکراو بە بڕیاری ژ:2709ی 7-11-1982 لە ل3 ەوە تۆمارکردوە

[2] د.عبدالله جەودەت کوردیکی عەلمانی توندبوو، یەکیك بوو لە دامەزرینەرانی (اتحاد الترقی) یەکەم کەس بوو پیتی لاتینی لە جیاتی ئیسلامی بەکارهینا لەنێو عوسمانی، واتە بەکارهێنانی پیتی لاتینی ئیستای تورکیا بۆ عبدالله جودەت دەگەریتەوە .

سەردەمی خیلافەت هەیان بووەو کەمالیە عەلمانیەکان لێیانیـان زەوت کردبـوو، هـەر لـە شێخ سەعید و مەلا سلیم، شێخ عبدالسلام، سمکۆی شکاك و و قـازی محمـد... تـا مـەلا مستەفا، کوتلەی پەرلەمانی کوردی لە سەردەمی مەلـەکی دیسـان هـەر داوای لـەعێراق دەکرد کە سیستەمی ویلایەتی عوسمانلی بکاتە چارەسەری کێشەی کورد، هەتا سـەرکردە عەلمانیە نوێیەکانی کوردیش دان بەوە دەنێن، (مام جەلال) لـەکاتی کردنـەوەی مزگـەوتی قازی لە سلێمانی وتی: ((هەموو ئەو داوایەی ئێستا بۆ کوردی دەکەین، ناگاتە نیوەی ئەو دۆخەی کوردی تیابوو لەسەردەمی خیلافەتی عوسمانلی)).

دوای ئەوەی شۆڕشەکانی کوردسـتانی سـەروو شکسـتی هێنـا، لـە خـوارووش کاتـێ ئینگلیز لەساڵی 1921 عێراقی دروست کرد، ئـەوا کوردسـتانی خـوارووی بـەزۆرەملی پێوەنووساند بەپێی (سایکس- پیکۆ- سانانوف) سنوری نێوان تورکیـا و عێـراق دارِژرا بەناوی هێڵی (برۆکسل- ئیڤیك) تیرێك لە جەرگی کورد درا و مەینەتی کورد دروست بوو لە ئەستۆی سێ تەوەری عەلمانی:

1- عەلمانی جیهانی (سایکس- پیکۆ 1916).

2- عەلمانی ئیقلیمی: (اتحاد والترقی+ کەمالیست).

3- عەلمانی ناوەکی (پاڵپشتی کردنی ئەنقەرە لەلایەن عەلمانیە کوردەکان )[1].

بەو شـێوەیە کـورد و کوردسـتان پارچەپارچـە کـراو کەوتـە مەینـەتی، تـا ئێسـتاش بەردەوامە مادام سەرخانی (سایکس- پیکـۆ) بـەردەوام بـێ، بەکورتیەکـەی لەئەسـتۆی خیلافـەتی ئیسـلامی نیـە ئەگـەر چـی بێسـەروبەریش بـووە، بۆیـە لەبەڵگەنامـەکانی هۆنراوەش ناوی خیلافەت نەهاتووە ناوی (عصبە الامم)هاتووە هەروەك قانیع دەڵێ:

**عصبـــە الامـم ئـــەگەر هـــــــــەقـــدارە**
**لـــە حـــالـــی عالـــەم چاك خەبـــەردارە**
**بۆچـی لە ئەحـــوالی کورد ناپرســــی ؟**
**مەگەر لە لەعنەتی تەئریخ ناترسی ؟**

ئەوە زۆر بەکورتی سەربردەی دروستبوونی مەینەتی کورد بوو لـە بـوارێکی تایبەتیـدا بەدرێژی باسی ئەو سـەربردەیە دەکـەین بـە پاڵپشـتی دیکۆمێنـت، هـەروەها لـە سـاڵی 1993وە لە دوو قۆڵی بەردەوام زانیاری مەیـدانی لـە پـیرە ووشـیارەکانی کوردسـتانی

[1] ئەو کاتی عەرەب رۆلیکی وایان نەبوو لە دارِشتنەوەی دیزاینی رۆژ هەلاتی ناوەراست.

توركیـا وەردەگـرین بـۆ ڕاسـتی و دوروسـتی ئـەو باسـانەی سـەروو.. هـەمووی لـەوێ بڵاودەكەینەوە[1].

## پاساو وخەباتی شۆڕشگێڕی (نیشتمانی –سیاسی –یاسایی)

ئەوەش كۆمـەڵێك پرسـیارو وەڵامـی گـرنگ لـەخۆ دەگـرێ بریتیـە لـە مانەفێسـتی كوردایەتی بۆ میللەتانی ناوچەكە و جیهان، پرسیاری سەرەكی ئەوەیە بۆچی كوردیش وەك میللەتانی تری ئەوروپی بێ دەنگ نەبوو وەك هاولاتیەك لە توركیاو عێـراق بـژی؟ ئەگـەر خـەباتی نیشتمانیشـی دەكـرد و باخـەباتی مـەدەنی بكردبایـە بـۆ پـەنای بـۆ خـەباتی شۆڕشگێڕی برد؟ كەواتە كورد كێشەی دروست كرد یان بۆی دروستكردكرا؟

بەكورتی ئەوەی خوارەوە وەلامی ئەوپرسیارانەیەو یاساو پاكانەی مێژوویشە بۆ خەبات و بەرگری شۆڕشگێری:

1- كورد لە كوردستان خاوەن مێژوویەكی دەسەڵاتداری سیاسی خۆی بووە، بۆیە بەشـێوەیەكی سروشتی خاوەن هەرسێ مەرجی دەولەت بوون بوو (گەڵ، هـەرێم، رێكخسـتنی سیاسـی) ئەوەش لەسەرخان ڕا گەلێك (شعب) دروست دەكا، بۆیە ناكرێ بلێی (هاووڵاتیانی كـورد) دەبێ بگۆترێ (میللـەتی كـورد یـان – گـەلی كـورد – شـعب الكـوردی)، ئەگـەر هـەر میللەتێك خاوەنی مێژوویی ئەو سێ پایەی سەرو نەبێ یـان بەلایـەن كەمـەوە (هـەرێم) و خاكێكی بەناو نەبێ ئەوە لە (كەمایـەتی) پـۆلین دەكـرێ و لەچوارچـێوەی هـەر وولاتێـك بەهاولاتی ناوزەد دەكرێ نەك (گەل – شعب)، بۆیە پەیوەندی كورد و كوردستان بـەعێراق هاولاتی بوون نیە، بەلكو گەلە، دیسان دەكرێ چەند گەلێك لەناویەك دەولەت بژین ئەگەر ئەو دەولەتانەی پرانسێپی (هاولاتی بوون) لەدەستورو دام و دەزگاكان بەردجەسـتە بكـات كەچـی ئـەو دەولاتانـەی كوردیـان بەسـەر دابەشـكرا بەئاڕاسـتەیەكی ڕەگـەزی و تـایفی دەولەتیان پێك هێنا، بۆیە بەكسانی و هاولاتی بوون نەهاتەدی بەلكو هـاولاتی پلەیـەك و پلە دوو..تا گەیشتە ڕادەی تەعریبی ڕێكخراو..

---

[1] كتیبەكە بلاو كرایتەوە بەناوی (ڕۆلی عەلمانی لە دروست بوونی مەینەتی كورد) .

2- ئیستعمار دابەشی کرد زولمێکی گەورەی لەکورد کرد کەچی لەگەڵ ئەو زولمە هەندی مافی بۆ دیاری کرد، وەك ماددەکانی سیڤەر، ماددەی (16)ی ئینتداب، راسپاردەکانی ویلایەتی موسل، راسپاردەی عوسبە، - بەڵێنامەکانی عێراق بۆ عوسبە، ..زۆری تر لەکوردستانی تورکیاش ئەتاتۆرك ئەو هەموو بەڵێنەی دا بەپێچەوانەوە دەوڵەتی عێراق (دەولەتی عوسمانی داگیر کاری تری نەك هەرجێ بەجێیان نەکرد بەڵکو رۆژ بەرۆژ خراتر دەبوون، لەسەردەمی مەلەکی باشتر بوون، سەردەمی کۆماری باش تر بوون لەسەردەمی بەعس...بەوشێوە...ئەوەش لەبەرامبەردا بەپێی یاسای نێو دەوڵەتی و شەریعەتی ئاسمانی خەباتی شۆڕشگێری دەخولقێنێ.

3- ئەو وولاتانە ئامادە بوون هەمو سازشێك لە بێگانە بکەن تەنها کورد مافی سەرەتایی نەبێ ،عیراق لە سالی 1975 کۆمەلێك خاك و ئاوی بە ئێران دا بۆ ئەوەی بزوتنەوەی کورد لاواز بکا، واتە هەردەم کوردستانی بەبەشێك لە وولات هەژمار نەکردوە .

4- لە وولاتانی ئەوروپا وجیهانی مەدەنیەت وا ڕێکەوتوە چەند پیکهاتەو نەتەوەیەك لەیەك دەولەت بووینە، بەهۆی ئەوەی دەسەلاتەکە هەولی ئەوەی نەداوە نەتەوە بچوکەکە لەناو گەورەکە بتوێنیتەوە بەلکو هەولیداوە هەمویان لە دەولەت بتوێنیتەوەو سیستەمی هاولاتیبوونی لێبەرپا بکا ،ئەوانە کیشەی نەتەوەیی وکەمایەتی نەما ،کەچی وولاتانی وەك عیراق وتورکیا هەولیان داوە کورد لە نێو عەرەب وتورك بتوێننەوە ،بۆیە بەرگری کورد لە بوونیەتی نەك مافی چارەنوس .

5- لەدوای هەموو ئەوانەش گەشەو نەشونمای کوردستان و تاکی کورد سست کرا، وای لێهات، کورد بوون شەرم بوو، کاتێ لێیان دەپرسی تۆ چ نەتەوەیەکی بەشەرمەوە دەی ووت من کوردم، نەخشەی کوردستانیش بەرەبەرە بچوك دەبۆوە، لەشارستانی و پێش کەوتن دادەبڕێنرا، چی تر نەیدەتوانی وەك گەل پەیوەندی خۆی لەگەڵ گەلانی تر گوزارش بکا، بەو پێیەی کە خوای گەورە ئەرکی بەسەر مرۆڤ بەتاك و کۆ داناوە، وەك گەل ئەرکی (تعارف) هاریکاری و برایەتیە لەگەڵ گەلانی تر، کەچی میللەتی کورد( میللەتانی ژێر دەست بەگشتی) نەیان توانی بەو دۆخەیاسایی و فەرهەنگیە ئەو ئەرکە خواییە ببینن، بۆیە وەك ئەرکی خوایش پێویستی کرد خەبات و جیهاد بکەن لەپێناو هێنانەدی دەزگای

سیاسی یاسایی بتوانیٚ گوزارش لەگەلی کوردستان بکا لەهاوریکاری و برایەتی و ئیعماری زەوی لەگەڵ گەلانی تر.

6- ئەو کاتە ناکۆکیەکان بە ناچاری دەگاتە ئاستی شۆڕش کە هیچ دەزگایەك لەسەرووی ململانێیەکە نیە بۆ چارەی،ئەو کاتە خودی دەولەت دەبێتە بەشیك لە کیشەکەولایەنگیری دەکا دژ بە کەمایەتیەکە ،بۆیە ناچار میلەتی کەمایەتی پەنا بۆ شۆڕش دەبا .

7- لە کۆتایدا پاساوێکی یاسایی دەولی گرنگی هەیە (بوون بە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتوەکان)ڕوون نیە ،ناکۆکی وبۆشاییەکی یاسایی هەیە لە نێوان یاسای مافی چارەنوس و بوون بە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتوەکان ،میلەتان وەرناگیرێنت دەبیٚ دەولەت بێت (هەرچەندە نوسراوە امم المتحدە)،مەرج وریکارە یاساییەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان بەتەنها میلەت ناگەیەنیتە مافی چارەنوس، بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییە یاساییە تەکان ودروست کردنی دۆخی دیفاکتۆی-ئەمری واقیعی پیویستە ،لەوەوە بناغەو پاساوی ئەخلاقی ویاسایی شۆرشەکانی رزگاری خوازی دادەریژریت .

## 2- 5سەرەنجامی سیاسی:

هەر لەدوای ئەو قەیرانە ترسناکەی ڕووبەڕووی کوردستان بۆوە، ڕاستەوخۆ سوپا و هێزی تورك و عەرەب و ئینگلیز وەك سوپایەکی داگیرکەر بەربوونە گیانی خەڵکی کوردستان، ئیتر خەڵکی کورد راستەوخۆ لایەنە نەتەوەییەکەی وروژا، نووسەران و ڕەوشەنبیرانو خەڵکی عەوامی کوردیش بەئاگا هاتنەوە، کەوا نەتەوەیەکی سەردەست بە پاڵپشتی ئەو دەزگایەی (دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی) وا زۆرداری لە کورد دەکا، بۆیە هەست و نەستی کوردایەتی بەخێرایی کەوتە نێو شیعر و نووسین و سرود و.. زاراوەی وەك (کوردایەتی، کوردستانی مەزن، خەبات، شۆڕش، حزبی کوردستانی، ڕزگاری، ئازادی... هتد.) دروست بوو، دۆخێکی سیاسی و شۆڕشگێڕی لە سەرانسەری کوردستان چەکەرە بوو، یەکێتی نەتەوەیی جێگەی یەکێتی ئیسلامی گرتەوە، ئیتر دەرگا والآبۆوە بۆ دروستبوونی دەیان دەستە و کۆمەڵ و حزبی سیاسی لەکوردستان، بەڵام لەپێش ئەو رابوونە سیاسیە ئەوا کۆمەڵێك ڕەوشەنبیر کە دوور و قووڵ و ئایندەبینن هەر زوو

هەستیان بەو چارەنووسە ڕەشە کرد لەگەڵ بەرپابوونی بنەماکانی (اتحـاد والترقـی)، بۆیـە ئەوانیش لەوساتی چەند حزبێکی سیاسی کوردیان دروست کردووە، جا ئێستا بابزانین ئاخۆ یەکەم حزبی سیاسی کورد لەکێ بووەو ناوی چ بووە؟

## 2- 6یەکەم حزبی* کوردستانی:

لەباسەکانی پێشووتر بۆمان دەرکەوت کە پەیدابوونی حزبی سیاسی مانای گەشەکردنی کۆمەڵایەتی دەبەخشێت، هەرچەندە وادەردەکەوێ سەلبیات و پارچـەبوونە هــەروەك چـۆن درۆی منداڵ سەلبیە کەچی نیشانەی گەشەیەتی، جا بـەگوێرەی پێشـکەوتنی شارسـتانی و سیاسی و باری ئاینی و دۆخی دەروونی و نەریتـەکانی ئـەو میللەتـە ئایـدۆلۆژیای حزبـە سیاسیەکانیش دەخەملێن، زۆر ئاساییە لە وڵاتانی جیهانی سـێ یـەم تـاخیرتر بێـت، وەك شاعیر و بیرتیژەکان زووتر فکرەی نەتەوایەتی و چینایەتی و دادگـەرێتی و ئیسلامیشـیان هەبووە، بەڵام نەبوویتە خواسـتێکی میللـی (مطلب جماهيري) بۆیـە لـەو کوردسـتانەش نەتوانراوە زەمینەی حزبی جـەماوەری دروسـت بکرێـت تـا سـاڵانی پـەنجاکان و شۆڕشـە عەسکەریەکەی 14ی گەلاوێژ 1958، ئەگـەر لەپێشـتریش کۆمـەڵـەو ڕێکخـراوی وەك (تشکیلات ئیجتماعی-  ئەمین عالی بەدرخان)، (رادیکـالی عوسمـانی-  شـریف پاشـا) لەگەڵ زۆر وورده دەستە و تاقم و کۆمەڵەی تر هەبووینە وەك تێبینی دەکـری هیشـتا بـە ناوی کوردستانی نەبووە.

لەبارەی یەکەم حزب لە کوردسـتان ڕای جیاجیـا هەیـە، بـەپێی چـەند سەرچـاوەیەك (یەکێتی محمدی  کە لە سالی 1908دروست بوە یـان 1909) بەسـەرۆکایەتی سـعید نورسیيەکەمبووە، بەڵام بەپێی بەڵگەنامـەکانی ئەرمەنی (یەکێتی کـورد) بـە ڕابەرایـەتی (شێخ عبیداللە نهری)لە سالی 1880دروست بووە**، بەپێی چەند سەرچاوەیەکی تـریش

---

*هەندی تویژینەوە جیاوازی لە نێوانکۆمەڵە ودەستەو حزب دەکا، ئێمە لێـرە ئـەو مەبەسـتەمان نیـە بەڵکو بە دوای ئەو جولانەوە سیاسیەین کە کاریگەری هەبێ.

**لە سالی 1880 لەنەهری کۆبونەوەیەکی فراوان بۆ سەرۆك عەشیرەت وکەسایەتیەکان کراو تیایـدا شێخ گوتارێکی ئاینی وسیاسی خوێندەوە ووتی : پێش نزیکەی 6سـەدەعوسمانی دەسـەڵاتی گرتۆتـە دەست بێ دەنگ بووین بەڵام ئیستا بەرەو عەلمانیەت دەڕوا حەتمـەن تێـك دەچـێت، کـاتی یـەکگرتمان

(کۆمەڵەی عەزم- عزم قوی جمعیتلر)[1] لەساڵی 1900 دروست بووە بریتیە لە یەکەم حزب،لەلایەکی تریش لەسالی 1907لەشاری دهۆك لەمالی شێخ محمد بریفکانی لەکۆبونەوەیەکی فراوان (پەیوەندی کورد)بەسەرۆکایەتی شێخ عبدالسلام ڕاگەیەنراو تیایدا خواستەکانی کوردی بەرجەستەکرا هەر هەمووشیان داوای جێبە جێ کردنی تەواوی شریعەتی ئیسلامیان دەکرد ،ئەوانە هەمووی ئەگەر یەکەم حزبی کوردیش نەبن یەکەم دارِژەری بنەماکانی سیاسی کوردایەتی بووینە ،هەرچی محمد امین زکی بەگ وبەدوای ئەویش زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسان(حزبی تەعالی و تەرەقی کوردی) بە یەکەم حزب لە کوردستان داناوە، ئەویش لە هەمووان کاریگەرتر بووە، ئێمەش لەسەری دەڕۆین.

## 2- 7حزبی تەعالی و تەرەقی کورد:

لەسەرەمەرگی خیلافەتی عوسمانی، لەپێش بزووتنەوەی مەشروتیەت (دەستوری) 1876، بیرۆکەی (جوان تورك- تورکیای لاو) پەیدابوو، یەکەم جار لە 1867 لە رۆژنامەیەکی بەلجیکیئەو ناوەیبلاوکرایەوە، لاسایی ئەڵمانیای لاو، فرنسای لاو، ئیتالیای لاو، بەریتانیای لاو... بوو[2]، لە 1889 (ئیتحادالتعالی و الترقی تورك) وەك باڵی عسکری جوان تورك لە دژی خیلافەتلە لایەن(د.عبدالله جودت،د.ئسحاق سکوتلی، ابراهم تمو، محمدرشید جرکسی )بە رێبازیکی عەلمانی و دوای بەسەرۆکایەتی (احمد رەزا بك) دروست بوو، زۆربەی سەرچاوە ئیسلامیەکان ئەو حزبە بە دروستکراوی زایۆنی و

---

هاتوە، بەو شێوەیە کۆمەڵەی کورد لەوێ ڕاگەیەنرا ، بۆ زیاتر بڕوانە :جلیلی جلیل- الإنتفاضة و خالفین —صراع علی کوردستان والکورد والدولة العثمانیة .

[1]بروانەد عبدالله جودت والقومیە الکردیە - ص27 . هەروە ها لە بەلگەنامەکانی بەریتانی وفرنسی ناوی دەستەیەك لە کۆمەل و ڕێکخراوی سیاسی ونا سیاسی تر بەو شێوە هاتوە :کۆمەڵەی عەزم (دەلیٚ لە سالی 1900ز دروست بووە لە ئەستەمبۆل بەسەرۆکایەتی ئەحمەد رامز، جەمعیەتی نەشری مەعاریفی کورد17\7\ 1912ئەستەمبۆل- عبد الرحمان بدرخان، جەمعیەتی هێڤی کورد، جەمعیەتی موحیبی کورد، کۆمەڵەی جیهانزانی، کورد ئیستقلال قومیەتی، جەمعیەتی تەعالی کورد —لە 17\کانونی یەکەم \1918بە سەرۆکایەتی شێخ عبدالقادر دروست بوو لەگەڵ تەعالی وترەقی سەروو جیایە ئەگەر چی بە هەمان ناوو سەرکردەش بووە، ...لەگەڵ زۆری تر ,

[2]بریتانیای لاو لەسالی 1842دروست بوە بەسەرۆکایەتی دزرائیل وجیگری تۆماس کارلیل، ئیتالیای لاو لە 1831بەسەرۆکایەتی ماتزینی دروست بوە لەگەشەی حزبی کاربوناری.بڕوانە: مارکس-انجلس بیان الشیوعی ص69 پەراویز.

ماسۆنی له قەڵەم دەدەن، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئـەو حزبـە لـەڕۆژئاوا دروسـتکراو ئـەوانیش هانیان داو پێیان گەیاند. ئەوکاتی (شـریف پاشـا)ی کـورد سـەفیری عوسمـانلی بـوو لـە فەڕەنسا، بەخێرایی پێوەندی بەو حزبە کـرد، وەك خـۆی[1] دەڵێـت: کـەسمان هەسـتمان بـە جیاوازی نەتەوەی نەدەکرد[2]، لەو سـەردەمی کـە بینیمـان بنـەماکانی ئـەو حزبـە باسـی سەروەری مێژوو و نەجیبایەتی تورك دەکات بـەجیا لـە عوسمـانلی، ئێمـەش لەگـەڵ (ذو الکفل، ئەمین عالی بەدرخان‌شێخ عبد القادر ئەمین، ...) حزبێکی هاوشێوەیان لە 2/تشرین یەکەم/ 1908 دروسـت کـرد بـەناوی (تعـالی وترقـی کـورد جمعیتلـەر)*، خـەڵکێکی مافناس و ئاینی و ئەفسەری تیابوو، بەڵام نەبووە حزبێکی موئەسەسـاتی و جـەماوەری و خاوەن نەخشەو بەرنامە، بەتایبـەتی (شـریف پاشـا) نوێنـەرێکی وریـای کـورد بـوو لـە رێکەوتننەکانی ئاشتی لە پاریس، بەڵام ماندووناس و پیـاوی ڕابـواردن بـوو، هـەروەهاش دووڕای جیای تێدابوو یەکەمیان داوای سەربەخویی تەواوی بۆ کوردستان دەکرد دووەمیـان کۆنفیدرالیـەك بـە ناوی‌جامیعـەی ئیسـلامی، بۆیـە ئـەو حیزبـە نـەیتوانی بەدروسـتی سەرکردایەتی شۆڕش 1925 کوردستانی تورکیا بکات، کە خەریکیش بوو سەرکەوێت و ئینجا هەر تێشکا، لە ساڵی 1927 شۆڕشەکە دامرکایـەوەو (حزبـی تعـالی کـورد)یش کزبووە، هەر لەسەرەتاشەوە باڵی عەلمانی کـورد و ئیسـلامیەکەی لـەبارەی (ئـە نقـەرە و ئەستەمبۆل) رێك نەبوون، تا لەساڵی 1927 لە کۆنگرەیەکی فـراوان لەگـەڵ کۆمـەڵێك گروپ و کەسایەتی تر(حزبی خۆیبونی- سەربەخۆبوون)یان لێ دروست کرد بۆ ڕابەرایـەتی حکومەتی ئەرارات بـە سـەرکردایەتی (احسـان پاشـا)[3]، سـەرنج بـدە هـەتا ئـەوکاتیش (کوردایەتی) نەبووە ویستێکی گشتی، هێشتا شۆڕشەکان ناوی کوردستانیان پێـوە نـەبوو نـاوی ناوچـەکانی پێوەبـوو. بەرەبـەرە حـزب و بـیری سیاسـی نەتـەوەیی و مەدرەسـی-

---

[1] بڕوانە ژیانی شریف پاشا.

[2] هەمان شت (محمد امین زکی بەگ)یش لە کتێبی (خولاسەی کورد و کوردستان) دووپـاتی دەکاتـەوە. هەروەهاش (ساطع الحصري) لە کتێبی (محاضرات في نشوء القومية).- ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینـە ئەو گۆڤارەی (مەشروتیەت)کەشریف پاشا دەری دەکرد دەبینین هـەتا ژمـارە 42 ی سـالی 1903 باسێکی کوردی وای تێدا نیە لەدوای ئەو ژمارانە ئینجا ئەو باسانە دێتە گۆڕێ،ئەوەش هەر نیشـانەی ئەوەیە کەسەرەتای ئەو کێشانە تائەو دواهییانەش نەبووە بە زەقی، دوای لەو سەردەمی سەری هەلدا.

*لە سالی 1918 درێژەیان بە حزبێکی هاوشێوەی ئەو ناوە داوە .

[3] بە پێی بەلگەنامەی بەریتانی (ڕاپۆرتی ئیلفینستۆن) یەکەم سـەرۆکی خۆیبـوون جـەلادەت بـەدرخان بووە .

عەولەمی گەشەی کرد هەتا جەنگی جیهانی دووەم و دامەزراندنی کۆماری مهاباد یەکەم حزبی نەتەوەیی کوردستانی بەزەقی دروست بوو.

بەو شێوەیە گەیشتینە سەربردەی یەکەم حزبی کوردستانی و رەهەندەکانی، ئیستاش دەچینەپال حزبە کوردستانیەکانی ئەو سەردەمە، کە لە سەرەتاکانی عەولەمەو کاریگەریەکانی دەست پێ دەکا .

# بەشی سێیەم

## مەدرەسەکانی عەولەمە

### 3- 1عەولەمە- جیهانگیری (*Globalism*)

لەدوای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو باس و زاراوەی (عەولەمە) زۆر بەخەستی کەوتە جیهان لەگەڵ تەنینەوەو خێرابوونی پەیوەندی و کەناڵە ئاسمانیەکان، بۆیە بەشێکی زۆر واتێگەیشتوون—لەوانە روتشیلد و روبەرت کوهین - عەولەمە زادەی سەدەی نوێیە و واتە تەمەنی 15- 20 ساڵێکە، زیاتر لەگەڵ جارنامەکەی سیستەمی نوێی جیهانی جۆرج بۆش لە 1991 لی تێکەڵاّ بووە،بەشێکی تر پێیان وایەلەگەڵرێکەوتنی "جات"1947- 1948هاتووە*، ئەوەی زیاتر ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە پتەو دەکا ئەوەیە وەك زاراوە لە فەرهەنگ و نووسینەکۆنەکان نەهاتوون، هەتا لە فەرهەنگێکی چالاکی وەك ئۆکسفۆردی 1991یش ئەو زاراوە نەهاتووە، یەکەم کەسزاراوەی(گلوبال-عولمە)ی بەکارهینا کۆمەڵناسی کەنەدی (ماك لوهان)بوو، راستیەکەی ئەوەیە زاراوەی عەولەمە لەو ماوەیەی دوای نەوەتەکانی سەدەی بیست هاتووەوەك (توماس فریدمان ) دەڵێ(( لە دوای جەنگی سارد ناوێکی وانەبوو گوزارش لەو قۆناغە بکا و ئیتر ئەو ناوە هاتە کایەوە))، ئەگینا ماهیەتەکەی کۆنە لە سەدەکانی 17- 18 بەرێکەوتووە،لەدوای شۆڕشی پیشەسازی و دۆزینەوەی کیشوەرەکان و کارلێك کردنی ئادەمیزاد لەگەڵ یەکتر لەسەر ئەو زەویە، بۆیە دەبینین ئەو سەردەمی وەسفی جیهان بە شاریکی گەورە دەکرا (هەروەك کریستیان کاوس لە پێشەکی کتیبی ئەمیر وای وەسفی جیهان کردوە) هەرچی ئیستایە جیهان بە گوند وەسف دەکرێ، یەکەم جار لە زانستەوە عەولەمە دەستی پێکرد و

*ئەو رێکەوتنە لەنێوان ولاتانی پێشەساز بوولە1947دەستی پێ کرد لە 1948 پەیرەو کرا، 7 خولی تری دانوستان کرا تا سالی 1994بۆ ئازادی بازرگانی جیهانی 124 وولات مۆریان کرد،سەرجەم بەلگە نامەکان 22000وکیشەکەی 175 کیلۆیە —بروانەالموسوعة السیاسیة الاذاعیةص148

هەموو بەشەریەت لێکـی وەرگـرت بێـئـەوەی ناسـنامـەیەکی ئـاینی یـان جـوگرافی یـان شارستانی و ڕەگەزی تیابێ، ئینجا بەرەبەرە وەك ئیبن خەلدون وتوویەتی: داب و نـەریت و دەستووری سیاسی و فەرهەنگی و کەلتووری لای سەرکەوتوو دەبووە جیهـانی[1]، هـەر لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم، دوای سەرکەوتنیسـەرخانی مەسـیحی بەسـەر خیلافـەت، بەرەبەرە بەرواری زایینی جێی بە بەرواری (ڕۆمی) و (کۆچی) لەق کرد تـا بـوە جیهـانی، ئینجا پێوانەکانی کێشان و پێوان و دووری و... هەمووی بووە مەتر و کیلـۆ و لـیتر و... ئینجا جل و بەرگیش لەگەڵ زۆر دیـاردەی تـری وەك یاسـای نێودەوڵـەتی، جارنامـەکانی جیهانی، (کۆمەڵەی نەتەوەکان- عصبة الأمم).. بەشی زۆریشیلە فەرهەنگی فەرەنسـیڕا بڵاوبـۆوە، بەرەبـەرە لەگـەڵ گەشـەکردنەکانی کۆمەڵگـە و ئـادەمیزاد و سیسـتەمەکانی زانسـتی و ئـابووری و سیاسـی و عـەقڵی و شارسـتانی و کـەلتووری.. لەگـەڵ بـازدانی ئامرازەکانی پەیوەندی و هاتووچۆعەولەمە زیاتر بـاڵی کێشـا بەسـەر جیهـان، ئـیتر لـەو سەردەمە کەمتر دیاردەی دەڤەری ماوە ئۆتۆماتیکانە بوویتە عەولەمی،هـەروەك (مـاری بورلی )دەلیت سەردەمی نەتەوەکان کوتایی هـات و نـۆرەی زەوی گەراییـە (عولمـە)، جـا لـەباری وادا دەبتـە جۆرێـك لـە ململانێـی ناسـنامە، هـەروەها قەرەباڵغیفاکتـەرکان و گواستنەوەی مرۆڤ لە چواردیواری کۆمەڵگـە و سنورەبچـووکەکەی بـەناوی نیشـتمان بـۆ جیهان، بەو شێوەیە هەم جیهان بۆی بچووك دەبێتەوە هـەم زەمـەنیش تەسـك دەبێتـەوە، ئالێرەدا بیردۆزەی پێناسی عەولەمە بەمانا بچـووك بوونـەوەی جیهـان هاتیتـە کایـەوە و بە(جیهان دێیەکی بچووك) وەسف دەکرێ.

## 3- 2 سێ عەولەمە یان دوو:

زانایانی پسپۆر کەمتر کێشەیان هەیە لەبارەی سەرهەڵدانی عەولەمە و ڕەگ و ریشەی ئاینی و سروشتیەکانی، بەڵام بەشی هەرەزۆری عەولەمە بۆ (3) قۆنـاغ دابـەش دەکـەن، عەولەمی پەیام (ئیسلامی)، دووەم عەولـەمی شـیوعیەت (أممیـة)، سـێیەم عەولەمـەی ئێستای سەرمایەداری.

[1]ابن الخلدون —مقدمة ، تحقيق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر-القاهرة ص192

ئەو دابەشیە زۆر دروست و زانستی نیە، ئەوە کاریگەری هەردوو تیۆری (ململانێی شارستانی) هندگتۆن و (کۆتایی مێژوو)ی ڤۆکۆیامای لەسەرە، مادام ناوی قۆناغ بهێنێ، خۆ بیکردبایە (3) جۆر ئەوە مانایەکی تری هەڵدەگرت، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە هەردوو جۆر عەولەمەیە:

1- عەولەمەی ئیسلام/ یان بەگشتی عەولەمەی پەیام، کە لە سەرەتای بەشەریەت لەشێوەی دەڤەری هاتووە تا لە پەیامی ئیسلام بووە جیهانی، ئینجا عەولەمی ئیسلام لە ئامانج و پێکهێنان و سیستەمدا زۆر جیایە لەگەڵ عەولەمی بەشەری، بۆیە عەولەمەی ئیسلام بەناوی (عالمیة الاسلام) ناودەبرێ نەك (عەولەمە)، هەروەك (سمیر عاطف زین) کتابێکی بەناوی (عالمیة الإسلام ومادیة العولمة) هەیە.

2- عەولەمەی بەشەری، هەڵبەتەپەیام پێشڕەوی بەشەریەتە هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆمەڵگەش دەمێنێ هەر پێشڕەوە، بۆیە جیهانیەتی پەیام زیاتر لە (10) سەدە لەپێش عەولەمی بەشەری هاتووە و ئێستاش هەر ڤاکتەری مونافیسە بۆی، لەڕاستیدا عەولەمی شیوعیەت و عەولەمی سەرمایەداری جیانین لەڕووی مادیایەتی، یان وەك (تۆینبی) وەختی خۆی وتبووی، دوو ئاوازی یەك گۆرانین، دوو قۆناغیش نین و هەریەکە سەر بە دوو سەربازگە و دوو سیستەمی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییش نین (لەگەڵ جیاوازی زۆری نێوانیشیان)، نەخێر بەڵکو هەردوولا سەر بە یەك عەولەمەی بەشەرین کە زادەی عەقڵی بەشەرین بەگشتی، ئەو عەولەمەی ئێستاش زادەی سەرمایەداری نیە بە تەنها، هەروەك بەشێکی زۆر واتێگەیشتوون بەتایبەتی ڕەوشەنبیری کورد وسیستەمی ئایدیۆلۆژیای زۆربەی حزبە ئەکتیڤەکانی کوردستانیش[1] .

ئەو عەولەمەیە ناسنامەی شارستانی و ڕەگەزی و جوگرافی و ئاینی نیە، هەرەوەزی هەموو کۆمەڵگەیە، بەڵام ڤاکتەری لایەنێکی زیاتر بەسەردا زاڵە، ئەوەشبابەتی (پێشڕەوایەتی و سەرکردایەتی عەولەمەیە) نەك خودی عەولەمە، لەوەیان دا بە سەلبی دەگەڕێتەوەو کێشەکانی (ناسنامە) و (هیمنة) و (تقزم) دێتە پێش و دەردەکەوێ ئەو عەولەمەیە (یان ئەودێیە بچووکە) دروست نیە ئەوەندە بەباشە باس دەکرێ، یەك ڕەنگ و

---

[1]سەرنج بدە لە (ڕاپۆرتی سیاسی- کۆنگرەی دووەمی ی.ن.ك- ل2.) چۆن سەرمایەداری وعەولەمەومافی مرۆڤ وبازاری ئازادی پێك وەبەستوە .

یەك ئاست و یەك تەرازوو.. نیە بەڵکو لەو دێیە (برسی و تێر، ڕەش و سپی، سەروو و خواروو، دەوڵەمەند و هەژار، کێخوا و خزمەتکار، ئازاد و دیل، خاوەن و بەندە،...)هەیە، بۆیە ئەو عەولەمەیە ئایدیۆلۆژیشە، پێکهاتووە لەدژولایەنگیری، (تەنزیری) بۆ دەکرێ هەروەك ئەو تیۆرەی (شارستانی- هندگتۆن) و (مێژووی- ڤۆکۆیاما)، کە خۆی دەنوێنێ لە : وڵاتانی سەرمایەداری باڵا و کۆمپانیا باڵاکان، چینە دەوڵەمەندە کۆمبرادۆرەکان، لایەنی مادی خواز.. دژەکانیش بریتین لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو، چینی هەژار بەگشتی کە زۆرایەتی پێك دەهێنن، لایەنی ئاینی..

سەرەڕای ئەوەش عەولەمی بەشەری کاریگەری لەسەر ئیسلام هەیە بە ئیجابی، چونکە ئەو عەولەمەیە لەجیهانی ئیسلامی جارێکی تر ناسنامەیەکی ئیسلامی جیهانی دەداتەوە تاکو کۆمەڵەکان، هەم ڕەهەندە جیهانیەکانی ئیسلامی زیندوو دەبیتەوە لە جیاتی ڕەهەندی دەڤەری ونەتەوەیی و..ئەوەش تەکانیکی تری سەرباری بە هێزی ڕابوونی ئیسلامیە، یەکسەر دەبیتە هۆی قەلۆش بوونی مدرەسەکانی تریش .

## 3 -3 بناغە و فاکتەرکانی عەولەمە:

عەولەمە داهێنان و بڕیار نیە، سەرەنجامێکی مێژوویيە، هەردەبوایە بێت، هەر سروشتەکانی مرۆڤ بەتاك و بەکۆ سیفاتەکانی عەولەمی هەڵگرتووە، هەروەها دیاردەکانی سروشتیش، بەجۆرێك هەموو پێویستیەکانی بەشەری جیهانین هەر لە تیشکی خۆر و مانگ ئاوو و هەواو ئازادی و دادگەری و ڕاستی و...هتد، بەشە (کەمالیاتەکەی) زادەی مرۆڤ خۆیەتی، ئەویش لەگەڵ گەشەی کۆمەڵ دەبێتە جیهانی، هەر بۆیەش مەبەستەکانی پەیامی ئاسمانی لە کۆتاییدا جیهانییە، هەروەك قۆناغەکانی پەیام لەرێی پێغەمبەرەکان(د.خ) واهاتووە لەسەرەتا بۆ بنەماڵەئینجا بۆ نەتەوە و چینێك ئینجا بۆ ناوچەیەکی فراوانتر تا لەدوای (ئیسلام) بۆ هەموو جیهان هات، هەروەها بانگی ئیسلامی سەرەتایش بەو قۆناغانە ڕەت بوو. بۆیە موسڵمانانی ڕاستەقینە ئەندامێکی جیهانیە، بگرە گەردوونی یە، نەك ڕەچەڵەکی و نیشتمانی ودەڤەری. مادام سروشت و ویست و ئارەزووی بەشەریەت هاوبەشە، ئەوەش بناغەیەکی بەهێزی عەولەمەی ئێستایە، جا چۆن

هەر ئادەمیزادێك کۆمەڵێك ڤاکتەری ئیجابی و سەلبی کاری لێ دەکا بە قەبارەی جیاجیا، ئاواش کۆمەڵگە بەو ڤاکتەرانە کاریگەرە.

لە فاکتەر سەلبیەکان:ئابووری زیادەڕەو، بەرەژەوەندی تایبەتی، خۆویستی، چینایەتی، نەژاد و ڕەگەزپەرستی...

لە فاکتەر ئیجابیەکان:ئایدیۆلۆژیای دادگەری، بەرژەوەندی گشتی،...

بۆیە شان بەشانی یەك لەڕەوتی تەمەنی عەولەمەدا چوار مەدرەسەی سەرەکی فکری و سیاسی خەملیوە، هەریەکە کۆمەڵێك چارەسەر و ڕێبازی تایبەتی خوی هەیە بۆ بەرنامەی ژیانی تاك و کۆ، هەر مەدرەسەیەکیشپێکهاتووە لە یەکگرتنی ئایدیۆلۆژیا و ئایین، هەربۆیەش ئەو مەدرەسانە لەو سەردەمە رۆڵی ئایین دەبینن لە (فەرمان و ڕێباز و ئەرك و بەرنامەی سیاسی)دا، ئەو مەدرەسانە - بەتایبەتی شیوعیەت - کاریگەریەکی گەلێ خەستی لەسەر حزبە کوردستانیەکانی عەلمانی کردووە، بۆیەپێش ئەوەی ببێتە سەر حزبە کوردستانیەکانی قۆناغی نوێ کورتەباسێکی مدرسەکان دەکەین:

# 3- 4 مدرسەکانی عەولەمە:

لەنێوان کۆمەڵێك تیۆری سیاسی و فەلسەفی و کەلتوری فەرهەنگی کە لەسەرەتای ڕێنیسانسی جیهانی سەری هەڵدا، چوار مەدرەسەی سەرەکی خەملاند لەکۆتاییدا وەك بەدیل بۆ یەکتر لەجیهانی نوێدا، هەروەك چۆن هەرژمارەیەك لەو جیهانە لەو (9) ڕەنوسە پێکهاتبوو، ئاواش ئایدیۆلۆجیای هەر حزبێك لە جیهان و کوردستانیش لەو چوار مدرسەیە پێکهاتووە، جا یان سەر بەیەکێ لەو مەدرەسانەیە یان لە تێکەڵێك لێیان، لەگەڵ چەند وردە تەوژم وئایدیۆلۆژیایەك نەگەیشتوونە ئاستی مدرسە.

مدرسەکان بریتین لە:

1- لیبرالی2- شیوعیەت3- سۆشیالیستی4- ئیسلامی.

هەڵبەتە کۆمەڵێك پرسیار لەسەر خاڵی (4) دروست دەبێ بە ئاڕاستەی جیاجیا و بگرە پێچەوانەش، بەشێك پێیان وایە زۆر لە مدرسە بالاتر و فراوانترە، بۆچی دابەزێنراوەتە ڕیزی مدرسە کە زیاتر زادەی ئایدیۆلۆژی بەشەرە، بەشێکی تر پێیان وایە ئیسلام ئاینێکە کاتی بەسەرچووە و خانەنشین بووە و بۆ ئەو سەردەمە ناشێت، ئیتر پێیان

وایە ناشێ بەرزبکرێتەوە بۆ ئاستی مدرسە، هەشە پێی وایە مدرەسەیە، بەڵام بەناوی ئیسلام نەبێ بەناوی ئایینی (واتە مەسیحی و یەهودی و... ئاینی تریش بگرێتەوە).

وەڵامی یەکەم و دووەم لە بابەتی ئیسلامی سیاسی (رابوون) داهاتوو دەدۆزرێتەوە، راستە مدرەسەی ئاینی فراوان ترە، بەڵام ئاینی ئیسلامی و ئاینی یەهودی و مەسیحی لە جەوهەردا تەواو لێك جیان،کەمتر ئەو ئاینانە داوای حوکم دەکەن، جگە لە رارەوی کالڤنی لە مەسیحیەت داوای پیادە کردنی ئاینی دەکرد بە تاقی تەنها بێ شەریکایەتی لە گەل عەلمانیەتدا، ئەوانی تر زیاتر وەك ئاینی تاکە، بۆیە لە پۆلێکدالەگەڵ ئاینی ئیسلامیکۆنابنەوە، زیاتر مەسیحیەتلەگەڵ ئایدیۆلۆژیای لیبرالی مدرسەی لیبرال دیمکراسیان پێکهێناوە و یەهودیش لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای سۆشیالیستی ئەو زاوزێیەی کردووە[1]، هەرچی ئیسلامە کەمتر ئەو زاوزێیە هەڵدەگرێ، سیستەمێکی تایبەت و تەواوی خۆی هەیە، بۆیە لەو سەردەمە بچووك تر دەرکەوێ یان زل تر لای بەشێکی زور لە گۆڕەپاندایە وەك بەدیلی ئەو مدرسانە، بە گەڵاڵەکردنی ئاشتیانەی بەرنامەی شارستانی خۆی.

بەو شێوە زۆر بەکورتی و خەستی باسێکی سەرەتای هەریەکە لەو مدرسانە دەکەین تا ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان ساغ بکرێتەوە لە و مدرسانە :

**1- مدرسەی لیبرالیزم (لیبرال دیمکراسی)** لە بنەچەدا (Liberaty) مانای ئازادییە، بەڵام ئازادی ئەو سەردەم گۆڕانکاری ڕیشەیی ویستووە، دوایبە یەکگرتنی لەگەڵ دیمکراسی مانا و مدرسەیەکی تری (فلسفەی تاك)ی وەرگرت، هەڵبەتە (دیمکراسی) و (لیبرالی دیمکراسی) زۆر لێك جیان، دوایی باسی دەکەین.

بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین ڕەچەلەکی دیموکراسی دەدرێتە ئەزمونی یۆنانی کۆن بەڵام بە پێی هەندێ توێژینەوەی مێژوویی وا پیدەچێ ئەوانیش لە فارسیان وەرگرتبێ، بە پێی ئەو مشت ومڕەی کەلەلایەن (هیرۆدۆتس)ەوە لە522پ زنەقل کراوە لەدوای ئەوەی فارس

---

[1] بروانە:سبینوزا –رسالة فی اللاهوت والسیاسة ،ترجمة:د حسن حنفی،دارالطباعة–بیروت،ط1 ص15وەرگێڕی ئەو کتیبە لە ص100 ئەو (ثالوثة)ی هیگلی وادارشتوە :ئاینی یەهودی تایبەتTheses ،ئاینی مسیحی دژیunti Theses کە ئیسلامیش هات ئەوا syn Theses.

علی عزت بیکۆڤیجیش لە (الإسلام بین الشرق والغرب)هەمان ڕەئی دووبارە دەکاتەوە .

ناوچەکانی ئەوانی داگیر کردوە سێجۆر حوکم باس دەکاو لەکۆتاییی دا لەسەر پێشنیاری(ئۆتانۆس شێوەیئیزۆنومیا)هەلدەبژێرن کە شێوەیەکی هاوشیوەی دیموکراسیە.

ئەو مدرسەیە وا دەڕوانێتە ژیان کە سەربەستی لە بڕواو کار و ماڵداری تاك خوی لە خویدا کۆمەڵگەیەکی ئازاد و داهێنەر دروست دەکا، لەکۆتاییدا هاوسەنگیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و دەروونی بە ئارامی دروست دەکا، ئەوەش چاکترین دادگەری مومکینە، ماوەیەکی دوورودرێژە لە ڕۆژئاوا پەیڕەو دەکرێ، بووەتە پاڵپشتێکی بەهێزی کەلتوورونەریتی سیاسیو ئابوریو کومەلایەتی ...، لەراستیدا دیمکراسی لایەنی سیاسی ئەو کۆمەڵگەیە، لیبرالیش لایەنی کۆمەڵایەتیەکەیتی، هەرچی سەرمایەداری و بازاڕی ئازادە لایەنی ئابووریەکەیەتی، واتە لایەنی سەلبی و ئیجابی هەیە، زیاتر سوو و پاوەنی بازاڕ و فراوانی چینایەتی جەوهەری ئەو سیستەمەیە، کە هەموو بەشەکانی لە چوارچێوەی بنەمای فراوانی (بەرژەوەندی) دەنوێنرێت، کۆمەڵگەیەکی پراگماتیت بۆ دروست دەکا، بۆیە لە ئەنجامی سەرەتاکانی پەیدابوونی (هەژار و دەوڵەمەند) (وڵاتی هەژار و وڵاتی دەوڵەمەند)ە، (بەهێز و بێهێز)ە...

لەبەرامبەر ئەوبنەما کوشندانە بووە لەدوای هەردوو جەنگی جیهانی لە ساڵی 1948 کۆمەڵێك (مەبادیئی مافی مرۆڤ)ی لێ جاڕدرا وەك لایەنی ئەخلاقی ئەو مەدرەسەیە، ئەگینا هیچ بنچینەیەکی ئەخلاقی تیا نیە لە تیۆر و پەیوەندی و حوکمی دیکتاتۆری بەرژەوەندیدا.

**بنچینە فکریەکانی لیبرالی :**

ئەو ڕێبازە لە شەبەنگێك تیۆر و فکر و ڕاڕەوی ئایدیۆلۆژیا و ئاینی و زانستی جیاجیا پێکهاتووە، مێژوویەکی تیۆری کۆنی هەیە (لەپێش زایین)، بەڵام پەیڕەو بوونی لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری دا هەموو ئەو زانا و فەیلەسوف و مەدرەسانە دەگرێتەوە کە بەشدارن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شۆڕش بەسەر دەسەڵاتی کەنیسە بەتایبەتی فکری (دیکارت)، (فرانسیس بیکۆن) (ڕۆسۆ) تا دەگاتە دوورەکەیان لە سیاسەت کە (تیۆری پەرەسەندنە)، ئەگەر گەشەکردنی ئەندام و مانەوەی چاکترین جۆرەکان (البقاء للأصلح) یاسای بایەلۆجی داروینی بن، ئەوا کەڵەکەبوونی سەرمایە و کۆمپانیاکان لەدەست کەمایەتیەکی کارامە و هێزدار و دەست بەتاڵی زۆرایەتیەکەش پێی وتراوە (داروینیەتی

کۆمەڵایەتی)، (ئادم سمیث) وتوویەتی: بەختیاری گشتی دێتەدی کاتێك هەرکەس بەدوای بەرژەوەندی خۆی بێت، ئەوە یان لە ئابووری، (دورکایم و کرۆتچە) لە کۆمەڵایەتی و (سپینر) لە گەشەکردن (وجودیەکان) لەبارەی سەربەستیدا.. هەریەکە یان وەستای کارامەی ئەو مەدرەسەن .

هەرچەندە پێشتر سەرمایەداری وەك نەخۆشی و ئافات سەیر دەکرا، بەڵام لەدوای سەرنەکەوتنی ئەزموونی سۆشیالیستی، لە سەدەی نوێ سەرمایەداری جارێکی تر وەك ئایدیۆلۆژیا و عەقیدە هاتەوە مەیدان، دو کتێبەکەی —فۆکۆیاما- (کۆتایی مێژوو) و —سمۆئیل- (ململانێی شارستانیەکان) چەکی فکری ئێستای مدرسەی لیبرالیەتە.

نموونەی ئەو مدرسەیە کۆمەڵگەی ئەوروپی و هەندێ وڵاتانی ئاسیایە یاخود وردتر بڵێین کۆمەڵگەی مەسیحی زیاتر سەر بەو مەدرەسەیەن، هۆیەکەش سادەیە زیاتر لەگەڵ باری دەروونی ئەو جۆرە کۆمەڵگە دەگونجێ کە گونجاوە لەگەڵ ناوەرۆکی ئینجیل و نەریتی مەسیحیەت (کە لە بابەتێکی تایبەتیدا باسی لێوەدەکەین).

ئەو فکرەیە پێشهەموو ڕێبازە عەلمانیەکانی تر لەسەر دەستی (د.عبدالله جودت- ئیسحاق سکوتی..) هاتۆتە کوردستان بەناو و بەڵێنی ڕزگاری و بەتەکنیك کردن، ئێستا جارێکی تر نۆرەی ئەو مەدرەسەیە لە کوردستان هاتۆتەوە، دوای ئەوەی لە سەردەمی شاخ بە ڕەجعی لەقەڵەم درابوو.

## 2- مدرسەی شیوعیەت (مارکسی- لینینی)

مارکس (1817- 1883) هاوڕێ فکری انجلس (1820- 1890)، پێکەوە کۆمەڵە تیۆرێکی ئابووری سیاسی کۆمەڵایەتی بە بناغەیەکی فکری فلسفی مادی توند دارشت، تیایدا مزگێنی داڕوخانی سەرمایەداری دا لەسەردەستی چینی کرێکاران و هاتنی بەهەشتی شیوعیەتی بێ (دەوڵەت و پۆلیس و یاسا و خێزان و موڵکیەت...) جارڕدا، یەکەم کەس و وولآت کە پەیڕەوی ئەو ڕێبازەی کرد لەئاسمانی تیۆریەوە هێنایە سەر زەمینی کارپێکردن لینین( 1870- 1924) بووبە هۆی شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 لەڕووسیا، بەو شێوەیە ئەو ڕێبازە ناوی لێنرا (مارکسی- لینینی).

**ئایدیۆلۆژیا له سەردەمی مارکس:**

ئەو ڕاوبۆچوونانە هەبوو لەو سەردەمی کە مارکس پوختەی تیۆرەکەی لەسەر دارشت:

*کۆتایی ڕووبەڕوو بوونەوە بوو لەگەڵ بیدعەکانی کڵێسە کە تەنها باج (11) جۆری سەپاندبوو.

+ لەبارەی گۆڕان و موڵکیەت ئەوجۆرە راو بۆچونانە هەبوو:

*ئەدمۆند بیرك (1870): کۆمەڵ بەپێی پێویستیەکانی دەگۆڕێت.

*سان سیمۆن (1760- 1825): کۆمەڵ دەگۆڕێت بەپێی گۆڕانی موڵکیەت.

*بیریارەکانی شۆڕشی پێشەسازی: زۆربەی داوای نەهێشتنی موڵکیەی تایبەتیان دەکرد.

+ لەبارەی سیاسی و ئابووری:

*(ئادەم و سمیث و ریکاردۆ) ئەوانە سیاسەتیان بە ئابووری بەستەوە.

+ چینەکان:

*ئۆگست پلانك (1805- 1881): پێشبینی دارمانی برجوازیەت و هاتنی پرۆلیتاریای کرد.

+ کاریگەریەکانی تر:

*هەریەکە لە کتێبەکانی (هۆلباخ- نظام الطبیعة)، (مۆرگان- المجتمع القدیم)، و تیۆری پەرەسەندن و مبدأ الافوازیەی کیمیا کاریگەریەکی مەزنیان لەسەر مارکس هەبوو.

(لینین)یش لەکتێبی (مارکس والمارکسیه) لەو وەسفەدا دەڵێ مارکسیەت میراتگری:

1- فەلسەفەی کلاسیکی ئەلمانی (فیورباخ- هیگل)ە.

2- ئابووری کلاسیکی ئینگلیزی (ریکاردۆ- ئادم سمیث).

1- سۆشیالیستی کلاسیکی فەرەنسی.

**تیڕوانینی ئاینیشی بە گوفتەیەکی بەناوبانگ (ئاین تلیاکی گەلان– الدین افیون الشعوب) لەلای مارکس هات[1]، لە پێش ئەویش بارون دولباخ ووتبوی ئاین هونەری سڕ کردنی میللەتانە تا هەست بە چەوسانەوە نەکەن[] .**

---

[1]. دەقی ووتەکەی مارکس لە کتیبی(نحو نقد لفلسفة الحق الهیجلیة- 1844م) وانوسراوە: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي . إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة ، هو قلب عالم لا قلب له ، مثلما هو روح وضع بلا روح . إنه أفيون الشعب .

**بنچینه فیکریەکانی:**

سەرنجەکانی مارکس لەوە دەستی پێکرد بینی ئەو خەڵکەی دەوروبەری لە جم وجـۆڵ و سەردان و کۆبوونەوەو سیاسەت کردن و دۆزینەوەی زانستیەکان و ناکۆکی و شین و شـای و هونەر تا دەگاتە ئینجیل خوێندن هەمووی بۆ یەك مەبەستە- ئەویش مادەیە.

*لەسەر ئەو بنچینەیە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵایەتی لە بیروباوەڕ و دەزگا سیاسـیەکان و زانست و هونەر و ئاین و تەبیعات و ڕەوشت هەمووی سەرخانن —بە رای مارکسیەت - تەنها ڕەنگدانەوەی ئەو ژێرخانە مادی و ئابوریـە یـە، لەکۆتاییـدا دوو چـینی دژ بەیـەك دروست دەکا.

*مێـژووش هـەروا هـاتووە بـە هـوی نـاکۆکی نێوانئـەو دوو چـینە سـەرەکیە،کەلە قۆناغەکانی مێژوو وا گوزارش کراوە:

1- مشاعی (بێچین) بۆ 2- بەندایەتی (خاوەن و بەندە) بـۆ3- دەرەبـەگی (ئاغـاو جووتیار) بۆ 4- سەرمایەداری (کرێکار و بەرجوازی) بۆ 5- سۆشیالیسـتی زانسـتی بـۆ (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاری برجوازی 6- شیوعیەت (بێچین).

*تیۆری سیاسی شۆڕشگێڕیەکەی لێرە دێـت (هێـزی بەرهـەم هێنـەر) جەوهەرەکـەی کرێکارە و شۆڕشگێڕە، پێوەندی بەرهەم هێنەرەکەش پەیوەندییەکی کۆنی سـەرمایەداری لە ئەنجامی نەگونجانیان بە حەتمی دەبێت بگۆڕێت تا بگونجێ لەگەڵهێزی بەرهـەم هێنـەر و دەبتە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی سەرانسەری، ئەوەش دەبێتـە هـۆی نـەمانی سـەرمایەداری وچینایەتی و هاتنی شیوعیەت، کە ناوی نراوە (الحتمیـة التاریخیـة)، دەوری دروسـتبوونی حزبە شـیوعیەکان بریتیـە لـە خێراکردنـی ووشـیاری کرێکـارو دروشمـی ناوەنـدی (ئـەی کرێکارانی جیهان یەکگرن)[2] لێرەوە هاتووە.

*لەسەر ئەو بنچینە سەرانی مارکس پێشبینیان کرد یەکەم گڵپەی شۆڕشی شیوعیەت لە وڵاتی پێشەسازیەکانی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئەڵمانیا بێت.

* فەلسەفەکەی وەك خۆی دەڵێ لەسەر سێ پێچکە وەستاوە:

1- تیۆری پەرەسەندن.2- گەردوونی بێسنوور.3- مادیەتی بوونەوەر.

---

[1] روجیه غارودی —مارکسیة قرن عشرین ت:نزیه الحکیم ص143

[2] بە پێ ی هەندی سەرچاوە یەکەم جار دروشمی (ئەی موسلمانانی جیهان یەکگرن) لە لایـەن (زانکـوی ئیسلامی ) هاتووە لەکوتای سەدەی - 19- (بروانە : الاسلام والعلمانیـة واثرهمـا فـی نشـأة الدولـة العراقیة الحدیثة-دانثر )

- " ناکۆکی" هەر کۆمەڵ ناجولێنێ، بەڵکو سروشتیش دەجولێنێ و گەشەی پێ دەخا بەهۆی سێ یاسا:
  1- یاسای ناکۆکی.2- یاسای وەرچەرخانی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی.
  3- یاسای (نفی النفی).
- ئەوە تەفسیری بوونەوەرو ئادەمیزادە، پێویست ناکات بیر لەهیچ (اضافة غریبة) و (خالق) (ئاین) بکاتەوە، ئەو جۆرە بیرە لە نەزانینی تەفسیری دیاردە سروشتیەکان هاتووە، بۆیە ئاینی ئێستا تلیاکی گەلانە (افیون الشعوب) لە خزمەتی چینی دەسەڵاتدایە.
- بەو شێوەیە شیوعیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی لەجیهان دروست بوو، بووە پرۆژەیەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و مێژوویی سیاسی و فکری و فلسفی و زانستی و سایکۆلۆژی و عەسکەری و دەولی، نەخشەی سیاسی جیهانی گۆڕی، سەدان هەزار کتێبی لەسەر نووسراوە تا ساڵی 1990 لەپاش ئەزموونێکی 70 ساڵی تێك ڕووخا، کارێکی یەکجار زۆریشی لەسەر هەموو حزبە عەلمانیەکانی جیهان هەبوو، لە کوردستانیش ئەو ئاسەوارەی زیاتر بوو لە قۆناغی نوێیدا، لە سەرانسەری کوردستان بەدەیان حزبی مارکس و نیمچە مارکسی لێ دروست بوو، سەرەڕای حزبە شیوعیەکانی ڕەسمی، کە لە هەر پارچەیەك سنوورەکەی (کوردستانی) نەبوو، بە پالپشت بەو مەبدەئەی کە لە (بەیانی شیوعی) هاتبوو دەڵێ: (کرێکاران نیشتمانیان نیەیە).
- ئەو کۆمەڵە فکرەیە کورتکراوەی سەدان سەرچاوەی مارکسیەتە، وا هەندێکیان تۆمار دەکەن، خوێنەر دەبێ سەرەتایەکی هەبێ لەبارەی شیوعیەت، ئەگینا بەو چەند دێرە تەنها دەتوانێ هێڵە گشتیەکانی لا ڕەوشەن بێتەوە، بۆ زیاتر و سوود سەرنج بدە ئەو کتێبانە:
  1- مارکس: رأسمال، بؤس الفلسفة،بۆ تیۆرە ئابووریەکان

2- انجلس: دیالیکتیك الطبیعة، انتی دوهرنگ، بۆ فلسفەی گەشەو ناکۆکیأصل العائلة والملكیة الخاصة والدولة بۆگەشەی کۆمەلگە لە کۆمەلگەی سەرەتایی بۆ کۆمەلگەی بەندایەتی ودەربەگی..

3- لینین: الدولة والثورة، المؤلفات كاملة، ما العمل ؟..

4- ماوتسی تونگ: في التناقض، في الممارسة العملية.
5- ستالين: المادية الدياليكتيكية والمادية التأريخية.
6- جورج پۆليتزر: اصول الفلسفة الماركسية.
7- رۆجیه گارودی: ماركسية القرن عشرين، منعطف الاشتراكية الكبير.
8- تروتسكی: الثورة الدائمة.
9- مجموعة علماء السوڤيت: عرض موجز للمادية الدياليكتية، المادية التأريخية، أسس الماركسية- اللينينية...

**3- مەدرەسەی سۆشیال دیموکرات**بیرۆکەی سۆشیالیستی زۆر کۆنە، دەگەڕێتەوە پێش زایین، نەچووبووە قاوغێکی دارِشتنەوە بەو شێوەیەی ئێستا تا لە سەدەکانی دوای (16) دەستی پێکرد، لە سەرەتادا زۆر جۆرە سۆشیالیستی گەڵاڵە کرا: (سۆشیالیستی تۆباوی، سۆشیالیستی نەتەوایەتی، سۆشیالیستی دیمکراسی،، سۆشیالیستی برجوازی، سۆشیالیستی نێونەتەوەیی، سۆشیالیستی ئاینی، سۆشیالیستی زانستی...).

لەدوایدا تەنها دووجۆرە سۆشیالیستی بوونە ئەزموون (سۆشیالیستی زانستی- سۆشیالیستی دیمکراسی)، دیارە سۆشیالیستی زانستی هەر هەمان مەدرەسەی مارکسیزمە وبریتی لەو قۆناغە پێشەکی‌یەی شیوعیەت، کە باسکرا بۆیە تەنیا باسی سۆشیال دیمکرات دەکەین:

ئەو مەدرەسەیە لەلایەن پێشڕەوانی وەك (فۆریێ- 1772)، (سان سیمۆن 1760- 1825)، (لاسال 1825- 1864)، (برنشتاین 1850- 1932)، (کاوتسکی 1854- 1938).. دارێژرا، ئەوانە بەکورتی پێیان وایە بۆ گەیشتن بە دادگەری کۆمەڵایەتی و گواستنەوەی سەرمایەداری بۆ سۆشیالیستی بەرێگەی ئاشتی و پرۆسەی دیمکراسی و چاکسازی ئابووری دەبێت، بۆ تێگەیشتن زیاتر لەو مەدرەسەیە تەنیا لیستێکی بەراوردی دەکەین لەگەڵبنەماکانی سۆشیالیستی زانستی (شیوعیەت) لە خوارەوە سەرنجی بدی . بەڵام هەر بۆ زانین سەرانی شیوعیەت زۆر بەتوندی دادەبەزینە سەر سۆشیال دیمکرات و بە (مونافق) ناویان دەبرد و بە بەشێك لە سەرمایەداریان لەقەڵەم دەدا، هەر ووتوویانە شیوعیەت یەك دەرگای هەیە (نەك زۆر) تەنیا سۆشیالیستی زانستی‌یە.

لەدوای دارِمانی شیوعیەت لە 1990 بەدواوە، سۆشیال دیموکراسەکان زیاتر بەرەو کۆمەڵگە و نەریتی لیبرال دیمکراسی و سیستەمی سەرمایەداری لاربوونەوە، تا ئەو رادەیە خۆیان ناکەنە خاوەنی ئەزموونی شیوعیەت و چەپی بەگشتی و هەتا مێژووەکەی خۆشیان، کە خاوەنی بەرنامەیەکی رادیکالی بوون.

لەدوای فراوان بوونی قەیرانەکانی فکری و واقعی شیوعیەت و مارکسیەت ئەوا بەشێکی زۆر لەلایەنە شیوعیەکان کەرانەوە بەرەو شێوازێك لە ڕێچکەی سۆشیال دیموکراسی، بەتایبەتی حزبە شیوعیەکانی ئەوروپا کە بە (ئۆرۆ- شیوعی) ناوبرابوون.

## لیستی بەراوردە گشتییەکان

| سۆشیال دیموکراتی | سۆشیال زانستی (مارکسی) |
|---|---|
| 1- لەو سیستەمە دەوڵەت هەر دەمێنێ. | 1- دەوڵەت ئامێری چەوسانەوەیە، خۆی دەتوێتەوە. |
| 2- بەشداری پەرلەمان و دەزگا سیاسیەکان و هەڵبژاردن دەکەن . | 2- بەشداری ناکەن (ئیسلاحی نین شۆڕشگێڕن) وە بە(طفرة)ەو شۆڕش ئەو واقعە دەگۆڕن. |
| 3- توندوتیژی نیە، گۆڕانەکان دیمکراسیانەن. | 3- توندوتیژی کۆڵەگەیەکیانە و دیمکراسی ڕوویەکی برجوازیە. |
| 4- تەبایی چینەکان. | 4- دژایەتی (کرێکار و سەرمایەدار) (جووتیار و ئاغە) بەکوشت و بڕ. |
| 5- باری پرۆلیتاریا دەشێت چاککرێت بەهێمنی بەهۆی چاکسازی پەیوەندی بەرهەم هێنان. | 5- پێوەندی بەرهەم هێنان چاناکرێت، یاساییە تەنها بە شۆڕش و بازدان نەبی . |
| 6- سۆشیالیزم پێ بەپێ و بەقۆناغ دێتەدی. | 6- بەناکاووەرگێڕان و شۆڕش و بازدان و بەهەمووی دەبێت. |
| 7- شیوعیەت نیە. | 7- شیوعیەت حەتمیە. |
| 8- کارکەری ئابووری گرنگە، بەڵام یەکلاکەرەوە نیە. | 8- یەکلاکەرەوەیە. |
| 9- سۆشیالیزم لە دیموکراسی جیانابێتەوە. | 9- سۆشیالیزم لەدیکتاتۆری(پرۆلیتاریا) جیانابێتەوە. |
| 10- سەرمایەداری چاکترە لە دەرەبەگایەتی و دەشێت چاتریشی بکرێت. | 10- سەرمایەداری لە دەرەبەگایەتی خراپتر تا دێت خراتر دەبێت (نظرية بؤس المتزايد). |
| 11- چینایەتی تاکە فاکتەری دروستکەری مێژوویی نیە. | 11- تاکە فاکتەریەتی. |
| 12- کرێکاران نیشتمانیان و ئینتمای نەتەوەییان هەیە. | 12- نیشتمانیان نیە و ئینتمایان چینایەتییە. |
| 13- کەرتی تایبەت + کەرتی گشتی | 13- نابێت کەرتی تایبەتی بمێنێ. |
| 14- سەرمایەداری بەشێوەیەك هەر دەمێنێ. | 14- بەهیچ شێوەیەك نامێنێ. |
| 15- ئێستا بەداهاتوو نادەن. | 15- ئێستا گرنگ نیە، داهاتوو گرنگە. |
| 16- مارکسیەت بێ لینینیەت | 16- مارکسی و لینینی تەواوکەری یەکترن. |
| 17- لە هەر وڵاتێك بەشێوەی تایبەتی ئەو سۆشیالیستە دێتە دی. | 17- بە شۆڕشێکی جیهانی بەیەك جار و بەگشتی دێتەدی. |

### 4- مەدرەسەی ئیسلامی (ڕابوون):

پێش ئەوەی باسی فکری ئیسلامی بکەین، پێویستە جارێ (عەلمانیەت) بەوردی دیاری بکەینتاچاکتر لە ئیسلام بگەین هەروەك (عومەری کوڕی خەتاب) گۆتەنی: (من لا یعرف

الجاهلية لا يعرف الإسلام)، عەلمانیەت بە هەموو مەدرەسەکانی نائیسلامی دەووترێ هەر لە لیبرالی و دیموکراسی و شیوعی و سۆشیالیستی و نەتەوایەتی ڕووت و حوکمەکانی ئۆتۆقراتی و ئورستقراتی و سیاسەتەکانی میکاڤیلی و دیکتاتۆری و.. یان تێکەڵاَ لەوانە.

بۆ ئەوەی ڕێ لە (جدل)ی (کێ عەلمانیەتە و کێ عەلمانی نیە) بگرین، ئەوا پەیڕەوی هەر حزبێك یان دەستووری هەر وڵاتێك لەو دووڕیانە سەختە لەئیسلام جیادەبتەوە: ئاخۆ دەستورەکەی یان پرۆگرامەکەی ئاین ڕێك دەخات یان بەپێچەوانە؟ لە یەکەمیان، ئیسلام دەبێتە بەشێك لەو چالاکیە گشتییەی کە بۆی دادەنرێ، ئەوکاتی دەستوری تورکی و تونسی و فڕنسی جیاوازیەکانیان وا نابێت، حزبێکی‌عەلمانی کوردی و عەرەبی و ئەوروپی وەك یەکە، بۆیە هیچ جیاوازییەکی وا نیە لەنێوان ئینتیما بۆ حزبێکی کوردستانی عەلمانی و حزبێکی عەلمانی عەرەبی یان عەلمانی ئەوروپی، هەروەك زۆر کوردی عەلمانی لەنێو حزبی بەعس بوو[1]، هەروەهاش ئێستا زۆر کورد لەنێو حزبی ئەوروپین، تا رادەی ئەندامی سەرکردایەتیە لەحزبی سەوزیسویدی...ئەوە ئاساییە لە چوار چێوەی عەلمانیەت هەروەك (شبلی العیسمی) دەڵێ: (..المؤمن وغير المؤمن في مرتبة اعتبارية السوية)[2]، ئەوەیان بەسادەیی دەردەکەوێ بەڵام بە (180) پلەی دژی ئایەتی (ان اكرمكم عندالله اتقاكم) ە، ئەگەر دەستوورەکە یان پرۆگرامەکە ئیسلامی بێت لەباری دووەم، ئەوە سەرچاوەی سیاسی هەموو جیاوازیەکانە.[3]

لە پاشترین دۆخ دا لەو دەستورانە تۆمار دەکرێ کە (ئیسلام سەرچاوەیەکی گرنگی تەشریعە نەك بەتەنها)، واتە شریکێك بۆ شەریعەت دانراوە لەو دەستوورە

کەواتە ئیسلامی و عەلمانی دەشێت کۆ ببنەوەومەودایەکی هاوبەش بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بەڵام ئیسلام وعەلمانی هەرگیز کۆنابنەوە و جیاوازیان بە ئەندازەی سنور و بێسنوور، نسبی و موتلەق، گەرد و گەردوون، تاریکی و ڕووناکییە.. دوو دنیای لێك

---

[1] لەدەستوری حزبی بەعس (کە لە 5ی نیسانی 1947 دەرچوە)لەبارەی غەیرە عەرەب وا هاتوە: المادة (1):- حزب (البعث العربي الاشتراكي) حزب عربي شامل ... ، المادة (15) :- الرابطة القومية هي الرابطة الوحيدة القائمة في الدولة العربية التي تكفل الانسجام بين المواطنين وانصهارهم في بوتقة واحدة، وتكافح سائر العصبيات المذهبية والطائفية والقبلية والعرقية والاقليمية.

[2] العلمانية والدولة الدينية.. ص54، هەروەها لەکتێبی (جوزيف مغزل- العروبة والعلمانيةص21).

[3] لەدوای زیاتر باسی ئیسلامی و عەلمانی دەکەین.

جیان، بەڕای ئیسلامیەکان پەیامی ئیسلامی هەمەلایەنە هەر لە گەردوون تا لە دەرگادان، لە حوکم تا سەلام کردن، لە شۆڕش تا پەیوەندی خێزانی، لە مافی ئادەمیزاد، تا مافی مێرووڵەیەك.. هەمووی بە یاسا و ڕێسای چەسپاوی خۆی قایم کراوە، هەماهەنگە لەگەڵ یاساکانی سروشت و تەبیعاتە بنەڕەتییە نەگۆڕەکانی ئادەمیزاد.

## فکرەی ئیسلام:

(بۆ ئەوانەی کە موسڵمان نین یان سەقافەتی ئیسلامیان نیە)، ئیسلامیەکان بەو شێوەیەی خوارەوە دەڕواننە گەردوون و بەرنامەی ژیان، کورت و پوختی دەکەینەوە:

یەزدان ئەو بونەوەرەی بەبینراو و نەبینراوەوە هەر لە ئەلیکترۆنێکەوە تا گەردوون بەپێی یاسای توندوتۆڵ (مسەیەر کراو) دروست کردووە، ئێمە بە هەڵە (پێی دەڵێین یاسای سروشتی) ((ربنا ألذي أعطى كل شيء خلقه ثم هدى)) واتە:

1- خلق، 2- هدی، لە شوێنی تر (خلق و تدبیر) یان (خلق وتقدیر): مانای دروست کردن و بەرنامەدارِێژی (کە دەکاتە یاسا) نەك وەك (ئەرستۆ و زانایانی لاهوتی- ربوبی) بڵێن دروستکەرەو بەس، کە سەرچاوەی فکری عەلمانی ئێستایە، نەخێر. بۆ ئاو هەیە تەنها ببێتە:هەڵم، بەفر، شلە، بەڵام ناتوانێ ببێتە نەوت، زەوی بەدەوری خۆی و خۆردا دەسوڕێتەوە، ڕووەك بەشەو ($CO_2$) هەڵبمژێت، هیچ شتێك ناتوانێ لەو بەرنامەیەی بۆی دانراوە لابدا، یان یاخی ببێ، مسەیەرە ((فقال للأرض ائتیا طوعا أو كرها قالتا أتینا طائعین))، تەنیا ئادەمیزادە ئەو بڕە سەربەستیەی پی دراوە[1]، ئەویش لایەنە بەشەریەکەی (مخیر)ەو خۆی بەرپرسی کارو کردەوەکانیەتی، ئەوەش مادەکانی ئیمتیحانەکەیەتی، جا پەیامی ئیسلامی (هدی) بریتییە لە درێژکراوەی ئەو کۆمەڵە یاسایانەی بوونەوەرکە هەمان خاوەنی هەیە، ئەگەر ئادەمیزاد پەیڕەوی ئەو یاسانە(شریعەت)ی کرد لە حوکم و ئابووری و معاملات و پەیوەندی.. ئەوا هەم لەسەر دنیا بەدادگەری و بەختەوەری دەژی و هەم لە ئیمتحانەکەش بە سەرکەوتوویی دەردەچن، ئەگەر لەجیاتی بەرنامەی تری دەستکردی پەیڕەو کرد، ئەوا هەم لەسەر دنیا ناگاتە ئامانج و دادگەری و ئاسودەیش نابینێ و ئەو ئەنجامانەش دەبێت.

[1]ئادەمیزاد و شارستانیەتی جن ئیختیارن، بەڵام بابەتەکەی ئێمە ئادەمیزادە.

1- کارەساتی کۆمەڵایەتی لە چەوسانەوە و دەستدرێژی و جەنگ و برسێتی ((ومن لم یحكم بما أنزل الله فأولئك هم.. الظالمون، ..الفاسقون، ..الكافرون))المائدة45- 47. لەکۆتاییدا لەدۆخە هەرەباشەکەیدا دەبێتە خزمەتکار و چەوساوە و ڕەنجکێش یان چەوسێنەر و زۆردار و ڕەنجەڕۆ و یان بەهەردوو ئاراستە لە بارودۆخی جیاجیا.

2- هەر بەرنامەیەکی تر هەردەم:

أ/سەتحیە، یەك لایەنە، کورت بینە، مەودا کورتە، قوووڵ نییە، ئەنجامی لێك نەدراوەتەوە، چەسپاو نیە، محلیە، وەختیە،... ((أفمن یمشي مكباً على وجهه أهدى أمن یمشي سویاً على صراط المستقیم))الملك:22.

ب/ناگونجێ لەگەڵ ڕەوشت و ڕسکانی ئادەمیزاد و یاساکانی بوونەوەر ((فطرة الله التي فطر الناس علیها..))الروم:30.

ج/ بەشەکانی ئەو بەرنامە خۆبەخۆ ناکۆکن، چ جای پەیڕەوکردن و پیادەکردنەکەی ((ولو كان من عند غیر الله لوجدوا فیه اختلافا كثیرا))سبأ:82.

د/ هەرگیز لە دۆخی هەرە چاکی ئەو بەرنامەیەدا یەکێتی گۆتە و کردەی نییە، ((لم تقولون ما لا تفعلون))الصف: هەروەها یەکێتی بەرنامەی حزبەکە و بەرنامەی خاوەن بەرنامەکە..لیك دوورە((أتأمرون الناس بالبرّ وتنسون أنفسكم))البقرة:44.

ه- هەموو یاسا و نەریت و بڕیارەکان لە دیفاکتۆ دەبێتە دیگۆرا، واتە هێز و (ئەمری واقیعە) یاساکانی دەستکرد دروست دەکا، بەپێی گۆڕانی هێز و هاوسەنگیەکان ئەو یاسا و ڕێسا و بڕیار و چارەسەریەکان دەگۆڕێن، بەپێچەوانەی یاساکانی ئیسلام چەسپاو و گشتگری زەمان و زەمینین لەوەو دادگەری دێتە دی و لە یاسای عەلمانیش چەوسانەوە.

## 3- 5(صراع البدائل) لە نێوان ئەو مدرسانە؟

ئەو مەدرەسانەش مادام عەقیدە وشەریعەتیان هەیە، واتە (حلال و حرام) و ئینتمایان هەیە، بەدیلی ئاینن، هەر بەپێناسی زانستیانەی ئاین نەك بەروانگەی ئاینی (وەك کێشەکەی عودەی کوڕی حاتەم)، بەڵام بۆچی ئیسلام بەتەنها لە ململانێیە لەگەڵیان، کەچی مەسیحی و یەهودی و بوزی و... بێدەنگن؟ پرسیارێکی گرنگی ڕابوون و ئەنسرۆپۆلۆژیاشە.

لەڕاستیدا هەریەك لەو مەدرەسانە لە نوقسـتانی ئاینێـك هـاتووە، وەك (علـی عـزت بیگۆڤیچ)[1] گۆتەنی: لیبرال دیمکراسی بۆ تەواوکردنی مەسیحیەت هاتووە، سۆشیالیستیش بۆ یەهودیەت.. بەو تەعدیل و بۆیاخـە نوێیـە بـەردەوامی چـاکتر وەردەگـیرێ، هەڵبەتـە شیوعیەت لەهیچ ئاینێك نزیك نیە و ئاینێکی نوێیە، جا ئیسلام ئاینێکیبێ نوقستانی- بەلایەن کەمەوە بەروانکەی ئیسلامیو زانایانیان - ، بۆیە پێویستی بـە شـریك و تعـدیل نیە، چۆن ئەو مدرەسانە دەیانەوێ لەو (عولمە)یە ببنە بەدیل، ئاواش ئیسلام بەرنامەکانی گەلاڵە دەکات وەك چوار ئاینی جیهـانی. لەڕاسـتیدا ئـەو چـوار مدرسـەیە نوێنەرایـەتی هەموو ململانێیەکانی ئاینی و چینایەتی و شارستانی و سیاسی دەکا، ئەگەر بەشـێوازی جیاتریش گوزارش کرا.

واتە ململانێی سیاسی سادە نییە، ململانێی بەرنامە و عەقیدە و ژیان و تێڕوانینـی گشتیە، چوار دنیای لێك جیایە، ئەوەیە ململانێ و تێکگەیشتنی ڕاستەقینە، نەك (صراع الحضارات)ی سامۆئیل.

بۆ تێگەیشتن زیاتر لیستێکی تری بەراوردی بنەماکانیهـەر چـوار مەدرەسـە دەکـەین بەتێبینی لەگەڵ لیستەکەی پێشتر.

---

[1] الإسلام بين الشرق والغرب .

| شیوعیەت | سۆشیالیستەکان | | سەرمایەداری (لیبرالی- دیموکراسی) | ئیسلام |
|---|---|---|---|---|
| | 1- سۆشیالیستی زانستی | 2- سۆشیالیستی دیموکراسی | | |
| 1- موڵکیەت نامێنێ.<br>2- خێزان، دەوڵەت، یاسا نیە.<br>3- دەزگای سیاسی دەوڵەت کۆتایی دێت.<br>4- ئازادی تاك مسەیەرە.<br>5- سەرکردە و بنکە نامێنێ.<br>6- ئەخلاق و ئاین پێویست نامێنێ، عەقیدەی شیوعیەت دەمێنێ.<br>7- کۆمەڵ بێ چینە و یەکسانیە.<br>8- دابەش : پرۆسەی بەرهەم لە دابەشکردن | 1- هەیە بەپێی (کل حسب عمله)<br>2- بەرەو هەڵوەشانەوەیە.<br>3- دیکتاتۆری پرۆلیتاریا دەمێنێ.<br>4- ئازادی چینایەتی هەیە، برجوازی، سەربەست نیە.<br>5- سەرکردە پرۆلیتارە.<br>6- ئەخلاقی پرۆلیتاریا دەمێنێ.<br>7- چینی پرۆلیتاریا زۆرینە و حاکمە.<br>8- پەیوەندی ڕاستەوخۆی کارودابەش.<br>9- موڵکی دەوڵەتە. | 1- هەمان شت لەگەڵ (عام، خاص)<br>2- دەمێنێ (ڕوون نیە).<br>3- پرۆلیتاریا+ دیموکراسی.<br>4- ئەخلاقی دیموکراسی+ بەرژەوەندی.<br>6- ئەخلاقی دیموکراسی+ بەرژەوەندی.<br>7- چینایەتیەکی هێواش.<br>8- هەمان شت.<br>9- تێکەڵە.<br>10- ڕێگەی دیموکراسی گەیشتنە بە سۆشیالیستی.<br>11- تەواو قەدەغەیە لە | 1- بێ سنور هەیە چۆنی پەیدا دەکەی.<br>2- دەمێنێ بێ دادگەری.<br>3- دیموکراسی سەرمایەداری و لیبرالیەتی کۆمەڵایەتی و پەرلەمانی دەبێت.<br>4- موتەلەق ئازادە.<br>5- ئیمتیازی زۆرە سەرمادارەکانن.<br>6- بەرژەوەندی لەسەروو+ مافەکانی مرۆڤ.<br>7- چینی سەرمایەداری فەرمانڕەوایە.<br>8- کار- کاری کرێکار، | 1- سنوردارە (خاص+ عام)<br>2- هەیەو پیرۆزە بەپێی مەبادیئی ئیسلام.<br>3- سیستەمی شورا+ ولایات+ ئیسلام حوجەیە نەك شەخصی و حزب.<br>4- سنوری هەیە.<br>5- سەرکردە پیرۆزە و بێ ئیمتیازە و خزمەتکارە.<br>6- ئەخلاق و ئاین ناوەندیە.<br>7- یەکسانی چینایەتی نیە، دادگەریە.<br>8- کار- تەقریبی- باج لەزیادەکان (زکات، خمس...). |

# 3- 6ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی

نەتەوایەتی مەدرەسەی سەربەخۆی نیە، تشریعات و تێڕوانینو هەڵوێستی گشتی نیـە، ئایدیۆلۆجیایەکی ناقصە، یان چاکتر بڵێین هەر ئایدۆلۆژیا نیە بـەڵکو ئینتمـا و هەسـت و سۆزە لەڕیزی ئینتماکانی ستونی‌وەك : بنەماڵە- خێل- نەتەوە- نەژادی- نێر و مـێ- ناوچە و کیشوەر، هەر بۆیە هەموو حیزبێکی نەتەوەیی (هەتا شـۆڤێنیەکانیش) بـە هـۆی مەدرەسەیەکی فکری‌ئایدیۆلۆژیاکەی پێ تەواودەکا، سەرنج بدە (حزبی بەعسـی عـەرەبی سۆشیالیستی)، (حزبی دیمکراتی نیشتمانی)، هەموو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان...

هەر بۆیەش لەگەڵ مەدرەسەمان ریز کردووە بەناچاری چـونکە حیزبـە کوردسـتانیەکان لەو سەرچاوە هەڵقوڵاوون، ئەگینا ئەو پێناسـەی (نەتەوایـەتی) و پەیوەنـدی (قومیە)بـە( الامە) پێناسی هەڵەن، هەروەها (مقوماتی قومی) گوایە هاوبەشی مێژوو و ئایین و خـاك و یەکێتی دەروون و نەریت و زمان... تـەواو نیە،(لـەدوایی باسـی دەکـەین)، بـوون لـە نەتەوەدا حەقەو سروشتی‌یە، بەڵام بە ئایدۆلۆژی کردنی (واتە: القومیـة+ الایدولوجیـة = الأمـة، بـەپێی ڕای نەتەوەییـەکان)، ئـەوە بـووە مایـەی سەرئێشـەو ڕەگەزپەرسـتی و داگیرکردنی لێهاتەدی کە ئێمەی کورد یەکێ لەو قوربانیانەین، لـە بەرامبـەردا هەسـت و قۆناغی نەتەوایەتی لێ پەیدا بووە و دەبێـت، واتـە هەسـتی نەتەواتیـەتی و ئایـدیۆلۆژی نەتەوایەتی لێك جیایە.

سەرهەڵدانی:

ئادەمیزاد بەندە بە کۆمەڵ، لە سەرەتای مێژوو هەرکەسە بۆ بەرگری لەبوونی تەنیا پێویستی بە بنەماڵە هەبوو، دوای گەشەسەندنی کشتوکاڵ و بەخێوکردن و پاوانکردنی موڵك و پارێزگاریەکەی زیاتر پێویستی بە ئەلقەیەکی فراوانتر بوو کە (خێڵ)ە، لە پرسیاری (ناسنامە)ی‌تۆ کێی؟لەوەڵاما دەیووت من فلانە خێڵ (عەشیرەت)م، بەو شێوەیە تا ئادەمیزاد ئاسۆی پێویستی و هاتوچۆ و تێکەڵی فراوان تر بوو، زیاتر ئینتمای فراوانتر بوو،گۆڕانکاری وگەشەیەکی کۆمەلایەتی زۆری ویستوە تا لە قۆناغی خیلایەتی وەرچەرخاوە بۆ قۆناغی نەتەوەیی،لەو نێوانەدا ئینتمای نەتەوەیی هەبوە بەڵام نوستوو

بوه،تەنها لەلایەن توێژێکی زۆر تایبەت دەبینرا،دوور نیە لە جیهانی ئیسلامی یەکەم جار هەستی پیێ کرابێ ،لەسەدەی 10 بەدواوە جۆرە تێڕوانینێکی نوێ سەبارەت بەدەست نیشان کردن وناسنامەی هەرێم لەناو جوگرافی ناسانی ئیسلامی وەك(ئەبوزەیدی بەلخی وئیستاخاریو ئیبن حۆقل و ماقدیسی..) سەری هەلدا، لە پال دابەشی هەرێم لەسەر بنچینەی جوگرافی وجۆری حوکم ئەوا بۆ یەکەم جاریش لەسەر بنچینەی زمان ونەتەوە هەرێمیان دەست نیشان کردوە ، کەواتە زۆر ئاساییە تا سەدەی 17- 18 و ڕابوونی پێشەسازی ئەوروپا و سەدەی 19- 20ی جیهانی سێیەمئەو هەستە نەدەورووژا ، تێکەلّی و بەجیهان بوون(عولمە) دەستیێ پێکرد بەتایبەتی لەسەرەتای ئەو سەدەیە، ئینجا ئادەمیزاد هەستی بەخۆی کرد سەرباری ئینتیما خێلّەکی محلی ئینتیما نەتەوایەتی فراوانیشی هەیە،پەیوەندیەکی سیاسی ئایدیۆلۆژی و(دوایش قانونی)لە نێوانهەرێم ومیللەت ودەسەلاّتی سیاسی دروست بوو،دەرکەوت نەتەوەی جیاجیاومێژووی جیاو کەلتوور و نەریتی جیاو زمانی جیا هەیە، ئیتر قۆناغێکی تر هاتە پێش، سەرنج بدە حزبە عەلمانیە ناشیۆنالیزمەکان چەند هەلّەن لە زیادەڕەوی لە(قوناغ بوونی نەتەوایەتی) دەکەن،نکولی لە وەختی بوونی دەکەن ، هەر بەنمونە لە کۆنگرەی بنیادنانی (حزبی بەعس 1947) لە هەردوو مادەی (3) و (4) هاتووە: (انە حزب قومي يؤمن بأن القومية حقيقة خالدة، ويؤمن بأن الاشتراكية منبعث من صميم القومية العربية)[1]، بەو شێوەیە لە هەندێ شوێن کرانە ئایدۆلۆژیا و نەتەوەی بالاّدەست نەتەوەی بچووکی داگیرکرد بە خێلّ و بنەمالّەوە، ئیدی هەستی نەتەوایەتی دروست بوو، ئێستا لەجیهان وەلاّمی پرسیارەکەی

[1] دةقةكانى وا لة (دستور حزب البعث العربى الإشتراكى -4-6نيسان 1947) هاتوة:مادة (3) :- حزب البعث العربي الاشتراكي قومي يؤمن بأن القومية حقيقة حية خالدة، وبأن الشعور القومي الواعي الذي يربط الفرد بأمته ربطا" وثيقا" هو شعور مقدس، ... المادة (4) :- حزب (البعث العربي الاشتراكي) اشتراكي يؤمن بأن الاشتراكية ضرورة منبعثة من صميم القومية العربية لانها النظام الامثل الذي يسمح للشعب العربي بتحقيق امكانياته وتفتح عبقريته على اكمل وجه فيضمن للامة نمواً مطرداً في انتاجها المعنوي والمادي وتآخياً وثيقاً بين افرادها.

پێشوو تۆ کێی؟ بڵێی من فلآنە خێڵم نیشانەی نەفامیت بیشان دەدا، کەواتە سەرەتای هەستی نەتەوایەتی و ووشیاری نەتەوایەتی کۆن نیە، لە سەرەتادا لە ئەوروپا دەستی پێکرد، گوایە (بسمارك 1815- 1898)ی ئەڵمانی یەکەم دەسەڵآتدارێك بوو، کە بەرنامەی کاری نەتەوایەتی پەیرەو کردووە ئەلمانیای لەسەر ئەو بنچینەیە لە 1871دروست کردووە، دوای هەموو ئەوروپای گرتەوە، ئینجا هاتە ناو جیهانی سێیەم کۆتای بە چەرخی ئیمپراتۆریەتەکان هێناو دەوڵەتی نەتەوەیی دروست بوون، ئەو پرۆسە گۆڕانە لە ئینتیما خێڵەکی بۆ ئینتیما نەتەوایەتی، کۆمەڵێك گۆڕانی تری پێك گرێدا بەم شێوەیە:-

لەرووی سیاسیەوە:

1- گۆرانی ئیمپراتۆریەکان بۆ وولآتانی هاوچەرخ (مەلەکی وکۆماری)
2- لە دیکتاتۆری تاك رەوی بۆ دیکتاتۆری دەزگایی وحزبیش
3- گۆرانی ئینتیمای کۆمەلایەتی ستونی بۆ ئینتمای سیاسی ئاسۆیی
4- لە پەیوەندی خێلەکی بۆ پەیوەندی فکری و حزبیشەوە

لەرووی یاسای نێو دەوڵەتیەوە:

1- یاسای نیو دەوڵەتیهاتە جێی هێز (تارادەیەکی چاك )،دەزگای وەك (عصبە الامم)پەیدا بوو.
2- جاران ئیمپراتۆریەت وهەرێم وگەل پەیوەندیەکی یاسایی و سیاسی وایان نەبوو دوای ئەو وەرچەرخانە بۆدروست بوونی دەوڵەت پێویست بوو دەسەلآت وهەرێم (نیشتمان) و گەل(نەتەوە)یاساییانەو سیاسیانە پیك وەببەسترێت .
3- سنورو بنەمای سەروەری (سیادة )هاتە جێی فەوزای نێو دەوڵەتی

لەرووی ئابووریەوە :

1. وەرچەرخانی کشتو کاڵ بەرەوپێشەسازی
2. لەبازاری ناوەکی بەرەو بازاری جیهانی
3. لە بەخێو کردن بۆ جێ نشینەوە
4. لەقورسایی لادێ بۆ قورسایی شار

لەرووی چینایەتیە:

1- وەرچەرخانی چینی دەرەبەگ بۆ چینی بورجوازی

2- وەرچەرخانی کرێکاری کشتوکاڵ بۆپرۆلیتاریا

لەرووی کۆمەلایەتیەوە:

1- وەرچەرخانیکۆمەڵگە ستونیەکانبەرەو مەدەنیەت

2 - وەرچەرخانی ئینتمای خێڵەکی بەرەو نەتەوەیی

لەرووی یاسایی سیاسیەوە:

1- وەرچەرچەرخانی نەریت بۆ یاسا، لەئاینیەوە بۆ عەلمانیەت

2- لەکتێبی ئاینیەوە بۆ دەستوری مەدەنی

3- وەرچەرخانی تاك لەژێر کاریگەریەنەریتە کۆمەلایەتیەکان بۆکاریگەری یاسایی

4- بەگشتی وەرچەرخان لە فاکتەر ستوونیەکان بەرەوفاکتەر ئاسۆییەکان.

لەرووی ئەخلاقی و ئاینیەوەی:

1- وەرچەرخانی پەیوەنیوەندیەکۆمەلایەتیەکان لەبەرژەوەندی گشتی بۆتایبەتی

2- لەپێکەوە ژیان بەرەو تاك ژیانی

3- لە مەبادیئیەوە بەرەو بەرژەوەندی

4- لە سیۆکراتیەوە بەرەو دیموکراتی ودەزگای مەدەنیەوە

لە رووی فکری وئاینی

1- وەرچەرخانی ئەحکامی ئاینی بۆ یاسایی

2- وەرچەرخانی بەها ئاینیەکان بۆ بەهای عەلمانیەت

3- وەرچەرخانی مدرسەی فکریو فلسفی میسالی بەرەو مادیەت

وەرچەرخانی ڤاکتەری نەتەوایەتی بۆ (عولم)یش کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەخۆوە دەبینی کە هێشتا ئاسۆکانی دەرنەکەوتوون، لە عەولەمەدا ئینتیما و لایەنگری وەك جاران نامێنێ، بەلام نابتە ئینتیمای شارستانی، بەڵکو دەبێتە ئینتیما مەدرەسی، بۆیە وەك جاران چالاکی سیاسی کادیر و رێکخستن و پاگندەی حزبی نامێنێ، بەڵکو لە هەر ناوچەیەك هەرچوار مەدرەسەی لێ گەشەدەکا.. ڕاگەیاندن ڕۆڵی بنچینەیی دەبێ.

ئەوە یاسایەکی گشتی بوو تەنیا پەیوەست بەکورد نیە، بۆیە هەست و ووشیاری نەتەوایەتی(کوردایەتی) تەمەنی زۆر کورتە لە سەدەیەك تێناپەڕێ بۆ بیریار و شاعیر و

زاناكان، بۆ خەڵكی سادەش كەمتر لەسەدەیەك، هەر بۆیەش زۆر هەڵەیە ئەوەی بۆ واقعی ئێستای جیهان و ناوچەكە لەدوای پەیدابوونی هەستی نەتەوایەتی محكمەی:مێژوو، م.. لولو، دەوڵەتی كوتی، ئیمارەتەكان، صلاح الدین ایوبی، زاناكانی كورد.. دەكاتبە هۆی نەبوونی هەستی نەتەوایەتی، دیارە هەر ئادەمیزادێكیش بیروباوەڕ و ئاستی عەقڵەكەی لە باشترین دۆخیدا تەنیا ڕەنگدانەوەی واقعی سەردەمی خۆیەتی، كەس نەیتوانیوە پێشبینی چەند سەدەیەك بكات ئەگەر بەدەگمەنیش بووبێت زووتر هەستی نەتەوایەتی هەبووبێت نەبوویتە ڕای گشتی.

## 3 – 7هەستی نەتەوایەتی كورد (كوردایەتی)

ئەوەی سەروو گشتی بوو، بزانین مێژووی كوردایەتی لەكەیەوە دەستی پێكردووە، هەروەك زانستی (بەردبوو زانی- علم المتحجرات) پانۆرامای مێژووی سروشتە، ئاواش (قسەی نەستەق) و (شعری كۆن) بەردبووزانی زانستی مێژووی ئەو میللەتەیە، لەسەر ئەو بنچینەیە ئێمە قسەی نەستەق و هونەر و گۆرانی كۆنمان نیە لەسەر هەستی نەتەوایەتی، هەروەك ئەدەبیاتیش لەپێش (احمد خانی) نیە، بەڵام لەپاش سەدەی بیستەم ئەدەب و نووسین و تیۆرێكی زۆرمان هەیە لەسەر كوردایەتی، ئێمە وادەزانین تەنیا (صلاح الدین) كێشەی ڕەچەڵەكی هەیە، نەخێر، لە سەردەمی خیلافەتەكان لەدائیرەی رەگەزنامەكانیش ناوی نەتەوەی نەدەنووسرا ،ئەو گرنگیە لە هیچ لایەك بە ڕەهەندی نەتەوەیی نەدەدرا، بۆیەش نەخشەی سیاسی عوسمانی كەوتبوە دەرەوەی میللەتانی تورك،هەروەك نەخشەی سیاسی ئەیوبیش كەوتبوە دەرەوەی میللەتی كورد،لەدائیرەی ڕەگەزنامەی عوسمانیش وتەنانەت لە دەستوری عوسمانی(مەشروتیە) كە پێك هاتبوو لە 119 مادە و 4368 ووشە بەیەك ووشەش ناوی توركی تیا نەهاتوە[1]،بە پێی مادەی(71)ی دەستوری عوسمانی (مەشروتیە) ئەوا نوینەر(مەبعوس) نوینەرایەتی هەموومیللەتان دەكا نەك هەر بازنەكەی

[1] بڕوانە دەقی یەكەم دەستوری عوسمانی دەرچووی 24/12/1876

خۆی،  زۆر بەووردی پشکنیمان ئاخۆ لە مێژوودا نازناویکی نەتەوەیی هەبێ نەبوە ،ئەو نازناوانەیان پێ دراوە(أسد الدولة، ألأعز، ألأغا، أمين الدولة، تاج الملوك، شاهنشاه، الغازی، القاهر، المستنصربالله، ملك الأشراف، الناصر...)[1]،پالنەری نەتەوەیی وڕەگەزپەرستی لەدوای سەدەی 19 دەست پێ دەکا بەتایبەتی سەردەمی (ئیتحادولتەرەقی لەدوای 1908) بەرامبەر ناوی هەر ئەفسەریکی کورد پیتی(ك) دەنوسرا وبەرامبەر ئەفسەری عرب پیتی(ع) دەنوسرا،لەو دەم تا ئەو ساتە گیانی ڕەگەزپەرستی کەوتە نێو بەشیکی زۆر لەکوردو تورك،  لە توێژینەوەیەکی(صنعان احمد ئاغەقەساب) لەبارەی لێك جیاکردنەوەی کورد وتورکمان لەهەولێر بەو فاکتەر لێك کردۆتەوە گوایە کرمانج(کورد)پیس وچلکن بوە،ئەو ڕایە دەگەڕێتەوە بۆفەرهەنگی ڕەگەزپەرستی ئیتحاد الترقی کەناوی لەعرب نا(پیس عرب)..کەچی یاقوت حموی لە(معجم البلدان ج1-اقليم السبع) دەلێت تورك وەك دڕندە بوە بە(وحش الجبال )وەسفیان دەکا،کلیمنسۆری سەرۆکی فرنسا لەکۆنگرەی ئاشتی باسی لەوە کرد کەتورك (نقص الكفاءة)ی هەیە ناتوانێ میللەتی تری لەژێردەست دابێ، ئەوە بوە بنچینەی یاسایی ڕێکەوتنی سیڤەر بەتایبەتی مادەی(132)ی ئەو ڕێکەوتنە،لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسلیش تورکمانی ناوچەی ویلایەتی موسل بە (مرتزقە العباسيه)باس دەکا[2]، لە شوێنێکی تری ئەو ڕاپۆرتە دەلێت  لە نێو عوسمانی کە ناوی تورك دەهات وەك گەمژەو غەشیم(همجی) سەیر دەکرا تا 1900لەسەر دەستی (بزوتنەوەی عموم الترك) بوونە جێی شانازی[3] ،تەنانەت لەسەردەمی عوسمانیش کە حوکمەکە تورکی بوە کەچی هەرناوی

---

[1]( معجم الألقاب أرباب السلطان فی الدولة الإسلامية) هەروەها بڕوانە: صحوەرجل المريج .. المصدرالسابق - ص467-469

[2] تقرير ولاية الموصل ص132

[3]تقرير ولاية الموصل ص 127، ص129، ص132- بزوتنەوەی (عموم الترك) نەبوە ،ڕەنگەمەبەستی ئیتحادوالترقی بێت .

تورك هاتبێ هاوتای (اعراب-بی ئیدراك)[1]بوه-لەبارەی وەسفی (بی ئیدراكی تورك) بڕوانه(ساطع الحصری -محاضرات فی نشوء القومیة) و( دراسات فی الحركة الكوردیة المعاصرة – د.عثمان علي ")،ئەوانە هەموو سەردەمی هاتنی عەلمانیه،لەگەڵ سەلبیاتی زۆری سولتان وخەلیفەكانی عوسمانی بەڵام ڕەهەندی ڕەگەزپەرستی نەتەوەیی بەدی ناكرێ،بۆیە كەس نەیدەزانی كێ چ نەتەوەیەكەو ئەوی تر چیە، ئیتر هەستی نەتەوایەتی چی، لەكۆنەوە بەلادێییەكانی جزیرەیان وتووە (عرب)، لەناو كوردیش ڕەوەند (كورد) بووینە، تەنانەت لە بەڵگەنامە مێژووییەكانیش دەردەكەوێ لەبەر نەبوونی ناوی نەتەوەی لە سەردەمیعوسمانلی لەناو كوردا ناویان لە پیاوەكانی عوسمانلی نابوو (جل خوارەكان) یان (گورگە بۆرەكان)[2]، لە نێو عەرەبیش پێیان دەووتن "ئەفەندم".. ئەوەش لەگەڵ ووتە بەنرخەكەی (محمد امین زكی بەگ) و (شریف پاشا) ی كورد یەك دەگرێتەوە كە دەڵێن (تا ئیتحادیەكان لەسالی 1908 بانگی توركایەتیان نەكرد، ئێمە هەستی كوردایەتیمان نەبوو).تەنانەت لە گوڤاری (مشروتیەت)ی شریف پاشا هەتا ژ:42ی سالی 1903باسێكی كوردایەتی تیدا نەبووە، ئینجا بووە سەردەمی چارەنووسی نەتەوەیی، بەشێك لە نەتەوەكان لەگەڵ سەربەخۆییان نەتەوەی تریشیان خستە بن دەستی خۆیان، ئیتر هەرنەتەوەیەك بەخۆی لە چارە نووسی خۆی بەرپرسیار بوو،كەواتە كوردایەتی ڕەوتێكی شەرعی وەرگرت هەقی خۆیەتی حزبی كوردستانی تایبەتی دروست بێت بە ئیسلامیەكانیشەوە، چونكە كورد پێشڕەو نەبووە لەو هەنگاوەو مادام دەوڵەتی عەرەبی و

---

[1]بۆیە كەمتر تورك لە پایەی دەوڵەتی عوسمانی بوو زیاتر سەربازو فەرمانبەری سادە بووە، لەوەوە بزوتنەوەی تۆرانی و كەمالی سەری هەڵداو ووتیان تورك لە هاوكێشەی عوسمانی زۆر مەغدورە لە بەرامبەر كورد و چەركەس و ئەرنائوت و عەرەب...، پاساوی بنچینەیی مستەفا ئەتاتورك لە گوتارەكانی رۆژی 1، 2، 1924\3\3سەبارەت بە هەلوەشانەوەی خیلافەتی عوسمانی لە ئەنجومەنی بالای توركی - پەرلەمان- ئەوەبوو.

[2]بڕوانە یاداشتەكانی رفیق حلمی، لەناو عەرەبیش پێیان دەووتن ئەفەندمەكان.. نەدەوترا توركەكان.

فارسی و توركی و.. هەبێت وەك محمود شاكری* مێژوو نوسی ئیسلامی دەڵێت بۆ دەوڵەتی كوردیش نەبێت؟لە وەلآمدا جارجار شیوعیەك یان ئیسلامیەك لە چوارچێوەی داوا مرۆڤانەكەی خۆی داوا لە هەموو نەتەوەكان دەكا لەو ساتەدا واز لە نەتەوایەتی بهێنن! ئەوەیان تەسلیمی ئەمری واقعە و لەژیانی میللەتی داگیركراوە، تازە نەتەوەی داگیركەرەكە پێویستی پێ نیە و وەك (گێفركانێ) ئەو بەشی خۆی و بەشی خەڵكی تریشی بردووە، ئینجا یەكێ بێت بڵێ لەو ساتە گوێی یەك بەردەن كۆتای هات ئەوا ژێركەوتوەكە گوێشی چوو ماڵیشی چوو بی نیشتمانیشبوو.

ئەوە نارەوایە، ڕاستیەكەی ئەوەیە یانهەموو لایەك بگەڕێتەوە سەر (ئومەمیەتەكە) كەس دەوڵەتی نەتەوەیی نەبێت یان با هەموو هەیان بێت.ئەوەش دەقیداوایەكەی شێخ سەعیدپیران بوو كە بریتیە لە: 1- گەڕانەوەی خیلافەت*، یان 2- دەوڵەتیش بۆ كوردستان. ڕاست و ڕەواترین پەیوەندی و ڕوانگەی ئیسلامە بۆ كوردایەتی، چاكترین پێناسی ئەكادیمیشە بۆ كێشەی كورد، لەو ڕوانگە ویژدانیە نجم الدین ئەربەكان ڕاستیەكی وای لە شارۆچكەی بنگول لە 1994 ووت وبوە هۆی لەدەست دانی سەرۆك وەزیرانەكەی لە توركیا..چی ووت؟ ئەوە دەقە توركیەكەیەتی:

"Bu ülkenin evlatları asırlar boyu mektebe başlarken, besmeleyle başlar. Siz geldiniz, bu besmeleyi kaldırdınız. Ne koydunuz yerine, ‘Türküm, doğruyum, çalışkanım.’ Sen bunu söyleyince, öbür taraftan da Kürt kökenli bir Müslüman evladı, ‘Ya öyle mi, ben de Kürdüm, daha doğruyum, daha çalışkanım’ deme hakkını kazandı...."

---

* خەلكی سعودیەیە لە زنجیرە كتیبەكانی بەناوی (تاریخ الاسلامی )بەرگی (العراق)باسی دەكا .

* لەڕاستیدا شۆرشەكانی هەریەكە لە شیخ عبدالسلام وملا سلیم وئەوانی تریش بریتی بوون لەو داوایە، ئەوەش باشترین بەلگەیە كەخیلافەتی عوسمانی بۆ كورد تارادەیەك باش بوو بۆیە داوای گەڕانەوەیان دەكرد، نووسینەوەی مێژوو لەكوردستان زولمێكی زۆر دەكا كاتی دەنووسێ شەری نێوان عوسمانی وعبدالسلام بارزانی! كەی ئەوە ڕاستە ئەو كاتی حوكمی ئتحادیە عەلمانیەكان بوو، ئەو دووفەترەیە زۆر جیایە، لەراستیدا لە سەرەتای سەدەی 19گۆڕان دەستی پێ كرد بەرەو تەغریبی، ئینجا تۆختر لە 1865 بەرە و 1889ئینجا 1908 ڕاستەوخۆ دەسەڵات كەوتە دەست عەلمانیەت تا رووخانی یەكجاری عوسمانی لە1924.

((رۆلەکانی ئەم گەلە بەدرێژایی چەند سەدەیەك کردنەوەی دەوامی قوتابخانەیان بە (بسم الله)یان دەکردەوە ،ئیوە هاتون ئەم بسم اللەیەتان هەلگرت چیتان لەجیگە دانا؟ دەلین: تورکم — راستم- خەباتکارم ،ئیوە کە ئەمە دەلین لە بەرامبەردا رۆلەیەکی موسولمانی بە ئەسل کورد هەقی خۆیەتی بلیت: کەواتە منیش کوردم راستترم خەباتکارترم))[1].

ئەوە مانای شۆڤێنی نیە و ئادیۆلۆژیاش نیە، ئەوە مافێکی سروشتی سەرەتاییەو ئەرکە لەسەر هەموو کەس و لایەنێك خۆی کۆبکاتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە، لەسەر ئەو بنچینە حزبی نەتەوەیی دروست بووە، کاتێ نەتەوایەتیش ئایدۆلۆژیا نەبێت ئەوا بۆ بوونی بەحزب پێویستی بە مدرسەیەکی فکری و سیاسی هەیە وەك سۆشیالیستی، شیوعی، لیبرالی و دیمکراسی، ئێستا ئیسلامیش، واتە هەموو حزبە کوردستانیەکان سەرباری نەتەوایەتیان سەر بە یەکێ لە مەدرەسەکانیشن.

لەوەوە دەردەکەوێ هەموو حزبێکی کوردستانی دوو تەوەرە خەباتی هەڵگرتووە، (ڕزگاری - نیشتمانی) تیایدا یەکسانن و (ڕزگاری- کۆمەڵایەتی) تیایدا لێك جیان، یەکەمیان کێشەی نەتەوەییەو دووەمیان کێشەی مدرسیە، چاکترین حزب ئەوەیە توانیبێتی مدرسەیەك هەڵبژێرێ تەواو لەگەڵ کێشەی نەتەوەییەکەی بگونجێ و هەردوو تەوەر یەکتر تەواو بکەن.

******

لەبەر ئەوەی حزبی مۆدیرن لە نیو میللەتە داگیرکراوەکان بە دوو ڕەهەندی ستونی(نەتەوەیی) وئاسۆیی(خزمەتگوزاری) کار دەکا ،ئەوا بۆ دیاری کردنی ناسنامەی حزب بەتاییەتی لە دوای پەنجاکانی سەدەی ڕابووردوو پیویستی بەو دوو ڕەهەندە هەیە کە بریتین لەو مەدرەسانەی سەروو کە بەکورتی گەلالەمان کردن، ئیستا بەو پێشەکیە دێینە نیو بابەتی حزبە کوردستانیەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم .

[1] بە هۆی ئەو گوتارەی لەشارۆچکەی بینگول لە 1994 درا دادگا لە لایەن عەلمانیەتی تۆرانی ولە سەرۆك وەزیری لادرا .

# بەشی چوارەم

## ڕەوتی حزبی لەدوای جەنگی جیهانی دووەم

لــەدوای زنجــیرە شکســتی شورشــەکانی کــورد لەبیســتەکان دا جۆرێــك لــەبێ ئومیدیوماندووی ڕووی لە کورد کرد تادوای جەنگی دووەم وچـەکەرە بـوونی بناغـەکانی (پ.د.ك).

لەو قۆناغەدا هاوسەنگی هێز گۆڕا و نەخشەی سیاسی و ئایدۆلۆژیش گۆڕا، (مارکسیەتی) لەشێوەی ستالینی باوی وەرگرت، کۆمەڵێك چەمك و بنەماو نەریتی سیاسی هاتە ئاراوە کە کارێکی زۆری هەبوو لەسەر دروست بوونی حزبە کوردستانیەکان، لە ڕووی: ئایدۆلۆژیا، هەڵس وکەوتیان، وەلائو هاوپەیمانیەتی، جۆری سەرکردایەتی، سنوری سیاسی و جەماریەکەی، ستراتیژیەت و پلانی عەسکەری و سیاسی، ئامانج و ئامرازی،... بەڵامپێش ئەوەی بێینە سەر (پ.د.ك) ئەوا بەپێی زنجیرەی خۆی دوو ڕوون کردنەوە پێویستە:

1- حزبی شیوعی عێراق لە ساڵی 1934 دروست بوو بە دروشمی نیشتمانی (نیشتمانێکی[1] ئازاد و گەلێکی بەختیار) و دروشمی چینایەتی (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن)، لقی لە کوردستان هەبوو، بەڵامعێراقی بوو، بۆیە ئەو حزبەتا دروستبوونی (حزبی شیوعی کوردستان) لە 1993/6/30 ئینجادەکەویتە خانەی حزبە کوردستانیەکان، لەو بەروارەشەوە نۆرەی دیتبەپێی زنجیرەی خۆی.

2- بەهەمان شێوەی فکرەی (حزبی ئیسلامی) لەئاستی عێراقی هـەبووە، کـەمتر لـە کوردستان تەنیا لە ئاست بیرمەنـدە ئاینیـەکان بـووە، تـا لـە سـاڵانی هەشـتاکان بوونـە حزبێکــی کوردســتانی، لــەوێوە نــۆرەی ئەوانیشــدێت، چــونکە بابەتەکــەمان حزبــە کوردستانیەکانە نەك عێراقی،کەلە بەشی داهاتوو ڕاستەوخۆدێینە نێو بابەتەکە .

---

[1]مەبەست لە نیشتمان عێراقە نەك کوردستان.

-1-

## پارتی دیموکراتی کوردستان

هەڵبەتە زۆر لە مەڕ ئەو حزبانە نووسـراوە، بـەڵام بەشـی هـەرەزۆری لـە چوارچـێوەی هەڵچوون و بە مەبەست و شەڕەقەڵەم بووە، هەوڵ دراوە ئەو توێژینەوە یـە دوور بـێ لـەو کاریگەریانە و زیاتر بابەتی و زانستیانە دەرگا واڵا بکریت تا زیاتر گفتوگـۆ هـەڵگرێ بـۆ دەوڵەمەندبوونی.

رەگ و ریشەی:

بەپێی ئەدەبیاتی خۆیان، ئەو حزبە زیاتر لە کوردستانی رۆژهەڵات چـەکەرەی کـردووە ئینجا پەرپەوە، یەکەم جار (ژ.ك: ژیانەوەی کورد)، لە 16/ئاب/1942 دروست بوو لە مهاباد (مێژووی تریشی هەیە)، بەکۆمەڵێك دروشمی ئیسـلامی و کوردایـەتی وەك :(1- ئیسلامەتی 2- کوردایەتی 3- مەدەنیەت4- ئاشتی)[1]، دوای لەیادی چوار ساڵەی لـە 16/ئاب/1946 بوو بە حزبی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی قازی محمد، لەدیوی کوردستانی خواروش ئەم چالاکی و پێشەکیە سیاسیانە هەبوو تا لـە (پـارتی دیمـوکراتی کوردستان) خەملی، بەو شیوەیەی خوارەوە :

- لـە سـاڵی 1939 کۆمـەڵێك رەوشـەنبیرلەوانە : (ئیـبراهیم ئەحمـەد، عەلائـەدین سجادی، رەفیق حلمی ..) جموجۆڵیان بە هەردوو تەوەری نەتەوەیی و فکری هەبوو.
- لە ساڵی 1938 (حزبی هیوا) دامـەزرا بەسـەرۆکایەتی (رەفیـق حلمـی)، ئامـانجی سەربەخۆیی کوردستان بوو،هەرچەندە خەلکی مارکسی تیابوو بەڵام تارادەیەك ئەوەش وەك (ژ ك) پابەند بووبە کوردایەتی رەسەن و بنەمای ئیسـلامی، بـەخێرایی پەرپـەوە بەشەکانی تری کوردستان.
- هەندێ گروپی تر پەیدابوون،لەوانە : (حزبی برایی 1938)، (حزبی پشتیوانی کـورد

[1]بە پێی بەڵگەنامەکانی بەریتانی –راپۆرتی کۆلینیـل ئیلفیلسـۆن کـە لـە 19/مـارتی/1947 ی نووسـیە دەڵێ زۆربـەی ئـەو رێکخراوانـە دروسـتکراوی کۆمـە نیسـتین، (ژ ك)یـش بـە هەسـتداری کۆمۆنیزمی وەسف دەکا ،بەڵام دەبێ ئاگادار بین مەبەستی کوردستانی رووسیایە ئـەگینا ئـەوەی لای خۆمان زیاتر ئارستەیەکی ئیسلامی هەبووە .

1938)، لقی(کۆمەڵـــەی ژیانـــەوەی کـــورد) ی ئێـــرانیش پەڕیـــەوە روژهـــەلاتی کوردستانیش، لەگەڵ وردە لایەنی تـری وەك (ڕێـی ڕاسـت)، (بـەرەی رزگـاری کـورد 1945)،...سەریان هەڵدا.

- لەساڵی 1944 (هیوا) بوو بـە دوو لـەت، بەشـێکیان چـوونە نـاو حزبـی شـیوعی عێراق، مارکسیە کوردپەروەرەکانیش (پـارتی کۆمۆنیسـتی کوردسـتانی عێراق)یـان دامەزرانـد بـە سـەرۆکایەتی (سـاڵح حەیدەری)،بـە (پـارتی شـۆڕش) ناسـرابوو، ڕۆژنامەیەکیان هەبوو بەناوی (یەکێتی تێکۆشین).
- لەسـەرەتای 1945 وەك بەرەیـەك هـەموو گروپـە دژ بـە ئیمپریالیزمـەکان بـۆ سەربەخۆیی کوردستانی گەورە (حزبی ڕزگاری)[1]یان دروست کرد، لـەو کەسـایەتیانە: (ساڵح حەیدەری، نافع یونس، د.جعفر محمد کریم، نـوری شـاوەیس، نـوری حمـدامین، تەها محی الدین معروف)، حزبی شیوعی دەڵێت لەسەر پێشـنیاری ئێمـەو بـەباتێکی فەرمی داوامان کرد حزبی رزگاری دروست بێت.[2]

## دامەزراندنی پارتی:

سەربردەی ئاسایی لەودەمە بەو شێوەیە: لە ساڵی 1946لەدایك بوو لـە یـەکگرتنی هەردوو حزبی ڕزگاری و شۆڕش بەناوی (پارتی دیموکراتی کـورد) لەوسـاڵیە کـە کۆمـاری مهابادیش ڕاگەیەنرا، دامەزرێنەرەکەی (همزە عبدالله) یە، بەڵام بەپێی ئـەدەبیاتی نـوێی (پ.د.ك) دەڵێن: ((همـزە عبـدالله لـەئێران نێـردرا، دامەزرێنـەرو سـەرۆکی راسـتەقینە مەلامستەفا بارزانی خۆی بووە)). بەڵام بە مسـۆگەر یەکـەم جـار لـە مهابـاد (پـارتی) دروست بوو ئینجا پەڕیەوە کوردستانی عێراق، ئەوکاتی مەلا مستەفا لە مهاباد بوو.

---

[1]بە پێی بەڵگەنامەکەی پێشـووی بـەریتانی –ڕاپـۆرتی کۆلینیـل ئیلفیلسـۆن ،..هـەروەها راپـۆرتی بالویزخانەی بەریتانیا لە بەغدا بە ژ:221/12/46لە 1946/7/26 بـاس لـە دروسـت بـوونی پارتی رزگاری کورد دەکا و بە دەسکردی کۆمەنیستی وەسف دەکا ، بڕوانە: کەمال مەزهەر– کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی بەریتانی ل209

2دەقی بەیانەکە لە : حامد محمد عیسی – المشکلة الکوردیة بۆ شرق الاوسط ص463

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە سەربردەی دروست بوونی (پ دك) دەبینین هەردوو ریوایەتی ئێرانی و دیوی عێراقی بەچاك یەك ناگرنەوە، هەروەها لەبارەی (دامەزرێنەرەکەشی) بۆیە پێویستە بە وردتر بن کۆڵی بکەین بۆ گەیشتن بەراستی:

1- بە پێی رای حزبی شیوعی ئەوابیرۆکەی حزبێکی بەرجوازی لەلای ئەوان هاتووە، بە پێی بەیانێکی (حزبی شیوعی کوردستانی )ڕاستەوخۆ لە دوای جەنگی جیهانی دووەم، بە ناوی- بیان ...: إتحدوا لتأسيس حزب رزگاری کورد... في سبيل تحرير كردستان الكبرى[1]، بووە هۆی دروست بوونی حزبی رزگاری دوای بوویتە پارتی .

2- بە پێی حزبی دیموکراسی ئێراندامەزرێنەرەکەی قازی محمدەو سەرەتاکەی بۆ ساڵی 1942ی (ژ ك)دەگەڕێتەوە .

3- گوایە فرقەی دیموکراسی ئازەربێجانی زۆر کاریگەری لەسەر ئەو دروست بوونە هەبووە.

4- لەدیوی ئیراقی ڕەگ وڕیشاڵی بۆسالآنی 1938 هیواو شۆرش دەگێڕنەوە .

4- کەواتە ڕاستیەکی وون هەیە لەو نێوانە با لێی بکۆلینەوە :

بەپێی دیکۆمینتەکانی فرەنسی و بەریتانیاو عوسمانی سەبارەت بەکورد ڕۆژی دامەزراندنی پارتی ناگەڕێتەوە بۆ 16ی ئابی 1946 بەڵکو بۆ ناوەڕاستی ساڵی 1919 وبەو شێوەی خوارەوە:

**یەکەم**//بروسکەیەکی هاوبەشی ئەو حزبانەی خوارەوەی تێدایە کە لە رۆژی 1920/3/25 بۆ (لوید جۆرج)یان ناردووە:

أ- ئەمین عالی بەدرخان:نائب (جمعيه تعالی والترقی).

ب- سلیم بەکر: ئەمین عام حزب الديمقراطي الكردي*.

ح- صبری** : رئیس خۆیبوون.

د- باقی : رئیس الجمعيه الدعايه.

ع- نهری معروف رئيس جمعيه الدعايه.

ك- كمال فوزی بأسم الصحافه الكرديه[2].

---

[1] بڕوانە :دەقی بەیانەکە لە کتێبی (المشكلة الكردية فی الشرق الأوسطص463) مێژووی لەسەر نیە .

* لە هەندی سەرچاوەی تر سکرتێری ئەو حزبەی دیاری کردووە بەناوی (نجم الدین‌طه ).

**ناوی تەواوی عوسمان سەبری بە ئاپۆ بەناوبانگ بوو واتە مامە .

[2] بڕوانە : کورد و کوردستان في وثائق بريطانية- ص340

**دووەم//** لەدیکۆمینتەکی بەریتانی کە لەڕۆژی 8|12| 1919 نووسراوە داوای سەربەخۆی کوردستانیان کردووە [1]،لە ژێرەوە بەناوی پارێزەر(منەوەر وبازرگان ) مۆریان کردووەبەناوی پارتی دیموکراتی کورد بۆ قومیسێری بەریتانیان ناردووە.

**سێیەم//** دیکۆمینتەکی تر بەرواری لە سەر نیە بەڵام هەردووکیان لە ئەستەمبۆل نووسراوە لە بارەی مۆلەتی یاسایی، دیارە ئەو پارتە مۆلەتی یاسایی پێ نەدراوە هەروەك خۆی لە نامەکەی سەروو باسی دەکا و لە دەقی بەڵگە نامەی (چاپەمەنی تورکیا ژ:185لە 1/تشرینی دووەم /1919 داوای مۆلەت پێدانی ڕەت دەکرێتەوە[2]،لە تورکیەکە بەناوی "کورد دمقرات فرقەسی"وسەرکردەی یەکەمی بە ناوی (ممدوح سەلیم)* تۆمار کراوە.

**چوارەم//**لەدیکۆمینتەکی تر بۆ قومیسێری بەریتانی پێشنیار دەکا بۆ بەریتانیا تاکوردستانیش بکەوێتەژێر ئینتدابی بەریتانی ومۆری سکرتێری پارتی دیموکراتی لە سەرە بێ ناو مێژوو،بەڵام واپێدەچی لەکۆتایی سالی 1919و نزیك سالی 1920 بێت چونکە سیستەمی ئینتداب لەدوای دامەزراندنی (عصبة الأمم)بوو بە پێی مادەی 22ی بەشی یەکەمی (عهد العصبة الأمم) .

پێنجەم// ناوی سەرکردایەتی ئەوحزبە بەو ناوانە هاتووە :ممدوح سلیم بەگ،منەوەر وبازرگان، نەجمەدین بەگ،حسێن بەگ ..

شەشەم// ئەو پارتە بە تورکیەکەی (کورد دیموقرات فرقەسی )بوو، کەواتە ئەو تیۆرەو دەڵێ ناوی پارتی لەسالی 1946 لە فرقەی دمقراتی ئازەر بێجانەوە هاتووە هەڵەیە، ڕەنگە پێچەوانەکەی ڕاست بێت و ئەوان لە کوردیان وەرگرتبێت .

---

[1] دەقی نامەکە لە کتێبی (کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەلگە نامەی بەریتانی وفرنسی – ل70)هەیە .

[2] هـ- س پێشوو ل79

* دوور نیە سلیم بەکر وممدوح سەلیم هەر یەك ناو بن و بەئینگلیزی زور جار ناوی یەکەم ناخوێننەوە ناوی باپیر وەك نازناو زیاد دەکەن- هەندێ جار بە ممدوح سلیم بەگ دەنوسرا، یان هەر گەلێ جار تەواوی ئەو زانیاریانەی نوێنەرەکانی بیانی لەکوردستان بە هەڵەیی بوویتە بەڵگەنامە دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین .

**حەفتەم//** لەهەندێ بەڵگەنامەی بەریتانی وفەڕەنسی وکوردیش ناوی ئەو پارتە هاتووە، لە ئەرشیفی وەزارەتی جەنگی فرنسی (20 N 1115)باس لە دوو نامەی تری ئەو پارتە دەکا کە بۆ بەریتانیایان نووسیە لە ساڵی 1920.

هەشتەم //وەك لەو دیکۆمینتەی خوارەوە هاتووە (لە خالی 13)باس لەپارتی دەکا لەمانگی( 9)- واتە لە دوای مانگی ئاب هەر بەسەرکردایەتی قازی **محمد** .

کەواتە پارتی مێژووی کون ترە و دامەزراندنەکەی ناگەڕێتەوە بۆ16ی ئابی 1946 و نە لە دیوی ئێران* و نە لە دیوی عێراق و دامەزرێنەریشی نە قازی **محمد**ە و نە هەمزە عبداللە یە و نە مەلا مصطفی.. بەڵکو بەلایەن کەمەوە لە پێش ساڵی1920 ئەو حزبە هەبووە.

بە هەر حال جگە لە جیاوازی لەبارەی دامەزرێنەروڕۆژی دامەزراندنی لەدیوی کوردستانی ئێران وئیراق، ئەوادامەزراندنی لە سوریاش بۆمێژووی1957/6/14دەگەڕێتەوە[1]. وەك لە دوای باسی دەکەین زیاتر دەردەکەوێ کە ملا مستەفا نەك دامەزرینەرە یاخود نا بەڵکو گومانێکی زۆر هەیە کە ئەوسەرۆکە هەر پارتیش نەبووبی.

دیکۆمینتەکان:
القنصلية البريطانية العامة
تبريز– 11/09/1946
سري رقم 30
سيدي:

---

* بەشێك پێیان وایە کە ناوی پارتی دیموکراتیەکە لە فرقەی دیموکراسی ئازەر بێجانەوە هاتووە ..هەڵبەتە ئەوەش لەوە دێت کە بە کەمی سەیری مێژووی فەرهەنگی کوردی دەکرێ، پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی پێچەوانەی ڕاست نیە ؟ ئەوەتا فرقەی دمقراتی کورد لە سالی 1919 هەبووە، کەچی فرقەی دمقراتی ئازەر لە جەنگی جیهانی دووەم سەری هەڵدا .

[1] بِروانة : د رضوان بادینی - أكراد سوريا :موعد مع التاريخ ص97

لي الشرف ان اكتب اليكم تقريرا عن نقاط النقاش المثير الذي بين بيني و بين قاسم الخاني زاده الديبوكري حول الوضع الكوردي الذي سبق و ان اعلمتكم عن زيارته في برقيتي رقم 285 ...

13- يقول قاسم آغا بصورة عامةبأن وضع جمهورية كردستان في ورطة و انها مفلسة كليا من الناحية المالية. و بينما قاضي محمد هو الرئيس من الناحية الرسمية للحكومة و الحزب الديموقراطي الكردستاني، ولكن في الواقع له سلطة قليلة جدا على القبائل و لا يمكن له الاعتماد على ولاء رؤساء القبائل له. و قد انتخبه الكورد رئيسا لهم لأنه المفتاح للوصول الى الدعم الروسي المالي و من ناحية اعطاء السلاح. و قد وصل مفاوضات قاضي مع قوام الى طريق الفشل: و قد الح قوام السلطنة على اعتبار الكورد جزءا من سكان آذربيجان و يجب ان يشملهم اتفاقية تبريز- طهران الموقعة في 14 حزيران. و لكن قاضي رفض القبول بذلك.

تێبینی: ئەو دیکۆمنتانەبەتەواوی لای من هەیە.

**کەسایەتیەکانی پارتی بەگشتی:** (ئیبراهیم ئەحمەد، همزە عبداللە، نوری شاویس، شێخ لەتیف، جەلال تالەبانی، عمر دەبابە، د.محمود عوسمان، سالح یوسفی، حمدامین معروف، سامی عبدالرحمن، حمەکریم فتح اللە، علی عبداللە، کاکەزیاد ئاغا، تەها محی الدین معروف، جعفر محمد کریم، رشید باجلان، رشید عبدالقادر، عبدالکریم توفیق، عبدالصمد محمد، سالح حیدری، کمال فوئاد، حمید عوسمان..). دەکرێ بلێین لەلایەن ئەو رەوشەنبیرانەوە زیندوکراوە.

گەشەی ئایدیۆلۆژیای:

حزبێکی نەتەوایەتی دیموکراتی بوو، بەڵام زۆربەی سەرکردە دامەزرێنەرەکانی مارکسی بوون وەك سالح حەیدەری و ئیبراهیم ئەحمەد، بەگشتی ئەزمونێکی کراوەی هەبوو، گەلێ جار وەك حزبێکی مارکسی خۆیان پێشان دەدا بەتایبەتی لە کۆنگرەی کەرکوکی 1953، بەڵام بە کاریگەری مەلا مستەفا دەگەڕایەوە سەر ناسنامەی میللەتی کورد، ئەو حزبە تەواو لەگەڵ بیروبڕوای مەلا مستەفا هەماهەنگ نەبووە. لەدوای غیابی مەلامستەفا جارێکی تر لە کۆنگرەی (9) ساڵی 1979 گەڕانەوە سەر ڕێڕەوی مارکسیزم، بۆ ماوەیەکی کەم، وەك تێبینی دەکری ئایدیولوژیای ئەو حزبەو بیرو بڕوای ملا مستەفا لیك جیا بووە .

دروشمی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دیموکراتی بۆ عێراق بووە.

## ڕێکخستن و سنووری:

کۆنترین حزبی نەتەوایەتی یە لەنێوان حزبە کوردستانیەکانی ئێستا، زۆر بەخێرایی لقی لە بەشەکانی تری کوردستان کرایەوە هەتا گەیشتە کوردستانی سوریا و لبنانیش*، شێوەی ڕێکخستنی وەك حزبە نویێ یەکانی جیهان (هەرەمیە) و پێك دێت لە سەرکردە و بنکە،و گوێڕایەڵی و ڕێنمایی، ڕێکخستنی توندو دیموکراسی ناوەندی، پەیکەری ڕێکخستنی بەم جۆرەیە: (سەرۆك- م.س.- کۆمیتەی ناوەندی- لق- ناوچە- ڕێکخراو- شانەی سەرەکی- شانە).

## ڕەوتی:

- ئەزموونی حکومەتی مهاباد شکستی هێنا و (پارتی) لەویێ کەوتە ژێرزەمین و مەلا مستەفا بەرەوسۆڤیەت ئاوارە بوو.
- کورد لەسەردەمی پادشایی عێراق هێشتا شەخسیەتێکی چاکی هەبوو تەنها کیانی سیاسی نەبوو، لە 1952 باڵی ئیبراهیم ئەحمەد و باڵی هەمزە عبداللە لەیەك جیابوونەوە، تاساڵی 1959 یەکیان گرتەوە، دوای دیسان همزە عبداللە دەرکرایەوە.
- لەدوای 14 ی گەلاوێژ لە 1958/10/6 بارزانی گەڕایەوە بەغداو تا ساڵی 1961 نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك لەگەڵ میری،بە پێی سەرچاوەیەکی دەگمەنی (ئیخوان)[1] ئەوا عبدالکریم قاسم لە پیلان بوە دژ بە بارزانی بۆ تیرۆر کردنی وبەغدای بەجێهێشتلە 1959.
- لە 11 ی ئەیلولی 1961 شۆڕشیان دەست پێکرد بەڕابەرایەتی مەلا مستەفا،(بەپێی کتێبی لا أصدقاء سوی الجبال)یەکەمجار (پارتی) بەشداری نەکرد بەڵکو بە (ڕجعی)شی لەقەڵەم دا، دوای هاتە ناو شۆڕش.

لە 1963/9/28بۆ یەکەم جار لە کوردستان ئیزگەی دەنگی کوردستان کرایەوە

---

*هەڵبەتەهەموو ئەو چەمکانەی وەك :کوردستانی سوریا یان کوردستانی عێراق ..هەڵەیە، پێویستە بنوسین باشوری کوردستان یان روژ ئاوای کوردستان .. بەڵام بۆ سوك تیگەیشتن وادەنوسین .

[1]لە کتیبی (الأخوان المسلمون فی العراق1959-1971 الدکتورة ایمان عبدالکریم دباغ ص593 واهاتوە:بارزانی لە (ساحە التحریر)کۆبونەوەی لەگەڵ لایەنگرانی خۆی هەبوە ،نوینەرانی ئیخوان(ابراهیم منیر وولید الأعظمی) خەبەری بارزانیان داوە نەچێتە ئەو کۆبونەوەیە چونکە پیلانی تیرۆرکردنی داڕێژراوە لەلایەن قاسمەوە .

وەك ئۆرگانی شۆرش بوە تەکانێکی مەزن لە رای گشتی دروست کردن و هۆشیاری وریێنمایش .

- لەساڵی 1963 حزبی شیوعی لەلایەن بەعسیەکان راوەدوونران و ئەوەی ڕزگاری بوو گەیشتە ناو شۆڕش.
- لەبەر نەبوونی ئایدۆلۆژیایەکی توند و تۆڵ کێشەی فرەتەوژمی و جیایی بیروڕای فراوان هەبوو.
- لەدوای کۆنگرەی (6)ی قەڵادزە لەساڵی 1964 باڵی (م.س) بە سەرکردایەتی (ئیبراهیم ئەحمەد- جەلال تالەبانی) لەدژی باڵی (مەلا مستەفا بارزانی) گوایە (ڕجعی) و (خێڵەکی) لێك جیابوونەوەو* سەرەتای (مەلایی) و (جەلالی) دروست بوو،کە لە راستیدا جۆرێك لە مل ملانێی نێوان عەلمانی وئیسلامی بوو، جەلالیەکان چوونە همدان،بە پێی ڕای (زۆر تایبەتی مام جلال) ئەو کێشەیەی ناو مەکتەب سیاسی بە فیتی حزبی شیوعی بوو لە ڕێی (خەت مائیل)ئەندامیکی باڵای پارتی جێ بە جێ کرا.
- دوای سووتانی (عبدالسلام عارف) دانوستانیك لەگەڵ عبدالرحمن عارف کراو بەیانی (لامرکزی )لە 29/حزیران/1966دەرچوو بۆ چارەی کێشەی کورد، بەڵام سەرەنجامی نەبوو.
- لە شەری عەرەب لەگەڵ ئیسرائیلی 5ی حوزەیرانی1967 بارزانی شەڕی یەك لایەنانە راگرت.
- جارێکی تر لەلایەن بەعسیەکان لەساڵی1968 دەسەڵاتیان گرتەوە دەست وشەڕ لەکوردستان زۆر بە توندی دەستی پێ کردەوە، جەلالیەکانیش گەڕابوونەوە باوەشی عێراق دژی شۆڕش بەڕەسمی جەنگان.
- لە 11 ی ئازاری1970دوای سەرنەکەوتنی سوپای عێراق دانی نا بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و لەگەڵ ملا مستەفا رێککەوتن بۆ ماوەی (4) ساڵ.
- بارزانی هەمان شەو (لێبوردنێکی گشتی) جاڕدا نەخشەی تێکبەردانی حکومەتی

*هەرچەندە لە پێشتر دژایەتی هەبووە بەڵام لەو کۆنگرەویە بە رەسمی ڕووبە ڕووی یەکتر بوونەوە، بە پێی کتێبی (بارزانی وبزوتنەوەی کورد – مسعود بارزانی ل139 )دەلێ لە 31ی تەمووزی 1963 کەهێرش کرایە سەر ناوچەی بارزان وحکومەت بەدرۆ گۆتی بارزان گیرا ئیبراهیم ئەحمەد هاواری کرد لە خۆشیان، مەکتەبی سیاسی پارتی ئەو سەردەم لەدژی ئەو هێرشە نەوەستان –بڕوانە ل147 ی هەمان کتاب،

هەڵوەشاندەوە.

- لە1971 جەلالیەکان لە کۆنگرەیەکی خێرادا ناویان لەخۆنا (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان) و چوونە ناو (پ.د.ك) بەهۆی ئەو لێبوردنە، پارتی شۆڕشگێر بەیانەکیان دەرکرد لە 1970/2/10 و لەلایەن (پ.د.ك) یشەوە بەیانێك لەهەمان رۆژ دەرچوو بەجیا پارتی شۆڕشگێرو (پ.د.ك) یەکیان گرت چوونەوەناوی.
- ئەو فەترەیەی1970- 1974 ئیدارەیەکی باش لە کوردستان دروست بوو لەچاو هەڵس و کەوتی حکومەت و جەلالیەکان و نائارامی و دزی و رێگری و کوشت و بڕ بەیەکجار زۆر کەم بۆوە، کورد یەکپارچە بۆوە.
- لەو فەترەیە (پ.د.ك) بووە گەورەترین حزب لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، خاوەنی زیاتر لەسەد هەزار ئەندام بوو، رۆژنامەی (التآخي) بەعەرەبی و (برایەتی) بەکوردی لە بەغدا دەردەچوو، بوێرانە بابەتی دەنووسی.
- لە کوردستان بوار بە حزبی شیوعی درابوو کاری سیاسی بەڕەسمی بکات و دوای لە بەغداش.
- یەکەم خیانەتی حزبی بەعسی عەلمانی لەدژی مەلا مستەفا ئەو پیلانە خۆکوژیە بوو کە چەند پیاوێکی بەدیمەن ئاینی و (هەواڵگری) بەڕووی مەلا مستەفا تەقینەوە، ئەو وەفدە بەناوی (محسن الحكيم) مرجعی شیعەکان هاتبوون کە ڕێزی تایبەتی لای مەلا مستەفا هەبوو، چونکە فتوای حرام کردنی جەنگی لەگەڵ کورد دابوو، دوای پیلان بوو لەدژی هەموو لایەك.
- حکومەت زوو دەستی بە تەعریب کردن و جم و جۆڵی سەلبی کردەوە.
- لەنێوان پیلانەکانی هەمیشەیی عێراق دژی شۆڕشی کورد توانی دووقۆڵیانە (حزبی شیوعی) هەڵخەڵەتێنن، لە 1973/7/17 لەدوای (ميثاق العمل الوطني) بەرەیەکی لاوازیان جاڕدا بێ پرسی (پ.د.ك) بەناوی(الجبهة الوطنية القومية التقدمية ).
- بەو شێوەیە حزبی شیوعی جارێکی تریش سەنگەری کەوتەوە لای حکومەت، بە هەنجەتی پارێزگاری کردن لە (سلطة الوطنية) گوایە نەوەك (ئەزموونی شیلی) و (سلڤادر ئەلیندی) و (ئینقلابەکەی بینوشی) لەعێراق دووبارە بێتەوە، چەکیشان وەرگرت لە حکومەت تەنها لەناوچەکانی کوردستان نەك لە سەرانسەری عێراق.

- لەساڵی 1974 حکومەت یەك لایەنانە لەگەڵ حزبی شیوعی و هەندێ خۆفرۆشی کورد یاسایەکیان دارشت بەناوی ئۆتۆنۆمی و دوو دەسەڵاتەکەی (تەنفیزی) و (تەشریعی) کە وێنەی نەبووە لە بێدەسەڵاتی لەو جیهانە.
- (پ.د.ك) رەتی کردەوەو حکومەتیش دەستی بەشەڕ کردەوەو ئەو جارە وڵاتانی سۆشیالیستی دۆستی گەلان و یەکێتی سۆڤیەت و حزبی شیوعی عێراقیش بەئاشکرا یارمەتی عێراقیان دا دژی ئیمپریالیزمی کورد!.
- بەشێك لەسەرکردایەتی پارتی لەوانە :عزیز عەقراوی، هاشم عەقراوی، ئیسماعیل مەلا عەزیز .. لە پێش مانگی ئازار ی 1974گەڕانەوە ناو حکومەت، لەنامەیەکی مام جلال لە1972/6/22 بۆ سەرکردایەتی کوردی ناردووە دەڵێ نوری شاوەیس وسالح یوسفی ودارا تۆفیق وعزیز وهاشم ئیسماعیل لە لایەن حزبی بەعسەوە بە (جناحی تەقەدومی )ناو زەد دەکرێن ئاگاتان لێیان بێت! .
- دوای یەك ساڵ جەنگ و بەرگری سەدان هەزار لە خەڵکی ڕەش و ڕووتی ئەو کوردستانە بە پیلانێکی عەلمانیەتی ناوچەکەو جیهان لە پەراوێزی کۆنگرەی (ئۆپیك) لە جەزائیر لە 1975/3/6 (شا و صدام) بە ئامادەبوونی (هواری بومیدیا) و ئەو (عبدالعزیز بوتەفلیقەی ئێستا، ئەوکاتی وەزیری دەرەوە بوو)، بەدەستخۆشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا- بەتایبەتی هینری کیسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکی ڕۆڵی باڵای بینی- دیسان لە هەمان( لانە) بەکوردیان وەداوە.
- لە بەرامبەر داڕووخانی شۆڕشی کوردستان، عێراق ئاوو خاکێکی زۆری کردە دیاری بۆ شای ئێران*.
- سەرەنجامی ئەو شۆرشەش وەك ئەوانی تر تاسەقفی دیاریکراو گەشەی کرد، ئیتر تیغیفاکتەری ئیقلیمی ملی شورشی بریەوە، کە فاکتەرێکە زیاتر دوزی کوردی ئالوز کردیە، میللەتانی ژێر دەستە لە دووفاکتەری ناوەکی —داگیرکاری ودادگەری نەبوونی یاسای دوەلی قەیرانی هەیە، بەڵام کورد لەدوای دابەش بوونی لە1916 سی قەیرانی کوشندەی ناوەکی وئیقلیمی وجیهانی هەبووە تا بەرپابوونی شۆرشی ئیسلامی لەئێران ئەو فاکتەرە کوشندەیەی ئیقلیمی زور سوك کردەوە .

---

* لە 1973/12/1 لە چاوپێکەوتنی سەدام بە وەفدی کوردی دیارە ئاماژەی بەوەها سەودایەك داوە، بڕوانە ل317ی بارزانیو بزوتنەوەیکورد

- بەو شێوەیە شۆڕشی ئەیلول شکستی هێنا و (پ.د.ك) جاڕی کۆتـایی خۆشـی هێنـاو هیچ حیزبێکی نیشتمانی لە گۆڕەپان نەما، هەندێ لە ناحەزانی شۆڕشـی ئـەیلول بـە (ئاشبەتاڵ)یان لەقەڵەم دا چونکە هێشتا شۆڕش خـاوەنی دەیـان هـەزار پێشـمەرگەو پارەوپوول و هێـزی لوجسـتی و مـادی زۆر بـوو، بـەپێی روونکردنەوەکـەی (لیژنـەی ئامادەی پدك- دمحمودعوسمان )60000پ مو15 ملیـۆن فیشـەك و ناوچـەیەکی فراوانی ئازادیش لەبەر دەستی شۆڕش بووە.
- لە کوردستانی عێراق تەنیا (حزبی شیوعی) و (چەند پارتیەکی کارتۆنی وەك : پارتی عزیز عقراوی و پارتی شۆڕشگێر- عبدالسـتار تـاهیر، بزوتنـەوەی پێشـکەوتنخواز- مەلا عبدالله سمایل- مەلا ماتۆڕ- ) مابوون کە لایەنگیری حکومەت بوون.

گۆڕەپانی ڕاستەقینەی کوردستان بۆشاییەکی مەزنی لێ دروست بـوو، بەتایبـەتی کـە ڕێبەرانی (پ.د.ك) نەیانتوانی ستراتیژیەتی شۆڕش بگۆڕن بۆ جەنگی چریکی، گۆڕەپانیـان چۆل کرد، بەو شێوە کۆتایش بە سیستەمی تاك حزبی و تاك ڕابەری هات، کە بۆ قۆنـاغی رزگاری ئەو سیستەمە چاکتر بوو نەك فرەلایەنی و فرە رابەری و فرە میلیشیایی.

لێـرەدا قۆنـاغی نـوێی بزووتنـەوەی رزگـاری خـوازی کوردسـتان دەسـت پێدەکـا و بناغەکانی حزبە کوردستانیەکانیش لێرەوە چەکەرە دەکا، ئەوجارە هەر لەژێرکاریگەر بیری نەتەوەیی ئاودراو بە ئایین نەما، زیاتر بە دینامیکێکی ئایـدیۆلۆجی چـەپی و عەلمانیانـە هاتنە مەیدان، بۆیە لێرەوە پێویستمان بە توێژینـەوەی مەدرەسـە فیکرەکانـە کـە چـەندە کاریگـەرن لەسـەر شـێوازی حزبایـەتی و ڕەوتیـان و هەڵوێسـت و ڕەفتاریـان، هـەتا چارەنووسیشیان، کە لە دەرفەتێکی فراوانتر باسی دەکەین، ئیتر نۆرەیەکێتی نیشـتمانی وسەرکردایەتی کاتی ... دێت.

# بەشی پێنجەم

## قۆناغی نوێی حزبە کوردستانیەکان

چەند پێناسێك

ئادیۆلۆژیا :[1] بریتیەلەکۆمەڵەبیرو بـرواو پاسـاوی ڕێباز و مەدرەسـەکانکە لـە چـۆنیەتی بەرنامەی ژیان (یان لایەنێك) دەکۆڵنەوەو .

ئینتیمای بڕوایی: بیروباوەڕی هەرکەسـێك بـە هـەر مەردسـەرەیەك، واتـە ڕاهێنـان و شاهیدی دان لەناخەوە بۆ ڕاستی ئەو مەدرەسەو بەدڵسۆزیش کاری بۆ بکـەی،(بیروبـڕوا = وەلاء+ زانیاری) .

ڕێسا: دوو بڕوای بەدیل بۆ یەکتر کۆنابنەوە لە یەك ناخدا، واتە ناشێت مارکسـی بیـت و لیـبرالیش، یـان سۆشیالیسـتی بیـت و ئیسـلامیش، نـەك هـەر لـەلای ئـاینی ڕەتکراوەتەوە((وما جعل الله لرجل من قلبين في جوفه))، لەلایەن مەدرەسەکانی تریش ئاوا بەدەق رەتکراوەتەوە.

حزبەکانی جیهانی سێیەم کـە لـەژێر بـارودۆخێکی تونـدی دیکتاتۆریانـەی ڕژێمـەکان دروست دەبوون، بەرنامەکانیان رادیکالیانەو سەر بە مەدرەسەیەکی فیکـری دیـاری کـراو بووینە، بۆیە سەرەڕای رادیکالیەتی کۆمەڵایەتی و ئایـدۆلۆجی ڕادیکـالی نیشـتمانیش و بگرە خۆیان لە قەرەی ڕادیکالیەتی نەتەوایەتیش داوە، هەر بۆیەش ئامانج و تێکۆشـان و بنەچە فیکرەکانیان لەسەر دوو تەوەری سەرەکی یووە*،(کـە لەپـەیڕەو پرۆگرامـی گشـت

---

[1] ئایدۆلۆژیا: لە دوو وشەی لاتینی پیك هاتووە، ئایدیا مانـای بیروبـاوەڕ، لۆگۆسـی یۆنـانی بـەمانای زانست، یەکەم فەیلەسوف (دیستراتی فرنسی لە 1755 - 1863) لە کتێبی ( elemenis of edeology) ئایدیۆ لۆژیای بەکار هێنا.

* واتە ڕزگاری کوردستانیان هاوبەشە، بەڵام بە چ ئامراز و چ جـۆرە دەوڵـەتێکی کوردسـتانی دروسـت دەکەن، لەوەوە لێك جیان،بەجوریك کە : **چەپیەکان** دەیانەوێ کوردستانێکی سەربەخۆ و حکومەتێکی مارکسیانە دروست بکەن، لیبرال دیموکراسیەکانیش کوردستانێکی سەربەخۆ و حکومەتێکی لیـبرالی،

حزبـە کوردسـتانیەکان بـە هەرسـێ تـەیاری ئێستاشـەوە - نەتەوایـەتی، چـەپیەکان، ئیسلامیەکان- وا دارِشتراوە) :

**تەوەری یەکەم:** رِزگاری- نیشتمان، واتە هەموویان بەرنامە و سـنووری رِکخسـتن و ئامانجیـان رِزگـاری کوردسـتانە هـەر لـە (لامرکـزی، ئۆتۆنـۆمی، فـدرالّی، ولایـات، کۆنفیدرالّی...) تا سەربەخۆیی کە ئەوەش دوا مەبەستەکەیە،لە کوردستان بە (رِزگـاری- نیشتمانی) ووتراوە کوردایـەتی، ئـەو رِێبـازە نەتەوەییـە نیـوەی ئایـدیۆلۆژیای حزبـەکان دروست دەکات، کە لەدوایی باسی دەکەین.

**تـەوەری دووەم:**رِزگاری - کۆمەلأیەتی ناونراوە، ئەگەر تەوەری یەکەم پەیوەندی نێوان ئادەمیزاد و نیشتمانەکەی بێت، یان نێوان نەتەوە بێت بـە سـتونی، ئـەوا تـەوەری دووەم ئەرکی رِێکخستنی پەیوەندی ئادەمیزاد بە ئادەمیزادەوە بە ئاسۆیی، بۆ ئامانجە بنەرِەتیـە مرۆڤایەتیەکان، وەك دادگەری و رِەوشت و یەکسانی و مافی مرۆڤ و ئافرەت و هەژاریەتی و... واتە لە یەکەم پەیوەندی تاك بە خاکە لە دووەم پەیوەندی تاك بە تاکە.

بە کورتی بەرنامەی ژیانی کۆمەلأیەتی و ئابووری و سیاسی و حقوقی و چینایەتی... کە پەیوەستە بە مەدرەسەی سیاسی و فکرییەوە.

گرنگ ترین بەشی ستراتیژەو تیۆری سیاسی هەر حزبێکە،ئـەو دوو تەوەرەلـە دروشمـی حزبەکان بەدی دەکری، هەر بۆ نموونە:

(پ.د.ك): 1- ئۆتۆنۆمی (ئێستا فیدالّی) بۆ کوردستان، 2- دیموکراسی بۆ عێراق.

(ی.ن.ك): 1- مافی چارەی خۆنوسین بۆ کوردستان، 2- ئـەی کرێکـارانی گـەلانی زۆرلێکراوانی جیهان یەکگرن.

(حزبی شـیوعی عێـراق): 1- نیشـتمانێکی ئـازاد و گـەلێکی بـەختیار، 2- ئـەی کرێکارانی جیهان یەکگرن.

سەرنج بدە بەشی یەکەمی دروشمەکان رِزگاری نیشـتمانیە، بەشـی دووەمیـان رِزگـاری کۆمەلأیەتیە، ناوەناوە هەندێ لایەنی دەستکورت لە فکر و مەدرەسـەی سیاسـی وای بـۆ دەچن گوایە جارێ پێویست بە تەوەری دووەم نیە تا رِزگار دەبین، بـەلأم هـەر رِێکخسـتنی خودی حزبەکە لە دەسەلأت و مافی دەزگای سەروو بەخوارە وە، سەرکردە و بنکە، سـزا و

---

بە هەمان شێوە ئیسلامیەکانیش کوردستانێکی رِزگارکراویان دەوێ تیایـدا حکومـەتێکی ئیسـلامی پەیرِەو بکەن .

پاداشت،..هەموو ئەوانە پێویستی بە دادگـەری هەیـە، جـا ئـەو دادگەریـە پێوانەیـەکی لەومدرسانە (سۆشیالیستیە، ئیسـلامیە، لیبرالیـە) پێویسـتە، هەڵبەتـە ئـەو بزووتنـەوە نیشـتمانیەی بـەرپای دەکـەن دژی داگیرکـەر بزووتنەوەیـەکی جەماوەریـە پێویسـتی بـە ڕێکخسـتن و ئیـدارە و کۆمەڵایـەتی هەیـە، ڕێکخسـتنی ژیـانی خێزانـی و گیروگرفـت و چارەسەریەکانی پێشمەرگە خۆبەخۆ و لەگەڵ جەماوەریش هەمووی پەیوەندی بـە(ڕزگاری- کۆمەڵایەتی) هەیە، هەر ئێستا ئەو جیاوازیە گەورەیەی ئاستی ژیانی پێشـمەرگەی سـادە و ئامیرێك، فەرمانبەرێك و بەڕێوەبەرێك، هەژارێك و بەرپرسـێك..هەمووی بەشـێکە لـە نوقسانی ئەو دادگەریەی کە (ڕزگاری- کۆمەڵایەتی) لێی بەرپرسیارە، ئەوەیان تەوەرێکە بەتایبـەتی لـەژێر ڕەوتـی ئێسـتای (عـەولەمـە) پەیوەسـتە بـە هـەموو مرۆڤایـەتی و ئەزموونەکان بەخێراپی لە کشوەرەکان دەپەڕێتەوە، بویە تەوەری یەکـەم بـە تاقیتـەنهابێ تەوەری دووەمانایەك ببەخشی مانایشوفینی وخیلەکی وبەدەویانە دەبەخشی .

هەردوو تەوەری فکری ونیشتمانی ئەودوو تەوەرەی نیشتمانی (گەشـەی کوردایـەتی )و گەشـەی فکـری لـە بەشـەکانی( 2 و3 )دیاریمـان کـرد زۆر کاریگـەری لەسـەر حزبـە کوردستانیەکانی هاوچەرخ هەیە،لە تەوەری نەوتەوایەتیدا جم وجۆلو هەست بـە ئینتمـای سیاسی کوردستانیەت ونەتەوەیی دەکرێ، کە هاندانێکی مـەزنی سروشـتی وهەمیشـەیی دەداتە تاکی کورد بیرو هۆشیاری سیاسی دروست بێت وسانابێت بۆ بە حزبی کردنی .

لەتەوەری دووەمیشا بنچینەیەکی ئایدیۆلۆژی بۆ ئامـادە دەکـا کـە لـە حزبایەتیەکـە قـووڵ بێتەوە، کوردایەتی ببەستێتەوە بە یەکێ لە مەدرەسەکان، ..لەڕاستیدا تەوەرەی دووەم زیـاتر لـە قۆناغی نوێی کوردایەتی کاریگەر بوو نەك لە سەردەمی دروست بوونی (پ. د. ك.).

بۆ زیاتر بڕوانه ئەو خشتەیەی جیاوازی:

| ڕزگاری —نیشتمانی | ڕزگاری —کۆمەڵایەتی |
| --- | --- |
| 1- پەیوەندی تاك بەخاكە. | 1- پەیوەندی تاك بەتاكە. |
| 2- بیروبـاوەڕ و ئایـدۆلۆژیا نیـە بـەڵكو هەست و نەست و هۆنراوە و جەماوەریە. | 2- بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆژیا و مەدرەسە و فەلسەفە و حزب و توێژی پێشڕەویە. |
| 3- پەیوەندیەكی ستونیە. | 3-بە سروشتی پەیوەندی ئاسۆییە. |
| 4- دەڤەریە وەك ڕەهەند. | 4- ڕەهەندێكی جیهانیشە. |
| 5- حزبە كوردستانیەكان لێی هاوبەشن. | 5- لێی جیان. |
| 6- قۆنـاغێكی وەختیـە و تایبەتـە بـە نەتەوەكانی ژێردەست. | 6- دوورودرێژە و گشتیە. |

- 2 -

# یەکێتی نیشتمانی کوردستان (ی.ن.ك)

**دۆخی دروستبوونی :**

بۆ ئەوەی خوێنەران ئاشنای بابەتەکە بن پێویستە سەرەتایەکی دروست بوون و مێژووەکەی بزانرێ.

**یەکەم**- باری ناوخۆیی:

بارودۆخێکی ناوەکی و ئیقلیمی و جیهانی زۆر ناسك و نەگونجاو بوو بۆ کورد، لەناوەخۆدا، تەنها سێ مانگ بوو شورشی ئەیلول زۆر بەبێ ئومێدی لە 1975 شکستی هێناو جارِی کۆتایی هێنانی حزبایەتی و سیاسەت و کوردایەتیش بوو لەو دەمیدا، کە خاوەنی زیاتر لە 60000 پ.م و توانای جەنگی بەهێز و ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی رزگارکراوی هەبوو، بێ ئەوەی هیچ رێنماییەك بەو خەڵکە بدرێت، بۆیە بەشێك لە رۆشنبیرانی چەپی کورد یاخود عەلمانیەتی کورد بە (ئاش بەتاڵ) ناوزەدیان کرد، بەو شێوە شاخ و گۆرِەپان چۆل بوو، حکومەتی بەعس زۆر زاڵ بوون بەسەر کوردستان، ئەوەی ئێستا دەبینرێ لەلایەن بەرژەوەندی پەرستان بۆ حزبە دەسەلاتدارە کوردیەکان دەیکەن — گەندەلجی وجاشەکان بە هەمووجورەکانیەوە، ئاواشیان بۆ بەعس دەکرد، چەند حزبێکی کوردی هەبوو لە بەرەی حکومەت بوو وەك:

1- پدك. باڵی جیابووەوەو بە سەرۆکایەتی عزیز عقراوی.

2- پارتی شۆرِشگێرِی کوردستان- بە سەرۆکایەتی عبدالستار تاهیر شەریف ئەو باڵەی کە لەگەڵ جەلالیەت نەگەرِایەوە نێو شۆرِشی کورد لە لێبوردنی1970 /3/11ی مەلا مستەفا بارزانی.

3- بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازانی کورد- هەر لە هەمان باڵ جیابۆوە- بە سەرۆکایەتی عبداللە اسماعیل- بە مەلاماتۆر بەناوبانگ بوو.

4- حزبی شیوعی عێراقی.

هەمووی لە بەرەدابوون لەگەڵ حزبی بەعس. .

- لەو کاتی تەنها تروسکایەکی جم و جۆڵی (ئەوکاتی پێیان دەووتن کۆنە جەلالیەکان) هەبوو لەگەڵ شەخسی (جەلال تاڵەبانی) خۆشی.
- کوردایەتی کەوتەوە نێو شیعر و گۆرانی و شانۆگەری، زۆرایەتی ئەو توێژە دەورێکی گرنگیان بینی.
- کۆمەڵە ڕایەك سەری هەڵدا ئەو کاتی گوایە ئەو شکستەی شۆڕشی ئەیلول لە ئەنجامی کوردایەتیەکی کلاسیکی و خێڵەکی تاکرەوی ئاینی بوو، نوقسان بوو لە تیۆری زانستی و عەلمانی و مارکسی، بەتایبەتی لەو سەردەمی شکستەکەی کورد هاوەدەم بوو لەگەڵ سەرکەوتنەکانی بزووتنەوە مارکسیەکان لە (ڤیتنام، کەمبۆدیا، لاوس، ئەنگۆلا، مۆزمبیق،..).
- بەو شێوەیە تەیاری عەلمانی و مارکسی زۆر تەشەنەی کرد لە کوردستان، حزبی شیوعیش ئەو شەپۆلەی پێ هەرس نەکرا لەبەر عێراقیەتەکەی بە پێچەوانەوە بەیانی دەرکرد ئەو جم وجۆلەی دروست بوونەوەی شۆرشی بە تەقەلاکانی ئیمپریالیزم و رەجعی لەدژی حکومەتی نیشتمانی بەعسی لە قەڵەم دا ،تەنانەت ڕووخانی شۆرشی کورد بەسەرۆکایەتی بارزانی لە 1975کە شینی کوردان بوو ئەوان لەکۆنگرەی 3ی 1976ی (ح ش ع) بەدەسکەوتێکی گەورەی وەسف کردو ئەو شۆرشەی بە (رجعی)لە قەلەم دابوو وەك لەدەقی بەیانەکەی واهاتوە:(..وفی مقدمة المنجزات الجبهة الوطنية الحكم الذاتی وقضية التمردالرجعی الكوردی)، دروشم کۆنگرەی 3ی (ح ش ع) بریتی بوو لە :(دەست لەناودەست بۆ پێشەوە بەرەودامەزراندنی سۆشیالیزم لە عێراق)[1]،دوایش کە شۆرشی نویێ هەلگیرسایەوە بەبەیانێك لەسالی 1978ئەو شۆرشەی بە کرێگرتەی ئیمپریالیزم وەسف کرد،دەقەکەی وا هاتوە:(..ئیمپریالیزم ووولاتانی رەجعی ناوچەکەیارمەتی عەناسری دژ بە عێراقی پێشکەوتوونیشتمان پەروەردەدەن..)،هەموو ئەو هەلویستە سەلبیانەی (ح ش ع) بووە پێشەکیەکی بەهێز بۆگەشەیکۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان و دروستبوونی (ی.ن.ك)یش.

[1]تقرير السياسی ا-لمؤتمر الثالث للحزب الشيوعی العراقی 1976، دەست لەناو دەست مەبەستی لە ناودەستی حزبی بەعس بوو کە ئەو کاتی پێکەوە لەو (جبهة الوطنية) بوون.

**دووەم** - باری ئەقلیمی:

- هەرسێ وولاتی (عێراقی بەعس، ئێرانی شاه، تورکیای تورانی) رێکەوتنی خنکێنەریان لە دژی کورد دارشتبوو.

- هەردووحزبی بەعسی دەسەلاتدار لەسوریا و عێراق ناکۆك بوون، زەمینەیەك بۆ (یەکێتی) هاتە بار،بە پێی ئەونامەیەی د فوئاد مەعسوم (ئەو کاتی نوێنەری پارتی بوو لە قاهیرە) بۆ کاك مسعودی ناردووە لە 1974/10/16 ئەوا پەیوەندی مام جلال و سوریا بۆ ئەوکاتی دەگەرێتەوەو لە نامەکەیدا باس لەوە دەکا کە سورییەکان ئیهتمام بە مام جلال دەدەن و بیجۆیەکی 404 ودەمانچەکیان پێداوە [1]،بەلام شوێنی بوونی (ی.ن.ك) کە لە ناوچەی سۆران بوو لەگەڵ سوریا (تەك و لۆ) هاتبوو، سودێکی وای نەبوو بۆی، ئیتر باری ئیقلیمی زور سەخت بوو .

**سێیەم**- باری جیهانی:

- جیهانی سەرمایەداری و رۆژئاوا بەپێی بنەمای بەرژەوەندی ئەو لایەنە بوو هەر لێی بە کورد وەدەدەدرا (من جحر واحد..).

- ولاتانی سۆشیالیست و یەکێتی سۆڤیەت پەیماننامەی (20) سالەیان هەبوو لەگەڵعێراق.

- ولاتانی جیهانی سێیەم و جامیعەی عەرەبی شۆڤێنیانە پالپشتی عێراق بوون.

- تەنیا کۆمەلە ولاتێکی وەك (چین- ماوتسی تۆنگ) و (کۆریا- کیم ئیل سۆنگ) وسوریا و یەمەنی خواروو ولیبیا- معمر قەزافی) ئەوانە تەریك بوون لەگەڵ رەوتی دەولی، رێکخراوی (بەرەی میللی بە سەرۆکایەتی جۆرج حەبەش) لەو خانە بوو کە دۆستایەتی تایبەتی لەگەڵ خودی سکرتێری یەکێتی هەبوو، ئەوەش کەمە یارمەتیدەرێك بوو.

هەموو ئەو بارودۆخە ناوەکی و ئیقلیمی و دەولیە بەو سەختیە زەمینەیەکی سازدا بۆ دروستبوونی بزووتنەوەیەکی کوردایەتی بە ناوەرۆك مارکسی هاوچەرخ جیا لە مارکسیەتی شیوعیە رەسمیەکان، بەلام بەگشتی ئەو پرۆژەی شۆرش هەلگیرساندنە بەو بارودۆخە نەگونجاوەی جیهانی و ئەقلیمی و ناوەکی هەورازێکی سەخت ونیمچە (مەحاڵ) بوو، بوێریەکی زۆری دەویست ئەو تەوقە بشکێنن، ئەوەش لە بوێری جەلال تالەبانی هاتەدی.

---

[1] بڕوانە :مسعود بارزانی —بارزانی وبزوتنەوەی کورد ل467

## (ی– ن – ك)

یەکەم ئەلقە لەو چوار کەسە پێك هات : (جـلال تالـەبانی، عـادل مـراد، عبـدالرزاق فەیلی، د فوئاد معسوم )، دوای ئەوانی تر لە دەرەوەو ناوەوە پەیوەندیان کرد، بلیمـەتی و بوێری ئەوانەو دەستەی دامەزرێنەرانی تری وەك (نەوشیروان مسـتەفا، د.کمـال خۆشـناو، د.کمال فوئاد، د.عمر شێخ موسی...) لەگەڵ بوێری سەرکردەکانی ناوەخۆ کە بریتی بوون لە (عەلی عەسکەری، د.خالید، عمر دەبابە، سەید کاکـە...) ئـەو مەحاڵـەیان شـکاند، ئەوانـە زیـاتر سـەرکردەی مەیـدانی زۆر بـەتوانا بـوون، زۆربەشـیان بـاڵی (بزوتنـەوەی سۆشیالیستی) بوون، ئەوانەی شام زیاتر خەتی گشتی و کۆمەڵە بوون، بەو شـێوە (ینـك) لە سێ باڵ لە 1/حزیران/ 1975لە شام جاڕدرا، بە سەرۆکایەتی (جـەلال حسـام الـدین تالەبانی) .

## پێکهاتنی یەکێتی:

باڵەکانی ناو (ی.ن.ك) لەسەر داهێنانەی زۆر عەبقەریانەی مارکسی بوو،بەهۆی بنەمای یاسای سێیەمی (مادیەی دیالیکتیك) دروست کرابوو، کە بریتیە لە (وحدة وصراع المتناقضات[1])، بەجۆرێك کە (وحدە) کە بریتی بێ لەسەر بنچینەی نیشتمانی و رزگاری کوردستان و (صراع)ەکەش بریتی بێ لە (ململانێی چینەکانی کوردستان) هەر لە چوارچێوەی (ینك)، ناوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لەوفەلسەفەیە هاتووە،ووردتر لە ئەزمونی چینی وفکری ماوتسی تۆنگ هەروەك لە لە پەیامە وەلاٌمێکی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی چینی بۆ کۆمیتەی ناوەندی ح ش سۆڤیەتی لە30\3\1963)هاتوە: (عندما یجری تشکیل الجبهة المتحدة مع البرجوازیة ینبغی للحزب البرولیتاري أن یتبع سیاسة الإتحاد و النضال فی آن واحد . سیاسة الإتحاد مع البرجوازیة طالما کانت تمیل نحو

[1] بۆ زانیاری سەرنج بدە (المادیة الدیالیکتیکیة) نووسینی (جماعة من اساتذة سوفیت) بەشی حەوتەم.

التقدمية وسياسة النضال ضد ميولها الرجعية )[1] ،ئەو ئەزموونە بەو شێوە لاسایی وڵاتانێك بوو لەسەر شێوەی قۆناغی کورد کە لە (ئەنگۆلا و مۆزەمبیق) پەیڕەوکرابوو هەر بەهەمان نێوی (یەکێتی نیشتمانی) و پێکهاتنیان لە چەند باڵێك.

ئەو داڕشتنەی (ینك) بە مەبەستێکی پۆڵاییینی وا بەرجەستەکرابوو کە:

1- بواری هیچ ڕێکخراوێکی تر لە دەرەوەی (ینك) نەدرێ، مادام نوێنەری هەموو چینەکان جێیان کرابێتەوە.

بەشێوەیەك (ینك) داڕژرابوو کە لە کۆتاییدا (کۆمەڵە) لێی سەرکەوتووبێ، تاڕادەیەکی زەق فێڵ لە (خەتی گشتی و بزوتنەوەی سۆشیالیستی) کرابوو، ئەوان بەپێی ئەو یاسایەی سەروو نوێنەرایەتی وردەبۆرجوازی نیشتمانیان دەکرد، کۆمەڵەش نوێنەری پرۆلیتاریا، ئیتر لەژێر سایەو فەزای مارکسیەت، هەڵبەتە ئەوەی یەکەم بەرەو کزی دەڕوا و ئەوەی دووەمیش بەرەو گەشەکردن و هەروەك واش هاتەوەو، جگە لە فێڵی فکری (کە ناونرابوو تاکتیك) فێڵی راستەوخۆش لەشێوەی (خط مائل)، د.کمال خۆشناو کە ئەندامی م.س. بوو لەسەر لیستی خەتی گشتی، کەچی لەژێرەوە بۆ (کۆمەڵە) ئیشی دەکرد، تا لەدواییدا ئاشکرابوو، لەو (نهێنیە) مام جەلال سکرتێری گشتی ئاگادار بوو، لەو سەردەمی زیاتر لایەنگری کۆمەڵە بوو، تا دروستبوونی (شۆڕشگێڕان) .

بەو شێوەیە پێکهاتەکەی لەسەر یاسای بنەڕەتی دیالیکتیك ومارکسیانە بوو، پێك هاتەو باڵەکانیشی ئەوانەن :

## 1- کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان:

بە تەقویمی خۆیان لە 1970/6/10 دروست بووە لەلایەن شەهاب شێخ نووری، وەستا ئەنوەر، جعفر کۆیی.. هەرسێکیان لەسێدارەدران لە 1977 دوای ئەوەی شای ئێران تەسلیم بە عێراقی کردنەوە، بەڵام بەپێی سەرچاوەی تر گوایە مام جەلال خۆی

[1]رسالة اللجنة المركزية للحزب الشيوعي الصيني ردا على رسالة اللجنة المركزية للحزب الشيوعي السوفياتي / دار النشر باللغات الأجنبية ،بكين ص19 .

دامەزرێنەرەو سکرتێریش بووە[1]، تا لەسالەکانی 1972نامەی بۆ ناردوون تیایـدا باسـی ئەوەی کردووە کە کوردستان پێویستی بە ریکخراویکی فراوانتر هەیە .

- لە سەرەتای 1976 بووە باڵێك لەناو یەکێتی بەناوی کۆمەڵەی مارکسی لینینـی کوردستان، زیاتر (ماوی) بوو، هەریەکە لە نەوشیروان مستەفا وشاسوار جـەلال- ئـارامو حکمتمحمد کریم- مەلا بەختیاربەهێزترین کەسانێك بوون تیایدا.

- لەدوای کارەساتی هەکاری زۆر گەشەی کرد بەهۆی ناوەنـدێتی رێکخسـتنی، بـەڵام هەریەکـە لـە مفـاوەزاتی 1983 و دووبـەرەکی عێراقچـی کوردستانچـی و شکسـتی مارکسیەتی جیهان بوونە هۆی کزبوونی تا لـە یەکـەم کـۆنگرەی یـەکێتی لـە 1992ی هەولیربە یەکجاری کۆتایی هات.

## 2- باڵی خەتی گشتی:

ئەو باڵـە بیدعەیـەك بـوو لـە مارکسـیەت، چـونکە بنچـینەی چـینایەتی و یاسـایی دیالیکتیکی نەبوو، بەڵام توانرا لەو باڵە کۆمەڵە خـەڵکێکی بیروبـاوەڕ جیـا و ئینتیمـای جیا لە ئاغەی نیشتمان پەروەر و ئاینی و نامارکسی جێیان بێتەوە، بەو شـێوەیە یـەکێتی بووە ئەو (تەیرە) جوانە (وەك سکرتێری یەکێتی وەسفی دەکرد) بە دوو باڵەکەی دەفـڕی و لەشە گەورەکەش خەتی گشتیە، قاوغەکی شمولیانـەی وا داڕێـژرابوو بیـانۆو بـواری هـیچ حزب و تەیارێکی تری فکری و سیاسی نەمێنی لە دەرەوەی ئەو قاوغە.

## 3- باڵی بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان:

- بە تەقویمی خۆیان هەر لەدوای ئاشبەتاڵ لە سـەرەتای مـانگی 1975/4 یەکـەم کۆبوونەوەی لە ورمێ بە ئامادەبوونی (عەلی عەسکەری، د.خالید، علـی هـەژار، کـاردۆ گەلاڵی، جەمال ئاغە، رسول مامەند، جمال خۆشناو..) گرێدراوە، بەڵام یادی دامەزراندنی دەگێڕنەوە بۆ سەرەتای مانگی 1976/8.

- عومەر دەبابە لە هـەمان سـاڵ سـەردانی شـامی کـرد و لەگـەڵ جـەلال تالـەبانی نەخشەی شۆڕشیان داڕشتەوە.

[1]بروانە: چەند لاپەرەیەك لە مێژووی یەکێتی نیشتمانی کوردستان –ل65

- له سەرەتا ناویان نا (بزووتنـەوەی سۆشیالیسـتی دیموکراسـتی کوردسـتان)، بـەڵام لەسەر پێشنیاری جـەلال تالّـەبانی (دیموکراتیەکـە) لادرا، چـونکە (سۆشـیال دیمـوکرات) سومعەی خراپ بوو لە دنیای مارکسیدا.[1]

- جەمال خۆشناو لە پلەی سـکرتێر بـوو بـەڵام کەسـی یەکـەم نـەبوو، تالـە سـاڵی 1977 لە خۆشناوەتی گیرا، دوای دەرچوونی لە زیندان لەناو کۆیەتیرۆرکرا.

- زۆربـەی عەسـکەریەکانی نـاو (یەکێتی)لـەوان پێکهـاتبوو، لـە سـەرەتادا (عـەلی عەسکەری و د.خالید) بەهێزترین تـەوەر بـوون تـا لـە کارەسـاتەکەی هـەکاری 1978 هەردووك شەهیدکران، ئینجا ڕێ بۆ کۆمەڵە خـۆش بـوو، ئـەگینا هەڵگیرسـان و گلێپـەی شۆڕش بەوانە ئەنجام درا.

- دوای ئـەو کارەسـاتە ڕەسـول مامەنـد بـووە سـکرتێر و تـا لـە سـاڵی 1979 ئسنشقاقیان کرد و (حیسك)یان دروست کرد.

## ئایدۆلۆژیای یەکێتی:

لەو سەردەم مارکسیەت زۆر باوی هەبوو و لەهـەمان کـاتیش فرەتـەیار و فرەڕێبـازی مارکسی هەبوو، لەوانە: ترۆتسکی، ماوی،ئیسـلاحی، شۆڕشـگێڕی، بـاکۆنی، سـتالینی، مارکسی بێ لینینی،...هتد، لە (دوا فەرهـەنگی یـەکێتی سـۆڤیەتی ئەوسـا) زیـاتر لـە (100) جۆرە مارکسـیەتی تۆمـارکردبوو، بـەڵام وەك (ئـەرزی واقیـع) مـاوی چـینی و برێجنیڤی سۆڤیەتی هەبوو، (ینك) بە (کۆمەڵە)شەوە لە سەرەتادا بە (ماویەت) کاریگـەر بوو، بۆیەش پێکهاتن و داڕشتنی (ینك) زیاتر مۆرکی ماویـەتی پێـوە دیـاربوو، کـە لـە مەرجەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی (لەسەر ڕاڕەوی ماوتسی تۆنگ) بۆ سازدرابوو:

1- پێشڕەوێکی مارکسی (کۆمەڵە).
2- بەرەیەکی فراوانی چینەکان (یەکێتی)
3- سوپایەکی توندوتۆڵ (هێزی پێشمەرگە).

دروشمیش هەر ماویانە بوو (ئەی کرێکاران و گەلانی چەوساوەی جیهان یەکگرن).
وەك لە یەکەم مانفێستی (ینك) هاتبوو ئەوادوژمنەکانی بریتی بوون لە:

---

[1]بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە کتێبی (شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکارییەکانی سەردەم) –حکمت محمد کریم( مەلا بەختیار).

1- ئەمریکا و ئیمپریالیزم و زایۆنی.

2- ڕەجعیەتی عەرەبی و بەکرێگیراوانی ئیمپریالیزم و بورجوازیەت.

3- ڕەجعیەتی کوردی و بەکرێگیراوانی ئیمپریالیزمی ئەمریکی و زایۆنی و چینەکانی دەرەبەگ و بورجوازی و نوێنەرانیان لە (سەرخان) حزبی سیاسیدا کە لەو کاتی خۆی (سەرکردایەتی پدك. دەنواند بەپێی پۆلینی چینایەتی ئەوسا).

دۆستەکانیشی بریتی بوون لە:

1- سەربازگەی سۆشیالیستی و گەلانی چەوساوەو چینی کرێکارانی (پرۆلیتاری) جیهان.

2- بەرەی پێشکەوتنخوازی عەرەب.

3- چینی پرۆلیتاریا و زەحمەتکێشانی کوردستان.

هەروەها پەیڕەوی تیۆری سیاسی شۆڕشگێڕی (توندوتیژی) دەکرا بۆ هێنانەدی ئەو ئامانج و دروشمانە، دژی چەمکی وەك :دیمکراسی، پەرلەمانی، فرەیی، مافی مرۆڤ، هەڵبژاردن، چاکسازیە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان، عەقیدەی میسالی(ئاینی)، ئەخلاقی کلاسیکی، کۆمەڵگەی مەدەنی، کەرتی تایبەت، بورجوازی وبازاڕی ئازاد و لیبرالی و تەغریب بوون.

لە مارکسیەتیش لە خەتە هەرە توندەکەی شۆڕشگێڕی بوون لە ماویدا، بەڵام دوای ئەوەی لە هەندێ بەرەدا لایەنگرانی ماوی شکستیان هێنا، لەوانە لە ناکۆکی نێوان ڤێتنام (بەسەرۆکایەتی هۆشی مینە- سەر بە سۆڤیەت بوو) لەگەڵ کەمبۆدیا (بەسەرۆکایەتی پۆل پۆت- لایەنگری ماوی چینی بوو)، ڤێتنام زال بوو بەسەر کەمبۆدیاو پۆل پۆت دەسەڵاتی دۆڕاند و (هنگ سامرین) لەساڵی 1977 دەسەڵاتی گرتە دەست، کە لایەنگری سۆڤیەتی بوو، مارکسیەکانی نێو (ینك)یش زۆر بە ئەزموونەکانی (پۆل پۆت) کاریگەر بوون، بۆیە بەرەبەرە روویان گۆڕی بەرەو سۆڤیەتی. هەتا ناوی (کۆمەڵە)ش لە (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) گۆڕا بۆ (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان).

لە ئەنجامی ڕەوتی گەشەی ناکۆکی و پێشبڕکێی باڵەکان دەبووە هۆی گەشەسەندنی یەکێتیش، واش داڕشترابوو کە لە کۆتاییدا حزبێکی پێشڕەوی مارکسیانەی لێ دەربچووبوایە و یەکێتی کۆتایی بهاتبایە بەڵام وەك باوە ئەزمونەکە لە دەبڵ کوژایەوە،

بۆیە عەقیدەی گۆڕا بۆ سۆشیال دیموکراسی، لەوێش جارێکی تر بۆ جۆرە سۆشیالیستیەکی تر، هەروەك لە کۆنگرەی دووەمی (ی.ن.ك) هاتووە.

## ڕێکخستنی:

ڕێکخستنی وەك هەموو حزبەکانی تری کوردستان و جیهانی سێیەم (هەرەمیە، دسپلینی شۆڕشگێڕیە، دەمارگیری فکری سیاسی) بەشێوەی (سکرتێر- م.س- سەرکردایەتی- لەسەرەتا لق بوو تاسالی 1982 ئینجا بووە مەڵبەند- کۆمیتە- کەرت -پۆل -شانە -ئەندام) داڕژرابوو.

دەزگاکانی خواروو گوێڕایەڵی سەروون، سیستەمی سکرتاریەتە، مەکتەبی سیاسی زیاتر مەکتەبە تەنفیزی بوو و سەرکردایەتی زیاتر مەکتەبی تەشریعی بوو، بێ لێك جیاکردنەوەی تەواو.

ئەندام لە هەر باڵێك ئەندام بوو لە یەکێتیش، پێچەوانەکەی مەرج نەبوو.

بە ئیدارەو موئەسەساتی بوو، لایەنی عەسکەریش سەر بە ڕێکخستن بوو.

ڕێکخستنەکانی ناوشاریان تاك و بەکۆمەڵیش بوو.

## ڕەوتی (سیرە):

≈ لەدوای ساڵێك لە دروستبوونی دەست بە جم و جۆڵی پێشمەرگایەتی کرا، سەرکردەکان خۆیان هاتنە مەیدان و (سەید کاکە و سەعدی گچکە و محەمەدی حاجی مەحمود..)یش هاتنە ناو یەکێتی و زیاتر تەکانی دا.

≈ زۆر بەخێرایی گەشەی کرد و هەر بە خێراییش ڕووبەڕووی کێشەی کۆنی (جەلالی ومەلایی) بوونەوە لەگەڵ (قیادەی موەقەتەی پارتی)[1]، لەلایەکی تریش خەڵکێکی زۆر هەر گومانی کۆنی مابوو، وایان دەزانی ڕووباری یەکێتی پڕ لە تاڤگە و بەنداو و وەرچەرخانە و جێی متمانە نیە.

≈ بەخێرایی دووچاری شەڕی براکوژی بوو،لەهاوینی1976 دەستەکەی ئبراهیم عەزو شەهیدکران ویەکێتی وای لە قەڵەم دا کە ئەوە ئاشبەتالیەکی تر بوو بەشورش کرا

---

[1] لەدوای چالاکیە سەرکەوتووەکانی (ی.ن.ك) لە کوردستان، پارتی دیموکراسی کوردستان بەناوی (سەرکردایەتی کاتی- قیادة مؤقتة) خۆی ڕێکخستەوەو مەفرەزەیان لە کوردستان دروست بوو.

لەلایەن پارتی .

≈ ئەو ناکوکیانە پاڵی بە یەکێتی نا دەست بە سەوداو سەوداکاری لەگـەڵئێران و عێـراق بکـا ویەکـەم کـەناڵی دانوسـتان لەگەڵعێراقلەسـالی1977کـراوەو علـی عسـکری سەردانی بەغدای کردوو متمانە بەیەکتر زور لاواز بوو .

≈ لە هەمووی ترسناکتر شەڕەکەی هەکاری بوو لە مانگی 1978/6کە بە سـێ ڕەتـڵ نزیکەی (1700) پێشمەرگەیان کۆکردەوە و چوونە سـەر (ق.م پـارتی)، گوایـە بـۆ ڕێکردنەوەو هاتنی چەك و سیلاح لە سـوریا، زۆربـەی سـەرکردەکانی مەیـدانی وەك: (عەلی عەسکەری، د.خالید، حسێن بابەشێخ، سید کاکە، محمد حاجی محمود، تالیـب رۆستەم..) وێران بوون، لەدوایدا (سید کاکە و محمد حاجی مەحمود) هەڵاتن و (تالیـب رۆستەم)یش تەسلیم بۆوەو لەسلێمانی تیرۆر کرا.

≈ یەکێتی تێکشکا و نائارامی کەوتە نێوی،بزوتنەوەی سوشیالیستی بەرەو سـەربەخویی وپچران بوون، لە دوایدا تەنیا مام جلال و (70) (پ.م) مابوونەوە لە بناری قەندیل، بەڵام کۆڵیان نەداو بەرەبەرە پێشمەرگە و دەزگاکانی دروست کردەوە.

≈ لەسـاڵی 1978 شۆڕشـی ئیسـلامی ئێرانـی دەسـتی پێکـرد و لەسـاڵی 1979 سەرکەوت و ئیدی باری یەکێتی و کورد لەو ئاسۆیە تەنگە ڕزگاری بوو بەیـەکجاری و هەتا ئەو چرکەیەی وا کورد بووەتـە سـەرۆك کۆمـاری عێـراق هـەر کاریگـەری ئـەو شۆڕشەی پێوە ماوە.

≈ لەهەمان ساڵ عێراق لە حزبـی شـیوعی داو دیسـان بـە کوردسـتان خۆیـان گرتـەوە، هەرچـەندە ئـەو شۆڕشـە نوێیـەو (یـەکێتی) لای حزبـی شـیوعی بـە جـم و جـۆڵی (ڕەجعیەت) لەقەڵەم درابوو.

≈ لە21- 3- 1979 لەسـەر کۆمـەڵێك هۆکـاری فکـری و ئیـداری و دەروونـی و (بزووتنەوە) لە (یەکێتی) بە تەواوی جیابۆوە، نیوەی (پ.م)کانی لەگەڵ خۆی برد کـە نزیکـە 800پێشـمەرگە دەبـوو، دوای لەگـەڵ لیژنـەی ئامـادەی (پ- د- ك بـە سەروکایەتی د محمود)یەکیان گرت و سەرکردایەتی یەکی نوێیان لـە (دۆڵـەتوو) دانـا بەناوی (حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی کوردستان- حسیك ).

≈ یـەکێتی بـەخێرایی لـەجێی بزووتنـەوەی کـۆن سـەرکردایەتیەکی بـۆ دروسـتکردن پێکهاتبوو لە (عومەر دەبابە- جمال ئاغا- عەلی حویز، سوار ئاغـە..)، کۆمەڵـەش

بەجیا و بەخێرایی گەشەی ڕێکخستنەو ئینجا پێشمەرگایەتیشی کرد.

≈ لەساڵی 1980 لەدوای هەڵگیرسانی جەنگی عێراق و ئێران لە کوردستان دوو بەرە دژ بەیەك دروست بوو:1- بەرەی نیشتمانی نەتەوەی دیموکراسی(جوقد) کەلە 11/2/ 1980 لە دیمەشق دروست بوو، پێك هاتبوو لە:یەکێتی- شیوعی- بەعسی سەر بە سوریا،یەکێتی لێی بنچینە بوو2- بەرەی نیشتمانی دیموکراسی (جود) لە1981/1/28 جاڕدرا پێك هاتبوو لە: حسك- شیوعی - پ.د.ك لێی بنچینە بوون، ئەوەی جێی سەرنج بوو (حزبی شیوعی) لەناو هەردوو بەرەدا بوو!.

≈ ئینجا جەنگی ناوخۆیی کورد بە زەق تر و ڕۆژانە دەستی پێکرد لەگەڵ تەمەنی جەنگی عێراق- ئێران، یەکێتی دیسان بە قۆناغێکی سەخت تێ پەری کاتی نەوشیرەوان مستەفا لەلایەن حسیك دەست گیر کراو مام جلالیش دوور لە کوردستان بوو، دوای لەلایەن کاوە شیخ لەتیف ونیمچە نێوبژیەکی حشع ئازاد کرا*.

≈ لەساڵی 1981 یەکەم شەڕی سەرتاسەری براکوژی دەستی پێکرد لەسەر کوشتنی (جەمال عەلی باپیر- یەکێتی) و (شێرکۆ شێخ عەلی- سۆشیالیست)، بەڵام هێزەکانی پارتی درەنگ بەهانای سۆشیالیست هات و لە ئەنجامدا شکستیان هێناو دەوری (یەکێتی) بەڕاستی دەستی پێکرد،بەڵاملەگەڵهەمووحزبە کوردستانیەکان لەشەر دابوو .

≈ لەیادی 24- 4- 1974ی قەڵادزە بووە خۆپێشاندانێکی سەرانسەری کوردستان بە ڕابەرایەتی یەکێتی و زیاتر جەماوەری تر بوو حزبەکانی تریش بەرەو کزی بوون.

≈ لە ساڵی 1982 بەهانای (حزبی دیموکراسی کوردستانی ئێران) هات لە بەرامبەر هێزەکانی پاسداران و پارتی دا بەناوی هێزی پشتیوان.

≈ لە جەژنی هەمان ساڵ بڕیاردرا لە (لەشکری ئیسلامی) بدرێت و هەموویان چەك کرد و دەرکرد هەرچەندە خۆی هینابوویە کوردستان.

≈ لەدوای ئەو پرۆسانە پەیکەری ئیداری و عەسکەری و ڕێکخستنی گۆڕی، چوار مەڵبەندی دروست کرد لە جیاتی لقەکان، و هەرێمەکان بوونە تیپ و یەکێتی شۆڕشگێڕانیش دروست بوو لە یەکگرتنی خەتی گشتی و بزووتنەوە.

---

*کاوەی شیخ لەتیف لە 1981دەست بەسەر بوو لە بارەگای ئێمە لەنێوزەنگ، ئەو نهێنیانەی دەست گیرکردنی نەوشیرەوان و ئازاد کردنی بۆ باس کردم .

≈ مەڵبەندەکان: م(1): حاجی مامەند- مەلا بەختیار بەرپرسی بوو (کۆمەڵـە)، م(2) گەرمیان: جبار فرمـان (کۆمەڵـە)، م(3) وەرتـی: سـید مجیـد (شورشـگیران)، م(4) بالیسان: د.کمال خۆشناو (کۆمەڵە)، دوای 1985م(3) و م(4) بووە یەك مەڵبەنـد بە سەرکردایەتی کۆسرەت ڕەسول، کە تازە ئاشکرا کرابوو لە کۆنفرانسی کۆمەڵە.

≈ لەسالی1982 لە چەند شوێنێك شـەڕی لەگـەڵ سـوپای ئێـران کـرد و ئـەو کـاتی سیاسەتی یەکێتی وابوو گوایە ئێران داگیرکەری عێراقە یـەکێتیش بـەرگری دەکـا لـە خاکی عێراق، هەماهـەنگێك پەیـدابوو لەگـەڵ مـیری عێـراق، دوای بـەهۆی حزبـی دیموکرات و (شێخ عزالدینی حسـێنی) مفـاوەزاتی یـەك سـاڵی کـرا بەتـەنها لەگـەڵ (ی.ن.ك).

≈ لە مانگی5/ 1982 لە سەرکردایەتی (حزبی شیوعی- حسك- پاسـۆك) درا لـە قرناقاو پشت ئاشان گەورەترین زیان بە حزبی شیوعی کەوت، دیسان (پ.د.ك) تـاخیر بوو لە تەوقیتەکە و نەیتوانی بەهانایانەوە بێت.

≈ لەو مفاوەزاتە کورد و خودی یەکێتیش زەرەریان بوو، تەنانەت لە وەڵامیپرسـیارێکی کادیرێك لە کۆبوونـەوەی (مەرگـە سـاڵی 1984) ئـاخۆ ئـەو مفاوەزاتـە قـازانجی سیاسی چیە؟ لە وەڵامدا نەوشیروان مستەفاووتی: قازانجمانە، ئەوەتا 500 دەمانچە و ئۆفسێتەکمان وەرگرتووە!!، لە بەرامبەردا حکومەت قازانجێکی زۆری عەسـکەری و سیاسی و جەماوەری کرد، وەك:

1- سوپای لە کوردستانی بردەوە خواروو خۆی لە بەرامبەر ئێران پێ گرتەوە.

2- سۆز و هەڵچوونی خەڵکی کوردستانی پێ کپ بۆوە.

3- وەختێکی زێڕین لەدەست چوو زیاتر بێمتمانەیی و نـاکۆکی لـە کوردسـتان دروسـت بوو.

4- حکومەت لە کوردسـتانیش فـەوجێکی زۆر و (جـیش الشـعبی)و (بەعسـیاتیەکەی) دروست کردەوەو چەندین سەرکردەی دڵسۆزی وەك (مامەڕیشە)ی لێ تیرۆر کـردن،ئیتر سەرەنجامی ئەو هەلەیە زورە لە خالە لاوازەکان باسی دەکەین .

## دوای بەرەی کوردستانی:

سەرنەکەوتنی یەکێتی لەو ستراتیژیەی ڕوو لە حکومەتی عێراق لەلایەك، لەلایەکی تر ماندووبوونی حزبی شیوعی و حسك بە بیرۆکراسیەتی ئەوسای پارتی (وەك خۆیان وتیان)سەرەرای‌تووندی حکومەتی عێراق..هەموو ئەوانە وای کرد لە 1986/11/7 مامجلال و ئیدریس بارزانی لەسەر دەستی کۆماری ئیسلامی ئێرانی پێك بێنەوە ، تا بەرەیەکی (8) لایی لە 1988/5/7پێکبیت ، بەڵام بەپێچەوانەی دروشمەکەی (تا بەسەرشۆڕی یەکیان نەخستین با بە سەربەرزی یەکگرین) بەڵکو لە ئەنجامی شکستی هەموو لایەك هاتە دی ولە راستیدا، زیاتر بە تەقەلاّی ئێرانی ئەو بەرەیە دروست بوو، تیایدا (ی.ن.ك) بنچینە و پێشڕەو بوو، چونکە:

1- بە حوکمی بوونی لە مەیدان.
2- ئامادە و جورئەت و موئەسەساتی یەکەی.
3- چالاکی عەسکەرییانەکەی.
4- داهێنانی سیاسی و ئیداریانەی.
5- چاوشکانی لایەنەکانی تر..

بووە سەرکردەی ئەو بەرەیە بێ هیچ بڕیارێکی ڕەسمی یان بەلای کەمەوە بووە لایەنی دەستپێشخەر لەهەموو روویەکەوە، هەر بە نموونە:

+ یەکێتی (پاسداری) هێنا کوردستان، هەموو لایەنەکانی تر هێنایان (بێجگە لە حزبی شیوعی و بزووتنەوەی ئیسلامی).

+ لەدوای بەکارهینانی چەکی کیمیایی* جگە لەمەڵبەندی سێی هەولێر بە

*ئەو چەکانە لەدوای 1986 بەکار هاتن کاتی لەبەرەکانی جەنگی بەسرە عێراق بەکاری هێنا لە دژی ئێران و سەرکەوتوو بوو بێئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان سزای بدا، لەکوردستانیش دەستی کرد بەبەکارهێنانی بەتایبەتی لەشاری هەلەبجە ودوای لەهەموو کوردستان بەکاری هێنا .
مێژووی بەکارهێنانی کیمیایی دەگەڕێتەوە بۆ 2000پ زیەکەم جار لە جەنگەکانی هندی هەڵی ژاراوی وا بەکارهات دەبووە هۆی تەمبەلی وخەوالۆیی سەربازەکان، بەوشێوەیە ناوە ناوە بەکارهاتووە، مەنزەنیقیش لەسەردەمی خۆی بەچەکی کۆکوژ پۆلین کراوە، لەهەردوو جەنگی جیهانی دیسان بە فراوانی بەکار هات، سەرجەم لەجەنگی یەکەم بەگازی ژاراوی 1.800000کەس کوژران، دووبارە ئەمریکا لە جەنگەکانی فیتنام بەکاری هێناوە، هەرچەندە لەکۆنگرەی لاهای 1907 ودوای لە1899کرا دیکۆمینتی وتا(کۆمەڵەی نەتەوەکان ) لە 1925لە رێکەوتنامەی جنیف قەدەغەیان کرد، دووبارە نەتەوە یەکگرتووەکان لە 1962 بەبڕیاڕی یاسایی قەدەغەیان کرد، لە دوایئەمریکا

سەرکردایەتی (کوسرەت رەسول) مەڵبەندەکانی تر لەکوردستان نەحەوانەوە وبەرەو ئێران لاربوونەوە .

- لەدوای وەستانی جەنگی عێراق- ئێرانبە تەواوی کەوتنە دیوی ئێران، و دارمانەکەی مارکسیەتیش لەسالی 1990دەستی پێکرد، ئی دی زۆرینەی کادیرانی یەکێتی ڕابوون بەرەو هەندەران، چالاکی هەموو حزبەکان زۆر سست بوو، لەناو یەکێتی زیاتر (سکرتێر) و (کۆسرەت) ئیشیان دەکرد بەگەرمی.

## یەکێتی لەدوای ڕاپەڕین:

- 2ی ئاب 1990 بووە وەرچەرخانێکی نوی لەناوچەکەوبەتایبەتی لەدوای شکستی عێراق لە کوێت، زەمینەی راپەڕین سەری هەڵدا، لە خواروو کلّپەی راپەڕین گەیشتبوە نزیك بەغدا، لێرەش (ینك) وەك هێزێکی بنچینە و پێشرەو جاری راپەڕینی داو سەرکەوتوو بوو، بەلاّم بیّ سەروبەری پێوە دیاربوو.
- تالان وگەندەلی بەزەقی سەری هەڵدا، بەرەبەرە دیمەنی پێش مەرگە ناشرین بوو،لایجەماوەریش ئەو دیمەنە نوێیەی بەرپرسان زور ناکاو بوو .
- راپەرینی خواروو شکستی هینا ئیتر شکست رووی لە کوردستانیش کردو کۆڕەوەکەی لی هاتە دی و لە ژێر فشاری دەولی دانوستانکرا بە تایبەتی لە دوای ئەو بەرگریە هاوبەشەی لە کۆڕێ کرا،دوو خولی گفتوگۆ کرا لە:20- 1991/4/28 لەدوەمیشالەمانگی 5و1991/6
- حکوومەتی عێراقی بەکۆمەڵێك بڕیاری UN کوت وبەند کرا سەرجەم گەیشتە 40 بڕیار.
- لەو ماوەیە شارەکان لە دەست حکومەت بوو، بەلاّم بە هاتنی مام جلال بۆناو هەولێر و ووتارە بەناوبانگ وبوێرەکەی لە(ساحەی ملعب)رەوتی رووداوەکانی گۆری وبووە هۆی دەرکردنەوەی حکومەت لەشارەکان بەئەندازەی راپەرینەکە کاریگەری هەبوو .
- یەکێتی ئەرکێکی قورسی کەوتە ئەستۆ لە هەڵچوونی جەماوەر و نەبوونی بەرنامەی

---

سەردەمی نویٚ یەکەم جار عێراق بەکاری هێناوە، بەڵام بۆ یەکەم جارە لە هەموومێژوودەسەڵاتێك وەك عێراق لەدژی میللەتەکەی خۆی بە کاری بهێنیٚ .

ئیداری پێشوەخت و نوقستانی کادیر.. هەتا خودی یەکێتیش بەرزەفت نەدەبوو، بەڵام دیسان کلیلی چارەسەریەکانی لە بوونی (رێکخستن) دۆزیەوەو دەستپێشخەری بوێرانەی کرد و خۆی کردە خاوەنی ئەو راپەرینە.

- یەکەم کۆنگرەی یەکێتی لە هەولێر ساڵی 1992 گرێدرا، گرنگترین هەنگاوەکانی:

1- هەردوو باڵی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕانی هەڵوەشاندەوە لەناو یەکێتی.

2- ئایدیولوژی گوری وشۆسیال دیموکراسی هینا جێی مارکسیەت.

3- لەبەر سەروەری یەکێتی ناوەکەیان هێشتەوە.

- وادیار بوو لەو فەترەیەی غیابی ئایدێولۆژی وشکستی کورد بەرپرسیکی زوری یەکێتی پەیوەندی بە حکومەتی بەعسس کردبوو، جگە لەوپیلانەی لە دژی نەوشیرەوان ئاشکرا کرا لەقاسمە رەش لەو کۆنگرەیەشلیستیکی دوورو دریژلەلایەن ریکخستنەوەئامادەکراوخویندرایەوەبەلاّمله(120)ەمینەوە لەلایەن سکرتیرەوە راگیراو نەخویندرایەوە .

- لەدوای هەندێ کێشەی ئیدراری و ناهاوسەنگی (بەرەی کوردستانی) رێککەوتن له5/19/ 1992 هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت و یەکێتی وای رادەبینی کە بەرێژەی 70٪ی دەنگەکان بەدەست بهێنێ، لەگەڵ حزبی (زەحمەتکێشان) بەلیستێکی هاوبەش، کەچی 43.8٪ی دەنگ بەدەست هێنا سەرەڕای هەندێ تەزویر (14046) دەنگی لە پارتی کەمتر هێنا کە بەهەڵەدا چووبو لە:

1- وای زانی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لەگەڵهێزی عەسکەری و سەروەریەکانی دێتەوە.

2- وادیارە حساباتەکەی لەسەر خەڵکی سادە نەکردبوو کە چیان لەدڵدایە، ئەو دیاردە و سەلبیاتی ڕۆژانە لە (ئاودیوکردن، تالاّن، دزی، تێل برین، لێدان، بێیاسایی، دیاردەی چەکداری، جیاوازی ژیان، بێڕێزی، هۆیەکانی شەڕی ناوخۆ..) کاری دەروونی سامناکی هەبووە و لە ئەستۆی یەکێتی بووە.

3- عاملی ئاینی و ئەخلاقی سیاسی لاگیری یەکێتی نەبوو.

- یەکێتی بەو ئەنجامە قایل نەبوو،پارتیش لە بەر بێهێزی ناچار تەنازولی کرد، بۆیە رێککەوتن حکومەت و پەرلەمان (50 بە 50) دابەش بکەن،حکومەت بۆ یەکێتی و پەرلەمانیش بۆ پارتی،بەلاّم لە ڕەوتی ئیداری دەرکەوت لە ئەنجامی لێهاتوویی

یەکێتی (70-  بە 30) بوو.

- وەك یەكەم پرۆسەی عەسكەری ئەو حكومەتە ی(یەكێتی وپارتی )بەهاوبەشی لەگەڵ سوپای توركی هێرشیان كردە سەر (پ ك ك).
- گۆڕینی سەرۆكی یەكەم حكومەت لە (د.فوئاد)ەوە بۆ (كۆسرەت ڕەسوول) و گۆڕینی (كەمال موفتی) بە (جەبار فەرمان) سەرەتایزیاتری كێشەی حزبی دروست كرد،نیازەكانی یەكێتی زیاتر دەرخست و ئاسۆی شەری براكوژی زەنگی لێدەداوە هەرچەندە مام جەلال لە ووتارەكانی داكۆكیەكی زۆری لەسەر نەمانی شەری براكوژی دەكردەوە و دەی ووت شەری برا كوژی دووبارە نابیتەوە وئاوووئاووچوو..
- چەندین وردە شەڕ و ناكۆكی نێوان (ی.ن.ك) لەگەڵ پارتی و حزبی شیوعی، حزبی سۆشیالیستی و بزووتنەوە ڕوویدا.
- لە 1993/12/20 شەڕێكی سەرتاسەری لەكەڵ ( بزوتنەوە- باسك) كرد و خۆی پێ توندوتۆڵ كردەوەو سەرەتای نائارامی و شەڕی ناوخۆی كوردستان بوو.
- لە 1994/5/1 خوولی یەكەمی شەڕی پارتی و یەكێتی دەستی پێكرد،دیاربوو خولادانی پارتی وتەنازولەكانی لە شەری براكوژی دووری نەخستەوە .
- لە دوای1994/5/1 زۆر بەسەختی تووشی شەڕی بزووتنەوەو پارتی بۆوەو لەو خولە پارتی بەسایەی بزووتنەوە ترسی چەند ساڵەی لە یەكێتی شكا، لە 1994/8/29 هەموو لایەك ئاشت بوونەوە بێ سزای تاوانباران و بنبڕكردنی هۆكارەكانی شەڕەكە.
- دوای وەستانی جەنگ چوار تەعمیم هات بۆمەڵبەندەكانتیایدا هاتبوو چیتر لە (پ د ك)قەبوول نەكری، ئیتر ئەوە لەراستیدا خۆ ئامادەكردن بوو بو خوولی دووەمی براكوژی .
- لە مانگی 1994/12 خولی دووەم دەستی پێكردەوەو ئی دی تا 31/ئاب 1996 هاوسەنگی هێز لە قازانجی یەكێتی نەما بۆ یەكەم جار سەروەریە عەسكەرتاریەكەشی لەدەست داو لە هەموو كوردستان دەركرا لەلایەن پارتی بە هاوكاری حكومەتی عێراق.
- سەرۆكی پارتی پڕیاری دا یەكێتی بە چەكداریەوە قەبوول ناكاتەوە تەنیا وەك حزبێكی سیاسی نەبێ.

- دوای چەند مانگێك بە پشتیوانی تۆپخانەی ئێرانیەکێتی زیندوو بۆوەو هێرشی هینا تا ناوچەکانی سنوری هەولیر ئینجا وەستا .
- لە1996/7/29هێزەکانی ئێرانی هێنایە سەر (حزبی دیموکراسی ئێران) لەکۆیە.
- لە1997/4/8 دیسان یەکێتی لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی کەوتنەوە براکوژی لە ناوچەکانی هەڵەبجە، هۆیەکانیش ئەوانە بوو:

1- بزوتنەوەی ئیسلامی لەرووی عەسکەری دالدە دەری هێزەکانی پارتی بوو لەو ناوچەیە- پێش 31/ئاب هێزەکانی (پ.د.ك) لەناوچەی هەڵەبجە بوون، چەند جارێك هێرشیان لەوێ بۆ سەر (ی.ن.ك) دەکرد و دەشکان و دەگەڕانەوە هەمان ناوچە، واتە ببوە ناوچەیەکی دژ بە (ی.ن.ك)، هەرچەندە لەدوای 31/ئاب هێزەکانی پارتی لەو ناوچە نەمان.

2- لەرووی سیاسیش تاکە لایەن بوو لە هەموو قۆناغەکان پشتی پارتی بەرنەدا

3- لەرووی ئیداریش ئەو ناوچانەی ژێردەسەڵاتی بزوتنەوە لەوێ سەر بە حکومەتی هەولێری (پ د ك )بوو، دانی بەحکوومەتی سلێمانی نەدەهێنا..زۆر لەشێوەی پاکستانی رۆژهەلات رۆژئاوا دەچوو.

- ئەو جەنگە کۆتایی هات بە نێوبژی ئێران و رێکەوتن کە بزوتنەوە لە حکومەتی سلێمانی بەشدار بێ، لە ئەنجاما وەزیرەکانی لە حکومەتی هەولێر دەرکران و پەیوەندی لەگەڵ (پ.د.ك) بەرەبەرە سارد بۆوە. بەرەبەرە (ی ن ك) لە پێشڕەوایەتی و هێزی یەکەمی دابەزی، لەراستیدا یەکەم جەنگی یەکێتیلەگەڵ (بزوتنەوەی ئیسلامی) بووە هۆی:

أ- بزوتنەوەی ئیسلامی لە پێشڕەوایەتی و پلەی یەك لەنێو ئیسلامیەکان دابەزێ و یەکگرتووی ئیسلامی جێی بگرێتەوە.

ب- یەکێتی لە پێشڕەوایەتی و پلەی یەك لەنیو حزبە نەتەوەییەکان دابەزێ و (پ دك)بەرەو پلەی یەك بوو.

ئیستا ئەو ڕاستیە زیاتر بەرجەستە و هەموو لایەك دانیان پیاهێناوە، بۆیە جاڕی چاکسازیش بە ئاشکرا درا لەکوتایی سالی 2006 .

- لە1998/10/2بە هاوکاری (پ.ك.ك) هێرشیان کردەوە سەر (پ.د.ك) دیسان (پ.د.ك) هاواری بۆ تورکیا برد و هێزی زەمینی و ئاسمانی تورکی هاتە هانای و

هێزەکانی (ی.ن.ك) و (پ.ك.ك) شکستیان هێنا .

- دوای هاتنەوەیان بە شەڕ ئەو نەخشە سیاسی و عەسکەری تا ئێستای (نووسین) ئارامی گرتووە، لەو ساتیەوە سیاسەتێکی نەرم بەکاردێت لەگەڵ پارتی .
- لە سالی 2002ز (ی ن ك) لەگەڵ (پ ك ك) کەوتنە براکوژی و سەرکەوتوو نەبوو،یەکێتیهێزی تورکی داواکرد و دەبابەیەکی زۆری هێنا ناوچەکانی ڕانیە بەڵام ئەو ئەنجامەی کەپارتی لەوجۆرە گۆبەندانەی بۆ هاتەدیبۆیەکێتی نەهاتەدی.
- لەدوای زنجیرە لێکترازانەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی و دروست بوونی (انصار الاسلام لە 2001/12/5) شەڕێکی سەخت لەگەڵ (ینك) هەڵگیرساو بەردەوام بوو، هەتا هێزەکانی ئەمریکی بەڕەسمی لەئاسمان و زەمین هاتنە یارمەتی (ینك) ئینجا بەسەریدا زاڵ بوو.
- لە2002/9/8یەکەم کەناڵی دانوستان لەگەڵ (پ.د.ك) دروست بوو بەناوبژی ئەمریکا و یەکەم دانیشتنی پەرلەمانی هاوبەش لە2002/10/4 ئەنجام درا .
- لەدوای مۆرکردنی یاسای ئازادکردنی عێراق لەلایەن سەرۆکی ئەمریکی(کلینتون)کە لە1998وخولی 105* ی کۆنگرێس بەرز کرایەوە، هەردوو لا لەبەر ناکۆکی یان هەڵوێستیان بێلایەنی بوو بەرامبەر عێراق، دوودڵیش بوون لە سووربوونی ئەمریکا، دوای چوونە نێو هاوپەیمانیەتەکە.
- لەدوای ڕووخانی بەعس ئاسۆیەکی قووڵ و فراوان کرایەوە و هەموو پیلانەکانی دژی کورد لەوەتەی دروست بونی عێراق لە 1921 هەڵوەشایەوە.
- کۆمەڵێك (فایل) ئاشکرا کران کە بە هەزاران بەرپرس و سەرکردە و کۆنە موستەشار و خەڵکی ئەکادیمی لە دەسەڵاتداران دەرکەوت سەر بەو ڕژێمە بووینەو، ڕێنماییان لێ وەرگرتووە و ئەرکی بنچینەییان هەڵگیرساندنی شەڕی براکوژی بووە.
- لەو ماوەیە زێڕینیە لە ڕکی یەکتر نەتوانرا هەموو دەرفەتەکان بقۆزرێتەوە.
- بۆ هەڵبژاردن لیستێکی هاوبەشی کوردستانی پێك هات لە نێوان (یەکێتی، پارتی، یەکگرتوو، شیوعی، سۆشیالیست،...) سەرکەوتنێکی کوردیانەی باشیان هێنا.
- لە هەڵبژاردنەکانی 2004/12/31 دەرکەوت کە (ی.ن.ك) تا ڕادەیەك بەهۆی

---

*لەدوای سەرکەوتنیان لەعێراق خۆیان پرۆژەیەکیان پێشکەش نەتەوە یەکگرتوەکان کرد وبە پێی بڕیاڕی4761لە2\ئایار\2003 خۆیان (ئەمریکاو بریتانیاو ئیرلەندا )بە داگیر کەر ناساند بە پێی بەشی حەوتەم (مادەکانی 39 تا 51)ی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووە کان!

چاكسازی و نەرمی و پەیوەندی.. لایەك لە سەروەریەكانی ڕاست كردۆتـەوەو لەچـاو (پ.د.ك) بڕی 27255 دەنگی زیاتر هێنابوو[1]، بەڵام سەرجەم لەچـاو هەڵبـژاردنی 1992 بڕی لە 12٪ی لە كورتی دابوو.

- (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) دوو قۆڵیانە بێ پرسی لیستی هاوبـەش ڕێكـەوتن كـە سـەرۆك كۆماری عێراق مام جەلال و سەرۆكی ئیقلیمیش كاك مەسعود بێت.
- لە2005/4/12بۆ یەكەم جار لەمێژووی عێراقی سیاسی مام جـلال وەك كوردێـك دەگاتەپۆسـتی سـەرۆك كۆمـار بـەهۆی ئـەو هاوپەیمانیەتیـەی كـورد لەگـەڵ لایەنـە ئیسـلامیەكانی عێراقـی (حزبـی دەعـوەو مجلـس الاعلی..)بـە كـۆی 227 دەنـگ بەرامبەر 30 دەنگـی دژ،17دەنگـیش غائب،شـایانی باسـە زۆربـەی هـەرە زۆری ئیسلامیە شیعەكان دەنگی (بەلێ)یان دا مام جلال، ئەو 30 دەنگـە دژەش زۆربـەی عەلمانیە عروبیەكان بوو، هەڵبەتـە لـەژێر سـایەی عروبـی عـەلمانی وئـەمریكی ئـەو دەسكەوتە نەدەهاتە دی .
- لە2006/5/7 هەردووحكوومەتی سلیمانی وهەولێریانتێكەڵ كردەوە .
- لە هەلبژاردنی 2009/7/25دووبارە هەریەكە لە پارتی ویەكێتی شكستیان هێناو دەنگـەكانیان هاتـە خـوار بـۆ 29٪ بـە هـۆی ئـەو بەرنامـە گەندەڵیـەی لەسـەری دەڕۆن،هەرچەندە لـە ناوچـەكانی ژێـر دەسـەڵاتی (پ د ك)تـەزویرێكی زۆر كـرا ،بـە پێچەوانەی لای یەكێتی تا ڕادەیەكی پاك بوو.

چەند لایەنێكی تری یەكێتی:

1- سەركردە عەسكەری و سیاسی لەسەرەتا تا ڕاپەڕین:

ناوچەی گەرمیان و قەرەداغ: (فیصل شـێخ رشـید تالـەبانی- سـیروان) لـە 1979 شەهید بوو، (مستەفا چاوڕەش)، (مام رۆستەم)، (سامان گەرمیانی)، (مامەڕیشە- لـە ساڵی 1985 شەهیدبوو).

ناوچەی شارەزوور و پێنجوین: محمدی حاجی محمود (ئێستا سـكرتێری سۆشیالیسـتە)، بكر حاجی سەفەر، شەوكەت حاجی موشیر (شەهید كرا)، حامد حاجی غالی ...

شارباژێڕ: علی چوارتای (شەهیدكراوە)، ئاوات قارەمانی، وەهاب حاجی .

---

[1] بروانە : هەلبژاردن لە نێوان عەلمانی وئیسلامی - ل105 نوسینی : نوسەر

ناوچەی دوکان: جەمال علی باپیر (1980 شەهید کرا)، شێخ جعفر.

شوانەتی: انور حسن (1981 شەهیدکرا)، مام ئاراس (1982 شەهیدکرا)، نازمی حەمەی سلێمان (1982 شەهیدکرا).

باڵەکایەتی: سید کریم (1984 شەهید کـرا)، احمـد مولـود (1982 شـەهیدکرا)، عزیز داود (دوای ڕاپەڕین لە ئاو خنکا)، قادر خەبات، حسن کویستانی (لەدوای ڕاپـەڕین شەهیدکرا).

خۆشـــناوەتی: شـــینە بـــۆڵی (1987 شـــەهیدکرا)، ســـلێمان بیرێـــژی (1978 شەهیدکرا)،ئەوە لەپێش لێکجیابوونەوەی سۆشیالیست، ملازم خولە(مردلەئەوروبا).

دەشتی کۆیە: شەفیق، مەندە، فرج، سەرباز (هەموو شەهیدبوون)، ڕەهبەر سید برایم.

دەشتی هەولێر: قادر مستەفا (بە سۆشیالیستی شەهید بوو 1985)، هـاوڕێ کـاوە (1982 شەهید بوو)، سەفین ملاقەرە، سـلاح شـینە (1989 نـەماوە)، مـام غفـور، صابر رسول (لە ئەوروپا مـرد). لـەدوای 1985 دەوری کۆسـرەت ڕەسـول وەك پاڵـەوان دەست پێدەکا.

## کێشەی عێراقچی و کوردستانچی لەناو کۆمەڵە:

ئەو کێشەیە مانـا و گرنگیـەکی تایبـەتی هەیـە و زۆر درێـژەی خایانـدو بـووە هـۆی ئینشقاق، بۆیە هەڵوەستەیەکی لەسەر دەکەین، سەرانی عێراقچی (مەلا بەختیار- سالار عزیز) لای بەرامبەریش (نەوشیروان- فەرەیدون)، سکرتێریش لای کوردستانیەکان بوو.

ئەو کێشەیە گەیشتە بنکەکانی خوارووش:

بەپێی عێراقچیەکان: بنەماکانی مارکسیەت چینی کرێکاری هەمووعێراق یەك چینەو (ناکۆکی چینایەتیش بنچینەیەکە، ناکۆکی نەتەوایـەتی لاوەکـی و لقـە)[1]، واتـە ناکرێـت پرۆلیتاریا بەتەنها لە کوردستان سەرکەوێ، بۆیە خوازیاری گۆڕینی سنوری کۆمەڵـە بـوون لە کوردستانی بۆ عێراقی، هەروەك کۆمەڵەی ئێران پێی هەڵسا لەدوای.

هەرچی کوردستان چی یەکانیش بوون لەڕووی فکـرەوە تـەنیا (تـەئویلی مارکسـی)یان پێبوو سەبارەت بەدۆخی ئێرلەندا نەك یاسا، بەو شێوەیە هاوسەنگیەك دروسـت بـوو، بـۆ

---

[1] هەر لە مانیفستی کۆمەنیستی هاتووە : (ناکۆکی کرێکار و برجوازی بنچینەیەو ئەوی تـر لاوەکیـە) ماركس وأنجلس- بيان الشيوعي(مانيفيست) ص63-65

درێژەکێشانی ئەو کێشەیە لەلایەن عێراقچیەکان بەڵگەو یاسای بەهێزتریان بەدەستەوە بوو، بەڵام واقعی نەبوو، لەلای کوردستانچیەکان واقعی تر بوون، بەڵگەیمارکسیان لاواز بوو بەڵام سەرکردە بڕیاربەدەستەکانیشیان لەگەڵدا بوو، کەسیش بوێری نەکرد بڵێت مادام واقع لەدۆڵێکەو تیۆریش لە دۆڵێکی ترە، ئەوا خەلەل لە فکرو فەلسەفەکەیە بۆ لەسەر کورد ساغی دەکەنەوە؟ بۆیە لە کۆتایی 1985 ئینشقاقیان کرد و لەمانگی 1985/12مەلا بەختیار گیرا بەتۆمەتی (موخابەراتی عێراق !!)لەپلینیۆمی 1985/12/10بەزۆری دەنگ بڕیاری کوشتنی درا، دوای ئازاد کرا، (ئاڵای شۆڕش)یان دروست کرد، دوای بوونە زەحمەتکێشان وبەچەند وێستگەیەك هاتنەوە ناو یەکێتی.

هەر بەکورتی خەلەلەکە لەو دوو خاڵە دێت :

1- عێراقچیەکان بە ووردی زانیاری ئەوەیان نەبوو کە خودی عێراق ودەوڵەتی عێراقی دروست کراوی ئیمپریالیزمە وولاتێکی سروشتی نیە تا چینی پڕۆلیتاریای لێ بە سروشتی خەملی بێت[1].

2- ئەو کێشەیە لە نێوان ستالین وترۆتسکی بەزەق تر هەلگیرسا وپرۆلیتاریای نیشتمانی زاڵ کرا لەو ئەزموونە بە سەر پرۆلیتاریای جیهانی، دوای لە هەمووان سەرنج ڕاکێش هەلوێستی حزبی شیوعی تونس بوو زیاتر لای داگیرکەرەکەی بوو لە دژی وولاتەکەی بە هۆی ئەو پەیوەندیەی لەگەڵ حزبی شیوعی فرنسای (دایك)هەیبوو، جگە لەوەش خودی تیۆرەکەش ستاندەر و دروست نەبوو تا ئەو شەڕەی لەسەر بکرێ .

(بابەتێکی تایبەتی هەیە لەدوای لەبارەی عێراقی و کوردستانی).

---

[1]بەدرێژی ئەو بابەتە لە رسالەی ماجستێری (الإسلام والعلمانية واثرهما فى النشأة الدولة العراقية الحديثة ) ی —نووسەر بخوێنەوە

## پەند و ئەزمونی (ی.ن.ك) لە :

أ- خاڵە بەهێزەكانی:

1- هەر دروستكردنی یەكێتی و هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ بەهێزترین خاڵە كە-بەڕای من- ئەگەر (ینك) و سەركردایەتی وەك مام جەلال نەبوایە، بەزەحمەت شۆڕش دروست دەبۆوە، بەلایەنی كەمەوە هەتا ساڵی 1980 و روخانی شای ئێران.

2- رێكخستنێكی پۆڵایینی وای دروست كرد(**نواة الصلب**)،هەموو دامودەزگاو لایەنە سەربازیەكەشی خستە ژێر ركێفی ئەو رێكخستنە ئیتر ئیجابیاتی ئەوەندە زۆر بوو هەر ناژمێردرێن.

هەڵبەتە ئەو سەركەوتنەی رێكخستنیش بەدەوری خۆی دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزی ئایدیۆلۆژیاكەی، كە بریتی بوو لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا و تیۆرێكی سیاسی ماركسی زۆر بەهێز، توانیبووی (ینك) پێ پۆڵایین بكرێ و ئەندام و لایەنگرانی چاوكراوەو وشیار و چالاك بكا، جگە لەوەی پەروەردەیەكی بەهێزیش بۆ دژ بە گەندەڵی و تەوژمی نەفامی و نامەدەنی لەبەردەست بوو.

3- سكرتێرەكەی زۆر بەڕاوێژ و متابەعە بوو، كۆڵ نەدەر بوو لە تەنگانە، خەڵكی پێدەگەیاند و دەیچەسپاندن، وەڵامی هەموو نامەیەكی دەدایەوە، سادەش بوایە، وای پێشان دەدا هەمووان دەناسێ و ئاگای لە ئیشی هەموو لایەكە، ئاگاداریش بوو، رێنماییو هەنگاوەكانی ئەو گرفتەی تەخت دەكرد كە لەپێش كادیرێك و ئەندامێك دەبوو، (پاداشت و سزا)ی هەبوو، لە نفوزی كەس نەدەترسا لە چوارچێوەی یەكێتی، هەموو ئەو كاتانەی گوایە ناكۆكە لەگەڵ فلان سەركردە یان گوایە لەدوای ئاهەنگی سورداش 1984 لە نفوزی مامەڕیشە ترساوەو بەكوشتنی داوە. هەموو ئەو كاتانە بێ بناغەن، خۆی لەسەرووی ئەو ناكۆكیانە بووە، تواناشی بێسنور بوو، ئیعتمادی لەسەر خزم و بنەماڵەی نەبوو، بۆیە بێسنوور سەركردەكانی بەرز دەكردەوەو قورمیشی دەكردن.. چالاك دەبوون و دوودڵ نەدەبوون، لەكۆتاییدا یەكێتیەكی چالاك و بەكاری بەڕێوە دەبرد.

4- دروست كردنی بڕیار و هەنگاوەكانی لامركزی بوو، بەڵام تەنفیزی مركزی بوو،

سەرچاوەی لە خواروو و بنکەکانی یەکێتی دەستی پێدەکرد بۆیـە دەقیـق و دانایانـە بوو ئامانجەکانی باش دەپێکا.

5- زۆری ناوەند، تا ئێستاش بەشێکی زۆر ئەو (زۆری ناوەند)ە بە سەلبی دەزانـن، بـەلأم لەناو یەکێتی سەرکەوتوو بوو، بووە هۆی (نەمانی کادیری بـێئیش، زیـاتر تـەفاعول کردن لەگەڵ خەڵك، دروسـتکردنی کـادیرێکی زۆر)، وە تەقاندنـەوەی تواناکـان، زۆر سـەرکەوتوو بـوو لـە ئـەزموونی (بـەرە) و (حکومـەتی هـەرێم)یش و ئـەو هـەموو کادیرانەی ئامادەبوون بۆ پڕکردنەوەی دەزگاکان و، بەو شێوەیە گرانایی خـۆی خسـتە سەر حکومەت و ئەزمونێکی سەرکەوتوو بوو (هەڵبەتە بەپێی نەریتی حزبایەتی ئـەو سەردەمە).

6- بە نەخشەو پلان و موئەسەساتی کارکردن و ڕەچاوی ناوەوەو ناوچەکەو هەل و مەرجی دەولی یان دەکرد، بۆیە ئامرازی گۆڕانیان لای خۆ بوو، خێراخێراش گۆڕانیـان بەسـەر خۆ دەهێنا.

7- لە شەڕەکانی ناوەخۆ شەڕ و ئاشتیان گورج و گۆڵ بوو، لە شەڕا خێرایی و تێکڕایـی و ئەنجامدان پێکەوە بوو، لەدوای سەرکەوتنیش ئەوەی لەشەڕدا دەی چاند لـە سیاسـەت پێی دەگەیاند لە ڕێکخستنیش دەیدوریەوە.

8- دوودڵ نـەبوون لـە هـەنگاوە سـتراتیژیەکانیش، ئەگـەر هـەنگاوێکی نـاوێزە بوایـە دەیانتوانی پاساوی ماقووڵ بدۆزنەوە، دوو نمونـەی زۆر زەق بـۆ ئـەو مەبەسـتە بـاس دەکەین:

**یەکەم:** لە زستانی 1981 لە (هۆڵێ سیمنیاری نێوزەنگ) مام جەلال وەسفی (ینـك)ی کرد بەوەی کە کۆمەڵە و بزوتنەوە دوو باڵن و خەتی گشتی و یـەکێتیش لاشـەکەن، ئـیتر هەموو باڵندەیەك وەك یاسا دەبێ وابێ، کەچی لە هاوین خەتی گشتی و بزوتنەوە یـەکیان گرت و دوو باڵەکە نەما جۆرە گوتارێکی سیاسـی وای باسـکرد لـەو یەکگرتنـە هـەرگیز کەس لەبیری نەما کە باڵندە ئیتر بە یەك باڵ چۆن بفڕێ یـاخود بـێ لاشـە.. بـە هـەرحاڵ نوقستانیەك کەوتە باڵندەکە بێ ئەوەی هەستی پێ بکرێ.

**دووەم:** لە هەمان شوێن لە وەلأمی پرسـیاری ئـەوەی ئـاخۆ دەکـرێ (دانوسـتان) لەگـەڵ بەعس بکرێ، لە وەلأمدا مام جەلال وتی: مەحاڵە..و ئەو پرسی ئەرێ دەکرێ بلێین بەفری

برژاومان بۆ بێنە؟! هەموو وتیان نەخێر، کەواتە (دانوستان) ئاوایە.. کەچی دوای ساڵێك ئەو دانوستانە کراو ئەوەی نارازی بوو بووە (نێرراو)..بەفری برژاو هێنرا.

بەکورتی لەو دۆخانەدا دەرباز و وەرچەرخانی سەرسورهێنەری ئەنجام دەدا، هەرچەندە سەلبیاتیشی هەبوو بۆ مەودا ستراتیژیەکان، بەڵام ئەو دەم و دەستی بلیمەتانە بوو.دوودڵ نەبوون وبۆ هەر هەنگاوێکی ئەگەر ناخۆش بوایە بە هەڵمەتێکی راگەیاندن و جم و جۆڵی عەسکەری و چالاکی میللی ئاسایی دەکردەوەو بەسانایی بۆی لیی دەردەچوو، لەراستیدا مام جلال بە هەڵەو قەدەر کەوتبووە بەرەی مارکسی ئەگینا سروشت ورسکانی لە ئەزەلدا بۆ لیبرالیەکی میکافیلیانە دروست ببوو .

9- دەستگۆڕی دەسەڵات و، سزا و پاداش و گەشەپێکردنی دەزگاکان (جگە لە سکرتێر و چەند کەسانێك) ئەوی تر هەمووی شایانی گۆڕین بوون، بۆیە خەڵکی شایشتە بە خێرایی دەکەوتە شوێنی شایستە،دەبووە هۆی گەشەپێکردنی دەزگاکان و کادیرەکان.. بوونی ئازادیەکی زۆری رادەربرین و راهاتن لەگەڵ رەخنە و رای جیا بێ پشی تەنگی.

10- رزگاربوون لە کاریگەری سامناکی بنەماڵەیی سەرکردایەتی، کە بووە هۆی ئەوەی هەموو سەرکردە و کادیران و ئەندامانی سادەی ئەو یەکێتی یە خۆیان بە خاوەن بزانن، ئیتر تواناکانیان دەتەقایەوە بێسنور.

11- ئەگەر کەمترین راستی بگۆترێ ئەوا یەکێتی هەڵگیرسێنەری شۆرشی نوێ و راپەرینەکانی 1982 و راپەرینی 1991 و بیرۆکەی حکومەتی هەرێم بووە، بە کورتی کاری داهینەرانە بووە .

12- جێی هەڵوەستەیەکی مەزنە، ئەندامانی سادەی یەکێتی دەیتوانی رەخنە لە سکرتێریش بگرێت، ئەوە نیشانەی پێگەیشتوویی سکرتێرەو ئەندامانی ئەو لایەنەشە، دروست کردنی بناغەکانی کەسێتی و کادیریشە.

13- ئەزموونێکی تاقانە بوو توانرا ئەو مارکسیەتە نامۆیەی تەفاعول پی بکات لەگەڵ جەماوەرێکی موسوڵمان بەهۆی ئەو دارشتنەی بوونی (کۆمەڵە) لەناو هەناوی چوارچێوەیەکی نیشتمانی، بەسەر ئەو گرفتە گەورەیە زاڵ بێت و مارکسیەتەکە لە نامۆیی بکاتە میللی، بەو دارشتنەی (کۆمەڵە وەك باڵێك) ئەوا لە سەختترین قۆناغی شکستی مارکسیەت لەجیهان لەسالآنی 1989 بەدواوە و رزگاری بوو کە بەدەگمەن دەسەڵاتدارە مارکسیەکان لیی دەرچوونە، زۆربەیان وەرگێران و یان

سەرکردەکانیان دەرکران، کەچی (ی.ن.ك) ڕاستەوخۆ خۆی نەختسە ژێـر بەرپرسـیەتی ئەزموونی مارکسیەت، بەڵکو خستیە ئەستۆی کۆمەڵەو ئەویش لە کـۆنگرەی (1)ی 1992 هەڵوەشێنرایەوە، بەو شێوەیە ئەو مارکسیەتە بـە سـانایی لـەکۆڵ یـەکێتی بۆوە.

بـە کـورتی (ی.ن.ك) لـە کوردسـتان لـە سـەلبی و ئیجـابی پێشـڕەوو داهێنـەر بووەوحزبەکانی تـر بـەدوای دا هـاتوون. یەکـەم جـار چ هـەنگاوێکی دەنـا بـەدوای ئـەو حزبەکانی تریش هەنگاویان دەنا، بۆیە گۆڕانکاریەکانی کوردستان و کلیلـەکانی لەدەسـت یەکێتی بوو، بەو شێوە دەچینە نێو خاڵە لاوازەکانیش.

**ب**- لە خاڵە لاوازەکانی:

هەوڵ دەدەین بەکورتی ئەو لایەنە لاوازانە بخەینە ڕوو کە خۆشیان کۆکن لەسەری بەلای ئەو نهێنیانە ناچین کە خۆیان بڵاویان نەکردۆتەوە بۆ ئەوەی باسـەکەمان زانسـتی سیاسـی بێت نەك سێرەی سیاسی.

1- باسـی(عەبقەریەتی) سـەرکردەکانیيەکێتی مـان کـرد، بـەڵام لـە چوارچـێوەی مارکسیەت، ئەگینا (یـەکێتی و نـاکۆکی- الوحدة والصراع) یاسـا نیـەو پـەیڕەوکردنی وێرانکەرە بەتایبەتی بۆ (قۆناغی ڕزگاری) کە پێویستی بە مەرکەزیەت و یەکێتی هەیـە، ئەو بەناو (یاسا)یە بووە هـۆی هـەردەم شـەری براکـوژی و بـوونی ململانـێ لـەناوخودی باڵەکانی یەکێتیش، لە نێوان دەزگاکـان و کەرتـە عەسـکەریەکان، بـاڵی زینـدان و بـاڵی دەرەوە، عێراقچی و کوردستان چی، بزوتنەوە و کۆمەڵە،... بـووە هـۆی دوو ئینشـقاقی گەورە، خەڵکێکی زۆریش بەهۆی ئەو دووبەرەکیانە تەسـلیم بوونـەوە.. بوونـە چـەکداری حکومەت.

هەر لەچوارچێوەی بنەما مارکسیەتەکە وبە پێی (تاکتیکی پرۆلیتـاری )هـەنگاوەکانی هەرە سەرەتایشی جێی گومان بوو، لە لایەك مام جلالنامـەی بـۆ بـارزانی نـارد وتیایـدا باسـی لـەوە کردبـوو کـە ئـەو شۆرشـە نوێیـە دژ بـە ئـەوان نیـە، بـەڵکو پاراسـتنی سەروەریەکانیشیانە ...کەچی هەر لە یەکەم بەیانی دامەزراندنی یـەکێتیپارتیو بـارزانی لەگەڵ دوژمنان ڕیز دەکا .

2- هەموو ئەو سەرەنجامە نتێگەتیڤانەی براکوژی، دیاردەی جاشایەتی، داڕووخانی بناغەی کۆمەڵایەتی، سەلبیاتەکانی عەلمانیەت، بەشی هەرەزۆری دیاردە نوێکانی گەندەڵی و زادەی رەوتیبەو تەوژمەیتیهەم سەرچاوەی خاڵە لاوازەکانی (ی.ن.ك)یشە.

هەر ئەو بەناو (یاسا)یە شەرعیەتی بە شەڕی کورد و کوردی دا گوایە ئەوە (ململانێی پرۆلیتاریا و برجوازیە) هەر دەبێ ببێ، لە دەمەتەقێیەکی فکری لە کۆنگرەی نێوزەنگی 1982ی کۆمەڵە لەبارەی دۆزینەوەی ژێرخانی چینایەتی و ململانی بۆ حزبەکوردستانیەکان وادارژرا : یەکێتینوێنەرایەتی (پرۆلیتاریا)دەکا، پارتیش برجوازی، حزبی شیوعیش پرۆلیتاری منحرف، خڵتەی چینەکان...هتد. ئیتر شەڕی یەکێتی و پارتیولایەنەکانی تر شەڕی براکوژی نیەو ململانێی دوو چینی دژ بەیەکن، هەرگیز گفتوگۆی تەبایی لەنێوانیان نیەو دژایەتیەکەیان لە پلەی یەکە، لەناکاو پرسیارێك ئاراستە کرا ئاخۆ دژایەتی یەکێتی بە حکومەتی بەعس لە چ پلەیەکە؟ هیچ خانەیەکی چینایەتی نەمابوو (بەعس)ی لێ دانێن، بەو شێوەیە وەك بڵێی ئەو شۆڕشە هەر لە دژی یەك هەڵگیرساوە، هەتا ئەو دواییەش ئەو کاریگەریە لەسەر یەکێتی مابوو، لە شەڕەکانی براکوژی نێو شاردیسان گەڵاڵەی (ئاخۆ ئەوە شەڕی براکوژیە یان نا؟) پەیدابوو، بەزاراوەی شەڕی براکوژی قایل نەبوون بەپێی( یاسای دیالیکتیك)ئەو شەرە حەتمیە لەنێوان چینی هەژار لەدژی برجوازی وئاغاو ..، ئەو جۆرە شەڕە براکوژیانە بە پۆزەتیڤ و مژدەبەخش دەزانرا پێیان وابوو شەڕی براکوژی سوودی هەیە و وڵاتی پێ دروست دەبێ، نمونەشیان ئەمریکا و ئیسپانیا،( بەشێکی تایبەت تەرخان دەکەین بۆ شەڕی براکوژی).

3- ئەو دۆخەی ململانێی (شێوە دیالیکتیکانە)و دواییش (میکاڤیلانە)و.. بوونی (خط مائل) لەناوەخۆو (سەنگەرگواستنەوە) لەنێو باڵەکانی یەکێتی، بووە هۆی کەم بوونی متمانە بە یەکتر.. لەکۆتاییدا لەگەڵ لاوازبوونی ئایدیۆلۆژیا.. بەرەبەرە خۆویستی جێی ئایدیۆلۆژیای گرتەوە، تا ئەو رادەیە پەیوەندی لابەلاش دروست بوو، جگە لەو (مەلەفدارانەی ئەم دواییە)، لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی لە هەولێر، دیسان مەلەفی سەدان کادیر و بەرپرسی تر خەریك بوو ئاشکرا بکرێ، هەتا نزیکەی 120یان خوێندرایەوە لەلایەن شەهید (حسن کوێستانی) دوایی ڕاگیرا..سەربردەی ئەو مەلەفدارانە کۆنە دەگەرێتەوە بۆسالی1988ویەکەم وەجبەی لە سالی 1989 لە قاسمە ڕەش بە ئاشکرابوونی پیلانی کوشتنی نەوشیرەوان، بەشێك لەوپیلانگێڕانە تائیستاش ماوون لە

نێـو یـەكێتی،.. ئـیتر مانـەوەو خـۆڕاگری و دروشمـەكانی (كـەم بـژی و كـەڵ بـژی) و (خۆنەویستی) و گیان فیدایی و ... پیرۆزیەتی لاواز بوو.

4- بەپیچەوانەی ریساو بەهای كوردەواری ودەروازەكـانی گـوران بـەهوی كاریگـەری ئاین وپابەندی خەلكی پێی نەبووە فاكتەریكی گرنگ، بەڵكو فەراموش ترینیان بوو .

5- - ئایـــدیۆلۆژیای ماركســـی لـــەنێو كـــورد هەڵنـــەقولابوو، بۆیـــە گـــۆڕینی پێشەوا(ئیســـلامی)یە كوردەكـــانی وەك (شـــێخ ســـەعید، شـــێخ مـــەحمود، قـــازی محمـــد، مەلامستەفا...) بۆ (ماركس، ئەنجلس، لینین، ستالین، ماو، ترۆتسكی، گیڤـارا، هۆشـی مینە،..) سەخت بوو لە ڕووی بڕوایی و مێـژوویی و ناسـنامەیی و سـایكۆلۆجی.. بۆیـە ئەگەر بەهۆی فاكتەری كوردایەتی- نیشتمانی نەبوایە ئەو ئایدیۆلۆژیـە خـورد نـەدەبۆوە، كاتێ خوردیش بوەتەوە ئاسەوارێكی ترسناكی دروست كردووە لەسەر سروشتی كۆمەڵگەی كوردی و لەسەر سكەی خۆی لایداوەو بەدەیان سەرەنجامی نێگەتیڤی بۆ دروست كـردووە، ئینجـا لاسـاییەكی زۆری دەرەوە دەكـراوە بەتایبـەت ئەنجامـە عەسـكەریەكانی نـەك سیاسـیەكان، سـەركەوتنەكانی ڤێتنـام و ئـەفریقا و ئـەمریكای خـواروو (1975- 1976) ئەو ماركسیەتەی بە سـەركردایەتی كـورد نووسـاند، داگیركردنـی كـەمبۆدیای (پۆل پـۆتی- مـاوی).. بـووە هـۆی ئـەوەی (یـەكێتی) سـەنگەری فكـری لـە ماویـەت بگوازرێتەوە، بەشێكی تایبەت تەرخان دەكەین لەبارەی كاریگەری لاسایی كردنەوە لەسەر ڕەوت و ئایدیۆلۆژیای یەكێتی لە دروست بوونیەوە تا ئێستا.

6- بۆ قۆناغی بەرگری نیشتمانی (ئەخلاقی كۆمەلایەتی: ئەمەك، بەڵێن، پیـاوەتی، گەورەو بچووك، ڕاستگۆیی، چەسپاوی، مەبادیئی، بەرژەوەنـدی گشـتی، هەژارپـەروەری، ویـژدان،...) ئەسـتۆنگەی ژێرخـانی یـەكگرتنی كۆمەڵـە، هـەر میللـەتێك ئەوژێرخانـە ئەخلاقیانەی دارڕزا بێ ئەوا پەرش وبلاوو بەدوای بەرژەوەندی و گیرفان پڕكردن و خیانەت و جاشایەتی و شەڕە كورسی و درۆ و... دەبێت، هێزی بەرگریشی لاواز دەبـێ و بەسـانایی داگیر دەكرێت، ڕزگاریان نابێت، كەچی ئەو ئایدۆلۆژیەی عەلمانیـەت و ماركسـیەت بـووە هۆی دارڕزانـی ئـەو ئەخلاقـە و لـەژێر نـاوی قەلاچـوی كۆنەپەرسـتیەت، خزمـەتی زۆری ستراتیژیەتی دوژمنی كرد و لەكۆتاییدا ئەو هەموو دیاردە دزێوانەی لێ پەیـدا بـوون، لـە هەمووی خراپتر (دیاردەی جاشایەتی) لە مێژووی كورد هـەر خـائین كەمایـەتی بووینـە، كەچی ئەو جارە ژمارەی جاش و دژە شۆڕش نزیكەی(350) ئەوەندەی پێشمەرگە بـوون،

ئەو دیاردە تا ئێستاش لە هۆیە بنچینەکانی نەکۆڵراوەتەوە.. تا جارێکی تر بەو ئەندازەیە دووبارە نەبێتەوە. بەپێچەوانەوە هێشتا هەڵسوکەوت و ڕێبازەکە (بەپێی عەلمانیەتی و سیاسەتی میکاڤیلیانە) هاندەرە بۆ تەشەنەو بەرەسەن کردنی ئەو دیاردە دزێوانە و جاشایەتیش بە ترسناکی ئەگەری دووبارە بوونەوەی هەیە .

6- لە ئەنجامی ئەو ململانێیەی ناو خودی یەکێتیش بووە هۆی بێمتمانەیی و لەدەست دانی ڕووحیەتی سەرکردە، هەموو گومانیان وا پەیدا کردبوو کە سکرتێریش لەو سیناریۆیەی کۆمەڵەیە چونکە:

أ/ بەسادەیی دەرکەوت دۆخی فکری ناو یەکێتی وا لێژ کرابۆوە هەرچی ئینتیمایەکێتی بکردایە دواگەشەسەندنی خۆی لە کۆمەڵە دەدۆزیەوە.

ب/ دیاردەی (خط مائل)* نەك لە ئاستی خواروو، لە ئاستی مەکتەبی سیاسی، د.کمال خۆشناو لە کۆنفرانسی 1980 ئاشکراکراو پاداش کرا کە تا ئەو کاتە (خط مائل)ی کۆمەڵە بووە لەناو خەتی گشتی.. بووە هۆی تەسلیم بوونەوەی خەڵکێکی زۆر و بێمتمانەیی و داڕووخانی پیرۆزیەتی باری سەرکردایەتی، لە هەمووشی گرنگتر مانای وایە (سکرتێر) نەك سەرۆکی کوردە، بەڵکو خۆی وا بچووك کردۆتەوە بۆ سەرۆکی باڵێك.

7- چالاکی شۆڕشگێڕیش بەگشتی ڕوو لە داگیرکەر نەبێت ئەوا سەلبیاتی زۆرە، بۆیە یەکێتی لە ئەنجامی ئەو هەموو شەڕی ناوخۆییەو کوشتنی وەرەقە هەڵگرێك لە 50٪ی بنەماڵەی میللەتەکەی خۆی لێ دەبتە دوژمن، تازە ئەو (سەقفە)ی دەنگ هێنانی زیاد ناکات مەگەم کەم کردن.

8- لەسەرەتاشەوە ستراتیژیەتێکی روونی بۆ رزگاری کوردی نەبوو، لە جەمسەرەکانی جیهان و ستراتیژیەتی ئیقلیمی، تەواو نەیتوانی سوود لە گۆڕانکاریە ئیقلیمی و جیهانیەکان لەدوای داڕووخانی (شای ئێران)، هەروەها دوایش داڕمانی بلۆکی سۆڤیەت

---

*بەو کەسانەیان دەووت (خەت مائیل)کەلەناو باڵێکی تر بوو بەڵام لە ژێرەوە بۆ باڵێکی تر ئیشی دەکرد، ئەو دیاردەیە بڵاو بوو زیاتر کۆمەڵە بەکاری دەهێنا لە چوارچێوەی پەیامی پرۆلیتاریا!، لە بیرمە لە سالی 1983 لە وەرتێ یاری باڵەمان دەکرد ئێمە وەك هەولێری لەبەرامبەر د خدرمەعسوم(بەرپرسی م س) کۆییەکان بووین، مام جلالیش لە دیار ئەو تۆپانەیە وەستا بوو، زوو زوو ئەوەی دووبارە دەکردەوە دەیووت هەولێرینە ئاگاتان لێ بێت(مسعود عبدالخالق )خەت مایلی د خدریە —چونکە ئەمنیش خەتی گشتی بووم دخدر بەرپرسی خەتی گشتی بوو—، هەرچەندە بۆ پێکەنین ئەو قسەیەی دەکرد بەڵام توێژەری ئەکادیمی (لە ماناو دەرەنجامی دەروونیدا)بۆی دەردەکەوێ کە ئەو دیاردەیە باوو بووە .

بەو شێوەیە جیهان سێ جار لەم سەدەیە دەهەژێ و نەخشــە دەگــۆڕێ، کــوردیش هــەروەك خۆیەتی ناچێتە پێش.

بۆیە یەکێتیش هەروەك ئەزموونە چەندبارە بوویەکەی کوردایەتی کۆن نەیتوانی سوود لە گۆڕانکاریە جیهانی و ئیقلیمی و هەندێ جار ناوەکیش وەرگرێ، نمونەی ڕووخانی (شاه) ڕاستەوخۆ سوودمەند نەبوو، لەسەر ئەو ڕەوتە گەیشتە ئەنجامێکی رووبەرووی سەربازی لە چەندین (بەیانی ڕەسمی)دا گوایە بەرگری لە خــاکی عێــراق دەکــا دژی ئێرانــی ئیســلامی داگیرکەر، زۆربــەی شــاخە گرنگــەکانی دەوری ســەرکردایەتی (لەهــەمووان زەقــتر ســەری مامەندە بوو) درا دەست عێراق، لەکۆتاییدا لە پاداشا کیمیاوی و ئــەنفالی کــران، تــەنها ئێرانیش بوو پەناگاو بەهانای لێقەوماوان بێت.

9- مفاوەزاتێکی بەتاقی تەنها لەگــەڵ عێــراق کــرد، لەکاتێکــدا مفــاوەزاتی نــەبوو لەگەڵ لایەنەکانی تری کورد، ئەوەش لەگــەڵ ئــەدەبیاتی یــەکێتی و پــەروەردەی کــادیران نیمچە مەحاڵ بوو، هەر ساڵێك پێش ئەو مفاوەزاتە لە سیمینارەکانی شەوانەی نێوزەنگی زستانەی 1981، (سکرتێری گشتی) لە وەڵامــی پرســیارێك ســەبارەت بــە مفــاوەزات لەگەڵ بەعس وتی: وەك بڵێی هەندێ بەفری برژاومان بــۆ بهێنــە! هەڵبەتــە بــەفری بــرژاو مەحاڵە، ئاواش مفاوەزات لەگەڵ بەعس محاڵــە، کەچــی کەوتنــە مفــاوەزات بەنیوبــژیوان کردنــی د عبــدارحمن قــاسملو وشــیخ عزالــدین حســینی، ئــیتر کاریگەریــەکی ســەلبی هەمەلایەنی کردە سەر ڕەوتی یەکێتی و ئایدۆلۆژیا و پەروەردە و... ســەرەتای گەنــدەڵی یەکێتی لەوێڕا دەست پێدەکا. دانوستانەکەی کاتێك لەگەڵ بەعس کرد لە 1983 کە:

أ- حکومەتی عێراق لەوپەڕی تەنگی بوو.

ب- یەکێتی لەگەڵ لایەنەکانی کورد و ئێــرانیش لەجەنگــدابوو. واتــە دەســتکەوتێکی سیاسی و عەسکەری گرنگ بوو بۆ عێراق و لە بەرامبەریشدا بۆ کورد شــتێکی وانــەبوو، بۆیە لە کۆبوونەوە فراوانەکەی 1984ی مەرگە، سەبارەت بــە ســوودی ئــەو دانوســتانە (نەوشیروان مستەفا) لە وەڵامدا ووتــی: 500 دەمانچــە و ئۆفســێتکمان لــە حکومــەت وەرگرتووە.! ئــیتر ئــەوە دەســتکەوت نــەبوو، یــەکێتی لــەو مفاوەزاتــە دەرگاکــانی تــری داخستبوو تەنها دەرگای ڕەحمی حزبی بەعسی هێشتبۆوە، بۆیە زیاتر بەعس گاڵتە جــاڕی دەکــرد، شــەوێکیان صــدام لەگــەڵ هەنــدێ فــیراری گــەڕاوە نمونــەی بــەو مفاوەزاتــە هێنایەوەوووتی: بەسەرکردەیەکی گەڕاوەی کوردم ووتوە: ((اللی جــای گبلــك بیــوم اشــرف

منك..))بۆبەیانی زوو نەوشیرەوان بەجیهاز بەمام جلالی ووت ئەوقسـەیەی صـدام لەگـەڵ ئێمەیتی، بەڵام مام جلال گوتی نەخێر ئەوە لەگەڵ نوێنەری پـارتی (عـزت سـلیمان بـەگ )بووە کە لەو ماوەیە چووبووە لای صدام .وا پێدەچوو قسەکەی صدام راست بێ نە ئـەوەی مام جلال، بەڵام سیاسەتی (فن الممکن)ئاوا لەسەر چەواشەو چەواشـەی پێچـەوانە دەڕوا ، مێژووش ئاوا وەك (ئەلبیرۆنی)ووتەنی زیاتر بە ئارەزووی دەسەڵاتدار دەنوسرێتەوە.

10- لـەنێوان 1980- 1983 زیادەڕەویـەکی زیـاتر لەسـەر (تـەوەری دووەم- فکری) کراو (تەوەری یەکەم- کوردایەتی) تەواو فەرامۆش کراو، جارجـار بـە ڕەجعـی و ڕەگەزپەرسـتی لەقەڵـەم دەدرا لەچـاو خەسـتی مارکسـیەتەکەیان، بۆیـە کـە نووسـین و فەرهەنگەکانیان ناوی (نەتەوەیی) بەدەگمەن تیانەبوو، هەتا سرودی (ئەی ڕەقیب) گۆڕا بە سرووددی (ئینتەرناشیونال)*، بەو شێوە ئامانجە کوردستانیەکان کرانە ئامرازی خزمەت بـۆ فکری مارکسیەت.

11- ئەو نوختە سەلبیانەی کە لیسـتی کـرد بـوو لەسـەر پـارتی و یـەکێتی لەسـەر دروست بوو، زۆربەی لەخۆی پەیدا بـۆوە بەتایبـەتی لـەدوای ڕاپـەڕین، لەوانـە :ا- پـاوان کردنی گۆرەپان ب- تاك رەوی ج- پەیوەندی بە ئیسرائیل وئـەمریکا د- خێلەکیانـە ع- نەبوونی ستراتیجیەت ق- کەمی هۆشیاری ...

ئیتر پاساوی جیای نەما،بە تایبەتی لەوساتەی نوسینی ئەو دێرانە شتیکی فکری جیـا لە نێوانیان نەماوە، ئێستا بەرنامە سیاسیەکانی ناو (ی.ن.ك) بگۆڕنەوە سەربەسەر لەگەڵ (پ.د.ك) دەبینـی هەریەکـە جەماوەرەکـەی هـەرماوە، دەبوایـە ئـەو خەڵکـەی بـەدوای بەرنامەی حزبەکە بن نەك شەخسی کە گـەورەترین خەلـەلی مەبدەئیـە و زیـاتر مانـای نەمانی گرنگـی ئایـدیۆلۆژیا و بەرنامـەی سیاسـی و مەبادیئەکانـە لەچـاو بەرژەوەنـدی تایبەتی و زۆر و بۆری و لێشاوی ستوونی، مادام هەریەك حزب ( پارتی یەکە)بوونایە نەك حزبێکی تر دروست بکەن، کە ئێستا بەڕوونی دەرکەوت تەنیا دابەش کردنـی کـوردە، بـا

---

*کۆن ترین سرودی نیشتمانی دەگەریتەوە بو هەردو وسرودی هۆڵەنـدی- 1570 بـەناوی(میر ولیـام سناو)، وە بریتانی1745ز (خوا مەلیك بپاریزی))، هەرچی سرودی ئینتەرناسیونالیشـە لەروسـیا لـە دوای شورشی 1917ی بەلشەفی (شیوعی) سرودی قەیسەر تووردرا وسرودی ئینتەر ناسیونال هاتـە جێی هەتا ساڵی 1944سرودی یەکێتی کۆمارەکانی سوفیەتی هاتە جێی، ئینجا کورد تازە بە تـازە دێت سرودێکی تێهەلدراوی لە جیاتی ئەی رەقیب دادەنی. بروانە (القـاموس السیاسـی ص1298-1299)

نموونەیەك وەرگرین:لە یەكەم هەڵبژاردنی كوردستان 1992 یەكێتی دروشمی فیدرالی بوو كەچی پارتی ئۆتۆنۆمی بوو، وەك دەزانین لە ریفرونداماكان دەركەوت ٪95 لەگەڵ سەربەخۆیی بوون، كەواتە بە هەموو پێوانەیەك دەبوایە دەنگی فیدرالی زاڵ بێت بەسەر ئۆتۆنۆمی، كەچی پیچەوانە دەرچوو،برێكی باش دەنگی پارتی زیاتر بوو، ئەوەش گوزارش لەكۆمەلیك مانای سیاسی وفەرهەنگی و كۆمەلایەتی قوول دەكا.

<u>لە خاڵە لاوازە نوێیەكانی:</u>

زۆر بەكورتی پەنجەیان بۆ درێژ دەكەین:

1- دیسان لەدوای ئەزموونێكی دوورودرێژ لە تەوقی لاسایی رزگاری نەبوو، ئەمجارە لە جەمسەری ماركسیەت بەرەو جەمسەری دژەكەی لەسۆشیال —دیموكراسەوە بو بازاری ئازادو لیبرالیەتو بەهاكانی تری رۆژئاوایی، كە پێشتر زۆری زەم كردبوو، لە یەكەم بەیانیەوە تا دوایی، ئیتر جارێكی تر بێی بۆ خەڵكی بسەلمێنی كە چی كردوومە و چی گوتوومانە هەمووی هەڵە بووە یاخود پێچەوانە بووە، هەتا سكرتێری گشتی لە ئاهەنگی یەكگرتنەوەی باڵی (ئالای شۆڕش) و یەكێتی ووتی: ((ئێمە شێت بووین))!!، راستە ئەوە بوێری و سادەیە، بەڵام لەلایەكی تریش كار لە كیانی سیاسی و متمانە و ئەخلاقی سیاسیش دەكا.. ئەوانە هەمووی بوونە پێشەكی سازدراو بۆ ئەوەی بەرژەوەندی تایبەتی و خۆویستی جێگەی بەرژەوەندی گشتی و مەبادیئی بگرێتەوە،لەنێو سەركردایەتیش ئەو بنەمایە شەرعیەتی پێ دراو دەووترا(لە شاخ مەبادیئو لەشاریش مەساڵح) بە تایبەتی لەسەردەمی حكومەتی كۆسرەت رەسول ، ئیتر لەدوای ئەوە هەموو ئەگەرێك لەگینە، سەنگەر گواستنەوە، گەندەڵی، تلیاك، خیانەت، دزی، رێگری، بەرتیل،...هتد بڵاو بیتەوە.

2- بەرجەستەبوونی ئەو بارودۆخە فكریەی ناو یەكێتی بووە هۆی نەگونجانی لەگەڵ تەیاری ئیسلامی و ناكۆكی و خوێن رشتنێكی زیادەڕەو، ئیتر بەگشتی ڕای گشتیەكی وا دروست بوو كە ناوی (یەكێتی) بهێنرێ وەك دیمەنێكی دژ بە ئیسلام و ئایین و زانایانی ئاینی دەركەوی، ئەوەش كاریگەرییەكی ئەوەندە قوولی هەیە، بەڵام لەسەرخۆیی و بەبێ‌دەنگی.

3- هەڵسوکەوتی لایەنگران و بەرپرسانی یەکێتی لـەرادە دەرچوو،دەسـت پێشـخەری زوربەی دیاردە سەلبیەکانی ئیستایە، لە بردنی سامانی گشتی میللەت، هەتا دەسـت بـرا بۆ (تەلی کارەبا) و بیتوێنەوەو بیفرۆشیٚ، سەرنج بدە ئەو کارە دژ بـە شارسـتانیو ویرانـی گشتیبۆ ئەوەی گیرفانی چەند بەرپرسێك ئاوادان بێـت!! کاریگـەری سـەلبی هـەر تـەواو نابیٚ.

4- هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی (سەرخان درێژخایەن) بەرەبەرە ژێرخـانی کۆمەڵگـەی کوردەواریی تێك دەدا.. تا وای لیٚدیٚ و (واشی لیٚهات) ئـەو میللەتـە ناتوانـیٚ (راسـت و چەوت) لێك بکاتەوە، یاخود خراتر بە (راست) بڵیٚ چەوت و بە (چەوت)یش بڵیٚ راسـت.. ئەوەیان دواداڕووخانـە.. ئـیتر مانایـەك بـۆ (چاکسـازی) نامێنـیٚ.. بۆیـە دەبیـنین ئـەو میللەتـەی ئێمـە شـتێکی نـەماوە نـاوی فشـاری رای گشـتی بـیٚ و هـیچ سـەنگ و کاریگەریەکی نەماوە، بەراستی عەوام کراوە، بۆیە ئەگـەر بـە ڕەگـەزەکانی (بەدەویـەت) لەقەپانی بدەین زۆر لە سەرەنجامەکەی دەترسم، ئیتر کە باسی (مەدەنیەت) دەکـەن جیٚـی گاڵتەجاڕیە. هەڵبەتە (بەدەویەت) تەنها مانای بیابان و مەڕداری نیـە، بەدەویـەت لـەژێر بۆینباخ و شارستانیدا.

5- کەمتر تەقەلای پـەروەردەیی و ئـەخلاقی سیاسـی و بیناکردنـەوەی تـاکی کـوردی و یاخود پەروەردەی حزبی ماوە، بۆیە (مقەوەماتی) مانەوە تەنها لە دەسـەڵات و مـادە مـاوە، ئیتر ئاساییە پێویستیەکی زۆری بە (دەسەڵات) دەبیٚ هەتا شەڕکردن لەسـەری و گـویٚ نەدانـە دیموکراسی و رای میللەت و نەبوونی شەفافیەت و ریٚ نەدان بـە دروسـت بـوونی ئۆپۆزسـیۆنی یاسایی، نەبوونی دەستگۆڕی دەسەڵات، ئازادی رای جیاجیا.. تا ئەو ساتەی خۆی دەسـەڵاتدار بوو.. ئیتر ئێستا وا هەمان ئەو فەزایەی دروستی کرد رووبەڕووی خۆشی دەبێتەوە.

6- خـاڵی لاواز گـەلیٚ زۆرە، رەنگـە لیٚـرە پیٚمـان تـەواو نـەکریٚ، بـەڵام بەگشـتی وەرچەرخانێك لە جەنگی ساردی کوردسـتان روویـداوە، سـەرکردایەتی یـەکێتی بەچـاکی هەستی پیٚ نەکردبیٚ، کە بووەتە هۆی بەرەبەرە لە دەستدانی پلەی یەکەمی، یاخود بـەرەو (رجل المریض).. ئەویش ئەوەیـە، تـا ئـەو جەنگـە سـاردە کلاسـیکیەی نێـوان پـارتی و یەکێتی، لەلای یەکێتی بەهۆی ئایدیۆلۆژیا بەڕێوەبرا، ئەوا داینەمۆیەکی بەهێز بوو بۆی و زاڵیش بوو، کاتی چۆنیەتی و سروشتی ئەو ململانێیە لە ململانێی ئایدیۆلۆژی دابەزی بـۆ ململانێی کۆمەڵایەتی، ئەوا بەرەبەرە هاوسـەنگییەکان گـۆڕان، جـاران (ینـك) تـا پلـەی

70٪ زاڵ بوو لەسەر کوردستان و بە هەموو مانای سیاسی و سەربازی و بڕیاری چارەنووس و..، هەڵبەتە لە ململانێی کۆمەڵایەتی لە کۆتاییدا پارتی دە بیباتەوە کە لێی بەهێزە، و لەو فاکتەر و فەزایەشیەکێتی لێی لاوازترە، ئیتر نەبوونی حیکمەت و هەڵەشەیی و گوێ نەدانە هەندێ ڕووداو و گۆڕانکاری، هەردوولا کەوتنە بازنەیەك کە (پ.د.ك) لێی بەهێزترە، بەرەبەرە (ی ن ك) پلەی یەکەمی لەدەستداوە، بەتایبەتی لەدوای (2000)، ئەو دیراسەتانە زیاتر زانستین زۆر سروشتیە هەموو سەنتەر و ناوەندێك بیکا، وەختی ئەو دیراسە زانستیانە هاتووە.

7- زۆر بەڵێنی گەورە بە میللەت درا لە خزمەت گوزاری، پاداشتی کۆنەپێشمەرگە، بنبڕکردنی گەندەڵی، ڕزگارکردنی کەرکوك، نەکردنی شەڕی کورد لەگەڵ کورد.. کەچی نەهاتە دی، بەڵکو بەشێکی هەر پێچەوانە بوو.

8- لە بڕیار و هەڵوێست و ساتە هەڵچوونەکانی لەگەڵ حزبە کوردستانیەکان دیسان هاتۆتەوە سەر دەردەکانی هەنگاوی ئانیەت و بەپێی ئەو پانتاییەی ڕووداوەکە هەڵوێست و بڕیاری مەزنی داوە نەك بەپێی بارودۆخی سەرانسەری کوردستان و باری ئیقلیمی و جیهانی، بۆیە ئەو جۆرە هەنگاوانەن زیاتر (ی.ن.ك) لەو هەورازە گیرکردووەو سەرناکەوێ، ئینجا هەنگاوەکانی لەو ساتە (نالۆگیکیانە) هەردەم سەرچیخە نەك قووڵ، هەنووکەییە نەك دووربینی، دەماو دەست و زادەی یەك لایەنیە نەك هەمەلایەنی، یەك ئەنجامی هەڵسەنگێنراوە نەك کۆی سەرەنجامەکانی.

9- هەڵس و کەوتی لایەنگران و کادیرانی لە توندوتیژ و هەڕەشەو گوێنەدانە یاساو نەریت.. بووە هۆی زیاتر بێ متمانەیی.

10- پەیڕەوکردنی ئەو ڕێبازە سیاسیەی (میکاڤیلی) گوایە سیاسەت و دپلۆماسیەت وادەخوازێ هەڵخەڵەتان و ناڕاستی و سوڕ و پەرەپێنەدان و پەیمان شکاندن... بووە هۆی چەواشەیی و تێکەڵ بوونی (ئەوەلیات و سانەویات)، (ئامراز و ئامانج)، (مرکزی و لامرکزی)، (دیموکراسی و دیکتاتۆری)، (نیشتمانیەت و خیانەت)، (دۆست و ناحەز)..

تا ئەو ڕادەیە لەلایەن خەڵکی سادە کاردانەوەیەکی نیشتمانی وا نەما کە هێزی دوژمنیان لە31/ی ئاب هێنا ناو کوردستان و خۆی بووە قوربانی، ئینجا گلەیی لەبێ هەڵوێستی حزبەکانی تر و میللەتیش دەکا.

11- دوای خۆی بووە قوربانی لەشکر کیشی داگیرکەر، ئەوا خۆشی وای کرد هێزی ئێرانی هێنایە سەر بارەگاکانی (حدکا) ودوای هێزی تورکیاشی هێنا بۆسەر (پ.ک ک)،هەڵبەتە لەیەکەم شەری هاوبەشی پارتی ویەکێتی لەگەڵ(پ.ك.ك) لە 1992[1] زور بەئاشکرا هەمووجورە هاوکاریەکی تورکیایان کرد و کار گەیشتە ئەوەی تێکۆشەرانی دژ بەرژێمەکانی داگیر کەر تەسلیم بەوان بکەنەوە لەگەڵ پەیوەندی کردنی هەردوولا بەدەزگای گوماناوی،بۆ زیاتر بروانە هەموو ئەو بەڵگەنامانەی لە دوای 31یئاب لەسەریەکتر بڵاو کرایتەوە،بەشێکیان لە کتێبی (الاكراد فی مسألە العراقیە –سعد بزاز) بڵاوکرایتەوە لە ل184- هەتا کۆتایی .

12- لە زنجیرەی شەڕەکانی ناوخۆ، با لەڕەوا بوونی گەڕێین، یەکەم جار لەگەڵ (باسك) بووە هۆی ماندووکردنی یەکێتی، بەو شێوەیە لە کۆتاییدا هاوسەنگی هێز لە کوردستان بە فعلی گۆڕا کە پێشتر یەکێتی لە 60٪ بوو، لە 15٪* بزووتنەوە، لە 25٪ پارتی، کەچی یەکێتی داشکاوە لە قازانجی (پ.د.ك) و بزووتنەوەش داشکا لە قازانجی یەکگرتوو .

13- هێشتا بەگشتی سەرکردایەتی کورد بێ ستراتیجە.

14- هیچ تەقەلایەکی نیە بۆ پەروەردەی ئەخلاقی سیاسی و دروستکردنی نەوەیەکی مەبدەئی پاك بۆ بەرگری لە هەر ئەگەرێکی داهاتوو.

15- ئەگەربەکورتی دووبارەی بکەینەوە بناغەکانی ئیجابیات وسەلبیاتی دۆخی کوردستانی ئیستا بەشی هەرە زۆری دەگەڕێتەوە بۆیەکێتی، بەلایەن کەمەوە هەتا دەورو بەری سالانی 1995 .

16- بەپێچەوانەوە ئەو هەموو خەڵکە بێ پەروەردەو هەمەڕەنگەی کۆکردەوە، بووە هۆی بێوورەیی قارەمانەکانی رەسەنی یەکێتیش،پێش گەیشتنی هێزی پارتی بۆ سلێمانی بە دەیان هەزار پێشمەرگەی یەکێتی لە دارستانی شارباژێڕ و سنووریش پەڕینەوە، ئەو ڕووداوە سادە نیە ئەوە کت و مت تیۆرەکەی (دۆرکایم)ە لەسەر عەوام کە بە (ڕەوە)ی دەشوبهێنێ و دەڵێ: ((ئەگەر یەکێك ڕای کرد، دەبتە گشتی و پێچەوانەش بە پێچەوانە)). هێزی (ی.ن.ك) پێش تر واناسرابوو کە (عەوام) نیە.

---

[1] بەپێی کتێبی( ڕۆلی سیستەمی بنەمالە ..د حسین محمد عزیز )یەکەم بریاری پەرلەمانیش بوو .

* ئەوە لەرووی چەندایەتی بەلام لەڕووی چۆنایەتی هێزی بزوتنەوە زور بالا تر بوو.

17- ئــەو ئەزمونانــەی هەڵبــژاردنی (نیکــاراگوا، جــەزائیر، یەمــەن، ئــەریتیریا، موزەمبیق، ئەنگۆلا،..) بەڕوونتر سەلماندیان کە خەڵك لەگەڵ سەرکردەیەکی میللـی دایـە نەك حزبی، هێمن نەك تورە، ڕووحی نەك مادی، گران نەك بزێـو، لاشـەڕ نـەك شـەڕاوی، ڕاستگۆ نەك خوار، لەگەڵ نیشانەیەکی دەروونـی زۆر تایبــەتی تـر (شـاذ) لــە کوردســتان خەڵك پتر ڕای لەگەڵ سەرکردەیەکی ڕەش بینە پــتر نــەك گەشــبین و بوهــاری (هەرچــەندە پێچەوانەی فەرموودەشە)، بەڵام ئەوە دۆخی دەروونی ئەو میللەتەیــە کــە چــەندین ســاڵە شکستی بۆ دووبارە دەبێتەوە،لەورووەوە سروشت وتەبیعاتی مام جلال لەگــەڵ ئــەو دۆخــە دەروونیەی (کە وەسفمان کرد) نایەتەوە .

ئالێرەدا سیرەی یەکێتی و داستانەکانی و ناووبانگی لەگەڵ سەرەنجامی دەنگەکان لێـك دوور بوون پڕیەتی لە پەند و وانە.. بەڵامهەمووی کۆدەبێتەوە لەو سەردێرەو لە پرسیارە.. بۆچی لەدەنگی رابەری (یەکێتی) زیاتر لە کورتی دا؟ وەڵامەکی هەر لە خاڵە لاوازەکـانی دەدۆزیەوە لە سەروو، لەبابەتی (پ.د.ك)یش وەڵامی هەیە.

**چوار فاکتەری سەربازی هەیبەتی یەکێتی شکاند:**

زۆر جار یەکێتی دووچاری شکست بووە کەچی بەخێراییی خۆی دروسـت کردیتــەوە بــە هۆی ئــەو تونــدو تۆڵیــە ئایدیۆلۆژیــەی، بەڵاملــەدوای ڕاپــەڕین وشکســتی (عەلمانیــەتی شیوعیەت ) ئایدیۆلۆژیای کزولاواز بوو ئەو جارە نەیتوانی شکســتەکانی ســاڕێژ کــا، کــە زۆر بە کورتی ئەو چوارە بوون بە ڕای من :

1- شەڕی بزوتنــەوەی ســاڵی 1993 ئەوبەرگریــە بــەهێزوە پێشــانی دا ترســی هــەموو لایەکی لەیەکێتی شکاند .

2- شکستی دوای 31ی ئاب، مەبەست خودی هەولێر نیە بەڵکو ئەو شکستەی لــەدوای تا دەرکردنی لە تەواوی کوردستان .

3- شەڕی دووەمی پەکەکە کەلەناوچەکانی پشت ئاشان ڕوویدا و شکستی هێنا .

4- دوا شەڕی لەگەڵ ئەنسارولئیسلام لەلای هەڵەبجەو بەردەوامی تا هێزەکـانی ئـەمریکا هات لە کۆڵ یەکێتی کردنەوە بەو مەرجەی ژمارەی هێزی یەکێتی بە دەیان قــات لــە وان زیاتر بوو .

## کەواتە ئێستا (ی ن ك) لە چ دۆخێکە؟

هەڵبەتە لەمێژووی نوێدا باری وا زێڕینی بۆ کورد نەهاتووە، مەودایەکی ئیشکردن بـۆ هەموو لایەك هەتا بۆ ئیسلامیەکانیش رەخساوە بـۆ ئیشـکردن و گـرەو بردنـەوە، ئـیتر (البقاء للأصلح) لە ماوەیەکی کورت نەخشە دەگۆڕێ چیتر ئەو هاوسەنگیە نامێنێ، بۆیە ئەوەی بیری لە چاکسازی کردۆتەوە زۆر بلیمەت بووەو لەجێی خۆیـەتی، هـەنگاوێکی زۆر بوێرانەیە.. لەراستیدا هەموو لایەنەکانی تریش پێویستیان بە چاکسازی هەیە، بەڵام لێـی دەترسن، بەگشتی ئێستا حزبـی دەسـەڵاتدار لـە قـەیرانی سـەختدایە، وەك بڵێـی لـەژێر (ئینعاش) دایە، ئینعاشی دەسەڵات، هەر لە دەسەڵات جیای کەیتەوە واتە لـە ئینعاشـت جیاکردەوەو مەرگە.. بۆ وایە؟ چـونکە مقـەوەماتی حزبـی نـەماوە، حـزب لـە بنەچـەدا هەروەك واش (ی ن ك) دروست بووە،خاوەن ئایدیۆلۆژیایە بـەپێی (عقـد فکـري وسیاسـي) لەگەڵ خەڵکی گرێبەست دەکا نەك بە(عقدی گیرفـان)، ئێسـتا دەبیـنین بـوون بـە حزبـی یەکسەر ئەو مانایە دەبەخشێ، واتـە: گیرفـان پڕکـردن، سەرپێچـی، زۆرداری لـە خـەڵك بکەیت، ئیمتیازی مادیت پێ بدرێ و خانوو و کۆشك و تەلار دروست بکـەی، ڕێ بگـری، لەسەرووی یاسا بیێ،.. ئەگەر لـەوێ ئـەو ئیمتیازانـە نـەما ئـەوا سـەنگەری بگوازێتـەوە بۆلایەکی تر کە زیاتری پـێ دەدا.. ئـیتر ئـەو جـۆرە کـارە وا بـاوی وەرگرتووەوئەگـەرپێ دەوڵەمەند بوو دەڵێن (بۆخۆی عاقڵە) بووە پیاو! ئەوە زۆر ترسناکە ئەگەر پێوانەی حزبـی و جەماوەری وای بەسەربێ، جا نازانرێ ئەوکاتی چاکسازی چۆن بکەی، لەراسـتیدا ئەگـەر لیستێکی بەراوردی سەرتاسەری لە (ینك)ی شـاخ و ئێسـتای بکـەیت، دەبینـی زۆربـەی هەرەزۆری خاڵە بنچینەکانی نەك هـەر گـۆڕاوە، بـەڵکو پێچـەوانەش بووەتـەوە، هـەموو بوارەکانی فکری، سیاسی، مەنهەجی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی،.. دەگرێتـەوە. کەواتە ئێستا پرسیاری زانستی لەبارەی هەردوو حزبی دەسـەڵاتدار ئەوەیـە، ئـەو تۆپەڵـە خەڵکە چین؟ ئایا حـزبین، لەسـەر چ بنچـینەیەك یـەکیان گرتـووە؟ بیروبـڕوا و مـەبادیٔ و مەدرەسەیە یاخود بەرژەوەندیە؟.. ئەگەر یەکەم بێت ئـەوە حزبیـە و سـەلامەتە.. ئەگـەر دووەمیش بێت ئەوە لە کۆمپانیای فرەڕەگەزی (بچووککراو) دەچێ، ئەوەی لێـی دەترسـین ئەوەیـە یەکـەم نیـە، چـونکە کـوا کـام بـیرورا و ئایدیۆلۆژیایـە ئـەو خەڵکـەی بەیـەك بەستۆتەوە.. ئەگەر بڵێین (بەڕێز مام جەلال، یاخود فلان.. ئەوەیان مانای حزب نابەخشـێ مانای خێل و عەشیرەت و (دیرە) دەبەخشێ.. ئـەی کەواتـە ئـەو نـاکۆکی و دەمارگیریـە

لەسەرچی بوو؟ تا بە پرسیار قوول بیەوە وەڵامی ترسناکترت دەست دەکەوێ، کە لەسەر سکە تەواو دەرچووەو ئیتر چاکسازی پێویستە.

**چاکسازی/**یەکێك لە پێناسەکانی سیاسەت مانای (چاکسازی گشتی)یە، ئیتر زۆربەی پەیامبەران و زانایان و مەدرەسەکان بۆ چاکسازی هاتوون، کەواتە ئەنجامێکی لۆجیکیت دەداتە دەست کە ماوەیەکی دوورودرێژ ئەو حزبە (سیاسەتی راست و دروستی نەکردووە) بۆیە چاکسازی کەڵەکە بووە، جا کاتێ رێژەی ئەو کەڵەکە بووە لە 50٪ ڕەت بدا پێی ناگوترێ چاکسازی، پێی دەوترێ گۆڕانی ریشەیی، چونکە چاکساز گۆڕانێکی سەرچیخە زیاتر، بەڵام سەرکردەی بلیمەت وئامراز و ئایدیۆلۆژیای تێرو ستاندەر جاروایە دەتوانێ ئەو گۆڕانە ریشەییەش بە چاکسازی وەدەست بهێنێ، کە عادەتەن پێی دەوترێ شۆڕشی سپی، لەسەر ئەو بنچینەیە وا پێدەچی بۆ ئەو دۆخەی حزبە دەسەڵاتدارەکانی تێکەوتووە لە سنوری چاکسازی نیە، زیاتر لە 80٪ی گۆڕانی پێویستە، چونکە گەلێ جار بەراشکاوانە هەردوو سەرۆك وتوویانە نازانین کێ لەجیاتی کێ دابنێین، هەموو یەك لەیەك خراترن.. هاتوونە سەر ئەوە کە گوایە کۆمەڵگەکەمان تێکچووە!.. نەخێر.. ئەوە نیشانەی ئەوەیە حزبەکەت وێرانە، ئەگینا تۆ کەسی دڵسۆزت نەبێ بۆ شوێنێکە گەندەڵی لێ دەکرێ، تا ئێستا سزایەك نیە.. واتە بەروونی مانای وایە ئەو دەستە زۆرایەتیە و چارەی ناکرێ، وەك مەسەلەی فارسیەکەیە وتی: (خەسەن و خوسەین دختەری معاویە هەستن).. ئەوەی بەرامبەری وتی: لەکێ ڕا بۆی چابکەم، خەسەن نیە حەسەنە... بەکورتی لە (5) وشە (6) هەڵەی تیایە، خۆ لە کوردەواریش قسەیەکی خۆش هەیە، دەڵێن بە حوشتریان وتووە ملت خوارە، حوشتریش وتبووی جا کوێم ڕاستە هەتا ملم راست بێ... ئیتر مانای وایە وەك دختۆر نازانرێ لەکام لاو لەکێ ڕا دەست بە چاکسازی بکرێ، لەگەڵ ئەو خاڵانەش لەبارەی چاکسازی:

1- پێویستە ئەوانەی لایەنی چاکسازین بەشێك نەبووبن نە لە نزیك نە لە دوور لە سەرەنجامی ئەو دۆخە، لەپێش ڕا پێش بینیان کردبێ و بەگوێیان نەکرابێ، ئەگینا لە دۆخی پێچەوانەی دا لەپێش ئەوانە خۆیانە پێویستیان بە چاکسازی دەبێ.

2- خودی ڕیفۆرم پێویستی بە (فۆرم)ە* بنچینەکە هەیە کەلەسەری ڕیفۆرم بکەی، واتە بەرنامەیەکی سیاسی و فکری و هەتا سیستەمی مەدرەسەیی جیاشی هەبێ، تا ئەو چاکسازیەی لەسەر بکرێ، ئاخۆ دەتوانری لەو چاکسازیەدا ناوەخنی تاك وا بگۆڕێ لە تاکێکی سەلبی وەرچەرخێتە ئیجابی، (ماکینەی(ی.ن.ك)ئەو دەزگایەی وەستاوە کە بتوانێ تاك وا دروست بکا...) چاکسازیەك بتوانێ ئەو مرۆڤانە کەلە لاشەی ئەو حزبانە ئالاون لێی دەخۆن، لەسەری دەژین، بە وەسفی (هۆبز، نیتچە، دورکایم..) وەك گورگن.. ئیتر چۆن بکرێنە مرۆڤێکی خێرخوازی چاکساز، وەك ئەو مرۆڤ و پێشمەرگانەی کاتی خۆی شاخ خاوەنی ویژدان و خۆنەویستی و خزمەتکار و ولاتپارێز و.. دروست بکرێتەوە، بەکورتی بە چ بەرنامەیەکی سیاسی و فکری ئەو تاکانە وەردەگەڕێن لە خۆویستی بۆ خۆنەویستی، ئەوە ئەرکی چاکسازیە ئەکەر بتوانرێ.

3- دەبێ هێزی چاکسازی دیاری بکرێ لەپێشدا ئاخۆ لەتوانای‌دا هەیە چی بکا.. ئەزموونەکانی چاکسازی چەند سەرەنجامێکی هەبووە لە دوورونزیك نمونەمان هەیە: ئەو چاکسازیەی زۆر ناوبانگی هەیە وەك هەموو ئەنسکلۆپیدیا و فەرهەنگەکان لە باسی (چاکسازی) یەکسەر بە مانای چاکسازی (مارتن لۆسەر)ت بۆ گوزارش دەکەن، لەو چاکسازیەدا مەزهەبیکی نوێشی لەگەڵ داهێنرا (مەزهەبی پرۆتستانی- واتە معارەزە)، لەلایەکی تر چاکسازی ئەوروپی کە لەلایەن عەلمانیەکان دەستی پێکرد لە دەرەوەی ئاینی مەسیحی ئەوا ئەو ئەوروپا نوێیەی لێ هاتەدی.. ئەوەش جۆرێکی تری چاکسازی بوو، چاکسازی تر بووەتە هۆی مەرگ، وەك ئەو چاکسازیەی گۆرباتچۆف پێی هەڵسا بە دروشمی (بیروسترویکا و گلاستۆست) بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت و رووخانی بلۆکی سۆشیالیستی.

چاکسازی تر هەیە دەبێتە هۆی بچووك بوونەوەی خۆی، وەك ئەو چاکسازیەی (جوان تورك- تورکیای نوێ) پێی هەڵسا لە 1865 ڕا دەستی پێکرد و ئەو (عوسمانلی)یە مەزنەی بچووك کردەوە بۆ ئەو تورکیا بچووکەی ئێستا کە لەوەتی دروست بووە لە 1922 تا ئەم ساتە بەدوای مەرجەکانی ئەوروپایە هەر پێی ناگاتا لێی ببێ بە

*فۆرمە بنچینەییەکەی یەکێتی بریتیە لە بەیانی (تەئسیسی 1975)لە ٪90ی پێچەوانە بوویتەوە جا چۆن ئیشی لەسەر دەکرێ .

ئەندام.چاکسازی تر هەیە بووەتە هۆی لێك جیابوونەوەو داتلیشان، نمونەی نزیك چاکسازی بزوتنەوەی ئیسلامی بوولەکوردستان..

کەواتە ئەو چاکسازیەی (ینك) وا پێی هەڵدەستێ لەکام ئەزموون نزیکە، سەرەنجامی چی دەبێ؟ وا پیدەچی لە چاکسازیەکە پەشیمان دەبنەوەو هەندێ ئیجرائاتی سادە دەکەن وەك ئەو هەڵبژاردنەی ئێستایان کە لەسەر بنچینەیەکی زانستی و ستاندەرانە نیەو.. بگرە لەجیاتی چاکسازی، خراپسازی لێ دێتەوە،لەوەوە بزوتنەوەی گۆڕانی لێ پەیدا بوو.

## بزوتنەوەی گۆڕان

بە هۆی هەموو ئەوانە چاکسازەکان کە بێ ئومێد بوون لە چاکردنی یەکێتی لە ناوەوە،ئەوە ناچاربیریان کردەوە لە دەرەوە چاکسازی بکەن،بەو شێوەیەلەسەرەتابەناوی (گۆڕان)خوازان کارو چالاکی ڕاگەیاندن بەناوی کۆمپانیای ووشە سەری هەڵدا،لە 2009/7/25یەکەم هەلبژاردنیان 25 کورسیان لەپەرلەمان هێنا ، لەبەرامبەریشدا یەکێتی خراپ شکستی هێنا وئەگەر لەبەر هاوپەیمانی لەگەڵ پارتی نەبوایە ڕەنگە هەر تەنها 16 تا 18 کورسی دەنگی ڕاستەقینەی خۆی بێت هەروەك لە داتاکانی سەرکردایەتی پارتی گوزارش دەکرا،بۆ یەکەم جار معارەزەیەکی یاسایی پێك هات لە (گۆڕان،یەکگرتوو،کۆمەل)، ئەوەش قۆناغێکی نوێی لەکوردستان هێنا ئاراوەو ڕەنگە کۆتایی بەو هاوسەنگیە سەلبیە بهێنی لە کوردستان کەلەوەتەی شۆرشی نوی لە 1976ەوە درێژەی کێشا بەلایەکی دابخا لە ڕێی سندوقی دەنگ دان ،چونکە هەردوو لای سەرەکی (پارتی ویەکێتی) دەنگەکانیان ئەوەندە کەم بویتەوە بەهەر سەودایەکی تری ناوەکی ئەگەری لە حکومەت دوورخستنەوەی هەر لایەکیان هەیە بە یاساییانە ، بۆ ئەو قۆناغە(کە لە 2009ز) هۆیەکانی دروست بوونی معارەزە وسەرەنجامەکانی لایەنی ئیجابی وسەلبی ئەو بزوتنەوەیە زۆر تازەیە ناخرێتە ژێر هەلسەنگاندنی ستراتیژی ،تەمەنێکی دەوێ تا بزانین ناسنامەی چیە ،تا ئەو ساتە سودی لەوە وەرگرتوە کە حزب نیە بزوتنەوەیەکی میللی گشتیە جێی هەموو لایەکی لێ دەبێتەوە،خۆشی ساغ نەکردۆتەوە بەلای عەلمانی وئاینی ،تا ئەو کاتە لایەنە ئاینیەکانی کوردستان بە سیاسی وناسیاسیەوە سودێکی زۆریان لێ بینیوە،خالی هەرە بە هێزی تری ئەوەیە نەوشیروان مستەفا بەکەسێکی دژ بە گەندەل ناوبانگی داوە ، بەڵام چەند پرسیارێکیشی بەدوای

خۆی دروست کردوە لەوانە:بۆچـی هەموویـەکێتی یـان هەمووکۆمەڵـە کۆنـەکانی لەگـەڵ نەهاتن؟ خۆی جێگری مام جلال بوو کاتیٚ مام جلال ببێتە سـەرۆك کۆمـارخۆی بەکەسـی یەکەم دەمێنیتەوە بۆ ئەو شوێنەی بەجێهێشت؟ وەڵامی هـەموو ئەوانـە لـە رێکەوتنامـە ستراتیژیەکەی یەکێتی وپارتیو کەسێتی مام جلالمان دەست دەکەویٚ.

## کەسێتی مام جەلال

رەنگ دانەوەی کاریگەری سروشتی سکرتیر زور بەخەستی لە سـەر یەکیتیـە هـەبووەو هەیە، خەریك بوو تا 1994 هەموو کوردستانی مـەزن بکەوتـە ژیـر ئـەو کاریگەریـە، پیاویکی زور کولنەدەرە، مەحال لای ئەو نیە، کەسێتیەکەی زور دەگمەنە، لەناو ئەو شاخ وداخە بەبی خـزم و کـەس ئـاوا دیسـپلینی هـەبووە بـە سـەر ئـەو هـەموو عەسـکەریە چەمووشانە کە زور بە زەحمەت بـەرزەفت دەکـران، لەپەیوەنـدی مێوانـداری زور بـەریزە، هەروەك واقیع ناسە ئاواش خەلك ناسە، هەریەکە دەزانی بەکەلك چـی دیـت وکـەس لای ئـەو زیـاد نیـە، گـەرلای دادەنیشـی هەسـت بەبچـووکی خـوت ناکـەی زور بـەرزت دەکاتەوە،مەگەر هەر خوت هیچت لەبالا نەبی، نایەلی کادیری دانیشتوو یـان معـارەزەی هەبی، ئەمن پێش مەرگەیەکی سادە بووم، تەنها گوێی لێبوو ووتم ئـەو مفاوەزاتە(سـالی 1983) چاك نیەلە رووی ستراتیجا، ئەوا یەکسەر ماموستا عزیزی لیٚنزیك بـوو لـەوی لێی پرسی بوو،دوای د کمال خوشناوی وەك سەرۆك لیژنەیـەك نـارد بـو ئیقنـاع کردنمـان، دوای خوشی ناردی بەدوام، هەندی خالی باس کـرد یـەکیٚ لەوانـە ئـەوەبوو ووتـی ئەگـەر مفاوەزات نەکەین ئەوا حکومەت بەرنامەی ئەنفالی هەیەو (ئـەوە بـوو پـاش مفـاوەزات کردی)،ئیتر قەناعەتم هات و هەر لەسەر پێشنیاری ئەویش منی کـردە بەرپرسـی لیژنـەی تەنیسقی مفاوەزاتی تەوەری رانیە –هەولیر، ئـاوا لـە معارەزەییـەوە وەری دەگێـراین بـوٚ بەشێك لە پرۆژەکە،هەر بەبۆنەی زۆربەئاگا بـوون و زانیـاری تایبـەتی لـە نێـو دەسـەڵات پێدەگەیشـت،ئەگەر بـە ووردی سـەرنج بدەینـە ئەونامەیـەی بـۆ مسـعود بـارزانی لە1975/1/1تیایدا زانیاریەکی زۆر سەرسوڕهێنەر باس دەکاو دەڵیٚ: ((لـە دوسـتێکی عەرەبەوە بیستم بە بۆنـەی نەخۆشـی بـەکرەوە –کـە ڕەنگـە زووبمرێـت –موئامرەیـەکی عەسکەری هەیە بۆ کوشتنی سەدام ولابردنی تاقمەکەی لە حوکم))[1]،ئەوڕووداوە کت ومت لە 1979 ڕوویدا، زۆر بە ئاگا بوو لە ناو یەکیتیش بی ئەوەی لە ئـازادی رادەربـین سـل

[1] بارزانی وبزوتنەوەی کورد- ل459

بکاتــەوە، بــەڵام گــەلێ جــاریش خــۆی بچــووك دەکــردەوەو دەهاتــە نێــو وورده ئــیش، سبەینەیەکی زوو شەهیدعبد الــرحیم ســەرتیپی بــەری مەرگــە بــوو لەگــەڵ بکــر پــیرۆت نامەیەکی مام جلالی بولای من هێنا لە سەرکەپکان، تا بیبەین بو نوینــەری حکومــەتی مفاویز لە رانیــە تــەنها بــو 1000بلــوك!! منــیش نامەکــەیم شــاردەوەو هەرســێکمان ریکەوتین کە نامەی مام جلال نابی لەداوای کوردستان کەمتر بی چۆن بو بلوك دەنووســی، ئینجا بەخوم نامەم نوسی 2000 بلوکمان بۆ وەرگرت ،ئەو خەســلەتەی مــام جــلال لــە سەرۆك کۆماری وبەرەی دیپلۆماسی لە نێو خۆی عێراق وجیهانیش هەتا ئیستا بەردەوامە وزۆر زیان بەخشیشە .

هەرچــــەندە مــــام جــــلال بــــە مارکســــی بــــەناوبانگ بــــوو، بــــەڵام سروشــــت ورسکانی(سایکۆلۆژیەنی) لیبرالی بوو، کە رەنگدانەوەی سکرتێری گشتی بــوو لەســەریان، تا ئەو ساتەش یەکێ لە سەلبیاتەکانی سکرتێر ئەوەیــە نــە دۆســتایەتی و نەدوژمنایــەتی تاسەرنیە، هەتا بەرژەوەندیش تا سەری نیە، هەتا لەگەڵ دوســتیش، بــەڵکو ئــەو لەســەر رێرەوێکی دەگمەنی تر دەرۆیشت کە بریتیە لە :(بەیەك گەیشتنی دووبەرژەوەنــدی لــەدژی سێیەم)[1] ئەوەش زۆر وێران کەر دەبێت وزەمینەیەکی بەئاژاوەو بێ متمانە دروست دەبــێ، جارێکیان لەگەرمەی یارمەتی دانی یەکێتی بــو(حدکا)لــە 1982، د قــاسملو بەشــۆخی لەسەرخانووی (م س)نێوزەنگ رووی لــە مــام جــلال کــرد ووتــی : ((واجــارێ مــام جــلال یارمەتیمان دەداو نازانین کەیش دەستەکی بە ئێمەش دادەینی ))، ئالێرەدا لێڵیــەك هەیــە لە هەندێ هەنگاو ئامانج و پاڵنــەرەکانی دیــار نیــە، بینایــەکی سیاســی مــەزن دەکاتــە بەراگێری دەستکەوتێکی سادە و بچووك، یان بەگوزارشتیکی تر ســکرتێر زور بلیمەتانــەو لەمەحالا بینا دروست دەکا بەدەستی خوی، بەڵام بەشیوەیەکی نامەنتیقی ئەو بینایــە بــە قاچ تیك دەداتەوە، لــە راســتیدائەو دابەشــیەی مســعود بــارزانی بــۆ ســەرۆکی هــەرێمی کوردستان و وسەرۆکایەتی ئیراقیش بۆ مام جلال زۆر نموونەییە، لەوەش بەهێز تــر ئەوەیــە ئەگەر هەردوولاش بەیەکجاری لە حزبایەتی دوورکەونەوە.

ئەو توانایەی مام جلال وادەکا تا ئەو بمێنێ هەموویەکێتی نابێتە مولکی گۆڕان .

---

[1] لەبنەچەدا ئەوەبۆچوونی (مارکیز دارجنستون)ە کەدەلێ هەموو بەرژەوەندیەك تایبەتمەندی هەیە،گەیشتنی دوو بەرژەوەنــدی دژ بــە ســێیەمە- بڕوانە جان جاك رۆسۆ-فی العقد الإجتماعی ص68

## -3-

### سەرکردایەتی کاتی( س.ك )( پ.د.ك )( قيادة مؤقتة )

لە ڕێکەوتنی 1975ی جەزائیری نێوان (شا و صدام)، کورد خاوەنی زیاتر لە 60000 پێشمەرگە و توانای مادی و لۆجستی و بەشاخەکانەوە لە حکومەت کەمتر نەبوو، کەچی لەناکاو بە بڕیارێکی ناوەخۆی نەك لە شکستی عەسکەری کۆتایی بە شۆڕشێکی 14 ساڵەی هێنرا بێ هیچ ڕێنمایی و نەخشە و پلانێکی نوێ، کۆتایش بە (پارتی) وەك حزب هێنرا، دووچاری پەرتەوازەیی بوون، بۆیە بەشێك لە ناحەزانیان ناویان بە (ئاش بەتاڵ) برد، هێزەچەکدارەکانیان تەسلیم بوونەوەو هەندێکیش بەرەو ئێران، سەرکردایەتیان بێ بڕیار دابەش بوون، بەشێك تەسلیم بوونەوە، لەوانە (صالح یوسفی، رشید سندی، حبیب محمد کریم، فارس باوە...). بەشێك بۆ ئەوروپا و ئەمریکا (بارزانی و خانەوادەی) لە تاران جێگیر بوون لەسەر داوای شای ئێران[1]، بەشێکی کەمی بەنیازی ئیشکردن بوون لەوانە: (سامی عبدالرحمن، د.محمود عوسمان، علی سنجاری)، (د.محمود ئینشقاقی کرد (لیژنەی ئامادە)ی دروست کرد، (علی سنجاری)یش (یەکێتی دیموکراتی کوردستان)ی دروست کرد، (سامی عبدالرحمن)یش (سەرکردایەتی کاتی (س.ك)ی پارتی دیموکراتی کوردستانی دروست کرد، بەپێێ تەقویمی خۆیان لە 1976/5/26.

### کێ سەرکردایەتی کاتی دروست کرد؟

لە سەرەتادا وەك لایەنێکی نوێ هاتنە مەیدان بە سەرۆکایەتی سامی عبدالرحمن، جارجار بارزانی وەك هێمایەك باس دەکرا یاخود بڵێین لە شێوەی (مەلەکی دەستوری)،بەپێی ڕێنمایەکانی ئەو کاتی ماڵی بارزانی ئاگایان لەدروست کردنەوەی ئەو سەرکردایەتیە نەبووە،بە پێی ئەو بەیانەی کە لە 1975/12/10 دەرچوە بە ناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان –سەرکردایەتی کاتی) ناوی مەلامستەفا وئیدریس بارزانی

[1]- بڕوانە: مسعود بارزانی –بارزانی و...

ومسعودبارزانی تێدا نیە ،لە دارشتنەکەش دوورە لە ئاڕستەی ئەوانە ، بۆ ئـەو مەبەسـتە ڕاشـــکاوانە تـــر ســـەید کاکـــە لەبیرەوەریـــەکانی خـــۆی باســـی کـــردووەو دەڵێ:یەکێتیوسەرکردایەتی کاتی هەموولادژایەتی شۆڕشی ئەیلوولیان دەکرد،هەردوولاش خەریکی کتێبی سووری ماوی بوون، لە کێشەکەی هەکاری سـەیدکاکە دەڵـێ بـە سـامیم ووت کە ئێمە ڕێکەوتنمان لەگەڵ ئیدریس بارزانی هـەبووە، لەوەلاّمـدا ووتـی:چـۆن ئێـوە لەخۆتانەوە ئیدریس بەبەرپرسی ئێمە دادەنێن، ئێمە سەر بە ئیدریس نین، دەلێتبۆیـە ئـەو شەڕەی هەکاری لە ملی قیادە موەقەتەیە نەك ماڵی بـارزانی، دەریـش کـەوت سـامی و قیـادە موەقەتـە چـەندە دژیئێمەن(یـەکێتی )ئەوەنـدەش دژی مـاڵی بـارزانین، هەربـەو شێوەیەش لەو کاتی سید کاکە نامەی بۆ مسعود بارزانی نوسیوەو ئەو ڕاستیانەی بۆ ڕوون کردۆتەوە[1] .

دوای کە کاك مسعود وکاك ئیـدریس زاڵ بوونـەوە بەسـەر سـەرکردایەتی کـاتی ئـەوا سامی و زۆربەی سەرکردەکان جیا بوونەوە،هیچ بەڵگەیەکی بەتەواوی نیـە بیسـەلمێنیتەوە کە ئەو شۆڕشە بە فەرمانی مەلا مستەفا دروست بوویێتەوە .

ئایدۆلۆژیای (س.ك):

ئەو جارە بەرەو ئایدۆلۆژیای چەپڕەوی و کرانەوەو ولاّتانی سۆشیالیستی وەرچەرخان، لە کۆنگرەی (9)ی ڕاژان 1979 بەتەواوی جاڕی مارکسیانەیان دا لە مادەی (5) و (6)ی پرۆگرام دروشمی دژ بە ئیمپریالیزمی ئەمریکیش بەرز کرایەوە، بەلاّم هەر تیۆر بوو پێیـان هەرس نەکرا.

**ڕەوتی (سیرەی):**

هەل و مەرجی جیهانی و ئەقلیمی و دەولی دروست بوونی ئەو (س.ك) هـەمان دۆخـە کە لە پێشەکی دروستبوونی (ی.ن.ك) تۆمارکرا.

- بەپێی تەقویمی خۆیان هەر لەگەڵ دروست بوونی ئەو (س.ك) لـەمانگی (5)ی گـولاّن مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەو (شۆڕشی گولاّن)ی لیّ دروست بوو.

---

[1] بڕوانە کتێبی : بیرەوەری پێشـمەرگەیەك —سـەید کاکـە، ب2 ل113- 165 بیرەوەری پیشمەرگەیەك – ل152 -156)؟؟؟؟ ئەوە ڕاستە

- کێشەی سەرکردایەتیان هەبوو (بارزانی وازی لە سیاسەت هێنابوو)، بۆیە وارێکـەوت کە (ئیدریس بارزانی) وەك ڕابەرێکی ڕەمزی بێت، بەڵام لەدواییدا لـە کـۆنگرەی (9) بەیەکجاری (سامی عبـدالرحمن) لادراو (مسـعود بـارزانی) بـووە سـەرۆکی پـارتی، لەناوی (س.ك) بۆوە (پارتی دیموکراتی کوردستان).
- سامی عبدالرحمن جیابۆوە (پارتی گەل)یان دروست کرد کـە پێـك هـاتبوو لەوانـە :( نوری شاوەیس، عارف تەیفور،کریم سنجاری، د مجید رشید جعفر،دلشاد میران، جوهر نامق ..)[1] . بەڵام نەیانتوانی لە یـەکێتی نزیـك بێتـەوە، چـونکە کوشـتنی (عـەلی عسکری و د.خالید) و کارەساتی هەکاریخرابووە ئەسـتۆی ئەوانـە، بەشـێك لەوانـە گەرانەوە ناو پارتی .
- سەرکردایەتی سیاسی ئەو کاتیان دوای ئاوا دروست بۆوە : (د.ڕۆژ، جوهر نامق، فازڵ میرانی، ملازم یونس، ملازم علی، د.کمال کرکوکی،...) مەفرەزە عەسکەریەکانیش هەتا ئەنفالەکان بەو شێوەیە بوو (هەورەمان- نادر هەورامی، خۆشـناوەتی- ڕسـول فقێ، خالید ئاشگە، باڵەکایەتی- نجم الدین گۆرۆنی، دەشتی هەولێر- خدر سـوارە، بادینان- محمود یەزیدی، لقی (1) بەتەواوی چالاك بوون).
- لەو لاشە لەگەڵیەکێتی هەر لە شەڕی براکوژی دابـوون، تـەن بەتـەن و بەکۆمـەڵیش، جارجاریش کە دەهاتنەوە کوردسـتانی بەشـی سـۆران 1979، 1980، 1982 هەر بەشەڕ دەردەکران تا دروستبوونی بەرەی کوردستانی 1988.
- لەدوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران 1979، ئەوانیش بووژانەوە، لە وەڵامی پیرۆزبـایی سەرکەوتنی شۆڕش (أ. خمینی) داوای لـە (بـارزانی) کـرد بگەڕێتـەوە ئێـران، بـەڵام پێڕانەگەیشت، لە 1979/3/1 کۆچی دوایی کرد، ئـەگینا بزوتنـەوەی کوردایـەتی جۆرە ڕەوت و واقعێکی تری دەبوو جیا لە ئێستا، بەپێی ووتارەکـەی کـاك مەسـعود لە3/5/ 1979 دەڵێت: مردنی بارزانی سروشتی نەبوو، بەڵکو بەدەستی سـاواك و سیای ئەمریکی بارزانی شەهید کرا.[2]

---

[1] ئەو زانیاریە وەرگیراوە لە کتێبی (التیارات السیاسیە فـی کوردسـتانالعراق)، لـە نووسـینی صـلاح خوراسانی ص284 .
[2] بڕوانە ووتارەکە لە نیسانی 1979، هەروەها کتێبی (ئەوەی بەعس پێی نەکرا، م.ڕەوشـەن کـردی) فیصل دەباغ، لە بڵاوکراوەکانی (پ.د.ك)، بەڵام کاك مسـعود لـە کتێبەکـەی (بـارزانی وبزوتنـەوەی

- له 1980/9/22 جەنگی عێراقئێران هەڵگیرسا، بە واقیعێك كە عێراق خۆی پـێ مەغدور بوو لە رێكەوتنی 1975ی جەزائیر تەنازولی لە ئاوو خاكێكی زۆر كرد بـۆ ئێران لە بەرامبەر وەسـتاندنی شۆڕشـی كـورد، بـەڵام شـۆڕش دروسـت بـۆوەو ئـاوو خاكەكەشی ڕۆیشتبوو، بۆیە لە 1980/9/17 رێكەوتنەكەی هەڵوەشاندەوە.
- لە 1980 بە دواوە بەرە بەرە توشی شەڕی بزوتنەوەی كوردایەتی ئێـران بـۆوە، لـە كۆنگرەی (10) بڕیاریشی لەسەردرا، بەپێی (حـدكا) و (كۆمەڵـە) و (ی.ن.ك) ئـەوا (س.ك) شان بەشانی پاسداران شەڕی كوردستانی ئێران دەكرد.
- لەو فەترە نەیتوانی دەورێكی چالاك ببینێ، تەنها لە ناوچەكانی بادینان نەبێ.
- لە 1988/5/7 لە بارەگای حزبی شیوعی (بەرەی كوردستانی) جاڕدرا.
- لە 1988 لەدوای وەستانی جەنگی عێراقئێران و ئەنفال و كیمیاوی كەوتنەوە دیوی ئێران.
- لەڕاپەڕینی 1991/3/5 هاتنەوە كوردسـتان بـە شـلۆقی لـە چوارچـێوەی بـەرەی كوردستانی.
- هەرچەندە بەدووڵی دەیان ڕوانیە ئەو ڕاپەڕینە، بەڵام تەكان و خۆ دروست كردنیان لە هاتنی سەرۆكی حزبیان بۆ مەیدان ڕاستەوخۆ دەستی پێكـرد، كـادیری عەسـكەری و سیاسی و جەماوەری یەكی وایان نەبوو.
- لە شەڕی كۆڕێ سەرۆكی پارتی خۆی سەرپەرشتیاری هێزەكانی پێشمەرگە بـوو[*]، كـە بـە پلـەی یـەك (ی.ن.ك) لـەوێ بـوو، ئینجـا پـارتی و بزوتنـەوەو دوای ئـەوانیش سۆشیالیست و حزبی شیوعی.
- لە كۆنگرەی (11) كۆمەڵێك كادیری چـالاكی سۆشیالیسـت و پاسـۆك و چـەپی تـر هاتنە ناو پارتی، تەكانیان پێدا لە هەموو بوارەكان.

---

كوردایەتی )ئاماژەی پێ نەكردووەو خۆی لێ لاداوە، تەنها باسێكی فشاری سیا وسافاكی كردووە لـەو بارەیەوە .

[*]لە ل265ی كتێبی (المسیرە)ی كریم ئەحمەد دەڵێ:لە كاتی ئەوشەڕە (كانبی گەورەم) بینـی 60پ م شیوعی لەگەڵ بوو،دوای رسول مەمەندی سۆشیالیستیشم بینی لێم پرسی ئاخۆ چەندی بۆ ئەو هێرشـە پێ ئامادە دەكرێ؟ ووتی80 پ م، چوومە لای كاك مسعود لێم پرسی چەندت پـێ ئامـادە دەكـرێ؟ ووتی ئیستا 12پ م لەگەڵ ماوە ئەگـەر پێیـان بلـێم خۆتـان بـۆ شـەڕئامادە بكـەن ئـەوا بەتـەنها دەمێنمەوە، بەپێی ڕای كریم ئەحمەد كاریگەری حزبەكان لەو شەڕە بەو ڕێژە دێت (..الشیوعی والإتحاد الوطنی والحركة الإسلامیة وسوسیالیست والبارتی فی دربند كوری - المسیرة ص266 )

- له هەڵبژاردنی پەرلەمان و ڕابەری 1992/5/19 دەنگی یەکەمیان هێنا بە ڕێژەی 46.2٪ پەرلەمانی (337879) ڕابەری (466819) لە 48.3٪ بەو شێوەیە(کاك مسعود لە بروسکەکەی بۆ ناوەخۆ دەڵێ ٪51ی دەنگمان هێناوە ئەوە هەڵەیە ئەوە زیادەی ئەو لایەنانەیە کە دەرنەچووینە ) لە لیست (14046) دەنگ زیاتر لە یەکێتی و لە ڕابەریش (25672) دەنگ زیاد، بەجۆرێك پاگندەی سەرەکی پارتی ئۆتۆنۆمی بوو یەکیتیش فیدراڵی .
- یەکێتی بەو ئەنجامە قایل نەبوو .
- حکومەت و پەرلەمانیان بە (50- 50) دروست کرد[1]، بەڵام لەکاری هاوبەشی کادیرانی پارتی زۆر بێتوانا بوون.
- واپیك هاتن سەرۆکی حکومەت یەکێتی بێ(د فوئادمعسوم)،سەروکی پەرلەمانیش پارتی (جوهر نامق ) .
- (ی.ن.ك) بەو دۆخە قایل نەبوو، سەرۆکی حکومەت و وەزیری پێشمەرگەی گۆڕی، (کوسرەت رسول ) و(جبار فرمان)، زیاتر حکومەتێکی عەسکەری دروست کرد.
- له سەرەتای مانگی 1993/12 فشارێکی زۆر خرایە سەر (پ.د.ك) لەلایەن (ی.ن.ك) بەڵام دوایی بووە شەڕی (ی.ن.ك)و (بزووتنەوەی ئیسلامی) لە 1993/12/20.
- له 1994/5/1 خوولی یەکەمی شەڕی (پارتی و یەکێتی) دەستی پێکرد، ئەوجارە (پ.د.ك) بۆ یەکەمجار بەرامبەر یەکێتی توانی بەرگریەکی باش لەخۆی بکا لە هەموو ئەو شوێنانەی کە بزوتنەوەی ئیسلامی لەگەڵ بووە.
- لە مانگی 1994/12 خولی دووەمی براکوژی دەستی پێکردەوە لەلایەن (ی.ن.ك)ەوە، ناویشی (جەنگی نان) بوو، گوایە هۆکەی داهاتی (ئیبراهیم خەلیل)

[1] ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە ئەو بروسکەیەی کە لەلایەن کاك مسعودەوە بۆ ئەندام ولایەنگرانی پارتی لێدراوە لە دوای هەڵبژاردنەکە چەند ئەنجامێکماندەست دەکەوێت،لەوانە:1- پارتی لە هەلبژاردنەکە دەنگی یەکەمی هێناوە بەڵام لەبەر بێ هێزی هەم تەزویرەکانی یەکێتی قبوول کردووە، هەم بەوەش قایل بووە کە ئامارەکان نەخوێندرێنەوە نەوەك خەلکی بۆیان دەرکەوێ یەکێت دۆڕاوە .2- ڕاستە پارتی بردیتیەوە بەڵام نەیزانیە ژمارەکان بە ووردی گوزارش بکا بە ٪51 ی ناوزەدی کردووە .3- پێك هێنانی حکومەت وپەرلەمان بە پێی ئەنجام نەبووە بەڵکو بەتەوافوقی بووە بۆ ماوەی 4 مانگ .لە بروسکەکەش ناڵێ حکومەت دەڵێ (مجلس تنفیذی) 4- دەڵێ بۆیە ئەو بروسکەم نارد چونکە حاکمی سەرپەرشتیاری هەڵبژاردن ژمارەکانی شاردەوە .

بوو، چوار خولی براکوژی لەنێوان (پ.د.ك) و (ی.ن.ك) دروست بوو، هیچیان بەدەستپێشخەری (پ.د.ك) نەبوو.

- لە1995/1/15لەلایەن مام جەلالەوە ئامادەباشی گشتی جاڕدراوداوای لە خەلکی کوردستان کرد چەك هەلگرن لە دژی پارتی وبنەماڵەی بارزانی.
- لە 1995/8/25 لەناکاو (پ.ك.ك)ش هاتە نێو ئەو شەڕە براکوژیە لەدژی (پ.د.ك)، گوایە هۆکەی ئەوەیە هێزەکانی (پ.د.ك) لە ساڵی 1992 بەدواوە لەگەڵ لەشکری تورکیا لە کوردستانی تورکیا شەڕی (پێشمەرگە) دەکا.
- باری (پ.د.ك) زۆر تەنگ بوو، بەتایبەتی ئەوجارە (بزوتنەوەی ئیسلامی) هاوپەیمانی راستەوخۆی نەبوو، ئەوەش یەکێ لە خاڵە لاوازەکانی (پ.د.ك) کە نەیتوانیوە (تا ئەو ساتەی نووسینیش) دۆستێکی ستراتیژی کوردستانی هەمیشەیی هەبێ، بۆیە (ی.ن.ك) خوولی یەکەمی جەنگی وەستان تا بەرەکانی بزووتنەوەو پارتی لێك بێتەوە، چونکە بە نووسین و رێکەوتن نەبوو، لەولایەش (جگە لە بزوتنەوە) زۆربەی حزبە کوردستانیەکانی تر لایەنگیری (ی.ن.ك) بوون. هەموو ئەو بارودۆخ و فشارە سەربازی و سیاسی و دەروونیە پاڵی بە سەرکردایەتی (پ.د.ك) نا پەنا بۆ دەربازێکی ترسناك ببا.
- لەکۆتایی مانگی ئاب 1996 خولی سێیەمی براکوژی زۆر بەسەختی هەڵگیرساوە بەهێرشێکی هەمەلایەنەی (ی.ن.ك) و (پ.ك.ك) و کۆمەڵێك هۆز و تیرەی ناوچەکەو.. باری (پ.د.ك) کەوتە مەترسی و تەنها لە یەك ڕۆژ (17) تیپی (پ.د.ك) ڕوویان گۆڕی و چوونە ڕێز (ی.ن.ك). بەو شێوەیە وەك دەرباز لە 31/ئاب 1996 بەڕەسمی لەلایەن سەرکردایەتی (پ.د.ك) داوای سوپای عێراق لە سەرۆکی عێراقی( صدام حسێن) کرا و هەولێر گیراو دوای بووە هۆی شکستی سەرانسەری (ی.ن.ك) لەکوردستان، سەرکردایەتیان کەوتەوە نێوزەنگ و زەڵێ، هاوپەیمانیەکی حزبە کوردستانیەکان لەدژی (پ.د.ك) دروست بوو، جگە لە (بزوتنەوە) نەبێ.
- لە ووتارەکەیقەڵادزێ (کاك مەسعود) جاڕیدا کە (ی.ن.ك) جارێکی تر نایەتەوە کوردستان بەچەکەوەتەنها وەك هێزێکی سیاسی نەبێ.
- (پ.د.ك) حکومەتێکی دروست کرد بە سەرۆکایەتی د.ڕۆژ نوری، هەریەکە لە (حشع) و (بزوتنەوە) و (یەکگرتوو) بەشدارییان کرد.

- دوای ماوەیەکی کەم هێزەکانی (ی.ن.ك) بە پاڵپشـتی تۆپخانـەی ئێـران هاوپـەیمانی حزبە کوردستانیەکان هێرشیان کردەوە سەر هێزەکانی (پ.د.ك) و چەند جار شکستی و شکستی بەرامبەر کە بە شەڕی (جادەوجادە) ناوزەد بوو، تیایدا لاوازی هـەردوولای سـەربازی دەرکـەوت، لەکۆتاییـدا ئـەو سـنورەی ئێسـتای دووبـەش کوردسـتان لـە (قەندیل- باڵەکایـەتی- کـارۆخ- مـاکۆك- هـەوری- سـەفین- بـاواجی) بـووە سنوری هەردوولا.
- لەهێرشـێکی تـری هاوبەشـی (ی.ن.ك) و (پ.ك.ك) کـرا سـەر (پ.د.ك)،لـەمانگی 1998/10ئەوجارە هانای بردە بەر تورکیا لە ئاسمان و زەمـین ڕژانـە کوردسـتان و هێزەکانی (ی.ن.ك) و (پ.ك.ك) بەزیانێکی زۆرەوە شکستیان پێهێنرا.
- دوای چەند خولێکی دانوستان و ئاشتبوونەوە یەکەم کۆبونەوەی پەرلـەمانی هاوبـەش لە2002/10/4 بەسترا.
- لەدوای دوودڵیەکی دوورودرێژ بەهۆی ڕەچاوی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی بـەعس تـا پێشهێرشـی ئـەمریکا بـۆ سـەر عێـراق لـە 2003/4/17 ئینجـا چـوونە نێـو هاوپەیمانیەتی.
- هەڵوێسـتەکانی سـەرۆکی پـارتی لـەدوای ڕووخـانی بـەعس بەرامبـەر بنـەماکانی کوردایەتی و ئاسایشی نەتەوەیی کورد و کوردستان پارسەنگێکی بـەهێز بـوو، بـەری ئەو هەموو کارە نێگەتیڤانەی گرتەوە.
- لە هەڵبژاردنی 2004/12/31 لیسـتی هاوبـەش لـەنێوان (پ.د.ك) و (ی.ن.ك) دروست بوو لەگەڵ چەند حزبێکی تری کوردستانی، لە ئەنجاما سەرکەوتنێکی باشـیان بۆ کوردیش هێنا.
- وا ڕێکەوتن کە سەرۆکی عێراقی شایستەی مام جەلال بێت و سەرۆکی ئیقلیمیش بـۆ کاك مەسعود.
- لە 2005 /6/14 مسعود بارزانی بووە سەرۆکی هەرێمی کوردستان .
- لە هەڵبـژاردنی 2009/7/25 سـەرۆکی هـەرێم دەنگێکـی زۆری هێنـا نزیکـەی 70٪بوە هۆی ئەوەی شکستەکەی دەنگی پارتیان لە بیر بچێت کە جارێکی تر هاتنە خوار بۆ 29٪.

پەند و ئەزموون:

لەدوای ڕاپەڕین پوختەی پەند و ئـەزموون و سـەرەنجامی واقعـی ئـەو دوو حزبـە لـەو پرسیارکۆدەبیتەوە: بۆچی یەکێتی زاڵ تر بـوو؟ کەچـی پـارتی دەنگـی زیـاتر هێنـا؟ یـان پێچەوانە بۆچی پارتی لە دەنگا زاڵ بو لە واقعدا نزم بوو؟

وەڵامی یەکەم: لە خاڵەبەهێزەکانی:

هۆیەکانی دەنگ هێنـانی پـارتی لـە هەڵبـژاردنی 1992/5/19کۆمەڵێکـە، لـەو خاڵەبەهێزانە، بەو شێوەیەی خوارەوە :

1- ئەو دەنگە زیـاتر درا کەلتووریەکـەی نـەك واقعەکـەی، کـە بـەراوردی مێـژووی هەردوو لایەن، یەکەمیان بە مێژوویەکی پاکتر زانرا.

2- خەڵکی کورد بەگشتی ئارەزووی ڕاستی و نەشاردنەوەو خۆ نـەگۆڕین و ئـەخلاقی سیاسی و هێمنی و باوەش فراوانیە، بەو شێوەیە سەرۆکی پارتی لەو لایەنەگرنگانە چـاکتر متمانەی دروست کرد.

3- دەنگەکانی سەرۆك لە دەنگی حزبەکەی زیاتر بوو بـە (18940) دەنـگ، ئـەو زیادەیە زۆر مانای لێ دەفامرێتەوە، دوایی یاسی دەکەین.

4- دیسان خەڵکی بەگشتی هەر لە بنەچەدا لە دیاردەی (حزبایەتی) بەگومانن بەهۆی ئاینەکەیانەوە، بەڵام لەسەر (مەلا مستەفا بارزانی) ئەو حزبە بە ئەهوەن تر تێگەشتن، لەبەرامبەردا (ی.ن.ك) بە ناتەباو لابەلای ئایین بینرا.

5- ئەگەر تەنها دوو حزب بدیل بن، لەپێشبڕکێ، ئەوا ئاساییە ناڕەزاییەکانی خەڵکی بەرامبەر یەکەم دەبتە بەرهەم بۆ دووەم، پێچەوانەش.

6- خەڵکی سادە کە زۆرینەکەن وا هەست دەکەن یاسا و ڕێگرتنی خراپە لە پارتی دایە کاتێ لە بەراوردی زەق بێ بەرپرسیارەتی لە دووەم دەردەکەوێ. واتە بەکورتی بەشێکی زۆری خاڵە بەهێزەکانی (پ.د.ك) لە قۆناغی نوێدا لە سەلبیاتی (ی.ن.ك)ەوە هاتووە.

7- لەبارەی ناوەخۆش کەمتر مێژووی شەڕی براکوژی و سزای توونـد و شۆڕشگێڕانەی بەرامبەر میللەتی کورد هەڵگرتبوو.

8- سەرۆكی پارتی لەدوای ڕاپەڕین خۆی مەیدانیانە هاتەوە كوردستان و سەرپەرشتی شەڕی بەناوبانگی كۆڕێی كرد،هەرچەندە هەرتەنها خۆشی بوو لەو شەڕە خەڵكی پارتیو بارزانی بەجێیان هێشتبوو[1]، پاشانیش هەر لەمەیدان بووە.

## لە خاڵە بەهێزەكانی تری كەلتووری:

1- هەڵبەتە لە (پ.د.ك)ی كۆنی ئەیلول و دوایش گولان، خاڵەبەهێزەكانی بریتیە لە (سەرۆكی - ملامستەفا) ئەو حزبە، هەروەك بڕیارە یەكلاكەرەوەكانیش لەدەست ئەو بووە.

بەكورتی ئەو سەرۆكە لەخۆبوردوو خۆنەویست بووە، زۆر دڵسۆز بووە بۆ كێشەی كوردستان، كەمتر خوازیاری خۆشگوزەرانی و كۆشك و تەلار و دیمەنی جوان و هەڵپەی پایتەختان، بۆیە دوژمنانی كورد زێدە پەرۆشی لەنێوبردنی بووینە، ئەویش لە بەرامبەردا زیاتر خۆشەویستی میللەت بووە.

3- خۆ دوورخستنەوە لە وردەكاری (تەنفیزی) و تاكتیكاتی حزبی و نێگەتیڤەكانی حزبایەتی عەلمانی و میكاڤیلی و كاریگەریەكانی بەسەر دپلۆماسیەت و بەشەكانی دانوستان و.. زیاتر كارێزمیەكەی پتەوكردبوو.

4- گوتاری سیاسی و هەڵوێستەكانی زیاتر ئاینی بوو، بۆیە لە سیاسەتدا زیاتر چەسپاوی و ڕاستگۆیی و ئەمەكی و... كارێكی زۆری كردبووە سەر بناغەكانی كۆمەڵگەی كوردەواری، كە بە قایمی بەرامبەر پیلانی دوژمنان بوەستێ، هەڵبەتە هەردەم داگیركەر ویستویەتی بناغەكانی ئەخلاقی میللەتی داگیركراو تێك بڕوخێنێ، تا زاڵ بێت بەسەریا، بنەماكانی ئەخلاقی ئەوانەن: ڕاستگۆیی، متمانە، سپاردەیی، هاریكاری، خۆنەویستی، بەرژەوەندی گشتی ویستی، ئەمەكی، پیاوەتی، عەیبە، گوناحە، شەرم، دڵسۆزی، بڕوایی، چەسپاوی... كە لە كۆتاییدا میللەتێكی بەتواناو ئیرادەو بەرگری دەبێ و داگیر ناكرێ، ئەگەرخاكیشی داگیر كرا تاكی داگیر ناكرێ، نیشتمانی داگیردەكرێ بەڵام كۆمەڵگەكە داگیرناكرێ، هەروەك لە نامەكەی (ئەسكەندەر مەكدۆنی) بۆ

---

[1] بڕوانە كتێبی (المسیرەص265)ی كریم ئەحمەدی سكرتێری حشك دەڵێ: كاك مسعود12 كەسی لەگەڵ مابوو پێی ووتم ئەگەر داوایان لێ بكەم بچن بۆ شەڕ ئەوانیش بە جێم دێلن و بەتەنها دەمینێمەوە.

(ئەرستۆ)ی نارد، داوای لێکردبوو چۆن کۆمەڵگەکەش داگیر بکا، وەڵامی دایەوە (فرق تسد)[1]، واتە بناغە ئەخلاقیەکان هەڵوەشێنەوە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزیش داکۆکی کردووە کە (ئیستخفاف) و (پارچەپارچەکردن) دەبتە هۆی مل کەچی.

کەواتە لەژێر سەرکردەی رووحی ڕەنگە خاك و نیشتمانی داگیر بکرێ، بەڵام میللەتەکەی داگیر ناکرێ. کەچی ئێستا بە داڕوخانی ئەو بناغانە و جێگرتنەوەی ئەو بنەما لیبرالی سیکۆلارە کەبالی بەسەر میللەت کێشاوە لە: بێمتمانەیی، مەزەندەی خراپ، بێئەمەکی، خۆویستی، دوودڵی، بەرژەوەندی تایبەتی خستنە سەر گشتی، گوێپێنەدان، بێبڕوایی، ناچەسپاوی، بۆ ئایدۆلۆژی،.. ئەوە لە کۆتاییدا میللەتێکی بێتوانا و عەوام و بێئیرادە و بەرگری لێ دروست دەبێ. جا سەرکردە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێدانی ڕێنمایی و دادگەری و بیروبڕوا و پەروەردە و ئامۆژگاری.. کە لەخۆی و ژیانی ڕۆژانەو مێژووەکەی ڕەونەق بداتەوە، لەسەر ئەو بنچینەیە دەتوانین بڵێین دوژمن توانیبووی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە خاکی کورد داگیر بکات، بەڵام نەیتوانیبوو میللەتی کورد داگیر بکا، هەتا دوای 1975.. ئینجا بەرەبەرە توانی میللەتیش داگیر بکا.. باش ترین بەڵگەش ئەوەیە بۆیەکەم جار لە مێژووی کورد ژمارەی جاش دە یان هێندەبە قەدپێشمەرگە بیت، تا ئەوساتەش نەتوانراوە ئەو زەمینە ترسناکە چارەسەر بکەن.

5- سیرەو هەڵوێست و کردە و گوفتەی ئەو سەرکردەیە زیاتر خۆی بە سەرۆکی میللەت زانیوە نەك حزبێك.

6- بڕیارەکانی یەکلاکەرەوە بوو، نەك هەر بۆ (پ.د.ك) و هێزی پێشمەرگە، هەتا زۆرایەتی ڕەهای میللەتیش پابەند دەبوو بەو بڕیارە، بۆیە هێزی جێبەجێکردنی زۆر خێرا و گورج و گۆڵ بوو لەچاو هێزێکی میلیشیایی، مەودای سەرهەڵدانی فرەناوەند و فرەمیلیشیا و بێسەروبەری نەدەڕەخسا، هەتا میلیشیای حزبی شیوعی عێراقیش ببووە بەشێکی پێکەوە نووساوی هێزی پێشمەرگە بە سەرکردایەتی بارزانی.

---

[1] نامەی ئەسکەندەر: أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، ... وەڵامی ئەرستۆ ..أشير عليك برأى هو أبلغ ، فتتفرّق كلمتهم، ويجتمعوا على الطاعة لك، ولا يؤدّى بعضهم إلى بعض طاعة، ولا يتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم.(لە ج1ی ص23 کتێبی –تجارب الامم–ابن مسكوى)وەرمان گرتوە .

7- ئەو سەرکردەیە وەك سەرکردەکانی تر (شێخ سعید، سەید تەها، عبدالسلام، قازی محمد...) دەیزانی مەینەتی کورد لەکێڕا دروست بووەو لەکێش کۆد بووە، بۆیە پەیوەندیەکی جدی لەگەڵ (مرجعەکانی شیعە) و زانایانی سوننەو زانایانی کوردستان هەبوو، هانی ڕابوونی ئیسلامی دەدا، وادیارە زانیویەتی بەو ڕابوونە دوو ئامانجی کوردی گرنگ دەپێکێ، یەکەمیان بناغەکانی ئەخلاقی میللەت و بەرگریەکەی لە نیشتمان، دووەم ئەو ڕابوونە دەتوانێ دەرگای قوفڵ دراوەکانی سایکس- پیکۆ بکاتەوە کە بەسەر کورد داخرابوون.

8- لە قۆناغی نوێ و دوای ڕاپەڕین کەمتر خاڵی بەهێزی حزب بەدی دەکرێ جگە لە چالاکی تایبەتی سەرۆکەکەی، بەپێچەوانەوە زۆربەی بوون و دیمەنی ئەو حزبە بەهۆی کادیران و بەرپرسانی لە خۆشگوزەرانی و باخچە و کۆشك و تەلار و سامانی زۆر خاڵەبەهێزەکانی هەڵوێستی سەرۆکی ئێستا و مەلامستەفاش لاواز کردووە.

خاڵە بەهێزەکان لە بەراوردا:

1- سەلبیاتی (ی.ن.ك): لە هەڵسوکەوت و سزاکانی چ بە هەق و چ بە ناهەق دەچۆڕێتە ئیجابیاتی بەرامبەر، لەگەڵ ئەو هەموو شەڕی براکوژییەی (ی.ن.ك) لەگەڵ (حسك، پاسۆك، لەشکری ئیسلامی، حزبی شیوعی، پ.ك.ك، بزوتنەوەی ئیسلامی، .. لەگەڵ زۆر وردە حزبی تر و هەتا دژ بە خائینانیش) وای کرد ریزەکانی (پ.د.ك) قەرەباڵغ بێتەوە.

2- هەڵبەتە لەدوای 1976 (پ.د.ك) لەڕاست (ی.ن.ك) کەمتر توانیویەتی بەتەنها بووەستێ، سەردەمێك (حسك)، دوای ئێران، ئینجا ئاشتی، دوای ڕاپەڕینیش بزوتنەوەی ئیسلامی باشترین پارسەنگ بوو بۆی، توانی ئەو قۆناغە سەختە رەت بکا، بە سوودوەرگرتن لە ناتەبایی نێوان (ی.ن.ك) و (بزوتنەوەی ئیسلامی).

3- دیسان لەشەڕە ناوخۆییەکان دەستپێشخەر نەبووە، ڕەچاوی کۆمەڵێك بەرپرسیاریەتی کرد، شەڕ پێفرۆشتنی بووە خاڵی بەهێزی لەزۆر ڕووی سیاسی و عەسکەری و دەروونی.

4- ئەو خاڵانــە و زۆربــەی خاڵــە لاوازەكــانی (ی.ن.ك) و هــەتا لایەنــەكانی تــر بــۆ (پ.د.ك) دەبێتە خاڵی بەهێز، پێچەوانەش بەپێچەوانە، ئەو ڕێســایە بــۆ حزبــە بــەدیل و ناكۆكەكان ڕاستە كە بنەمای چالاكی سیاسی لەسەر ئایدیۆلۆژیا و بیروباوەڕ نەبێ.

خاڵە لاوازەكانی لەو بەراوردەدا:

لە دوو حزبی بەدیل خاڵی لاوازی یەكێكیان بە بەهێزی دووەم دەردەكەوێ، وەك (پڕی و بــەتاڵی) پــەرداخێك دێــت، ئەگــەر وەســفی (پڕ)یەكــە بكــەیت ئــەوا ئۆتۆماتیكیــەن (بەتاڵیەكەشت) پێوا، بۆیە باسی ئەو دوو حزبە پێكەوە ناچاریە.

1- سەركردایەتی پارتی لە شۆڕشی ئەیلول شكستی هێنا، نۆرەی جۆرە ســەركردایەتی یەكی تر هات، هەروەها پشت بەســتنی بــارزانی تــەنها بەبەلینــەكانی ئــەمریكا و شــاه هەڵەیەكی ستراتیجی بوو، بەپێی ئەو سەردەم وكوتایی بــەو ئەزموونــە دیــت بــە هــەموو ڕەهەندەكانیشەوە، بۆیە نۆرەی جۆرە مدرسەیەكی تر و ستراتیژیەكی تر دیتونورەی یەكێتی یە.

2- واباوی وەرگرت كە شۆڕشی نوێ یەكێتی هەڵیگیرساندەوە، بۆیە بارێكی دەروونــی وا دروست بوو هەتا بۆ ئەندامانی پارتیش كە یەكێتیپێشڕەو خاوەن بێت، بۆیە گۆڕەپــانی كوردستان كەمتر لەدەست پارتی بوو.

3- سەركردەو دروست بوونی بڕیار و هــەنگاوەكانی (ی.ن.ك) لــەناو كوردســتان بــوو لەناو جەرگەی ڕووداوەكانیش بوو، كەچی سەركردایەتی پارتی هەتا ڕاپــەڕینیش هــەر لــە ئێران بوو.

4- لە شەڕەكانی نێوان پارتی و یەكێتی ئاشتی و تێكەڵآ بوونەكان كاتێ دەكــرا كــە یەكێتی سەركەوتوو بوو، سروشتیە لــەو دۆخــەدا وورەو بــاری دەروونــی ئەنــدامانی هــەر لایەنێكی تێكشكاو بەرامبەر لایەنە سەركەوتووەكە نزم دەبێت.

5- سەركردەو ئەندام و لایەنگرانی یەكێتی ووشیارتر بوون لە پارتی.

6- لەزۆربەی هەنگاوە سیاسی و ئیداری و فكرییەكانیش یەكێتی داهێنەرانەتر بــوو ئینجا ئەوانی تر لاسایان دەكردەوە لە شاخ و شار هەتاسەدەی نــوی، هــەر لــە كاروبــاری ڕێكخستن و پێشمەرگایەتی تا دەگاتــە ڕۆژنامــەو تەلــەفزیۆن و حكومــەت و پەرلــەمان و شێوازی ئیش كردنەكان و هەڵس و كەوتەكان بە سلبی و ئیجابییەوە.

7- هەڵبەتە حزبایەتی بە ئینتمای ئاسۆی ئایدیۆلۆژیا و فکر و ڕێباز و ئامانج و پەروەردە و گۆڕان دروست بووە، داینەمۆی (کوردایەتی) بەتەنها نوقستانە، پێویستی بە مدرسەی فکری و سیاسی هەیە، لێرەدا پارتی کەمتر توانیبووی ئایدیۆلۆژی و مەدرەسەیەك بکاتە سەرمەشق، کەچی (ی.ن.ك) ئایدیۆلۆژیای مارکسی رادیکالانەی پەیڕەوکردبوو، بۆیە ئەندام و لایەنگر و دەزگاکانی چاپك و چالاك و زیندوو بوو، زیاترگورەپانیان کۆنترۆڵ کرد.

8- قەیرانی بنچینەی (پ.د.ك) لەوە بوو بەدرێژایی مێژوو قەیرانی بێسنووری مەرکەزیەتی و تاکڕایی و دوورەجەماوەری پێ چارە نەکراوە، بوویتە هۆی (زۆری ئینشقاق، کەس خۆ بەخاوەن نەزانێ، دروست نەبوونی کادیر، نەبوونی عەقیدەی بەهێز، سەرەڕای دەردی سۆرانی و بادینی...)، بەو شێوەیە دیارە شاخ و کێو و بوێری شاهێدبوون بۆ (ی.ن.ك)، خەڵکی کلاسیکی کوردایەتیەکەشی شاهید بوون بۆ (پ.د.ك)، لە یەکەما زاڵیەتی عەسکەری و لە دووەمیشا زۆرایەتی دەنگ، جا چارەنووسەکە کەوتە نێوان دەنگ و شاخ، لە هەموو کۆمەڵگەیەکی ناعەیاری (لێرەش بەڕوونی دەرکەوت) ئەوەی کاری زیاتر لەسەر مێژوو و ڕووداوەکانیشە جورئەتە نەك فکر بەتەنها، توندوتیژیەنەك ئاشتی، سەرکردەیە نەك بنکەکانی، کەمایەتیە نەك زۆرایەتی، عەسکەرییە نەك مەدەنی، حزبیە نەك جەماوەر، ڕێکخستنە نەك ڕەمەکی، جولانە نەك وەستان،.. بەڵام بۆ هەڵبژاردن پێوانەکان دەگۆڕێن، جۆرە تەرازوویێك لەو ماوەیەی قۆناغی نوێی کوردستان تا پێش شەڕەکانی ناوخۆ و ساڵی 1993 هاوسەنگەکانی هێزی بەو شێوەیە بوو:

یەکەم: هێزی یەکەم یەکێتی بووە بەڕادەی لە 70٪ بەکاربووە هەر لە هەڵگیرسانی ڕاپەڕینەکانی ساڵی 1982 دوایش 1991 تەنانەت ڕاپەڕینەکانی ناوچەی بادینان چوار ڕۆژ پاش هەموو کوردستان بوو، دواییەکەش لە دروستکردنی حکومەت زیاتر ئەو ڕادەیە دەرکەوت.

دووەم و سێیەم: هێزی دووەم (پارتی)یە بەڕێژەیەکی کەم لە بزوتنەوەی ئیسلامی.

چوارەم و پێنجەم: هێزی سۆشیالیست و شیوعی دێت.

بەڵام ئێستا/ لەدوای هەموو ڕووداوو شەڕی ناوخۆی کورد و کورد و گۆڕانی نەخشەی عەسکەری و سیاسی و ئیداری و فکریش ( کە لە دەرفەتێکی تر باسی دەکەین) تا 2000 گۆڕا بەو شێوەیە:

پارتی هێزی یەکەمە لەڕووی یاسایی و جەماوەری و عەسکەریش، تاکە هێزە هەم سوودی هەرەگەورەی لە شەڕی بزووتنەوەو یەکێتی بۆ هات، هەم سودیشی لە تێکڕای شەڕی براکوژی بینی، ئەگەرچی ئەویش لایەنی دەست پێشخەری خولەکانی شەڕی براکوژی نەبووە لەگەڵ (ی.ن.ك)، بەڵام لەدوای ئەو مێژووەو بەتایبەتی لەدوای ڕووخانی بەعس ئەو گەشەو تینەی وەستاو جارێکی تر خاڵە لاوازەکانی دەرکەوتەوە.

خاڵەلاوازە نوێیەکانی:

1- هەندێ خاڵی لاوازی کۆنی ئەیلول ماوەتەوە نەتوانراوە چارەسەر بکرێ، لەوانە:

أ/ سەرکردایەتیەکی وەك بارزانی بەهۆی ژێرخانی مەعریفی و کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکان کەمتر گوێڕایەڵی ڕاوێژ و نەخشە و پلان و موئەسەساتی بوو، نایەتە نێو قاوغی بڕیارەکانی زۆرایەتی و یاسای حزبیانە، ئەوەش لە ئاستەکانی جیهانی و ئیقلیمی کاریگەری قووڵی دەبێ بەنێگەتیڤ، جار وایە دەکەویە داوی ستراتیژی دوژمنیش بێ ویستی خۆت، هەروەك ئەزموونی تاك کارتی شاهی ڕوویدا لە 1975.

ب/ ئەو لایەنانەی لە ئایدیۆلۆژیا ئاسۆییەکان لاوازن ئەوا بەخێرایی کۆمەڵێك ڤاکتەری ستونی کۆمەڵایەتی دەبتە پەیوەندی حزبایەتی، ئەوەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی تاقم تاقمی جیای کۆمەڵایەتی، لەو نێوە بادینی و سۆرانی دیسان سەری هەڵدایتەوەو قەیران و خاڵێکی لاوازە.

ج/ ئینجا لەسەر هەمان تراز سێ دەسەڵات لەو سەردەمە بە تەریبی حوکم دەکا، هەر لە دەسەڵاتی باڵا تا وورده دەسەڵاتەکانی ئیداریش، یەکەم: دەسەڵاتی بنەماڵەیی، دووەم: دەسەڵاتی حزبی، سێیەم: دەسەڵاتی حکومی.. ئەوەش تەواو پێچەوانەی بانگێشەی کۆمەڵگەی مەدەنی و سەروەری یاسا و ڕای گشتی و ئەزموونەکانی سەردەم و خاڵێکی لاوازە و کۆمەڵێك سەرەنجامی نێگەتیڤی هەیە کە لە کۆتاییدا بارقورسیە لەسەر هاوولاتی.

2- پاشەکشەی بیروباوەڕی حزبی و کوردایەتی دیاردەی ئاغایەتی و ئاغایەتی نـوێ و چینایەتی دروست کردووە، ئیمتیاز بۆ دەسەڵاتە کۆمەڵایەتیەکان و پێدانی ڤیتۆی یاسـایی و.. سـەرهەڵدانی دیـاردە دزێوەکـانی گەنـدەڵی ئیـداری و بـەرتیل و خۆویسـتی و..، بەکارهێنانی دەسـەڵاتی حزبـی و حکـومی و بنـەمای کوردایـەتی لـەپێناو بەرژەوەنـدی تایبەتی پاڵنەری بنچینەی کاری حزبی دەبێ.

3- هەندێ گۆتە هەیە لەنێو خـەڵك بـڵاوەو کاریگەریـەکی سـامناکیش لەسـەر ڕای گشتی هەیە، جا ڕاست بێ یان پڕوپاگەندەی ناحەز، ئەو ڕەخنە هەمیشـەیە لـە (پ.د.ك) هەبوو گوایە لەنێو (پ.د.ك) خەڵکی بەدەر لە بنەماڵەی بـارزانی دەسـەڵاتی بنچـینەییان نیە، هەر مووچەخۆرن و بەس، بەپێی هەندێ سەرنج ڕاستی ئەو گۆتانە پتەو دەبێ، لەوانە لە باسی شەهیدانیان تـەنها نـاوی مـەلا مسـتەفا و ئیـدریس بـارزانی دێـت، لـە وێنـە هەڵواسینیش تەنها وێنەی (مەلا مستەفا، کاك ئیدریس، کاك مەسعود، کاك نێچیر، کاك مەسرور) هەڵدەواسرێ!

4- هەندێ سەرکردە هەیە کە لـە خانـەی کـاریزمی و ڕووحیـدا بـێ، ئـەوا هەڵـەی سادەش کاریگەری ئاڵۆزی هەیە، لەبەر ئەوەی کاك مەسعود بەڕاسـتگۆیی و چەسـپاوی و کەم دوو بەناو بانگە، ئەوا هەندێ ئاخافتنی بە نەگەتیڤ دەگەڕێتەوە و ڕێخۆش دەکا بـۆ ڕەوشەنبیری عەوام بەخێرایی بڵێ (هەموو وەك یەکن) دوو لەو ئاخافتنانە:

أ/ بـەڵێنی کـاك مەسـعود بـۆ بنبڕکردنـی گەنـدەڵی ئیـداری و خۆویسـت و گیرفـان پڕکردووەکانی نێو (پ.د.ك) و حکومەتی هەرێم، دوایش لێی پاشـگەز بـۆوە، تـا ئیسـتا جارئەو بەلینەی داوەو جێ بەجێ نەکراوە .(5)

ب/ لە ووتاری زاخۆی جاڕیدا کە دەستی لەنێو دەستی سەرانی براکـوژی (ئامـاژە بـە مـام جـەلال بـوو) نـانێم، واتـە مەحاڵـە ئاشـت بوونـەوە، کەچـی لـە دانیشتنەکانیدیەکخسـتنەوەی پەرلـەمان لـەمانگی 2002/10ی دوکـانووتی: ئەگـەر دادگایەکی عادیلانە هەبێ بۆ براکـوژی، ئـەوا مـن و مـام جـەلال بێتـاوان تـرین کـەس دەردەچین!!.

5- ئەو حزبە لە هاوپەیمانیەتی ناوەخۆیـدا بـەهۆی بیرۆکراسـیەکەی بـەردەوام نابـێ، ئەزمونەکانی کۆنی لەگەڵ (حزبی شیوعی) دوای دیسان لـە 1980 - 1985 حسـك و حزبـی شـیوعی لـە (جـود)دا، دواتـریش لـە 1993 - 1998 لەگـەڵ بزووتنـەوەی

ئیسلامی.. خۆ ئەگەر هاوپەیمانیەکەی توندوتۆڵی لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی بەردەوام بوایە، پێویستی بەوە نەدەکرد هێزی عێراقی و تورکی بهێنێ بۆ دەرباز لە شەڕی براکوژی کە بووە خاڵی ڕەش لەمێژووی ئەو حزبە.

6- لەسەرەتای سەرهەڵدانی ناکۆکی لەگەڵ مەلا مستەفا بەوە بەسەر مەکتەبی سیاسی پارتی زاڵ بوو ئەوان پابەند بوون بەڕێبازێکی عەلمانی توند، کەچی بارزانی بە ئاینی، دوای پارتی لە 1979 بە بێ زانیاری دووبارە ڕووی لە مارکسیەت کردەوە وئەوناسنامەی لە خۆ داماڵیەوەو لاواز بۆوە لە بەرامبەر یەکێتی، واپێدەچی ئەو هەنگاوەیان زۆر بێ دیراسەت بووبێ چونکە لەو کاتی کە بەرەو مارکسیەت وەرچەرخان لە جیهان دا مارکسیەت ڕووبە ڕووی قەیرانی سەختی زانستی وئابووری و شارستانی وئاینی ..ببوونەوە، لە ئەوروپای ڕۆژهەلات خودی چینی کرێکاریش لە دژی مارکسیەت هەلسابوون، لەدوای هاتنەوەی پارتی بۆ ناو جەماوەری شار لە 1991 دیسان توانیان ناسنامەی مل ملانێی ئەوان ئاینی ویەکێتیو لایەنەکانی تر عەلمانی وەرگرنەوەو سەرکەوتووبن، بەڵام دیسان لەدوای 2000و سەدەی نوێ لەو بنەمایەی بەستنەوەی ئاین بە کوردایەتیەوەی دوورکەوتەوەو دووبارە قەیرانەکانیش ڕووی لە پارتی کرد هەروەك ڕووی لە یەکێتیکردبوو،بەو شێوەیە ئەو سیستەمە تەوافوقیە دیاریشە درێژەی کێشاوەو کوردستانیش زیاتر لە قەیران ئالاٌوە .

7- لە بنەچەدا (پ.د.ك) و مەلا مەستەفا یەك نەبووینە، حزبەکە زیاتر پێویستی بەو سەرکردە جەماوەریە هەبووە، حزبێکی نیمچە عەلمانی لەژێر ئەو سەرکردەیەو چەتری کێشەی کورد نەبوایە بەو ئەنجامە فراوانە نەدەگەیشت، ئەوەش ئەزموونی زۆربەی حزبە عەلمانیەکانی کوردستانە، کە هەر زانایەکی ئایینیان کردۆتە پێشەنگ، شێخ سەعید و شێخ عبدالقادر بۆ (حزبی ئیتحاد الترقی کوردی)، (پ.د.ك) و قازی محمد، (پ.د.ك) و مەلا مستەفا، کۆمەڵەی ئێران و شێخ عزالدین حسێنی،.. تا ئێستاش زۆربەی حزبە کوردستانیەکان یەکیەتیەکی زانایانی ئایینی تایبەتیان هەیە بۆ هەمان مەبەست.. جا زۆربەی کارە نێگەتیڤە سیاسیەکانی حزبەکە بەهۆی متمانەی ئەو سەرکردە ئاینیە دادەپۆشرا، لەو ئەزمونەش مەلا مستەفا و (پ.د.ك) دوو دنیای لێك جیابووینە، لە یەکەمیان بنەمای ئەخلاقی سیاسی و لە دووەمیشیان بنەمای میکاڤیلی سیاسی،هەر بە ناتەبایش هاتوون، هەر بۆیەش لە قۆناغی نوێی (پ.د.ك) ئەو دەنگ و جەماوەریەی

زیاتر بۆ مەلا مستەفا دەگەڕێتەوە، ئەویش لەسەروەریە ئاینی و بەرگرییەکانی وەرگرتووە, کەچی گەلێ جاربە تایبەتی ئیستالەنێو ئەو حزبە ویستویانە (ئینتحاریانە) ئەو دوو کەلتوورەی (قۆناغی نوێی کە بە شۆڕشی گولان و بەدوای ڕاپەڕین) بەناوبانگە بە کەلتوری (ئەیلول و مەلا مستەفا) بپچڕێنن، وەك قرتاندنی وشەی (مەلا) و هێشتنەوەی تەنها (مستەفا بارزانی)، یان (تصدیق کردنی) هەندێ پڕوپاگەندە بەدوای ئەو سەرکردەیە[1].. ئەو تەقەلایە فراوانە لەنێو ئەو حزبەو فرە ئاراستەشە بۆیە ئێستا دوو کەلتوری لێك جیایە.

بۆ زیاتر سەرنج بدە ئەو لیستە جیاوازیەی نێوان هەردوو شۆڕشی ئەیلول و گولان، یان جوانتر بلێین کەلتور و فەرهەنگی مەلا مستەفا وشاخ و سەردەمی ئێستای بەرپرسانی (پ.د.ك) لە سالی 2007.

| **شۆڕشی ئەیلول 1961- 1975** | **باری ئێستای (پ.د.ك)- لەدوای1996** |
|---|---|
| 1- سەرۆکی هەموو کوردستان بوو، نزیکەی 90٪ی میللەتی لەگەڵ بوو. | 1- سەرۆکی ئێستا تەنها سەرۆکی حزبەکەیە، دەنگی حزبەکەش ئیستالە29٪. |
| 2- سەرکردەیەکی ئاینی بوو، قەدەغە و (بکە و مەکە)ی بەو تەرازووە بوو. | 2- سەرکردەیەکە قایلە بەبنەمای عەلمانی وەك تەرازوو بۆ بڕیار و قەدەغە و هەڵوێستەکانی دادەڕێژێ. |
| 3- لەگەرمەی مارکسیەت و ژیانیشی لە سۆڤیەت هەر چەسپاو بوو لەسەر قەناعەت و بڕواکانی خۆی. | 3- لە کۆنگرەی (9)ی (پ.د.ك) بەتەواوی جاری مارکسیانەی خۆیان دا لە بەندەکانی (5) و (6). |
| 4- لەبەر دەرگای دوژمن نەبوو، سەودای لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی نەدەکرد. | 4- ئەو هێڵە بەزێندراو جاریش وایە تاڕادەی پێچەوانە. |
| 5- میللەت یەك ڕێز و یەك مەبەست بوو، | |

---

[1] بەوردی سەرنج بدە کتێبی (پشکۆ نجم الدین)کە لە گولانی سەر بە (پ د ك) دەرچوو چۆن لابەلا تەسدیقی بۆچوونی کتیبەکانی مێژوونوسانی گەورەی کوردی وەك:نەوشیرەوان مستەفا و جرجیس فتح الله.. دەکا گوایە بارزانی مەشروبی خواردۆتەوە .

| | |
|---|---|
| جیاوازی حزبی و ناحزبی نەبوو. | 5- میللەت پەرتەوازەو پارچەپارچەیەو فرەمەبەست و جیاوازیەکی زۆری حزبی و هاووڵاتی هەیە. |
| 6- سەرکردەو پێشمەرگە و حزب لە خزمەتی میللەت بوون. | 6- میللەت کراوە خزمەتکاری حزبی و بەرپرس. |
| 7- دیاردەی ڕاستگۆیی و متمانە و دەست و داوێن پاکی و دڵسۆزی و ئەمەك و سپاردەیی و خۆنەویستی و پەروەردەیی و ئازایەتی و بەرگری نیشتمانی. لەنێوسەرکردەو پێشمەرگەو حزب و میللەت باڵی کێشابوو | 7- دیاردەی دەست پیسی، بێمتمانەیی، خۆویستی، گوێ پێنەدان، نەساغی، قۆپیە، بێئینتمایی، شلۆقی نیشتمان پەروەری، بێ وورەیی و بەرگری،.. تەنیتەوە. |
| 8- ئەندامی حزبی و پێشمەرگە هەتا دوای ڕاپەڕینیش بریتی بوو لە کەسێتیەکی بەڕێزی کاریگەر و بەرژەوەندی گشتی خستبووە سەرووی بەرژەوەندی تایبەتی. | 8- ئەندامی ئێستا بریتیە لە کەسێتیەکی لەرزۆك هەردەم بەرژەوەندی تایبەتی خستۆتە سەرووی گشتی، سەرپێچ و یاساشکێنە. |
| 9- پابەند بوون بە فەرمانی سەرۆك. | 9- پابەندە بە فەرمانی مادە. |
| 10- بەرپرسی مانای بوونی لە بەرەی پێشەوە و دڵسۆزی و خۆشەویستی و بێ ماڵ و سامان و سادە.. | 10- بەرپرسی مانای دەوڵەمەندی و خاوەن کۆشك و تەلار و باخچە و کۆمپانیا و.. مانای لەسەرووی میللەت و یاسا و خاوەن ڤیتۆ... خۆبەزلزانی. |
| 11- پاڵنەر بۆ بوون بە پێشمەرگەو حزبی خزمەت و کوردایەتی و خۆشەویستی سەرۆك بوو.. خۆبەخش بوو لەوەوە ناوی (پێشمەرگە) هات. | 11- پاڵنەری بنچینەیی مادەو سەرپێچی و خۆدەرخستن و یان لەپێناو هێنانەدی مەرامێکی تایبەتی،دوورە لەمانای پێش مەرگە . |
| 12- ئەندام و پێشمەرگەی بە بیروباوەڕ و وشیار بوون. | 12- ناووشیاری وبێبیروباوەڕ، چەکی بێبیروباوەڕ سێدارەی جەماوەرە (لە دروشمەکانی کۆن). |
| 13-لە سەردەمی مەلا مستەفا لە نێو | 13-لەسەردەمی مسعود بارزانی باسی پارەو مۆنیکاو ڤێلاوشتی تربوو. |

| | ئەندامانی پارتی باس باسی کوردایەتی وبەرگری و خۆنەویستی ودادگەری بوو .. |
|---|---|

ئەوەش کۆمەڵێك خاڵی لاواز دەردەخا و بەرەبەرە ئەو زەخیرە زۆرەیمتمانـەی بـارزانی بێ پڕکردنەوەی دەخورێ و لە کۆتاییدا زەمەن لـە قـازانجی نابـێ، ئینجـا دەبـێ بـەدوای ڤاکتەری دەسەڵات و مادە بێ تا لە قـوڕگی ئەنـدام و لایـەنگرانی بکـا، ئـەوەش دەردی بێچارەی هەموو خاڵی لاوازەکانە و زەنگێکی ترسناکە. بۆیەش وابەرەبـەرە دەنگـی کـەم دەکا،لە یەکەم هەلبژاردنی 1992 هەرچەندە پارتی چەوساوەش بوو بە دەستی یـەکێتی و تەزویری دژ بە پـارتی کـرد کەچـی لـە51%ی دەنگـەکان هێنا،لـە هەلبـژاردنی دوەم دەنگەکانی هاتە خوار بۆ 41%،لەسـێەم بـۆ 36%،لـە دوا هەلبـژاردن2009/7/25 لەگەڵ تەزویرو سەرف کردنی پارەیەکی زۆرئینجا تەنها 29%ی بەدەست هێنا.

**پارتی بەرەو ڕێبازی بارزانیە یاخود پێچەوانە؟**

بارزانی مێژووەکی پر لەسەروەری نیشتمانی ودادگـەری هـەبووە، سـەرکردەیەکی خـۆ نەویست بووە،لە ژیانیکی سـادەبووە، شـارەزای نێـو دەوڵـەتیش بـووە، زۆر وەسـفی بـە خێلەکی وبێ زانیاری وتاك رەوی کـراوە لـە لایـەن تـەیاری عەلمانیـەتی کـوردەوە، بـەڵام بەراوردی ئەزموونەکان سەلماندوویەتی لەدوای خۆی سەرکردەیەکی تر وەك ئەو دلسۆزو بە راویژ ومیللی نەهاتووە،تائەویش مابوو توانیبووی کوردایـەتی وئـاین پێـك وەببەسـتەوەو بۆیە توانیبووی یەکێتی کوردستانی بپاریزی کە ئیسـتا لەباریـەك هەلوەشـایتەوە، دیـارە بـەوووردیش زانیبـووی دۆسـت ودوژمــن کێنــە،زانیبووی دەروازەی رزگـاری کوردسـتان لەچوارچیوەی سایکس- پیکۆ وعەلمانیەت نایەتەدی، بۆیە ئەو زیاتر لەتەقەلای پەیوەنـدی لەگەڵهێزە ئاینەکان بووە کە لەو سەردەمی لاوازیش بووینە، کەمتر ئومێدی بە عەلمانیەت هەبووە، بۆیە هەرداوای بە ئیسلامی کردنی شۆرشی کوردی کردووەو لـەدژی بـە عـەلمانی کردن بووە، تائەو رادە ووتویەتی :((أفضل ان اکون جندیافیدولـة اسـلامیة علـى ان اکـون رئیسـا فـی دولـة علمانیـة))[1]ئـەو ریبـازەی کـەمتر لـە لایـەن پـارتی وهـەتا لایەنـە ئیسلامیەکانی کوردستانیش ڕەچاو کراوە .

لە پەنابەریش بۆ ڕووسیا سکرتێری حشعی ئازەربێجان تەقەلای داوە بـیری شـیوعیەتی بەسەردا بچەسپێنێ بەڵام بێ سود بوە ،بۆیەش لە نامەیەکی ئەو سـکرتێرە بـۆ سـکرتێری

[1]بروانە :معضلة کوردستان والبدیل الامثل ص65

گشتی حشعی سۆڤیەت دەلێ بارزانی زەرەری هەیە لێرەو لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ زاناوئیسلام پەروەرەکانی ناوچەکە دەکا .

هەرچەندە بارزانی رێبازی فکری نەبووە ئەوەندە موفەکیریش نەبووە با بوختانی پێ نەکرێ، بەڵامریبازەکەی جیابووە لەگەڵ پارتی وهەرحزبایەتیەکی‌تر، لەراستیدا بارزانی لەگەڵ حزبایەتی –بەتایبەتی جۆری عەلمانی میکافیلی نەگونجاوە،بۆیە کیشەی لەگەڵ خودی پارتیش هەبووە، هەروەکوئەو ناکوکیانە ناوی نراوە ناکوکی بالی(م س)و بارزانی یان جەلالی ومەلایی.. وئیتر لایەنە عەلمانیەکانی کوردستان وناوچەکە بەچەپی ولیبرالی سوشیالیستی و ....لەگەڵیدانەبووینەو هەر بە رەجعی و کۆنە پەرستیان لە قەلەم داوە، لەبارەی بێ ئومێدی مەلامستەفا لەو مەسئولانە وتوویەتی (حکومەتی عێراق بێ ئەقلە، ئێمە داوای حوکمی زاتی دەکەین کەچی ئەوان دەستی بەدەستیمان پێ دەکەن، ئەگەر ئەقلیان هەبێ سەربەخۆیی تەواومان پێ دەدەن ئینجا بزانە دوای شەش مانگ لێپرسراوانی کورد چی بەسەر ئەو میللەتە[1] دەهێنن) ئاوا لە حزبایەتی ئەوانە بێ ئومێد بووە، زۆر بەزەحمەت لەسیرەی بارزانی لیدوانەکت دەست دەکەوی بەناوی پارتی ئاخافتبێ[2]،یان ووتبی من پارتیم،لەنامەیەکی تری سالی15/کانونی دوەم/ 1966 کەلە بەڵگەنامەکانی بەریتانی دۆزراوەتەوە بۆ هارولد ویلسنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیای ناردووەبە ناوی سەرۆکی ئەنجومەنی شۆرشی کوردستانی عێراق نوسیە نەك پارتی [3] ،راستیەکەی ئەوەیە ئەو ناکوکیە تالانەی سەریان هەڵداو بەشێك بووە لەمێژووی ململانێی عەلمانی وئاینی بۆ زال بوون بەسەر کوردایەتی، رەنگە راستیش بووبی کە لە سەرەتای شورشی ئەیلول پارتی لایەنگیری ئەو شورشەی نەکردووە، هەنگاوەکانی پارتی پێچەوانەی خواستی بارزانی بووە[4]، دوای بەشداریشیان زیاتر بۆ ئەوە بووە لە پەنای ئەو

---

[1] شەوکەت ئەمەلائیسماعیل – رۆژانی لەمێژووی شۆرشی ئەیلول ل5

[2] لە ناو هەمووئەو نامە دیکۆمینتانەی کە لە کۆتایی کتێبەکانی مسعود بارزانی تۆمار کراوە لە دووشوێن نامەی بەناوی پارتی نووسیوە: یەکەمیان نامەکەی1971/11/26 بۆ ئەحمەدحسن بکر،دووەمیان :نامەکەی 1972/4/8ی بۆئەلیکسی کۆسیجنی سەرەك وەزیرانی سۆڤیەتی ئەوسا، بەڵام لە هەردوونامە زۆر بە روونی دەردەکەوێ کە کۆمیتەی ناوەندی نووسیویانەو (بۆ وەڵامی هاوتای حزبی ) تەنها ئەو واژووی لەسەر کردووە .

[3] بروانە کوردو کوردستان لە بەلگە نامە نهێنیەکانی بەریتانی ل484- 485.

[4] هەروەك لەو دیکۆمنتەی خوارەوەش دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە مەکتەب سیاسی وکۆمیتەی ناوەندی بێ پرسی بارزانی بەرنامەی پارتیان داناوە:

خۆ دروست بکەن و دوای وەدەرینێن، ئەو تەقەلایە بەردەوام بووەو ناکوکی وجەنگی برا کوژیشی لیێ پەیدا بووە، جاریش وابووە بەرەسمی بارزانیان لە وحزبە دەرکردووە، لەدوایدا تەقەلاکانیان سەرکەوتوونەبووە چ بە فێل لیێ کردن و(ئیحتوا) چ بەدەرکردنی چ بەئینشقاق ....تائەو مابوو، لەبەر هۆیەکی زور سادە ئەویش ئەوەیە تێکڕای میللەتی کورد متمانەیەکی بێ سنوریان بەو سەرکردەیە هەبووە و هیچ پرو پاگندەیەك کاری لی نەکردووە، زۆربەیجار لەتەنگانەکان خودی سەرکردایەتی (پ د ك) یش بارزانیان بەجێ دەهێشت، لەشکستەکەی 1975 دیسان پارتی بە سکرتێرو کۆمیتەی سەرکردایەتی بارزانیان بەجێهێشت یان تەسلیمی حکومەتی عێراق بوونەوە یان جیابوونەوەو بەشێکیان بەوەش نەوەستان کەوتنە پیلان خەریك بوو مسعودبارزانی لە ئەوروپا تیرۆر بکەن،، کەچی بەدەیان هەزار لەخەلکی کوردستانی (نا حزبی) بەگەر بارزانی کەوتن ورۆیشتن بۆ دیوی ئێران، لە کێشەکەی( 1966 )یش بەڕاستی پارتی ڕاستەقینە لێی جودا بۆوە بۆیە خەلکی کوردستان بە شانازیەوە دەیان گۆت ئێمە مەلایین نەیان دەگۆت پارتین، ..بەلاّم ئێستا لەدوای خۆی بزوتنەوەی کوردایەتی و (پ د ك )بەرەبەرە بەرەو ریبازی عەلمانی و ئەنتی بارزانی دەڕوا، ئەو هەنگاوە وێچووی سەرەنجامی قۆناغی نەخۆشی دەولّەتی

---

السفارة البريطانية- بغداد29 شباط، 1960 رقم:10114/8/60

رسالة من السير ايج .تريفاليان

عزيزي جورج... قام ملا مصطفى البارزاني برد زيارتي حيث زارني في السفارة هنا .وتبين الامور التالية من الحديث الذي دار بيننا :

أ- يبدو ان البارزانيين قلقين جدا من تصرفات الجماعة المجرمة التي اشاروا اليها في لقاءنا الاخير وطالبوا الحكومة بأبعادهم من بارزان وأعطائهم اراضي جديدة في سليمانية اذا امكن ولكن قاسم يرفض هذه الطلب. لم يستجيب وزير الداخلية العراقي للشكاوي المقدمة من البارزانيين في مناسبات العديدة لمعاقبة وملاحقة الجناة.

كما لم يوافق الوزير المذكور على قيام البارزانيين بأخذ المبادرة بأنفسهم وأخذ الانتقام من القتلة. وهذا يؤكد ماسمعته من السفير اليوغسلافي في بغداد بكون البارزانيين حاليا في موقف الضعف.

1. يقول البارزاني أنه يفهم التأييد الحالي الموجود للشيوعية بين الكرد على ضوء ما حدث في السنين الأخيرة، وكما بين لي في اللقاء الاخير، بأن لمصطفى بارزاني شخصيا اراء مماثلة لرأي حول الشيوعية. ( وبما أنه جاء لوحده فأستغلت الفرصة بأن اكون هذه المرة أكثر صراحة معه في الحديث في المسائل التي ناقشناه في المرة السابقة. وتبين لي أنه غير مسؤول من النظام الداخلي الحالي للحزب الديمقراطي الكردستاني الذي تم تحديده من قبل اللجنة المركزية. وقال بأن الحزب سيضع نظاما داخليا جديدا سيرضي بريطانية. ولكنني سأرى موقفه الحقيقي من هذه المسألة من خلال افعاله في الفترة القادمة.

ب- ان ملا مصطفى البارزانيصادق في ولائه للحكومة العراقية ولشخص عبدالكريم قاسم.

عوسمـــانیو ســـەرهەلدانی (تورکیـــای لاوەلـــە1865)، هەڵبەتـــە لـــەوێش کومـــەلێك سیاسەتمەداری میکافیلی –سیکولاررووبەروو دژی سولتان وەستان و سەرکەوتوو نـەبوون، ئەو جارە خۆیان خزاندە ناوجەرگەی دەسەڵاتی عوسمانی و بەرێگەی شـەکراوەکە ئینقلابـی 1908یـان ئـەنجام دا، چـونکە دەوڵـەتی عوسمـانی لەقـەیران وگەنـدەلی دا بـوو ئـیتر هەریەکێکیان لە ئەوروپا دەهاتەوە دووکتێبی ڤولتێر و روسۆی دەهێناوە وەك ئێستا ئاسـا خۆی لێدەکردنە ماموستاو پایەی بەرزیان پێ دەدا تاپلەی (صـدر ئەلئەعزەم)چـوون، لـە ژێرەوەش سولڵتان مراد- پێش بوونی بە سولڵتان ببوە دالّدەدەری ئـەو رەوشـەنبیرانەی وەك مدحت باشا و نامق کمال پاشا و دوای ئەنوەر وجمال ..تاگەیشتە ئەتاتورك و بە یەکجاری دەسەڵات لە بنە مالەی عوسمانی ستاندرایەوە بەو ئینقلابە، وا ئیستاش رووکـاری پـارتی بە هەمان ئارستەیە، عەلمانی و رەوشەنبیرانێکی لائیك کە راسـتەوخو نـەیانتوانی زال بـن بەسەر ریبازی بـارزانی ئـەوا کۆمـەلّێك* لەوانـە زوربلیمەتانـە خزاونـە دەزگـای گـرنگ وگەیشتوونە سەرکردایەتی و وەزارەت ودەزگا راگەیاندنـەکان، ئـیتر زۆر روونـە کـونترۆلی پارتی وکوردایەتیان کردووە دوورلـە رێبـازی بـارزانی، بـەڵکو بـە پیچەوانەشـی وەك لـە خشتەکەی جیاوازی سەروو دیاریمان کرد،بۆیە ئیستا ئەوانەی پارتی دلسۆزن لەژێر بیـانۆی جیاجیا بەرەو پەراوێز کردنن .

**بوختانی پتەوی داگیرکەران و وەلامی لەرزۆکی کورد**
**<u>کوردایەتی وسەرکردە مێژوویەکان</u>**

لەلای (عەلمانی کورد هەندێ ئیسلامی) بە نەزانی ولەلای داگیرکەران بە زانینەوە هەولەکی هەماهەنگی سەرسورهێنەر هەیە بۆ ناشرین کردنی سەرکردە مێژووییەکانمان هەر لە سەلاحەدینەوە تا مەلامستەفا،لەکاتیکا میللەتانی تر سەروەری بۆ سەرکردە خائینەکانیشیان دروست دەکەن، شریفحسین بن علی بە پێی تەرازووی نیشتمانی وئاینی گەورەترین خیانەتی کردوە بە هەلگیرساندنی بزوتنەوەی چەکداری 1916ه لایەنگیری کردنی ئینگلیز و ستاندنەوەی شام وفلستین لە هێزی عوسمانی ورادەستی ئیسرائیل کرا لە

*ئەوانە پێك هاتوون لە چەپە توند رەوەکانی نێو حزبەکوردستانیەکان، هەندێك لەوانەی لەکاتی خـۆی لە بارزانی جیاببوونەوە لەتەنگانەکان ودوای ئەوەی پـارتی بـەهێز بـۆوە ئینجـا گەرانـەوە، بەشـێکی بەعسیشی تیایە .

کۆتایی ..کەچی لە مێژووی عربی ئەو بزوتنەوەیە بە (الثورة العربیة الکبری) تۆمارکراوە،لەولایەش سەرکردەکانی مێژووی کورد بەپاکیان کردوەو دەیانەوێ بیان دەنە پال ئیستعمارو زایۆنی وسافاك و..هتد.

هەول دەدەین ڕاستی وناڕاست،بوختان و دۆغری لەو هەموو گۆتە ناکۆکانەی ناحەزانی کورد سەبارەت بە مەلا مستەفاو بزوتنەوەی کورد یەکلا بکەینەوە ،بەئۆتۆماتیکی دەبێتە پاکانەی باقی سەرکردەکانمان،لەلایەك دەلێن مەلا مستەفا سەر بە(کەی جی بی)سۆڤیەتی بوەو ئەوان شۆڕشیان پێ دروست کردوە،لەلایەکی تر بۆ ئەمریکاو ئیسرائیل وئینجا ئێران و..تەنانەت میسریش...هەمووشی بەڵگەنامەی بۆ هۆنرایتەوە،لەوەوە گومان لە زانستی بەڵگەنامەش دەکرێ دەبێ لێی ووریا بین ،بە پێی چەند بەڵگەنامەیەك هەندێ مامۆستای ئاینی دهۆك پێش ئەوەی بچێتە سۆڤیەت بینیویانە بەدەستیکی قورئان وبەدەستەکەی تری فەرمودە بوەو ووتویەتی وەرن پەیڕەوی بکەین،دەلێ لەدوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەت باسی ئاینی لانەمابووگۆڕابوو بەرەو شیوعیەت، لە بەڵگەنامە ئەمریکی ورۆژئاواییەکان ئەو گومانە پشت ڕاست دەکاتەوە، لە بەڵگەنامەیەکی بریتانی ژ:63/229/10114 لە بالوێزخانەی بەریتانیاوە بۆ وەزارەتی دەرەوە لە سالی 1963باس لەوە دەکا کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا(مستەر دالاس) پێی وایە بارزانی دالدەدەری شیوعیەو نزیکە لە سۆڤیەت ، تەنانەت لە هەندێ سەرچاوەی ڕۆژئاواوبەڵگەنامە(fo371-170428بەریتانی بە نمونە)بارزانیان بە (مەلای سوور–Red mulla)[1]ناوزەد کردوە، جەنرال پاڤیل سودوپلاتۆڤ لە یاداشتەکانی خۆی دەلێ ملا مستەفا سەر بە (کەی جی پی) سۆڤیەتی بوو، ناوی نهینی (رئیس) بوە[2]،بەڵگەنامەیەکی تر گوایە لە (کەی جی پی)وەرگێردراوەبۆ ئینگلیزی دەلێ با

---

[1]بروانە: د کمال مزهر -کوردو کوردستان لە بەلگەنامەی بەریتانی ل373-374 ) .

[2] Pavel Sudoplatov, Special Tasks: The Memoirs of an Unwanted Witness — A Soviet Spymaster. د کمال قادر وەریگێڕاوە بە خوێندنەوەوە.

بەهۆی مەلامستەفا بەرژەوەندیەکانی رۆژئاواییەکان تیك بدەین [1]،هەر پالپشت بەو بەڵگەنامانە ناحەزانی دەڵێن هەر ئەوەش بوو بوە هۆی هەلگیرسانی شۆرشی ئەیلول!،تا ئێرە پالنەری شۆرشی ئەیلول دەرکەوت کە سۆڤیەت پێی کردۆتەوە ،کەچی لەولایە لای تەیاری عروبی کلاسیکی ومۆدێرن دەیسەلمێنن کە شۆڕشی ئەیلول لەلایەن ئەمریکاو ئیسرائیل ورەجعی عەرەب ولەژێر ڕێنمایی ڕاستەوخۆی سافاك ئەو شۆڕشە هەلگیرسا...

هەڵبەتە هەرکەمێك لە زانستی سیاسی ومێژوویی تێکەڵی وتوخمی بوختانی پێوە دیارە،سەرەڕای ئەوەش بەووردی هەلوەستە لەسەر ئەو بەڵگەنامانە دەکەین وبزانین لە واقعدا چ ڕوویداوە مەلا مستەفا سەر بەکام دەوڵەت وموخابرات بوە؟کرێگرتە بوە یان نیشتمان پەروەر؟..لەگەڵ زۆر پرسیاری تری ساغ نەکراوە.

**لەبارەی شیوعی بوونی مەلا مستەفا:** ئەو بەڵگانەی خوارەوە ناڕاستی ئەو تومەتە دەردەخا:

1- لەو بۆچوونە شێوە بوختانانەی سەروو وادەردەکەوێ کە کورد پێویستی بە شۆرش نەبوە،نەچەوسایتەوەوئامانجی نەتەوەیی ونیشتمانی نەبوە ...ئەوەش لەگەڵهەموو ڕووداووواقعیەکانی ئەو سەردەم ناتەبا دەبێت کە پێش ئەوەی مەلا مستەفا بێتەوە کوردستان لە1958باقی سەرکردەکان خۆیان بۆ ئەو نەخشەو پلانانە ڕێك خستبوو کە ڕوویدا،مەلا مستەفا کارێکی نامۆی زیاتر لە بەرنامەی حیزب وکۆمەڵەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان نەکرد.

2- ئەگەر مەلا مستەفا سەر بە (کەی جی پی) بوایە بۆ وا بەزەحمەت لە سۆڤیەت وەرگیرا لەکاتی پەڕینەوەیان ،هەروەك لە راپۆرتی (ج وەزیری ناوەخۆ ڤاسیلی ریسنۆف-1947) بۆ ستالینی سکرتیری ح ش سۆڤیەتی ناردوە، بەرواری

[1] ( المصدر: وثيقة كي جي بي من أرشيف اللجنة المركزية للحزب الشيوعي السوفيتي، رقم الوثيقة Shelepin to ) *Khrushchev, 29 July 1961, in St.-191/75gc, 1 August 1961, TsKhSD, fond* 4, opis 13, delo 81, ll. 131-32).

پەڕینەوەیانی دیاری کردوە (15-6-1947 )و لەگەڵ پێناس ..ئەوە مانـای بـێ زانیاری سۆڤیەتە لەبارەی بارزانی .

3- پێش هاتنەوەی مەلا مستەفا بۆ کوردستان ولەدوای شۆرشـی 14ی تـەموز خـەڵکی کوردستانیش بە لێشـاو ڕووی لـە شـیوعی کردبـوو (پ د ك) زۆر لاواز بوو،کەچـی بەگەڕانەوەیان هاوکیشەکان وەرگـەڕان و( ح ش ع)بـەرەو لاوازی ڕۆیشـت و(پ د ك) زۆر بە هێز بوو..لەو کاردانەوەوبۆیە پاساو بۆ ئەو وەرچەرخانە شـیوعیەکان دەیـان ووت مەلا مستەفا کەسێکی خێڵەکیە بۆیە شیوعیەتی پێ هەرس نەکراوە .

لەوەوە شیوعیەکان کۆمەڵێك تۆمەتیان دا پاڵ بارزانی و بزوتنەوەی کوردایەتی وەك: فاشیەتی، رەگەز پەرستی، سەر بە ئیمپریالیزم و زایۆنی، بزوتنەوەیەکی دەرەبەگی عەشایەریە، دژ بەپرۆلیتاریایە، .... تا ئەو رادەیەی بارزانی تازە لەسۆڤیەت لە 1958/10/6گەڕابۆوە ماڵی لەبەغدابوو، لەلایەن خوێندکارە شیوعیەکان لەسەر دەرگەی مالی بارزانی نوسیبویان خاوەنی ئەو ماڵە بە سەیارە ڕادەکێشری[1].

4- بە پێی کۆمەڵێ بەڵگەنامە مەلا مستەفا لە سۆڤیەتیش هەر چـاودێری لەسـەر بـوە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لەگەڵیشی بووینە 518کەس پەرت وبڵاو کراون[2] ،سکرتێری (ح ش ئازەربیجان-باقرۆف) ڕاپۆرتی بۆ کۆمیتەی ناوەندی ودەزگـای (کـەی جـی پـی) ناردوە تیایدا باسی لەوە کردبوو کە بارزانی زیاتر لـە پیـاوانی ئـاینی وئۆپۆزیسـۆن نزیك دەبیتەوە،بە نەفامی سیاسی وەسف کردوە دەڵێ هـانی کوردەکـانیش دەدا تـا میرنشـینێك لـە سـۆڤیەت دروسـت بکـا ، لەلایـەکی تـریش بـارزانی وئەوانـەی لەگەڵیدابوون ئەوەندە بارودۆخیان باش نەبوە ،بارزانی خۆی کریکاری وهەویر شێلانی کردوە ..ئەوە لەگەڵ ئەو زانیاریانەی گوایە سەر بە (کەی جی پی)بوە لێك دوورە.

---

1 ئەو زانیاریە لەو بەلگە نامەبریتانیە وەرگیراوە: أحداث كركوك 1959التصور الاميركي والبريطاني سري *السفارة البريطانية* ـ بغداد 31/تموز 1959 - 1013/321/59

[2] لە نامەکەی بارزانی بۆ ستالین لە مانگی 6ی 1947 دەڵێ 500 کەسین.

5- له بیٚ ئومیدی بارزانی لەگەڵ بەرپرسانی سۆڤیەتی جارێکیان بارزانی هەڕەشەی مان گرتنی کرد لەخواردن ئەوە بوە هەوالی گۆڤاری (فلاست) ژ: 23 ی رۆژی 14-6-1958 . دەلێت لە1958 لەبەرامبەر(نورالدین محی الدینۆف وپۆریس بۆناماریۆق) ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی (ح ش سۆڤیەت) ئەو هەڕەشەیەی کردوە ئەگەر بارودۆخ وگوزەرانیان چاك نەکریٚ.

6- لەدوای 14 ی گەلاوێژ لە 1958/10/6 بارزانی گەڕایەوە بەغداوەو تا ساڵی 1961 نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك لەگەڵ میری،بە پێی سەرچاوەیەکی دەگمەنی (ئیخوان) ئەوا عبدالکریم قاسم لە پیلان بوە دژ بە بارزانی بۆ تیرۆر کردنی ،بارزانی لە (ساحە التحریر)کۆبونەوەی لەگەڵ لایەنگرانی خۆی هەبوە ،نوینەرانی ئیخوان(ابراهیم منیر وولید الأعظمی) خەبەری بارزانیان داوە نەچێتە ئەو کۆبونەوەیە چونکە پیلانی تیرۆرکردنی دارێژراوە لەلایەن قاسمەوە[1]. وبەغدای بەجێهێشت لە 1959 زنجیرە ڕووداوەکان دیارن بە سروشتی خۆی وبە پێی یاسای فلسفی(هۆکارو ئاکام)گەیشتە پلەی شۆڕش هەلگیرسانەوە، چونکە ئیشی موخابەراتی توخمی(ناکاوو نامەعقول ونامۆی )تێدایە،ئینجا کاری دروست کراو جەماوەریەتی زۆر نابیٚ.

7- لە پێرەوی ناوخۆی (پ د ك) چەپیەکان بە سەرۆکایەتی همزە عبداللە وایان تۆمارکردبووکەسوودلە مارکسی –لینینی وەردەگرین مەلا مستەفا پێی ڕەش کردنەوە[2] ، ئەوەیان چەند جاردووبارە دەبوویەوە .

8- لە بەڵگەنامەیەکی بریتانی(ژ: 10114/8/60) لە29 شوباتی 1960 بالویزی بەریتانی(سیر ئیج تریڤالیان) بەنامە بۆ وەزارەتی دەرەوەیان دەنیریٚ باس لە هەمان ئەو خالەی (7) دەکاو دەلیٚ(..وتبين لي أنه غير مسؤول من النظام الداخلي الحالي للحزب الديمقراطي الكردستاني الذي تم تحديده من قبل اللجنة المركزية. وقال بأن

[1] الدكتورة ايمان عبدالكريم دباغ -الأخوان المسلمون فى العراق ص593

[2] شوکت ملا ئیسماعیل-رۆژانیٚ لە مێژووی شۆرشی ئەیلول ل21

الحزب سيضع نظاما داخليا جديدا سيرضي بريطانية. ولكنني سأرى موقفه الحقيقي من هذه المسألة من خلال افعاله في الفترة القادمة)[1]

**ناوی دۆسیەی بارزانی وجەنەرالیەکەی لە سۆڤیەت** :لەبەر ئەوە زۆر باسی توومەت دەکەین چونکەتەقەلاّیەکی سەخت هەیە بۆ دەستکاری مێژووی شۆرش وخودی بارزانیش،ئاشکرا دیارە کە پلەی جنراڵی لەلایەن قازی محمد پیٚ درا،بارزانی خۆی سەربردەکەی گێڕایتەوە بۆ رۆژنامە نوسیکی ئەمریکی و دەڵیٚ کاتیٚ کە سەرکەوتنی گەورەمان بەدەست هینا لە شکاندنی ئەو ئابلوقەی ئێران سەپاندبوویە سەر کۆماری مهاباد لە سیٚ لاوە ئەوکاتی جەنەرالیەکەم پیٚ درا،لە رۆژنامەی کوردستانی ئەوساش خەبەری پێدانی پلەی جەنەرالی بڵاو کرایتەوە،کەچی تا ئەو ساتەش باس لەوە دەکریٚ کە بارزانی لە پاداشی بەشداری سەرکوتی موسولمانانی چیچان وقەوقاز بە جنرال لەلایەن ستالین خەلات کراوە.. ئەوەش ڕاست نیە،ئەوانەش بەڵگەی زیاتر: 1-سەربردەی ئەو تومەتە لەلایەن بریماکۆفەوە (کۆنە وەزیری دەرەوەو سەرۆك وەزیران) بە ووردی باس کراوەو دەلیٚ ئەو زانیاریەی لە بارەی وەرگرتنی پلەی جەنەرالی لە سۆڤیەت هیچ بنچینەیەکی نیە،دەلیٚ خۆم لە بارزانیم پرسی ئەو پاگندەیەی جنرالی چیە دژی تۆ دەکریٚ،ووتی من جلێکی عسکری بە پلەی جنرالیم لە فرۆشگایەکی سەربازی مۆسکۆ کڕی وێنەیەکم پیٚ گرت ئەو وێنەیە کەوتە دەست بەریتانیەکان وئەو پروپاگەندەی لێکەوتەوە[2] . 2-ئەو تۆومەتە ئەوەندە بە هێز بووە گەیشتۆتە ئەوروپاش،ئادەم شمیتی ئەمریکی ئەو پرسیارە لە خودی مەلا مستەفا دەکا دەلی راستە ئەوە ستالین پیێی دای؟ لەوەلامدا دەلی نەخێر لە مهاباد وەرم گرت[3].. لە دوا تەقەلای داگیرکەران بۆ ئەوەی بیسەلمێنن شۆرشی ئەیلول بە فیتی (کەی جی پی) ومۆسکۆ ئەنجام درا ئەوا پالپشتیان کردۆتە سەر هەندیٚ ڕاپۆرت

---

[1] FO 371/49668:رقم 1960 ، 29 شباط السفارة البريطانية-بغداد10114/8/60

[2] بريماكوف-الشرق الأوسط..المعلوم والمخفى ص338

[3] ڕۆژانیٚ لەمێژووی شۆڕشی ئەیلول ل118

ویادەوەری کۆنە ئەفسەری گەورەی ئەو دەزگایەی سۆڤیەت،لەوانە (زابۆکی) پێشنیاری کردوە کە سود لە مەلا مستەفا وەرگیرێ بۆ دروست کردنی هەڕەشە لەسەر لایەنگرانی رۆژ ئاوا لە رۆژهەلاتی ناوەراست [1]، لەو لایەش ناوێکیان بۆ تاشیە گوایە ناوی نهینی بارزانی لە (کەی جی پی) بە (رئیس) تۆمارکراوە، دووبارە لەلایەن (بریماکۆف)ەوە ئەسلی ئەو ناوە باس کراوەودەڵێ هەریەکێکی بیانی پەنای بۆ سۆڤیەت بهێنابایە ناوو دۆسیەکیان بۆ دەکردەوە ،دەلێ ناوی مەلا مستەفا لە ژێر دۆسیەیەك کراوە بە ناوی (مامیدۆف)[2] ،نەك (رئیس)وەك لەو زانیاریەی پێشوو هاتبوو.

**بەریتانیا بارزانی دژبە قازی محمد نارد :** لە پێشوو تر باسی ئەو سەرچاوانەمان کرد کە ویستویانە بزاڤی کوردوسەرکردەکانی بدەنە پاڵ بەریتانیاو رۆژئاوا بەگشتی ،کەچی بەڵگەو ئاکامەکان نەك هەر دوورن لە ڕاستی بەڵکو پێچەوانەشە، بەڵگەنامەی بەریتانی گەلێ زۆر لەبەردەستدایە بەلامبەلگەنامەی ئەدمۆندز لە هەموان بە زەقانە تر دەلێ بەرژەوەندی بریتانیا لەگەڵ عەرەب دێتەوە لەگەڵ کورد نایەتەوە -(المذكرة التي اعده من قبل س. ج. أدموندز في 27\تموز\ 1941): هناك الواقعيون الذين وصلوا الى قناعة مفاداها بأن مصالح السياسة الاستعمارية البريطانية لا تتفق مع الاهداف القومية الكردية و تخدم المصالح العربية القومية)[3].

لەبارەی ئەوەی بارزانی بەرەو مهاباد رۆیشتبێ بۆ تیکدانی کۆماری مهاباد زۆر دوورە لەڕاستی ئەوەش بەڵگەکانە:

1-بەڵگەنامەی بریتانی- وەزارەتی دەرەوە نامەیەکی ملا مستەفابارزانی بۆ کورنوالیسی مەندوبی بریتانی لە عێراق داوادەکات ئەو هێرشە هاوبەشەی بریتانی وعێراقی دژ بە

---

[1] هـ- سەرچاوەی پێشوو : ( Shelepin to *Khrushchev, 29 July 1961, in St.-191/75gc, 1 August 1961, TsKhSD, fond* 4, opis 13, delo 81, ll. 131-32).

[2] بریماکوف-الشرق الأوسط..المعلوم والمخفی ص338

[3] وثيقة بريطانية: FO 624/6P.S. No 451/ BA/ 23 تقرير رقم:ب س177 27تموز 1941

سەرهەلدانی بارزان ڕاگرن : رسالة مترجمة من: ملا مصطفى البارزاني الى: سير كناهان كورنوالاس 1943/12/24(..لأطلب و بكل اخلاص, بأن تقبل حكومة بريطانيا العادلة و شخص سعادتكم الموقرة, التماسي بأصدار العفو عنا جميعا و السماح لعودة المعتقلين و المسلحين من انصارنا بالعودة الى ديارهم. ان الظلم الذي نعاني منه وصلت درجة يعجز اللسان عن وصفه. أملنا ان لا تطلب منا ان ندق ابواب ااآخرين للمرحمة)[1]—نابیّ خوێنەر ئەوەی لیّ تێکەڵ بێت کە ئێمە باسی سەرەتای دروست بوونەوەی شۆرش دەکەین یان باسی پێش چوونی بارزانی بۆ مهاباد دەکەین، پەیوەندی شۆرشی ئەیلول بە رۆژئاوا بە هەموو لایەکانیەوە لەدوای 1969 یان بە زەق تر لە1972 دەست پیّ دەکا[2] 2- هەر بەڵگەنامەی بریتانی خۆیان —نامەی دوەمی مەلا مستەفا بۆ کۆرنەوالیس: من: ملا مصطفى البارزاني الى: ايجج. اي. سيركيناهان كورنوالس -تأريخ 1943/12/25 و نسخ الى ب. ئي..س. اين. سئي. او. سالعقيد ود مستر اد موندز, س. (..اسمح لي لأعلمكم بأنني استلمت امركم الوارد ذكره في رسالتكم المؤرخة 21/كانون الأول/ 1943. أنني اقبل كل امر منكم كما يقبل الطفل الوالد الحنون الأوامر. و لكن تصرفات المسؤولين العراقيين الغير العادلة و قطعت كل باب للأمل لنل لذلك اضطررنا ان نتحرك دفاعا عن النفس. و ينوي هؤلاء المسؤولين ان ينالوا مناو يحّرضون القبائل ضدنا و يوزعون السلاح لهم لأستخدامه ضدنا) [3].3- هەر بەردەوام دەبین لەگەڵبەڵگەنامەی بریتانی و ئیستا دوا هێرشی سوپای بریتانی وعێراقیە بۆسەر بارزانی کە بووە هۆی دەرپەڕاندنی مەلامستەفا بەرەو مهاباد لەدوای هەموو ئەوانە بێی وبلّێی بارزانی بە فەرمانی بریتانیا هاتوە کۆماری مهاباد تێك بدات،ئەوە تاوانی زانستیە، بەپێی ئەو بەڵگەنامە سەربازیە زۆر نهینیەی بریتانی (1077-30-4522 و المؤرخ

---

[1] بەلگەنامەی بریتانی :371/40038-F.O

[2] بڕوانە :کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهینیەکانی ئەمریکا ل220-

[3] F.O 371/40038 21-كانون-1943

1945/9/22 رئيس البعثة زەعيم العسكرية البريطانيةHHC/JJW) ئەوانەی خوارەوە فەرماندەکانی عێراقین لە هێرشە هاوبەشەکەی بریتانیاو عێراق : أ- ئیسماعیل سەفوەت فەرماندەی هێزەکانی رواندوز ب-عەقید احمد حمدی فەرماندەی پیادە ج-هەریەکە لە مقدمعاسی حمود ورئیس الأولحسن مصطفى فەرماندەی تۆپخانە مقدم عبدالرزاقعبدالوهاب فەرماندەی تۆپخانەی شاخەوانی وچەندین فەرماندەی تر[1]،دەرپەڕاندنی مەلا مستەفا لەلایەن هێزەکانی بریتانیا و عێراقی هاوبەش لە نامەکەی (ج وەزیری ناوەخۆی سۆڤیەتی فاسینی ریاسنۆی)بۆ ستالینی سکرتێری ح ش سۆڤیەتی لەسالی 1947لە بارەی ناساندنی بارزانی دەنێری تیایدا دەلێ هەرسێ لای بریتانی وعێراقی وعەشایری کوردی ئابلوقەی هێزەکانی بارزانیان داو ناچارکرا بێتە دیوی کوردستانی ئێران کە ئەو کاتی هێزەکانی سۆڤیەت داگیریان کردبوو،دوورە لەو تومەتە،هەر لەبارەی پەیوەندی بارزانی وقازی **محمد** لە سەرچاوەی میراتگرانی قازی **محمد** دوا گفت وگۆی نێوان قازی وبارزانیان بڵاوکردۆتەوە،کە تیایدا خۆشەویستیان لە نێوان بوە،بەوەی بارزانی داوای لێکردوەو ووتویەتی حەزرەتی پێشەوا تکام وایەلەگەڵمان بێیت،قازی ووتویەتی ناکرێ میللەتەکەم بە جێ بهێلم،دوای قازی بە بارزانی ووتوە ماشینەکەی من ببەن سودی لێ وەرگرن،بارزانی زۆریشی پێویست بوە بەڵام ووتویەتی چاوم بەرایی نادابیبەم[2]، ئەوە دوا ئاخافتنی نێوانیان بوە .

**شۆرش پێویست بوو یان ئەجندای دەرەکی بوە:**زۆر بە ئاسانی مۆرکی ناحەزانی کورد لەباسی هەلگیرسانی شۆرش وڕاپەڕینەکانی کوردستان دەردەکەوێ ، ئەوانەی سەر بەو مەدرەسەن کە هۆکارەکان دەدەنە پاڵ دەرەکی وبیانی ئەوە باوەڕیان بەوە نیە کە میللەتێك

---

[1] FO،91 /624 موضوع:الجيش العراقي، العمليات العسكرية في الشمال، سري للغاية 45-31- 1577 وزارة الدفاع البعثة العسكرية البريطانية- بغداد -رقم التقرير 137-ج- 130 تأريخ 24- 9- 1945 سفارة جلالة ملك بريطانيا- بغداد نسخه منه :العقيد 20 0 سيفري . MC/DSO/CBطيا أبعث اليكم نسخة لمحضر الجلسة الحكومية التي وقعت في القصر الملكي في بغداد بتأريخ 23- 9-1945 كما أبعث لكم في كتابنا المرقم G133/ 130 4522–30-1077 و المؤرخ 1945/9/22

[2] حزبی دیموکراتی کوردستان —یادی 60 سالەی شەهید بوونی پێشەواو هاوڕێیانی ل158

چەوسایتەوەو خاکی داگیرکراوەو یاسای خواییە کە بەرگری دەکا ،تەنانەت هیچ گیان لەبەرێك نیە لانەکەی بە بێبەرگری بداتە دەست دریژکەرێك ،ئەوەیان زیاتر زانیاری هەلبەستراوەو بەشێکە لە هەلمەتی داگیر کاری ، تەنانەت کورد ئەگەر بەوداگیرکاری وبێ بەشیەی قایل بوایە ئەوا هەر ناچارکراودەکرا کە شۆڕش هەلگیرسێنێ چونکە بەرنامەی حکومەتەکانی داگیرکەر ڕاست کردنەوەی ئەو نەخشەیەی ئیمپریالیزم نەبو کەبۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاستیان دیزاین کردبوو، دروست کردنی برایەتی و بنەمای هاوولاتی بوون نەبوو، وەك لە وولاٌتانی ئەوروپی لە نێوان کۆمەلیك میللەت وپێکهاتە هەیە،لیرەوەوەلامی ئەو پرسیارە مێژووییە کە دەلێن بۆچی نەتەوەی جیا لە وولاتانی ئەوروپا شۆرش وپشێوی نانیتەوە کەچی لە جیهانی عەرەبی وئیسلامی وهەندێکی رۆژهەلاٌتیش وادەکەن ..کەواتە دەستی ئیستعمارە..،ئەو حوکمە زۆر هەلٌەیە،لەو ناوچەیەو کورد وەك نمونە ئەگەر شۆرشی نەکردبایە ئەوا نەمیللەت ونەوولاتی نەدەما،لە ئەوروپا حکومەت هەولٌی پێکەوە ژیان دەکەن لێرە هەولٌی توانەوە،بەراوردی دەستوری وولاٌتانی عەربی وتورکی وئەوروپی بکەلەگەلٌ ئەو وولاٌتانەی کوردی لێیە نکولٌی لە بوونی کراوە، سەیری دەستوری عێراق1968 بکەو ودوایش هەردووبارە دەبۆوە : المادة الأولى: ..الشعب العراقي جزء من الأمة العربية ...دەستوری سوریاش1970و 1973: المادة الأولى فقرة(2)- القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي. .لەو دەستورە 51جار ووشەی عەرەبی لێهاتوە بۆ یەك جاریش ناوی کوردی تیا نەهاتوە ، کورد پێش شۆڕش پێشنیاری دەستوری کردوە،ئەو دەستورەی مەلا مستەفای بارزان کە لە1965/3/12بۆ بەغدای نارد ، پیك هاتبوو لە13 بەند ، لەبەندی(3)دەلێت:گەلی عەرەب لە عێراقدابەشێکە لەمیللەتی عارەب..واتە بەوە قایل بوە ئەوەندە ناوی عرب بێت تەنها نکولی لە بوونی نەکرێ... لە ژێر ئەو رەوشە سیاسی وئیداری ودەستورە ڕەگەزپەرستیە بەرە بەرە سنوری کوردستان بچوك دەبۆوە،ئینجا میللەتی کورد لە پێشکەوتن وپەرەپێدان بێ بەش دەبوو وەك بێ بەش بوە،وای لێهات کورد بوون شەرم بێت کە دەروازەیەکی

سایكۆلۆژی مەترسیدارە بۆ توانەوە..وەك سەرەنجامێكی لۆژیكی شۆرش وبەرگری هەڵدەگێرسیٚ ،كەچی دەیدەنە پاڵ فاكتەری دەرەكی .

**ش**ۆرشی ئەیلول خۆرسكە یان ساڤاك هەلیگیرساند

توومەتی دەستی ئەولاوئەملا لە شۆرشی كورد لە كۆتایدا مانای ئەوە دەبەخشیٚ كە كورد پیویستی بە شۆرش نەبوە ، لەو چوارچیوەیە حزبی شیوعی بەیانیكی هەیە لەسەرووبەری هەلگیرسانی شۆرشی ئەیلول 22 یٚب 1961 بە ناونیشانی(حول الوچع الراهن فی كردستان) تیایداهاتوە : (..في الفترة بين 20 - 23 تموز 1961، اجتمع السفير الأمريكي في إيران (هولمز) وبمساعدة الملحقين العسكريين الأمريكان وقنصل أمريكا في مدينة رضائية الإيرانية - بعد أن نظموا سفرات في المناطق الكردية من إيران واتصلوا ببعض الشيوخ والأغوات - وفي نفس الوقت قام رئيس الاستخبارات الإيرانية ببعض السفرات المريبة في المناطق الكردية من إيران. وكانت باكورة النشاط التآمري الأمريكي على الجمهورية العراقية إرسال علي حسين أغا المنكوري على رأس عصابة مسلحة بالأسلحة الأمريكية بإشراف مبعوثين أمريكيين والسلطات الإيرانية، وقد اجتاز الحدود العراقية ليفرض سيطرة عصابته المسلحة على ناحية ناودشت ويعتقل بعض موظفيها..)
.

دووبارەلە توێژینەوە نوێیەكان باس لەوە دەكرێ كە لە بنەچەدا كورد پێویستی بە شۆرش نەبوە بەڵكو ئەوە ساواكە ئەو ئەركەی بە كوردسپاردوە، وەلاٚمی ئەو پاگندە ترسناكە :

1- لە بەڵگەنامەیەكی بریتانی(ژ: 10114/8/60) لە29شوباتی 1960بالویزی بەریتانی(سیر ئیج تریڤالیان) بەنامە بۆ وەزارەتی دەرەوەیان دەنێرێ باس لەوە دەكا كە مەلا مستەفا زۆر دلسۆزە بۆ عبد الكريم قاسم ، بەلاٚم حكومەتی عێراق بە پیل داواكانیان نایەت [1]، لەوەوە دەردەكەویٚ مەلا مستەفا نەیویستوە شۆرش دژی قاسم

[1] FO 371/49668:رقم ، 1960 شباط 29 السفارة البريطانية-بغداد10114/8/60

هەڵگیرسێنی.

2- نامەیەکی شای ئێرانکەلە(7ی کانونی یەکەمی 1964بۆ سەرۆکی ئەمریکا (جۆنسۆن)ناردوە تیایدا وەسفی مەلا مستەفا دەکاتو دەڵێت:دەترسم ئەوشۆرشەی بارزانی سەر بە کۆمەنیست بێت[1]،..ئەوەش باش ترین بەڵگەیە کە شای ئێران نەیزانیوە ناسنامەو ئامانجی شۆرش وئەو دەستانەی لە پشتە کێن؟ واتە بەلای کەمی لێرە سافاك دووركەوتەوە لە دروست بوونەوەی شۆرش.

3- لە بەڵگەنامەیەکی بالویێزخانەی ئێرانی لە بەریتانیا لە 13ی تەموزی 1963 دیسان داوای زانیاری لە بارەی بارزانی وشۆرشی کردوە ئاخۆ سەر بەکێنە[2] .

4- لە بەڵگەنامەیەکی تری بالوێزخانەی بەریتانیالە تاران(سری للغایە-رقم:614 13ی تموز1963) وەکو (حلف سنتو) ئێران وتورکیاوبریتانیاو ئەمریکا لە دژە هەڵوێستی سۆڤیەتی بەرامبەر عێراق داوا دەکەن کە کێشەی کورد وەك کێشەیەکی ناوەخۆی عێراق تەماشا بکرێ نەك زیاتر[3]، ئەوەش ڕوون دیارە کە لایەنگری شۆرشی کورد نەبووینە .

5- صدام حسین (ج سەرۆکی عێراقی ئەوسا)دەڵێت شای ئێران لە دوایساڵی 1969 ئینجا دەستی کەوتۆتە ناو کوردو بارزانی پەیوەندی بە ئێران دروست بووە[4]،ئەوە قسەی کەسێکی بە هێزی عێراق بووە کە دژ بەو پەیوەندیە بووە .

**6-** لە بەڵگەنامەیەکی تری بەریتانی بـە ژ:10114-229-63لـە ئیگلتۆنـەوە بـۆ مستەر دالاسی وەزیری دەرەوەی ئەمریکی ئەوسا زانیـاری ووردی لـەبارەی شۆرشـی ئەیلولەوە ناردوە دەڵێ سەربە هیچ لایەك نین وهیچ دەستێکی لـە پشـت نیـە بـەڵکو چەوساندنەوەو خراپی ئەو شۆرشەی پێ هەڵگیرساندون .

---

[1] فایلی ئەو دۆسیە لە XX11 ژ:١- 7،١٥ -کانون الأول-1964

[2] fo370\170515 1963-7-13

[3] رسالە (السیر دی رایت) الی وزارە الخارجیە 13تموز1963،Fo373-1703515

[4] صدام حسین-الثورە والصراعات الحاضر والمستقبل-ایران وحسن الجوارص٢٢

7- ئەگەر ئەو شۆرشە سەر بە سافاك وئیسرائیل ورۆژئاوا بوایە چۆن یەکێتی سۆڤیەت (کەدوژمنی سەرسەختی رۆژئاواو ئیسرائیل وئێرانبوو) لە 1963 ئاوا دژبەو پەلامارە گەلەکۆییەی وولاتانی عربی وەستا ، وووڵاتانی سۆشیالیستی ناوەناوە یارمەتیدەری شۆرشی کورد بووینە بەتایبەتی لەنێوان1963تا1970، یەکەم سکاڵای جینۆساید سۆڤیەت پێش کەشی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد ـ ( وثیقة رقم E/38099تموز1963الجلسة 36، المادة رقم1 في جدول الاعمال، سياسة حرب الابادة ضد الكرد من قبل الحكومة العراقية" طلب اضافة فقرة جديدة الى جدول الاعمال ـ رسالة رئيس بعثة الاتحاد السوفيتي الى الامم المتحدة )[1]، ڕەنگە رۆژئاوا مەترسی ئەوەی هەبووبێ شۆرشی کورد بکەوێتە باوەشی سۆڤیەت بۆیە هەولی داوە نێوانیان تێك بدا،بۆیە زۆر بە ووردی چاودیری کردوە ،لەتوێژینەوەیەکی هەوالگری ولیکۆلینەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ڕاپۆرتی لەو بارەیەوە بلاوکردیتەوەلە 31ی مایسی 1972 دەلیت تەقەلای تیرۆر کردنی ئیدریس بارزانی لەبەغدا دەستی سۆڤیەتیە[2] .

8- گرنگ ترین بەڵگەنامەی بریتانی لە سالی 1963 لەسەر ئاستی باڵای بەریتانی دڵنیایی لە شای ئێران وەرگیراوە کە ئێران هیچ جۆرە پاڵپشتیەکی (یاخی بوانی) کوردی لە سەرووی عێراق نەکردوە(وەك لە وەڵام ووەڵام دانەوەکەی نێوانئێران وبەریتانیا ئاوا هاتوە) :(اجيبكم حول السطر ألاخير من الفقرة الثانية والفقرة الثالثة من رسالتكم M1 4/518/COL/DO والمؤرخ 4تموز1963... اخبر عباس ارام سفير حكومة جلالة الملك بريطانيا بأن الشاه وافق على عدم أعطاء الدعم العسكري للمتمردين الكرد وهذا هو الموقف الرسمي للحكومة الايرانية. ولكن الشاه هو الحاكم

---

1Fo.371-1703415 رقم:E3909ئیس بوریسوف سەرۆکی نوینەرانی سۆڤیەت لە دانیشتنی ژ:36 ی نەتەوە یەکگرتوەکان.

2 بەلگەنامەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی E41969-1972–سەرچاوە :کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی ئەمریکادا ل200 .

المطلق في البلاد ومن الممكن أن قال لوزير خارجيته أن يقول هذا الخبر لنا فقط من أجل اسكاتنا. ومن الممكن جدا أن يستمر الشاه في مغازلته للمتمردين الكرد بدون علم حكومته وذلك من خلال الجنرال نصرالله (قائد الجيش الأول والخبير في الشؤون الكردية) والعقيدكمال جاى( رئيسة شعبة الاستخبارات في القيادة العليا)و الجنرال موهاتيان)[1].

9- گەلێ جار باس لەوە دەکرێ کە مەلا مستەفا بە جۆرێك پەیوەندی هەبووبێ لەگەڵ ئیسرائیل...هەڵبەتە ئیسرائیلو ووڵاتانی عەرەب پەیوەندیان هەیەو ووڵاتانی عربی وجامعەکەشیان ڕۆلی هەبوە لەدروست بوونی ئیسرائیل ، ڕەنگە مەلا مستەفا لەڕێی کەنالی جیا جیا لەگەڵ خەلکی یەهودی دەسەڵاتداری ڕۆژئاوا یان هەتا ئیسرائیلیش دانیشتبێ ، بەڵام ئەوەی گرنگە هەر پەیوەندیەك هەبووبێت بۆ کاتی تەنگانە بووە، ئێ چ کاتەك بۆ ئیسرائیل لە جەنگی سالی 1967 تەنگاوترنەبوە ، لەبەڵگەنامەی ئەمریکی-تیلیگرام:183 لەبەغدا بۆ وەزارەتی دەرەوە1966/8/19 دەڵێت وەفدێکی ئیسرائیلی سەردانی بارزانی کردوە بۆ ئەوەی لەکاتی شەڕ هەڵگیرسان پێش مەرگەکان بتوانن چالاکی دژ بە عێراق بکەن تا نەتوانن بەشداری شەڕی ئیسرائیل بکەن لە بەڵگەنامەکەدا دەلێ ئیسرائیل سەرکەوتو نەبوو لەو پلانەی وبارزانی بە جۆرێکی تری پێچەوانە کاری کرد[2]، کەچی ئەوەی بینیمان ئەوەبوو مەلا مستەفا لەگەرمەی شەڕی ئیسرائیل وعەرەب یەکلایەنی شەڕی ڕاگرت وداوای لە سوپای عێراقی کرد بچێت ئەرکی ئیسلامی خۆی ببینی وبچێتە یارمەتی عەرەب، ئەوەی جێی سەرنجەلەو کاتەی کە عەرەب دەڵێن سەر بە ئیسرائیله وەك بوختان لەلای ڕۆژئاواش بوختانی شیوعیایەتی ونزیك لە سۆڤیەت دەدرا پاڵ مەلا مستەفا .

---

[1][1]FO 371/170421MA/1400 سري من الكولونيل ايس .جي. واتسون السفارة البريطانية ، طهران الى العميد دي.ج. وليسون وزارة الحرب ، لندن 11تموز، 1963

[1]دۆسیەی ژ:63-229-10114 ،16-تشرين الأول 1963

[2] نامەی ئیگلتون بۆ مستەر دالاس-ژ: 63-229-1011416تشرینی یەکەم 1963

له کۆتایدا ئەوتوێژینەوە پاکانە نیە تونها بۆ سەرکردە مێژووییەکان زیاتر بۆ پتەو کردنی بزوتنەوەی کوردە کەبەو پاگندانە دەیانەوێ لـە ڕەسـەنایەتی بخەن،ئـەگینا ڕەنگـە مـەلا مستەفاش سەلبیاتی زۆری هەبووبێ،دوو کوڕی خۆی کردبوە مەکتەب سیاسی،لە ساڵانی 1968 بەدواوە هەوڵی پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل وئەمریکا داوە،دوایش لەگـەڵ شـای ئێران،ئەگەر ناچاریش بووبێ بە پێی مەبدەئی(الغریق یتشبث) دەبوایە کـە (پ د ك) لـە سالی 1975 شکسـتی هینـاو (ی ن ك) شۆرشـی هەڵگیرسـاندەوە وابـاش بـوو مـەلا مستەفا داوا لە (پ د ك) بکات یارمەتی ئەو شۆرشە نوێیە بدات.

( 4 )

## حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی کوردستان ( حسیك )

له هـاوینی 1979 دروسـتبووە لـە یـەکگرتنی بـاڵی جودابوویـەوەی (بزووتنـەوەی سۆشیالیستی کوردستانی ناو یەکێتی) و (لیژنەی ئامادەی پارتی دیموکراستی کوردسـتان) کە هەر لەدوای شکستی1975 لەپارتی جیابوونەوەو بـە بـەیانێك پـارتی بـە حزبێکـی بنەماڵەیی و بێ فکـر و مەدرەسـە لەقەڵـەم دا، بـەهێزترین کەسـایەتیەکانی بـریتین لـە: د.محمود عوسمان و جێگرەکەی شمـس الـدین مـوفتی، هـەروەها قـادر جـەباری و عـدنان موفتی.

<u>ئایدۆلۆژیای و ڕێکخستن:</u>

نەتەوایەتی + سۆشیالیستی زانستی، بـەڵام ئەنـدامانی ووشـیاریەکی سۆشیالیسـتی وایان نەبووە.

ڕێکخستنی وەك ڕێکخستنی یەکێتیە.

<u>باڵی سیاسی:</u>

رسول مامەند سکرتێری وەختی بوو- د.محمود جێگر- قادر جەباری،سعد عبداللـه، ملا ناصح، تاهیر علی والی (لەبەفر ڕەق بوو)، محمد حاجی محمود، سید کاکە، قادر عزیز، عادل مراد، عبدالخالق زەنگەنە.. هەروەها بەپێی زانیاری خۆیان سکرتێرە ڕاستەقینەکەیان (صالح یوسفی- هەڤاڵ سەیدا) بووە بەنهێنی (لەبەغدا بەنامەیەکی لوغم ڕێژ تیرۆر کرا).

<u>باڵی عەسکەری:</u>

لێی بەهێز بوون لەوانە وەك:سەید کاکە، دوایش محمد حاجی محمود، شێرکۆی شێخ عەلی (شەهیدلە1981)، عەولاّ بۆر، سید سلیم (شەهید لەئاوەگرد1979)، سلێمان بیرێژی (شەهید)، قادر مستەفا (شەهید)، عبداللە سور (شەهید 1981)، ئەنوەر مجید سوڵتان (شەهید).

<u>ڕەوتی (سیرەی):</u>

- لەدوای ئەو ئینشقاقە نەخشەی عەسکەری وا خەملّی ناوچەی بادینان زیاتر پارتی بوو، بەلاّم چالاکی هەر کەم بوو، ناوچەی گەرمیان و قەرەداغ یەکێتی، ناوچەی دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی- حسیك، ناوچەکانی شاربازێر، دوکان، وەرتێ، گەرەوان، حسك و یەکێتی تێك ئالاّبوون.

واتە یەکێتی و حسك دوو حزبی بەدیل و تێك ئالاّو بەو عەقلّیەتە ستالینەی ئەو سەردەمیش هەر بەخێرایی مێژووی ئەو حیزبە بووە شەڕی کوردکوژی، جا با ئەویش نەیوستبێ، حسیك زیاتر لەگەلّ (پ.د.ك) هاوپەیمان بوو.

- پەیوەندیان بە (حدکای ئێران و قاسملۆ) زۆر خۆش بوو، لەرِکی پەیوەندی یەکێتی و کۆمەڵەی ئێران.
- لەساڵی 1980 لەڕێی د.قاسملۆ مفاوەزاتێکی لاوازی وەختی کراو هیچ سەنگی نەبوو.
- لە هەمان ساڵ بەرەی (جود) لە (حسك، حزبی شیوعی، پاسۆك، پارتی) دروست بوو، لە بەرامبەریشدا (ی.ن.ك) و (حزبی شیوعی عێراق) و هەندێ حزبی تر بەرەی

(جوقد) ڕاگەیاند.

- لەساڵی 1981 تووشی شەڕێکی براکوژی سەرتاسەری بوو، هەرچەندە لە عەسکەری بەهێزتر بوو لە یەکێتی، بەڵام لەڕووی سیاسی و پلان و ستراتیژیەت بێ‌هێز بوو، لە ئەنجامدا لە عەسکەریش تێکشکا.
- لەدوای کارەساتی پشت ئاشانی 1982 بەیەکجاری ئاودیوی ئێران کرا.
- لە 12/12/ 1985 قادر عزیز وەك تەیارێکی مارکسی لێیان جیابۆوەو دوای حزبی زەحمەتکێشانیان دروست کرد.
- لەساڵی 1987 لەپێش جارِدانی (بەرەی کوردستانی) بەخۆیان و بە سەرکردایەتیەوە لەگەڵ حزبی شیوعی لەدوای ماندووبونێکی زۆر بە (سستی پارتی و بیرۆکراتیەتی- وەك خۆیان وتیان) تەسلیمی ئەمری واقعی یەکێتی بوون، بە یەکجاری وازیان لە هاوپەیمانیەتی پارتی هێنا، کەوتنە ژێر سایەی یەکێتی وهاتنەوە کوردستان.
- لەدوای وەستانی شەڕی عێراقئێران کەوتە دیوی ئێران.
- لەراپەڕین دەورێکیان هەبوو.
- لە هەڵبژاردنەکەی 1992 لیستی (24882) دەنگی هێنا (2.5٪)، رابەریش د.محمودتەنها(23342) دەنگی هێنا.
- لە 1992/2/5 بوونە دوو بەش، سەید کاکە و محمدی حاجی محمود و قادر جەباری لەگەڵ (پارتی گەلی دیموکراسی- سامی عبدالرحمن) هاتنە ناو پارتی و بەشەکەی تریش بە سەرکردایەتی (رسول مامند) چوونە ناو یەکێتی.
- لە کۆنگرەی (11)ی پارتی جارێکی تر محمد حاجی محمود ئینشقاقی کرد و (حزبی سۆشیالیستی دیموکراسی کوردستان)ی دروست کرد، تا ئێستاش بەردەوامە، ئەو حزبە زیاتر پانتاییەکی عەسکەریەو بەرەو کزیە.

**ئەزموون لە:**

**خاڵە بەهێزەکانی:**

1- کۆمەڵە کادیرێکی عەسکەری دڵسۆز و بەهێز بوون، لەڕۆژانی تەنگەکانی کوردستان خاوەن داستان بوون.

2- لە شەڕەکانی کورد- کورد دەست پێش خەر نەبوو.

3- ئەزمونێکی نوێ بوو لە دەرچوون لە سەرکردایەتی کلاسیکی کورد کە هەر لەچەند دانەیەك قەتیس مابوو، خەریك بوو دەردی مەلایی و جەلالی لەسەر دەستی ئەوان کۆتایی بێت.
4- لە چالاکی و شەڕەکانی دژی هێزی (جود) هەر بەرەیەك (حسك)ی لێبوایە خۆڕاگرتر دەبوون.
5- ئەوانە لە ساڵی 1980- 1981 زۆر بەهێز بوون، توانیان لە چوارچێوەی شەڕەکانی ناوخۆ (نەوشێروان مستەفا) بەدیل بگرن لەناوچەکانی سلێمانی کە ئەوکاتی لەجێی سکرتێر بوو، یەکێتی لەوپەڕی مەترسی بوو بێ سەرۆك مابۆوە، بەڵام حسك زۆر خوازیاری یەکلاکردنەوەی شەڕی کوردکوژیان نەبوو، بۆیە ئازاد کرا.
6- سەروەری زیاتر بۆ د.محمود دەگەڕایەوە لە پلانە سیاسیەکان، نمونەیەکی دەگمەنە کە زۆر خوازیاری پایەو سەرۆکایەتی نەبوو.

خاڵە لاوازەکانی:

5- کەسی یەکەم لە هەر حزبێك سەرچاوەی ئیجابی و سلبیاتەکەیەتی بەپێی مەرجەکانی سەرکردە، بۆیە ئەو حزبە هەم ئەو نوقستانیەی هەبوو هەم مونەزیریشی نەبوو، (د.محمود)یش لێیان تۆرابوو تەنیا لە تەنگانەکان دەگەڕایەوەو لە مەترسی و خلیسکانەکان دەیگێڕانەوەو دوای بەجێێ دەهێشتن ئیدی ئەوە سەرەنجامی ئەو حزبە بوو.
6- ئەو حزبە مێژوویەکی زیاتر عەسکەری هەیە، دیارە حزب بێ عەسکەری دەبێت، بەڵام هەرگیز بێ فکر و سیاسەت و شارەزایی و پلان و ستراتیجیەت نابێت، ئەو حزبە تەنیا لە سیاسەت شکستی هێنا و یاسای (البقاء للأصلح) تەزکیەی پێنەدا لاواز بۆوە.
7- نەبوونی تەوجیهی سیاسی دەماودەست و بێتینی مەدرەسەی فکریەکەی (سۆشیالیستی) لەچاو رادیکالیەتی مارکسیزمی ئەو سەردەمی بووە هۆی سەرپێچی عەسکەری بۆ سیاسی و ڕێکخستن، لە ئەنجامدا لەجیاتی موئەسەساتی و پلان و پرۆژەی گەشەکردنی چۆنایەتی کەوتنە بازنەی داخراوی ڕەمەکی سیاسی

و بێ ستراتیژیەتی و لالایانە و کاردانەوە.

8- لەبەر ئەو هۆیانەو لاوازی ڕاگەیاندن لە (مەزلۆمەوە) دەکرانە (زالم)، شەڕی پێ دەفرۆشرا، بەشەرهەلگیرسێنەر پێشان دەدرا.

9- ڕێکخستنەکانی بە زەمینەیەکی کۆمەلایەتی فراوان دا نەچەقیبوو و، لەگەل لاوازی گوتاری سیاسی و، بێناوبانگی سەرکردایەتیەکەی دەبووە هۆی پڕنەکردنەوەی هەر نوقستانیەك، چاکترین نمونە لەبێهێزی سیاسی: مێژووی ئەو حزبەو ئەنجامی دەنگدانەکەی زۆر لێك دوور بوو.

10- هەولی ئەو حیزبە لەڕێی حزبی شیوعی عێراقی گوایە ببێتە سەر بە (یەکێتی سۆڤیەت- ئەوسا) ئەوا لە تیۆری (تاکتیکی پرۆلیتاریای مارکسی) نەگەیشتبوو، لە ئەزموونی حزبی شیوعی لەگەل حزبە کوردیەکان بێئاگابوو، لە هاوکێشە ستراتیژیە ئەقلیمی و دەولەکانیش سەری دەرنەچوو، حزبی شیوعی خۆی (فاقد الشيء) بوو لەکاتێکدا لە عێراق قرانە شیوعی بوو (ڤیدل کاسترۆ) دەیگوت: ((صدام رفيقي وصديقي في النظال)) و یەکێتی سۆڤیەتیش هاوپەیمانیەتی 20 سالی لەگەل نوێدەکردەوە. چی بۆ حسیك پێنەدەکرا.

11- لە شەڕە ناوخۆیەکانیش ئەو ڕێژە بەرپرسیاریەتەی کە بەری دەکەوێ، نەیتوانی بە دانایی خۆی لێ لابداو لەجیاتی ئەو بەرە(جود)ەیلەگەل لایەنەکانی دوور لە گۆڕەپان مۆر کردبەتایبەتی پارتی، ئەوا لە (جوقد) بوایە لە گۆڕەپانن بەتایبەتی یەکێتی.

12- لە کۆتاییدا ئەزموونی ئەو جۆرە سەرکردەو دوو هێزلە گورەپان، هێزێکی توند بەلام سەرکردایەتی شلۆق، هێزی یەکێتیش شلۆق و سەرکردەی لێهاتوو، لە ئەنجامدا حسك هەرەسی هێناو یەکێتی دروست بوو، سەرکردەی بێتوانا دەتوانێ ئەو نوقسانیەی پڕ بکاتەوە بەراوێژ و زیاد کۆبوونەوەو گوێگرتن لە بنکەکانی خواروو و بڕیار و هەلوێست دروستکردنی لامەرکەزی.

## حزبی شیوعی کوردستان ( حشك )

ئەو حیزبە بەرەسمی لە لەژێر دروشمی (الدیمقراطیة والتجدید)ی کۆنگرەی (5)ی حشع ڕێکەوتی 1993/6/30دروست بووە، پێشتر لێژنەی هەرێمی کوردستان بوو، لەدوای دارمانی شیوعیەت عەیارەکان هاتنەوە جێ و حزبی شیوعی کوردستان دروست بوو، (کریم احمد) بووە سکرتێری یەکەمی.

پێشترجارێکی تر لە 1944 حزبی شیوعی کوردستان بۆ ماوەیەکی کەم بە سەرکردایەتی (صالح حیدری) هە بووە، بەلاّم بەخێرایی عێراقیایەتیەکە بەسەر کوردستانیدا زالّ بوو هەر بۆوە حزبی شیوعی عێراقی، ئەوەش مانای زۆرە لەدوایی باسی دەکەین .

ئایدۆلۆژیای

عەقیدەی ئەو حیزبە (مارکسی- لینینی) بە هەموو هەلّویست و روانگەکانی ئەو مەدرەسە سەبارەت بە :فەلسەفە و بوونەوەر و دروستکەر،ئایین، مێژوو، دادگەری، ئادەمیزاد، چارەنوس... لەدەست پێکردنی ڕادیۆ راستگۆترە لە عەلمانیەکانی تر قورئان ناخوێنێت.( بۆ زیاتر لە بیروباوەڕەکانی بگەڕێوە مەدرەسەی شیوعیەت).

ڕەوتی(سیرەی):

دیارە بەشی زۆری مێژووی (حشك) مێژووی (حشع)ە، بۆیە دەبێت هەندێ هەنگاو وێستگەی گرنگی ئەو حزبە بخەینەوە یاد:

- لەبارەی سەرەتاکەیلە بوونی بیری بەلشەفیەت راو بۆچوون زۆرە، تەنانەت جار وایە ناوی هەندێك لە زانایانی ئاینیش دێت، رەنگە تا رادەیەکیش راستی تیا بێ، لەلایەك لە دژی بریتانیا لە لایەکی تریشەوە بلشفیەتی(شیوعیەت)ئەوکاتی لە ژێر پە ردەی ئیسلامی ئیشی دەکردهەروەك (مکسیم رودنسن)لە کتێبی (الاسلام والمارکسیە )دان بەوە دەهێنی،شیوعیەکانی عێراقیش لابەلا ئەو سیاسەتەیان بە کار دەهێنا، کتێبێکیان دەرکرد بە ناوی (البلشفیة والاسلام )تیایدا هاتبوو: ((..انصتوا الی هذه الصرخة الإلهیة

واستجیبوا لنداء اخ لینین ))،کادیره بەرزەکانیان بۆ بە ڕەسەن کردنی شیوعیەت ئایـەت و فەرموودەیان بە کار دەهێنا، هەرچەندە لەژێرەوەش زور دژی ئاین بووینە کتێبێکی تریـان بەناوی (أین الله) بلاوکردەوە تیایدا ئەونموونە هەڵدەبژێرین وەك هـۆنراوە: ((وجـاء النـاس جماعات، وسأله عن الجهل، ومن هو الذی سقط، قلنا : ان الله الذی استبد والـذی تخلصـنا من بره وبحره))، یەکەم ئافرەت لە بەغدا کە پێچەی لەسـەری فڕێـدا (ئامینـه رحـاب)ی شیوعی بوو[1].

- لە سەرەتادا زۆربەی ئەو بیروباوەڕانەی عەلمانیەتی رۆژهەلآتی یان رۆژئاوایی لە ڕێی کەمایەتیە ئاینیەکان دەهات، بلاوبوونـەوەی شـیوعەتیش ئـاوابوو، لـە شـام بزوتنـەوەی هەشناقی ئەرمەنی شیوعیەتی بلاو کردەوە، لـە عێـراقیش لـە رێـی پیـاویکی ئاشـوری بەناوی(بیوتر فاسیلی)خەلکی ئەهوازی ئێرانـەوە ئـەو بیرۆکـەی هێنا(یـان راسـتتر هێنـرا ویلایەتی بەسرە)، لە راستیدا لە سەرەتا هەر ویلایەتێك بە جیا کـاری خـۆی دەکـرد، لـە ویلایەتی بەسرەو ناسریەهەریەکە لە یوسف سلمان (فهد)و عبد الحمید خطیب لـە سـالآنی 1927- 1928جـم وجۆلیـان هـەبووە لەگـەڵ ڤاسـیلینی، لەویلایـەتی بەغـداش لـە 1929 وەعاصم الفلیح کارا بووە[2]،بۆیە چەند مێـژووەکی جیـای دروسـت بـوونی بـاس دەکرێ، لەلایەك (الموسوعه السوفیتیه) دەڵێ سالی 1932حزبی شیوعی دروست بووە[3]، لەقاموسێکی تری سۆڤیەتی دەڵێ یەکەم کۆبوونەوەی ناساسایی لەئاداری 1934 بـووە، دەڵـــی لـــە 1932چـــالآکی تریـــان هـــەبووە[4]حنابطـــاطوش بوســـالی 1935یدەگێریتەوە[5]،لەلای خۆشیانسەربردەکە بەوشیوەیە:

+ لە 1933/3/31لیژنەیك بەناوی (لجنـة مکافحـة الأسـتعمار) بـە سـەرۆکایەتی (عاصم فلیح)*دروست بووە،، لەو سەردەمی ناوچەکەو عێـراق بـەپێی (سـایکس- پیکـۆ 1916) و (سان- ریمـۆ 1920) وفرسـای وسـیڤەر لـە 1920و( کـۆنگرەی قـاهرە 1921 ) و(لۆزان 1923) کەوتبووە ژێر دابەشی ئیمپریالیزمی بەریتانی و فەڕەنسـی، تازە عێراقلە 1932 ببوو بە ئەندام لە (عصبه الامم) بە تەزکیەی تایبەتی (ئینتـدابی)

---

[1]بروانه : الاسلام والعلمانیة وأثرهما فی نشأة الدولة العراقیة الحد یثة - رسالة ماجستیر، **نووسەر**ص194

[2]العراق –حنا بطاطو ص66-

[3]الموسوعه السوفیتیه ج18ص56،ص222،ص391ئەو مەوسوعەیە سالی 1935 دەرچووە.

4 قاموسی سیاسی - بونوماریوف – ص126.

[5] بروانە:العراق- حنابطاطو ج2 ص234،90،55

*دەرچووی زانکۆی شیوعی بوو لە (مۆسکۆ) و گەڕابۆوە عێراق

بەریتانی، هەر لەژێر هاوپەیمانی ئینگلیز بوو.. شۆڕشی 1917ی ئۆکتۆبەری ڕووسیاش بە سەرۆکایەتی (لینین) و بانگێشەی ڕزگاری میللەتان و دروشمی دژ بە ئیمپریالیزمی هەڵگرتبوو.

+ لەسەرەتا سنوری عێراقیانە نەبوو، باوەڕیان بە یەکگرتنەوەی هەموو عەرەب هەبوو، هەرواش بۆ یەکگرتنەوەی هەموو کوردستان، دوای ئەو جۆرە دروشمە بە نازی و فاشی و رەگەز پەرست لەقەڵەم درا لەلایەن شیوعیەکان .

+ لەسالی 1935 بووە حزبی شیوعی عێراق، دوای سەرۆکایەتی بە (یوسف سلمان- فهد)* سپێردرا، لەگەڵکەسانی وەك :(عزیز محمد، زکی خیری، عامر عبدالله، مکرم تاڵەبانی، کریم احمد ..) ئەو ڕەوتەیان پێگەیاند.

- هەڵوێستیان بەرامبەر کێشەی کورد چەسپاو نەبوو، جەند جاریك وەردەگەرا، لەدوایدا بەندی کرد بە چارەسەری کێشەی پرۆلیتاریای عێراق.

- کۆمەڵێك ئینشقاقیان تێکەوت،بەپێی هەندێ سەرچاوە زیاتر لە 25 جار لێك جودا بووینەوە، لەوانەی جودا بووینەوە : (کتلة العمل، وحدة النضال،کتلة الی الأمام، لجنة الوطنية الثورية، الأتحاد، راية الشغيلة...) بەڵام سەرەکیەکەی لە 17/9/ 1967 لەسەر دابەشی (چین و سۆڤیەت) ئەوانیش دابەش بوون بۆ قیادە مرکزی (عزیز الحاج- خەتی چینی) (لجنە مرکزی- عزیز محمد- خەتی سۆڤیەتی) زۆریش دژایەتی یەکیان کرد.

- لە ساڵی 1963 (عبدالسلام عارف) زۆر بە توندی لێیدان و هاتنەوە ناو شۆڕشی کورد.

- تا دوای ڕێکەوتنی ئازار بە یەك لایەنی بەرەیەکیان لەگەڵ حزبی بەعس جاڕدا لەیادی 17ی تەمووزی 1973.

- لە هەمان ساڵ تەنها لە بەشی کوردستان چەکیان لە حکومەت وەرگرت، بەڵام لە سەرتاسەری چەك کران بە فەرمانی بارزانیەوە .

- لە شەڕی چارەنووسی 1974- 1975 لە بەرەی حکومەت بوون بە چەکەوە دژی شۆڕشی کورد.

*لە بنەچەدا مەسیحی بوو ئیعدام کرا .

- دوای شکستی 1975 حکومەت سیاسەتی (ضغط على القواعد وتقريب القيادة)یان لەگەڵ بەکارهێنان.
- لەساڵی 1978 لەدوای قەلۆش بوونیان دیسان هاتنەوە ناو شۆڕشی کوردستان و جلی کوردی و جەمەدانی باوی هاتەوە، دروشمی کوردایەتی پەیدابۆوە.
- لەساڵی 1980 چوونە ناو هەردوو بەرەی دژ بەیەکی (جود- پارتی و حسك) و (جوقد- یەکێتی)، جود لە 1981/1/28 دروست بوو، جوقد لە 1980/11/2دروستبوو.
- لە 1982/5/1 کارەساتی قرناقەیان بەسەرهات لەسەر دەستی یەکێتی نزیکەی 100 کادیری چالاکیان لە دەست دا، هەریەکە لە (کریم احمد[*]- احمد بانی خەیلانی) سەرکردەکانی تر دەستگیر کران.
- کۆنگرەی (4)ی (حشع) زۆر سەخت بوو، نیمچە ئینشقاق و وازهێنان ڕویدا، ئەو ڕۆڵەیان کەم بۆوە، لەدوای ئاشت بوونەوە لەگەڵ (ینك) و پێکهێنانی بەرە لەگەڵی لەسالی 1988حشع ڕۆڵی لاواز بۆوە تا ئەو ساتەش .
- لەدوای وەستانی جەنگی عێراق- ئێران لە 1988 چوونە دیوی ئێران.
- لەدوای داڕمانی شیوعیەتی جیهان بە مەدرەسەوە لە 1991 زیاتر فکرەی دروست کردنی حشك هاتەوە مەیدان بەتایبەتی ئەو دەنگەی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان (21123) دەکا 2٪، ئیتر لەلیژنەی ئیقلیم بەرەو حزبێکی سەربەخۆی کوردستان وەڕێکەوت.
- <u>سەربردەی لیژنەی ئیقلیم:</u> دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1967 لە کۆنگرەی (3) بڕیاری دروست کردنی لیژنەی ئیقلیمی کوردستانی حزبی شیوعی درابوو.

[*]وادیار بوو بەجوریك دڵنیا کرابوونەوەلەلایەن یەکێتی کە ئەو هەڵمەتە حشع ناگرێتەوە، بۆیە (کریم احمد)کەلەلای ئێمە دیل بوو پشتی لێ کردبووین هەردووبارەی دەکردەوەو دەی ووت : ((لاحول ولا ...والله بابە باش،ئەدی کوا بەڵێن کوا پرولیتاریاکەمان ...))، بەشی عێراقچی ناوکۆمەڵە قایل نەبوون بەو لێدانە و مەلا بەختیار ئەو فەرمانەی جێ بەجێ نەکرد لەمەڵبەندی شارباژێری(حاجی مامەند )لەگەڵ بەهائەدین نوری ڕێکەوتن شەر نەکەن ولە ئەنجاما دەمەقالیەکی زۆر توند لە ڕێی جیهازی بێ تەل لەنێوان ملابختیار و نەوشیرەوان مستەفا روویدا کەسەرپەرشتی هەڵمەتی دژبە حشعی دەکرد، دوای مام جلال هاتە سەر خەت وەقی بە هەردوولا دا و ووتی هەنگاوی هەردوولاتان راستە!!هەریەکەتان بەدوای کاری خۆتان بەردەوام بن کوتایی بەکێشەکە هات .

- له راپەڕینەکان بەشدار بوو، ئەندام و لایەنگرانی پاکتر و پابەندتر بوون، له دیارده دزێوەکانی تالاّن، ئاودیوکردن، دزی، ڕاووڕووتی...دووربوون .

- له کۆنگرەی (5)ی شەقلاوه 1993 حشع بووه چەند پارچەیەك:

1- حشك- کریم احمد.

2- حشع- حمید موسی.

3- پارتی کاری سەربەخۆ- ابو حکمت- محمد حلاق.

- لەدوای ئەو دارِمانه جیهانیەی شیوعی ئەو حزبه بەرەو زیاتر کزیەو کەمتر ڕۆڵی ماوه.

سەرجەم سەرکرده بەکارەکانیان :عاصم الفلیح (1934- 1935،یوسف سلمان (فهد1939- 1949)،جاسم الطعان،، زکی وطبان- (1948- 1949)، بهاءالدین نوری (1950- 1953)، حمید عثمان(1954- 1955)، سلام عادل، عزیز محمد (1964- 1993) لەدوای د مجید موسا وکریم احمد وئیستاش د کمال شاکر ..

پەند و ئەزموون:

لەبەر ئەوەی باسەکەمان لەسەر حزبه کوردستانیەکانی هەموو بەسەرهات و ئەزموونەکانی (حشك)یش لەناو (حشع)ه ئەویش عێراقیه، بەلاّم ئەوەی گرنگه خەباتی ئەو چینایەتی بووه و کێشەی کوردیش نەتەوایەتی بووه، هەرچەنده زۆربەی سەرکرده و کادیرانی کورد بوون، بەلاّم ئەگەر وەك ئێستا (حشك) دروست بوایه جۆرەکاریگەرو ئەنجامێکی تری دەبوو، هەموو خاڵه لاوازەکانی سەبارەت به کورد لەوه کۆدەبێتەوه (تضحیة الجزء من أجل الکل) که کورد تیایدا (جزء) و ڕووخانی سەرمایەداریش (کل) بوو،یان له باشترین دوخیدا کوردستان (جزء) و عێراق (کل) بوو!، بۆیه گەلێ جار دەیان ووت به پێی مەرج وپێناسی ستالین بۆ (ئومه) ئەوا کورد ئومه نیه بۆیه شایستەی بەدەوڵەت بوون نیه ، هەڵوێستەکانی وێچووی ئەزموونی حزبی شیوعی تونسی بوو که له سالی 1919وەك درێژکراوەی حزبی شیوعی فرنسی دروست کرا، فرنسا وئیتالیاش داگیرکەری ئەو ناوچانه بوون بۆیه حزبی شیوعی تونسی نەیتوانی ئەو دوو دۆخه به سەلامەتی کۆ بکاتەوه له

ئەنجاما کەوتە بەرەی فرنسی لەدژی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی تونسی، هەرچەندە لەسالی 1934لە حزبی شیوعی فرنسی جیا بۆوە بەلاٌمئەوپەلٌەیە لە کۆلٌ مێژووی ئەو حزبە نەبۆوە تا گەشە بکا، بەو شێوەیەشمێژووی حزبی شیوعی نەك هەر دەردەسەری بوو بۆ کورد، بەلٌکو بۆ خۆشی، لەبەر هۆیەکی سادە ئەوان لەو واقعە دەژیان، کەچی بە عەینەکی سۆڤیەت دەیان ڕوانیە ئەو واقعەی خۆیان و جیهان،لەو بارەیەوە با گوێ لە ڕای فهد ڕاگرین لە بارەی هەر ڕەخنەیەك لە سەرکردایەتی ستالین و دەلٌێ: (ئەوەی ستالین دەیلێ ودەیکا هەر ئەرکی شیوعیەکانی سۆفیەتی نیە وەك ئەرکێکی موقەدەس ودەق جێبەجێی بکەن بەلٌکو ئەرکی هەموو پڕۆلیتاریای جیهانە پەیڕەوی بکا )[1]،هەموو ئەوانەو بیرو باوەڕێکی ئاوا نامۆ بە خەلکی کوردستان کە هەفتانە یەك ملیۆن خەلك خۆبەخشانە دەچنە گوتاری هەینی هەر ئەو ئەنجامەی دەبێ ولەگەلٌ 11 حزب ولایەنی تر ئینجا یەك کورسی پێ هاتوە .

[1]مؤلفات الرفیق فهد –حزب الشیوعی ولا إشتراکیة الدیموقراطیة ص23

## پارچەكانی تری كوردستان

لە پارچەكانی تری كوردستان نمونەی دوو حزبی تریان بە كورتی باس دەكەین بـەڵام لـە چوارچێوەی حزبە كوردستانیەكان نین، هەر بۆ ئەوەی شتێكی سەرەتاییش لەو دیو ئەو دیو بزانری :

## 1- كوردستانی ئێران

باری كوردستانی ئێران تایبەت ترە لە بەشەكانی تـر، چـونكە لـە سـەردەمی جـەنگی چالدێرانی 1514وە ئەو بەشـەی كوردسـتان كەوتۆتـە ژێـر دەسـەڵاتی فارسـی، جـاران دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەكان مانای فەرمانی ڕاسـتەوخۆ نـەبوو، بۆیـە دەسـەڵات زیـاتر بـۆ ئیمارەتەكان دەگەڕایەوە، بەڵامدەسەڵاتی ئیمارەتەكانی كوردی بەشـی عوسمـانی بـەهێزتر بوو، هەرچەندە هیچ لایەكیان پرۆسەی بەفارس كردن یان بە تورك كردنیان ئـەنجام نـەداوە، چونكە سەردەمی نەتەوایەتی و فەرهەنگی ناشناڵی نەبووە .

لەسەرەتای سەدەی بیستەمیش كە سەردەمی چارەی خۆنووسی میللـەتان بـوو، ئـەوا ئێرانی ئەوسا لەگەڵ بەریتانیا و ڕۆژئاوا هاوكار بوون، بۆیە لەو نەخشانەی كە لـە چـواردە خاڵەكەی ویلسون و بانگەوازی سەربەخۆیی فەڕەنسی و بەریتانی هاوبـەش لـە 1918 و دواییش سیڤەری 1920 و هەتا سایكس- بیكۆی 1916ش دیوی كوردستانی ئێرانـی نەدەگرتەوە، ئەوكاتیش ئێران زۆر لاواز بوو، ئەگەر كـورد خـاوەنی سـتراتیژ و بەرنامـەی بەهێز بوایە سەربەخۆیی زۆر سانابوو، بەتایبـەتی زۆربـەی خێڵـەكانی كوردسـتانی ئێـران لایەنگیری شێخ محمود بوون، بەڵام هەروەك ئێستاش سـەركردایەتی كـورد هێشـتا نازانـێ ڕزگاری لەكوێ وكەی دەست پێ دەكا وە هەروا كۆدەكـانی بزركـردووە، هەنـدێ ڕاپـەڕینی ئەنجام دا، لەوانە:

- سـەرجەم ڕاپـەڕین و شۆڕشـەكانی كوردسـتانی ئێـران : 1918، 1920،، 1925، 1927، 1929، 1930، لـە هەریەكـە لـە ناوچـەكانی موكریـان،

هەورامان، ورمێ، گوڵبان..)، گرنگ ترینیان (سمکۆی شکاك بـوو نـاوی لـەخۆ نـا شـای کوردستان و رۆژنامەی کوردستانی هەبوو).

- ماوەیەك لە سەرانسەری کوردسـتان بزوتنەوەیـەکی دیـاری وانـەبووە، تـا چـلەکان ئینجا کۆمەڵەی ژ.ك - ژیانەوەی کورد- لە 1942/8/16 بە بنـەمای ئیسـلامیانە لە شاری مهابـاد دروسـت بـوو، لـە 1945/8/16 (ژ.ك) بـوو بـە(حزبی دیموکراسـی کوردستان- حدکا)، بە دروشمی (حەقیقەت، عدالت، تەمەدون) ئـەو دروشمـە ئیسـلامیانە بەردەوام بوو تا قازی محمد لەسێدارە درائینجابەرە بەرە دروشمی سیکویلارانە جێی گرتەوە، ناوی ئەو حزبـە لەدووسەرچـاوە دێـت، یەکـەمیان:ئـەوناوە بـەکارهاتووە لـە دەوروبـەری 1918- 1920 دووەمیان لە ئازەربیجانیش فرقـەی دیمکراتـی هـەبوو لـەو دەمـیش کوردەکان زور لەژێر کاریگەری ئەزموونی ئازەر بوون .

- لە 1945/10/25 یەکەمین کۆنگرەی حدکا لە مـەهاباد بەسـترا، قـازی محمـد کرایە سەرۆکی حزب. - لە ساڵی 1946 کۆماری مهابـاد دروسـت بـوو دوای نزیکـەی ساڵێك شکستی هێنا.

- وەك لەمێژووی (پارتی) باسمان کرد (حـدکا) لـە دۆخێکـی تـەنگ دابـوو لـەکاتی شۆڕشی ئەیلول بەهۆی ئەو پەیوەندیەی نێوان سەرکردایەتی ئەیلول و شای ئێـران، بۆیـەش ناوەرۆکی لەگەڵ (پارتی) دیوی عێراقی زۆرجیایە.

قۆناغی نوێی:

باری دەولی و ئیقلیمی، باری ناوەخۆش کپ و بێدەنگی بوو لە ئـەنجامی ئـەو فشـارە زۆرەی ساواکی شای ئێران، بەلاّم جم وجۆڵی پێشمەرگایەتی (یەکێتی) کەمـە ئومێـدێکی بۆ پەیداکردبوون.

- ئەوکاتی سەرکردەکانی (حدکا) لەدەرەوە بـوون (هـێمن مهابـادی، عبـدالله حسـن زادە) لەعێراق بوون، د.قاسملو لە ئەوروپا بوو، چالاکیەکی وا بەو شێوەیان نەبوو.

- لـــە ســـاڵی 1978 لەســـەر ئـــەو وتـــارە ناشـــیرینەی کـــە لەلایـــەن وەزیـــری رۆشنبیری(داریۆش هومایۆن)ەوە نووسرا دژی خمێنی لە زانکۆی تەورێز خۆپێشـاندان کـراو شۆڕشەکە بە داینەمۆیەکی ئیسلامیانە گڵپەی گرت، 18 مانگی خایانـد، کوردسـتانیش

له (3) مانگی دوای بەفراوانتر بەشداری کرد[1]، تودەو بەرەی نیشتمانی و فـدائی خـەڵق و مجاهدینی خەلق... هاتنە مەیدان.

- لەدوای کلّپەی عاشورای 1979 سەرکردەکانی (حـدکا) و (د.قـاسملو) لـەڕێگای کوردستانی عێراق گەیشتنەوە دیوی کوردستانی ئێران.

- لــەدوای ســەرکەوتنی شۆڕشــی ئیســلامی لــەئێران لــە 1979/2/11 لــە کۆبوونەوەیەکی فراوانی جەماوەری لە مهاباد ئاشکرا بوونەوەی (حدکا) ڕاگەیەنرا لەلایــەن د.قاسملوی سکرتێری حیزب.

- لەدوایدا هەریەکە لە (عبداللە حسن زادە، کریمی حسامی، غـەنی بلوریـان، هـێمن مهابادی، صادق شرف کەندی، سید رسوی بابەگەورە،...) دەورو چالاکی خۆیـان هـەبووە لە قوناغە جیاجیاکانی رەوتی حدکا.

- لە هەمان کاتدا (محمـد مهتـدی) کـە پێشـتر (حـدکا) بـوو (کۆمەڵـەی یەکسـانی کوردستان)ی ڕاگەیاند بە تیۆڕێکی مارکسیانە و دوای بوو بە (کۆمەڵەی زەحمەت کێشانی کوردستان) .

- هەردوو زانای ئایینی (م. احمد مفتی زادە) و (شێخ عزالدین حسـێنی) لـە سـنە و مهاباد وەك دوو سەرکردەی ئایینی سەریان هەڵدا.

- کوردستانی ئێران بارێکی تایبەتی وەرگرت هەر لەگەڵ ڕووخانی شاه، سـەربازگەی مهاباد لەلایەن (سەرگورد عەباسی- دوای تیرۆر کـرا) تەسـلیمی خـەڵکی مهابـاد کـراو هەموو خەڵك چەكدار بوون.

- سێ شەڕ لە: پاوە، سنە، نەغەدە، هەڵگیرسا، بەڵام کۆنترۆڵ کرا.

- تەوەری (شێخ عزالدین- کۆمەڵە)ش لە یەکێتیەنزیك بـوون، بـەڵامنێوانی حـدکا و یـەکێتی سـارد بـوو بـەو تێڕوانینـەی کـە گوایە(کۆمەڵـەی زەحمەتکێشـان) درێـژکراوەی کۆمەڵەی عێراقە و (جلال تاڵـەبانی) دروسـتی کـردوون بـۆ دووبـەرەکی، هەرچـەندە بـە تەقویمی خۆیان کۆمەڵەی ئێران لەپێشکۆمەڵەی عێراقیش دروست بووە، بۆیە (حـدکا) لـە (حسك) نزیـك تـر بـوو لـە پاداشـی ئەوەشـا لـە سـالی 1980دانوسـتانێکیان لەگـەڵ حکومەتی عێراقی بو حسك رێکخست.

[1] بڕوانە: بەهمەن سعیدی-5سال لەگەڵ عبداللە موهتەدی ل93

- سەرکەوتنی ئیسلام لەئێران کۆمەڵێك دەرگای قوفڵ دراوی بۆ کورد کردەوە بە هەموو لایەك.

- لەدوای ئەو شەڕانە چەندین وەفد دروست بوو هات و چۆی کرد تا گەیشتن بە ئامانجێك کە شورای ئیسلامی لە شارەکانیان دروست بکەن، هەر کورد خۆی سنورەکان بپارێزن.

- لە راپرسیەکەی 1979ی سەرانسەری بۆ بناغەدانانی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان بێجگە لە (ملا أحمد موفتی زادە) لایەنگیری کۆماریکی ئیسلامی نەکرا و زیاتر بەلای عەلمانیەت بوون.

- ئەو ڕەوتە عەلمانیەی حزبەکانی کوردستانی ئێران مایەی نیگەرانی سەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، ئەو عەلمانیەتە وای کرد خەڵکی کوردستان سوود لەو گۆڕانە مەزنە وەرنەگرن کە هیچ میللەتێکی دوور و نزیك نەبوو سودی لێ وەرنەگرێ.

- جم وجۆڵی شەڕ و کەللەڕەقی دەستی پێکرد، بەڵام د.قاسملۆ دەیویست بە ئاشتیانەو سوود لە موئەسساتی نوێ وەرگرێ و خۆی بۆ (مجلس خبرگان) هەڵبژارد و دەریش چوو.

- لە سەرەتای 1979/8 لەڕێی ناوچەکانی گەرمیانی عێراق (گوایە قالە فەرەج) بەدەستی عێراق (کە زۆر مەبەستی بوو یەکەم شەڕ هەڵگیرسێ لە کوردستانی ئێران) چوونە ناو پاوەو (پۆلێك پاسداریان کوشت و دواییش سەریان بڕین)، کلپەی شەڕ دەستێ پێکرد زۆر بە سەختی.

- لە 1979/8/19 جەنگی سەرتاسەری جاڕدرا زۆر بە هەڵچوونیشەوە (3) مانگی خایاند.

- ئینجا دەوری (حدکا) زیاتر خەملی و فرە ناوەند و (شێخ عزالدین) بەرەبەرە نزم بوونەوە.

- ئەو شەڕە زۆر دەنگی دایەوە، زۆربەی شارەکانی کوردستانی ئێران کەوتەوە دەست حکومەت.

- (ا. تالەقانی) ئیمام جومعەی تاران ئامۆژگاریەکی کراوەی بۆ کورد نارد تیایدا هاتبوو ئێوەی نەوەی سلاح الدین بەگوێی بێگانە مەکەن لە دوایدا بەتەنها دەمێننەوە،

(عبدالحميد الكشك)و سەرکردە کوردەکانی عێراقیش لەوانە مام جەلال و کاك مەسعودیش هەمان ئامۆژگاری کردن.

- (حدکا) خۆی ڕێکخستەوەو دەستی بە چالاکی کردو زۆر شوێنی تری وەرگرتەوە، یەکێتیش (وساطة)ی کرد، بووە هۆی دانووستان.

- (أ. خومەینی) گەلاڵەیەکی بلاوکردەوە مادەی چاکی تیابوو (لە سەردەمی خاتەمی هەندیکی جێبەجێ کرا) ئەوکاتی لەلایەن هەموو لایەنەکان چاك پەیڕەو نەکرا.

- سنورەکانی دیوی عێراق بەرزەفت نەدەکرا (شەڕی سنە) جارێکی دی دەستی پێکرد.

- ئەوجارە شەڕی بەڕاستی دەستی پێکرد بێوەستان، پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقیش کەوتە بەرەی ئێران بەهۆی دەرهێنانی (تەرمی مەلا مستەفا بارزانی) گوایە (سید ڕەسوی بابەگەورە) بە هاوکاری (مخابراتی عێراق) پێی هەڵسابوون.

- لە ساڵی1980جەنگی عێراق- ئێران دەستی پێکرد، (حدکا)ش بەتەواوی شکا لە بەرامبەر هێرشی (پاسدار و قیادەموقەتە- وەك خۆیان لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی دەیان گوت)، یەکێتیش هاتە پشتیوانی و عێراقیش زیاتر یارمەتی دەدان.

- دەبێ بگوترێ (حدکا) پێشنیاری شەڕوەستانی کرد لەگەڵئێران لە ساتە تەنگانەکانی سەرەتای هێرشی عێراق.

- لە کۆنگرەی 1980/6/21 گرۆهی (7) نەفەری (غەنی بلوریانی) پەیوەندی بە توودە ئاشکرابوو، جیابوونەوە لەگەڵکۆمەڵەش جارجار شەڕی براکوژی ڕوویدەدا.

- لەساڵی1980 بە فرۆکەی عێراقی لە زیندانیەکانی (حدکا) درا لە ناوچەی دۆڵەتوو تیایدا کۆمەڵێك دیلی پاسدارو ئەرتەشی ئێرانی لێ کوژران،حدکاناڕەزایی دەربڕی، وا پێدەچوو لە نێو ڕیزەکانی حدکا سیخوڕی مخابراتی عێراقی ئەو دانانەی کردبێ، ئەگەر چی بەشێکیش پێیان وابوو سیناریۆکە فراوانترە.

- لە ساڵی 1982 لە هێرشە گەورەکانی هاوبەش (پارتی دیموکراسی کوردستانی عێراق) و (پاسداران) هێزەکانی حدکا خراپ تێشکاو (ینك) پاڵپشتی کرد.

- کۆمەڵەش لە 1983 یەکجاری چەکی داناو بووە حزبی کۆمەنیستی ئێران، دوای بەشێکیان گەڕانەوە .

- دەرکەوت (حدکا) تەواو لەگەڵعێراق پەیوەندیدارەو ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە دروستکردنی دانوستانی نێوان (ینك) و حکومەتی عێراق.

- بارەگاکانیان کەوتە کوردستانی عێراق،جارجار لە شەڕەکانی براکوژی لە قازانجیینك)بەشدار دەبوون، لەدوای ڕاپەڕینیش بەشداریەکی زیاتری شەڕی نێوان (ینك) و (بزوتنەوەی ئیسلامی) کرد لە قازانجی یەکێتی بەتایبەتی لە تەوەرەی کۆیە، ئەگەر ڕاست بووبێ کە (م.علی عبدالعزیزرابەری بزووتنەوە)گوایە (6) ئەندامی(حدکا)ی تەسلیم بە ئێران کردووە واپێدەچێ ئەوبەشداریە تۆڵەی ئەوە بووبێ.

- (حدکا)جارێکیترئینشقاقیان کرد(جلیل گادانی-ئەقلیەت)جیابووە.د.قاسملۆلە1989/7/13لەنەمساتیرۆرکرا،لەدوایدا سادق شرف کەندی هاتبووەجێیلە1992/9/17لە بەرلین تیرۆرکرا، بەپێی گومانی حدکا لەڕێی دڵنیای دانووستانی و هەڵخەڵەتێنران و لەلایەن ئێران تیرۆر کران،جاریش وایە بەناڕەسمی گومانیان لە هەندێسەرکردەی کوردیشە .

- جارێکیتریەکیان گرتەوە ودوای ماوەیەك دیسان لێك جیابوونەوە وئەوجارە عبدالله حسن زادە ئەقەلیەتە هەرچەندە ئەندامە ڕەسەنەکانی حیزب زیاتر لەگەڵ ئەون .

- ئێستا (حدکا) دیسان کەرت بووینەوە،زۆربەی لایەنە کوردیەکانی ئێران دووچاری ئەو پەرتەوازەییە بووینە ، بۆیە چالاکیشیان زۆر لاوازە .

ئایدۆلۆژیای:

نەتەوەیی+ چەپێکی مام ناوەندی + سۆشیالیستێکی دیموکراسیانە، هەڵوێستی بەرامبەر ئیسلام و عەلمانیەت میانڕەوە[1]، واتە تێڕوانینی کلاسیکیە،بەندە بە رارەوی عەلمانیەتی (هۆلیوکی) واتە نەلایەنگیری ئاینەنە دژیشە، ئاین و دەوڵەت و ژیان لێك جیادەکاتەوە، هەروەك لە ڕاپرسیە بەناوبانگەی (شەریعەتی ئیسلامی - 1979) دەرکەوت ئەوان دەنگیان نەدا بۆ ئیسلامی، ئەوسا لەجیاتی کۆماری ئیسلامی داوای

---

[1]بۆیە ناومان برد بە عەلمانیەتی میانڕەو چونکە عەلمانی توندڕەویش هەیە، کۆمەڵەی ئێران هەڵوێستی بەرامبەر ئاین هەڵوێستێکی مارکسیە و لەسەرەتای دەست پێکردنی ڕادیۆ قورئان ناخوێنێت، ئەوە نمونەیەکی توندڕەوی عەلمانیە، هەموو ئەوانەی بەربەرەکانی ئیسلامی و دیاردەی ئیسلام دەکەن چ بە نووسین چ بە یاسایی و سیاسی، ئەوا عەلمانیەتی توندی پێ دەوترێ.

سیستەمێکی سۆشیالیستی ئێستاش دیموکراسی دەکەن،ئەوانیش پـێش شکسـتی بلـۆکی سۆڤیەتی لە مارکسی نزیك بووینە،تەنانەت (د.قـاسملۆ)ش کـە بـە سـەرکدەیەکی میلـی وتێگەیشتوو هەژمارکراوە فکری مارکسی بوە[1]،پێشی وابوو ئیمپریالیزم ورۆژئاوا هۆکاری مەینەتی کوردن[2] .

دروشمیان:

لە نەتەوەییدا: دیموکراسی بۆ ئێران خودموختاری بۆ کوردستان، ئیسـتا بـەو شـێوەیە گۆڕاوە :وەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد لەچوارچێوەی ئێرانێکی فیدرال ودیموکراتدا .لـە کۆمەڵایەتیش: ڕووخـانی ئیمپریـالیزم (بەتایبـەتی ئـەمریکا)[3]، ئێسـتا گـۆڕاوە لـەدوای داڕمانی بلـۆکی سۆشیالیسـتی و سـۆڤیەت هـەروەك حزبـە کوردسـتانیەکانی تـر، وەدی هێنانی کۆمەلگەیەکی دیموکراتی سۆشیالیستی .

## ئەزموون و پەند

خالی بە هێزی کوردستانی ئێران ئەوەیە کە لە مێـژووی شۆرشـی کـوردی (عێـراق) هـەر یارمەتیدەر بووینە لەسەر ئاستی سەرکردایەتی ومیللەتەوە،لە سالی 1963 لەگەرمـەی هەلمەتی جینۆسایدکردنی کورد بەهۆی گەلـەکۆی وولاّتـانی عەرەبئـەوا هێزەکـانی حزبـی دیمکراتی کوردستانی ئێـران بە(احمـد تۆفیـق)ی سکرتیرشـیەوە هـاتن یارمـەتی شۆرشـی ئەیلولیان دا، ئەوە لەکاتێك بووە کە بەشێك لە کوردی ئیراق جاشایەتیان دەکرد، هـەروەك لەو دواییەش بۆ ئەنفالی دوەم بەعسیەکان بە یارمەتی راستەوخۆی زیاتر لە 350 فەوجی خەفیفەی کورد ،لەکاتێکدا کوردستانیئێران باوەشیان بـۆ کوردسـتانی ئـیراق کردبـۆوە بـە هەموو شێوەیەك، دەبێ ئەوەش بلێین زۆرشەرمەزاری بۆ ئیمەی کوردی ئیراق بوو لە پای ئەو

---

[1] بروانە :نیوسەدەتیکۆشان ل41

[2] بروانە:د عبدالرحمن قاسملۆ-کوردوکوردستان ل291

[3] جاران ئەوانیش وەك کوردستان ئیراق وتورکیا شەڕ بوو لەسەر ئەوەی کامیان زیاتر دژ بە ئیمپریالیزمـە نـەوەك حزبـە شیوعیەکان توومەتی سەر بە ئیمپریالیزمیان بدەنە پال،بۆیەلەسەرەتای کردنەوەی رادیۆی دەنگی کوردسـتان(حدکا)دەی ووت :تێدەکۆشین لە پێناو رووخانی ئیمپریالیزم بە تایبەتی ئەمریکا،سەرەرای ئەوەش حزبیتوودە د.قاسملۆی تۆمـەتبار کردبوو گوایە 9ملیۆن دۆلاری لە ناتۆ وەرگرتوە،جلیل گادانی لە کتیبی(50 سال خەبات ل249) دەلی:خـەباتی بـێ ووچانمان دژ بە ئیمپریالیزم وبەتایبەتی ئەمریکابوە..

چــاکانەی ئـــەوان لـــەنیو هەنـــدی حزبـــی کوردســـتانی خۆمـــان (بـــە عـــەلمانی وئیســـلامیەوە)هاریکاریان لەگـــەڵ پاســـداران وئیتلاعـــاتی ئێرانـــی دەکـــرد بـــۆ لێـــدانی کادیروکەسایەتی کوردستانی ئێران کەلەکوردستانی ئیراق (بە رێکەوتن) دانیشتبوون .

لە خاڵە لاوازەکانی کوردستانی ئێران:

**یەکـەم- شـێخ عزالـدین حسـینی:** مامۆسـتایەکی ئـایینی بـوو، گونجـاویش بـوو لەگەڵپێشهاتە نوێیەکانی ئێران..کەچی:

1- زۆر بەخێرایی خۆی لەدژی شورشی ئێران ساغ کردەوە.

2- لایەنگیری کۆمەڵە و مارکسیەت و عەلمانیەتی کرد لە کوردستان و لە ئێرانیش.

3- بەفتوایەکی ڕەسمی خۆی لایەنگیری شەریعەتی ئیسلامی نەکرد بۆ دەستوور.

4- لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بە (شێخ الاحمر) ناودەبرا.

5- لە دواییدا جەماوەری نەما لەسەر ئەو ڕێبازە، عەلمانیەکانیش پشتیان تێکرد، بەڕاستی ئەزمونێکی زەقە لەسەر بەکارهێنانی ئایین و زانایانی ئاینی بۆ مەرامی سیاسی، عەلمانیەکان تا ئیشیان پێبوو تەڕو قۆزبوو، بەکاریان دێنن لەگەڵ هەر گۆڕانێك بە سەرگەردانی بەجێیان دێڵن، بۆیە چارەنووسی هەموو مامۆستایاکی ئایینی بەو شێوازە لەدونیا وادەبێت لە قیامەتیش خۆیانچاکتر دەزانن چارەنووسی چیە.

**دووەم- حدکـــا :**

1- د.قاسملو بەپیاوێکی ژیرو دووربین ناسرابوو، بەڵام بە هەرهۆیـەکی نـاوەکی بێـت یان دەرەکی لە قەبڵاندنی واقعی نوێی ئێران بە هەڵەدا چوو بوو، هەموو نەخشە و پلان و ستراتیجیەت و پەیوەندیەکانیان بنیات نـابوو لەسـەر ئـەو بنچـینەی کـە (ڕژێمـی شـێوە ئیسـلامی) تەمـەنی زۆر کـورت و شـازە، 14 سـەدە گەڕانەوەیـە بـۆ دواوە، ئـەوە ڕای سەرجەم عەلمانیەکانی کوردستان بوو.

2- هەر بۆیەش نەگونجان لەگەڵ سیستەمی نوێی ئێـران و پـێش هاتـە جیهانیـەکان لەڕوانگەی عەقیدەیەکی سیاسی، نەك لە روانگەی کوردایەتیەوە.

3- گوایە حزبەکان دروست بوون بۆ مافی کورد.. ئەوە ئامانجە و حزبەکانیش ئامرازن، هەموو لایەك دەیلێنەوە، جا پرسیاری ستراتیجی ئەوەیە، (حدکا) خۆی ئامڕازەکە بوو، بۆچی عەقیدەی ئەو حزبەی لە عەلمانی نەگۆڕی بۆ ئیسلام؟ مادام لە خزمەت ئامانجدا بوو، ئەگەر بە تاکتیکیش بوایە مادام لەلایەن دەوڵەتی مەرکەزی ئەو جۆرە عەقیدەیەی عەلمانی نامۆ بێت؟

4- (حدکا) چووە ریزی عەلمانیەتی ئێرانلەگەڵ مجاهدینی خلق و فدائی خەلق بە پشتیوانی حکومەتی بەعسو کە هەموویان دژی کورد بوون، لە دژی (کۆماری ئیسلامی)یش بەرەیەکیان پێك هێنا بە ناوی (شورای مقاومت ) دوای مجاهدین بەحدکا قایل نەبوو ودەری کرد، بەو شێوەیە کێشە فکریەکەی خستە پێش کێشەی کورد.

5- واتە کوردستان دیسان بووە بەلاگێڕی عەقیدەو بیرۆکەی هێنراو.. کوردستان بووە سەنگەرێکی دژە ئیسلام (مجاهدین، فدائی، مارکسیزمی هاوچەرخ، توودە، بەرە،...)، باری کوردایەتیەکە قورستر بوو.

6- لە بیرەوەریەکانی زۆربەی سەرکردە کوردەکانی عێراق هاتووە گوایە ئامۆژگاری (حدکا) کراوە کە هەرچی داواکاریەکیان هەیە بە چەك و شۆڕش داوای نەکەن بە ئاشتیانەو سوود لە شوورا و ئەنجومەنی شارەوانی و هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی وەرگرن وەك ئێستا پەیڕەو دەکرێ زۆر بە بەرهەم ترە لەو ئەنجامەی (حدکا) پێ گەیشتووە.

7- سنوورەکانی عێراقیان پێ بەرزەفت نەدەبوو، دەستی عێراقی دەگەیشتە قوڵایی ئێران لەرێی کوردستان، بەپێی بەرژەوەندی خۆی ڕووداوی دروست دەکرد، هەردەم بەرژەوەندی ڕژێمی بەعسی عێراقیش لە دژی ستراتیجیەتی کوردە.

8- لە هەڵبژاردن دۆست و دوژمنی کورد، عێراقی بەعسی فاشیزمی دژ بە کورد و هاوشێوەکانی بەدۆست وەرگیرا.

9- هەر لە چوارچێوەی کوردیەوە تا (حدکا)دەسەڵاتی هەبوو کەمتر چاکەی لایەنەکانی کوردی عێراقی لەچاو گرت کە یارمەتی دابوون،هەرچەندە هەندێ لایەنی کوردی عێراقیش لەدوای ڕاپەڕین ئەو چاکەیەی کە کوردی ئێران لەکۆنەوە تا ئەو ساتەش لەگەڵ تەواوی کوردی ئیراقی کردوە باش لەبەرچاو نەگرت وبەکرێگرتەیی نزیکەی

207کادیرو پێشمەرگەی لایەنــە ئێرانیــەکانیان تــیرۆر کــرد[1]، چــەند جــارێکیش هێــزی ئێرانیان بەسەروەکردن.

10- وەکو هەموو حزبە عەلمانیەکان زۆربەی ناکۆکی و لێك جیابوونەوەکانیان لەسەر عەقیدەی چەپی و کێشەکانی سۆشیالیستی بوو کــە هــیچ پەیوەندیــەکی ئۆرگــانێکی بــە کوردایەتی نەبوو[2].

11 - نــەیتوانی باوەشــی فــراوانتر بکــات بــە ڕاســتەقینەی ســەنگەری ئیســلام و کوردایەتی بکاتە یەك و هەریەکە لە (احمد مفتی زادە) و شێخ عزالــدین حســێنی خانــەی خۆیان بۆ دابنێ.

هەڵوەستە لەسەر هەندێ لەو خاڵانە:

1- (حــدکا)ش وەك ئــەزموونی کوردســتانی عێراقلــە ســەرەتادا نــەیتوانیوە ببێتــە حزبێکی جەماوەری، بۆیە هەوڵی داوە سەرکردەیەکی روحی بۆ خۆی دروست بکا، هەروەك لە دیوی عێراق مەلا مستەفا ئەو چەترە بەهێزە بووە، بــەڵام لــە ســاتەکانی ئــەو دواییــە زیاتر عەلمانی زاڵ بــووە بۆیــە بەرەبــەرە ئــەو رەســیدە بــەهێزە لاواز دەکــرێ، حزبەکــەش لەگەڵیدا لاواز دەبێ، هەروەك دەبینین رێژەی لایەنگیری (پدك)ی عێراق لە سەردەمی مەلا مستەفا زیاتر لە90٪ی میللــەتی کــوردی لەگــەڵ بــوو، کەچــی ئێســتا وا دەقــەبڵێنری کە30٪ کەمتر بێت، لەدیوی کوردستانی ئێرانیش هەروابوو، یەکەم جار قازی محمد و بەو دروشمە ئایینیانەی (ژ.ك) بناغەی ئەو حزبەی بەهێزکرد، بەڵام لەدوایــدا بەرەبــەرە لــەژێر سەرکردایەتی عــەلمانی ئــەو بنکــە جەماوەریــەی لەدەســتداو فرەحزبــی و فرەمیلیشــیایی دروســت دەبــێ و دەبێتــە فــەوزا، بۆیــە ئێســتا دەنگــی زۆر لــە کورتیــەو ناوەندیایــەتی لەدەستداوە، بەردەوام لێك جیادەبنەوە.

[1]بڕوانە: 5سال لەگەڵ عبداللە موهتەدی ل454

[2]بڕوانە:عبداللە حسن زادە-نیو سەدە تێکۆشان ب2 بــاس لەوجیابوونــەوەی گــرۆی 7نەفــەری ووئــو دوای(لادەرەکــان) وئینجا(ریبەرایەتی شۆرشگێر)و زۆری تر لەکۆنگرەکان دەکا کە جیا بووینەوە بە هــۆی پرســی ئایــدیۆلۆژیای مارکســی وکیشەکانی نیو سۆڤیەت وشیوعیەت بوە نەك بە هۆی پرسی کوردەوە بێت ،بۆدیوی عێراقیش بروانە: پەنجــەکان یــەکتر دەشکێنن —نەوشیرەوان مستەفا ل271-274.

بەڵام لە کوردستانی عێراق ئەگەر بەتاکتیکیش بێ توانیویانــە هــەر حزبــەو (یــەکێتی یەکی زانایان) دروست بکا، ئەگەرچی دەسەڵاتیشیان نیە هەر لەرێزی (یــەکێتی ئافرەتــان) و (یەکێتی قوتابیان) و لاوان و ئەو شێوازەیە، بەڵام تــوانراوە بۆشــاییەکە پــڕ بکەنــەوە.. کەچی لەودیو نەیان توانیوە ئەو بوشایە پر بکەنەوە، بۆیە بۆشــاییەکە گەورەیــە و بووەتــە قەیران.

2- لەڕوانگەی عەقیدەیەکی چــەپی و سۆشیالیســتی و عەلمانیانەهــەلس و کــەوتیان لەگەڵ گۆڕانی نوێی ئێرانکردکە خۆی لە شۆڕشی ئیسـلامی دەنوێنێـت[1]، لەڕاسـتیدا ئــەو شۆڕشە قازانجێکی لەبن نەهاتووی بۆ جوڵانەوەی کــورد هــەبوو، چ وەك ســتراتیژی چ وەك دەماودەست، چونکە بۆ یەکەم جار دەرگای قوفڵ دراو- بەو قوفڵەی کــە لــە (ســایکس- بیکۆ 1916) ڕا کلیل درابوو - کرایەوە، تەکانێکی زۆر مــەزنی بــە جوڵانــەوەی کــورد بەخشی، بەداخەوە زۆربەی نووسەر و لێکۆڵەرەوەکانی ئێســتا بــە نەتەوایــەتی ســەرقاڵن، ئەوکات لەشاخ نەبوون، زۆر ئاگاداریش نەبوون کە چەندە هێــزی پێشــمەرگە لــەپێش ئــەو شۆڕشە لەدۆزەخی هاوپەیمانی سێکوچکە (شــا- بــەعس- تــورانی تورکی)دابــوو، بۆیــە دەبوایە کورد بەجۆرێکی تر بــەپیل ئــەو شۆڕشــە بچــوایە، بــەڵام وا تێبینــی دەکــرێ کــە لەوەتەی مەینەتی کورد لەسەرەتای سەدەی (20) ئەوە سێ جارە جیهان دەهەژێ، کەچی کورد ناتوانێ سوود وەرگرێ، ئەو شۆڕشەش جیهان هەژانێك بوو، چونکە لە بەرنامــەکانی دا گۆڕانی نەخشەی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت)ی تیــابوو، کــە لــە ســایکس- بیکــۆ وە وەك کۆنکریت داڕژراوەو تیایــدا کــوردی تیــا خنکێنــراوە، بەداخــەوە لــەو قوڵاییــە نووســەرو سیاسەتمەداری کوردکەمتر دەبینرێ، بۆیە ناتوانێ سوود لەو ڕەهەندە ستراتیژیانە وەرگــرێ، ئیتر بەپێچەوانە دەبینین (حدکا) لەبەرەی مجاهدین خلق و بەعس دۆزرایەوە، لەوەش زیــاتر توانیان (ینك)یش هەڵخەڵەتێنن و دانوستانی 1983 لەگەڵ بەعس ئەنجام بدەن، چــونکە مام جەلال تا ڕادەیەکی زۆر بەگوێی د.قاسملوی دەکرد،بــەو پێیــەی دکتــور ئــەو رایانــەی سوشیال —دیمکراسەکان نەقل دەکــا، هــەروەك بــەخۆم چــەند جارێــك بــەنارەسمی لــەنزیك کۆبونەوەکانی نێوانیان بووم لەنێوزەنگ، د.قاسملو و مەلا شێخ عزالدین ئەو مفاوەزاتــەیان بە یەکێتی کرد.. بەڵام هیچ جارێك ئەو دوو زاتە داوایان لە مام جەلال نەدەکرد کە لەگەڵ

[1]بەووردی بروانە (پەنجەکان یەکتر دەشکینن ل122 )ئەو لەنگیە لە ستراتیژیەتی تەواوی بزوتنەوەی کورد دەردەکەوێ .

قیاده موەقەتە دانوستان بکا! و نەشکرا. ئەوە هەموو هەڵەی ستراتیژی بووە، تەرازووەکان تا ڕادەیەکی زۆربەرژەوەندی شەخسی وحزبی بووە نەك بەرژەوەندی بالای کورد.

3- هەر بەهۆی بیروباوەڕ و تێڕوانینی عەلمانی ئەو ئینشقاقانە کراو دەکرێ، ئەو جۆرە جەدەلە وەك ئەرێ سۆشیال دیموکراسی چاکترە یان سۆشیالی زانستی، یاخودئەرێ سۆڤیەت سەرمایەداری راستەوخۆیە یان سەرمایەداری دەوڵەتیە.. ئێوە ترۆتسکین یاخود ستالینی.. لەو نێوانە دەبوە مشت و مڕێکی دیالکتیکانەی وا کۆتایی بە ئینشقاق دەهات[1]، بۆیە دەبینین ئەو هەموو ئینشقاقە کرا لەنێو ریزی (حدکا)، هەرچەندە حزبێکی میانڕەوسەرکردەیەکی- د.قاسملو- زۆر عاقڵیش هەبوو، تائیستاش لەحزبەدەسەڵاتدارەکانی کوردستانی ئیراقی پاکترە لە رووی پەروەردەو ریکخستن وخو نەویستی ... بەڵام پەیڕەوی عەلمانیەت وای بەهەلە دەبرد، یەکەم ئنشقاق (غەنی بلوریان) - کە بە گروهی (7) نەفەری ناوزەد دەکران - کردی بەهۆی ئەوەی گوایە (حدکا لایەنگیری سوشیال دیموکراسە نەك سۆشیال زانستی)،نمونەیەکی تری سەرنج راکێش باس بکەین، هاوڕێ خەجۆ کچە گەنجێکی زیرەك بوو، سکرتێری ئالای ڕزگاری کوردستانی سەروولەسەر ڕاڕەوی مارکسی- ستالینی بوون، بارەگای لە نیوزەنگ لەتەنیشت ئێمە بوو، لە 1981- 1982 مێردی بەمحمدموهتەدی کردکەسەربە مارکسی –تروتسکی بوو- برای صلاحی مهتدی سکرتیری کۆمەڵەی کوردستانی ئێران بوو،لەبەر ئەوەی وەختی خۆی ستالین وتروتسکی دژی یەك بوون ئەوا لەنێو ئالای رزگاری بووە لیك جیابوونەوە تا ئەو ڕادەیە سەرکردەیەکیان خۆی خنکاندو کە سبەینی هەستاینەوە حەبلی لەملی خۆی کردبوو بەدرەختێك لە رقی ئەوەی چۆن ستالینیەك میرد بە تروتسکیەك بکا!!، .. بەووردی سەرنج بدە ریبازەکانی عەلمانی چۆن میللەتی کوردی یەك رێزیان پارچەپارچە کرد و دەکەن، ئەو ڕایە لە (شەرەفنامە)ش بەدی دەکرێ و ئامۆژگاری و وەسیەتێکی گرنگی بەجێ هێشتووە، دەڵێ: کورد کاتێ تێك دەگیران ((تەنیالە شادە وئیماندا نەبی لە هیچ شتی تردایەکتر ناگرنەوە))[2]، واتە بە کوردی و کورتی بە عەلمانیەت پارچەپارچە دەبن و بە ئاییینیش یەك دەخرانەوە، ئەو سووڕە تائێستاش بە خەست تر بەردەوامە لە هەموو پارچەکان.

---

[1] نیو سەدە خەبات ..عبدالله حسن زادە .

[2] شەرەفنامە –ل36

بەهەمان شێوەی کە لە کوردستان لەنێو (ینك) بەهۆی عێراقچی و کوردستان چی کێشمەکێشی وا توند دروست بوو تا لەدوایی مەلا بەختیار جیابۆوەو بەدەیان جار دووپاتی دەکردەوە کە ئەوان بۆ کورد و مەسەلەی قەومی بەشاخ نەکەوتوون بۆ کرێکاران هاتوون و کرێکاری کورد و عەرەبیش جیاوازی نیە، ئیتر دروشمی (کوردایەتی شەرمەزاریە) لەوەوە هاتووە.. بەهەمان شێوە ئەو کێشەیە لە کوردستانی ئێرانیش هەڵگیرسا لەنێوان باڵی ئێرانچی و کوردستانچی، بەڵام لە عێراقبە هۆی مام جلالەوە باڵی کوردستانچی زاڵ بوو، بووە هۆی زیندانی کردنی مەلا بەختیار و دەرکردنی فەرمانی لەسێدارەدانی، کەچی لە کوردستانی ئەودیو ئێرانچی زاڵ بوو.

هەموو ئەو هەنگاو و رووداوانە لەسەر بنچینەی ئەوە نەبووە کە ئەو بیرۆکانە کامیان لەخزمەتی کورد بوونە، بەڵکو بیروڕاو سیستەمێك بووە کە لە هەندەران هێناویانە لەکاتێکدا کە لەشوێنی خۆی بێ سوود ببوو، تا ئەم ساتەش لەسەر ئەو پرۆگرامە سیاسی و ستراتیژیە بەردەوامن.

4- لەبارەی دروشمی (حدکا) هەڵبەتە دوو هەڵوەستە هەیە، یەکەمیان: ئەو دروشمەی دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان، ئەو دروشمە لەبەشی عێراقی نزیکەی نیو سەدە بەرزکرایەوە، کەچی لەو ئەزمونەی عێراقی نوێ بەعەمەلی دەرکەوت کە هەڵەیە، بە کورتیەکەی ئەوەیە ئەو دیموکراسیەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێ لەلایەن حزبە کوردستانیەکان بەخۆیان پەیڕەوی ناکەن، ئینجا لە بەغداش دەرکەوت کە بە دیموکراسی چارەسەری کێشەی نەتەوەیی ناکرێ، بۆیە لەناکاو زاراوەی (تەوافوف) سەری هەڵدا، جا ئەوەی جێی سەرنجە تا ئێستاش (حدکا) هەر پابەندە بەو دروشمە.. دووەمیان ئەوەیە (حدکا) لەسەردەمی یەکێتی سۆڤیەتی دروشمی روخانی ئیمپریالیزم بەتایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکی هەڵگرتبوو، هەروەك حزبەکانی تری کوردستان، کەچی لەناکاو دەرکەوت بۆیان تاکە رزگارکەری کورد ئەمریکایە..! لەدوای راپۆرتی بیکەر- هاملتۆن ئاواش دەرنەچوو.. بۆیە بەڕاستی نازانرێ ستراتیژیەتی سەرتاسەری بزوتنەوەی کوردایەتی چی دەکا، یاخود دەتوانین بڵێین ستراتیژیەتی نیە.

7- پەیوەندی (حدکا) بە (پدك):لەڕاستیدا لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران کاتی (أ.خمینی) وەڵامی بروسکەی مەلا مستەفای بە ڕێزێکی تایبەتیەوە داوە و داوای لێکرد بگەڕێتەوە ئێران، سەرتاسەری عەلمانیەتی کورد هەڵوێستیان بەرامبەر شۆڕشیئێرانبە

سەلبی گۆڕا، وەسفی (خمینی)یش بە سەرکردایەتیەکی عاشق بە کۆنەپەرستی وەك مەلا مستەفا کرا.. لەهەمووان زیاتر (حدکا) بوو، وا دیاربوو دەستی بەعسیش لێی بەهێز بوو[1]، بۆیە واپێدەچێ ئەو مەسەلەیەی دەرهێنانی تەرمی مەلا مستەفا ڕاست بێت[2]، کە (پدك) بەڕەسمی (سید رەسولی بابەگەورە) بەرپرسی م- ع(حدکا)ی لێ تاوانبار کرد.. بەگشتی (حدکا) هەر دەسەڵاتی کوردستانی وەرگرت زۆر منەتی بەسەر (پدك) کرد و ئاماژەی بە دەرکردنی دەکردن، لەکاتێکدا پەنای مجاهدین خلق و فدائی دەدا، تەنانەت کۆماری ئیسلامی ئێران وەك (حدکا) منەتی نەدەکرد کە دەوڵەت بوو، (پدك) لەسەر مەسئولیەتی ئەو دەوڵەتە لە ئێران بوون، ئەو چاکەیەم لە (عبدالعزیز حکیم)یش گوێ لێ بوو لەکاتێکدا کە لە وەفدێکی (ینك) بووین نامەی مام جەلالمان بۆ (محمد باقر حکیم) بردبوولە 1981 سەبارەت بە (چەکە حجزکراوەکانی یەکێتی لە سەقز)، عبدالعزیز حکیم هەڵوێستی لە (حدکا) نەرمتر بوو ووتی ئێمە لە وەسیەتی باوکمان (محسن الحکیم- گەورە مەرجەعی شیعەی عێراق لە شەستەکان) بۆمان ماوەتەوە کە ڕێز لە کورد بگرین و هەر ئیشێکی هەیان بێ بۆیان بکەین و قایلیش نین پارتی و لایەنەکانی تر لە کوردستانی ئێران دەربکرین.

ئەو دڕدۆنگیەی (حدکا) هەر مابوو هەتا کاتێ کەوتنە دیوی کوردستانی عێراقیش، واباشە بۆ روونکردنەوەی ئەو راستیە سەرنجێك بدەینە ئەم بەسەرهاتە:

لەکاتی ئەنفالەکان و کۆتایی جەنگی عێراق- ئێرانلە1988، هێز و لایەنە کوردیەکان خراپ شکستیان هێنا، ئێمە ئەوکاتە لە ناوچەی دۆڵی پڵنگان بووین، لەیەکێتی تۆرابووین، ئەو ناوچەیە- سوارە عباس ئاغە لێی باڵادەست بوو- هەر لە هەشتاکانەوە کە بارەگا لە کوردستان نەبوو، (پ.م)ی هەموو لایەنەکان دەیتوانی لەو ناوچەیە بحەوێتەوە، ئەو بنەماڵەیەی عباس ئاغەی سەرکەپکان بنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەر بوون، هەرچەندە ئەوانیش دابەش ببوون بەلای حکومەت و یەکێتی و پارتی، بەڵام جیا لە زۆربەی سەرۆك عەشیرەتەکان، ئەوانە وڵات پارێز و پەناگەی نیشتمان پەروەران بوون، راپەڕینیش لەو دەروازەیە سەری هەڵدا، لەو ناوچەیەدا جێگەی (حدکا)شی لێببۆ وە

---

[1] بڕوانە: بەهمەن سعیدی-5سال لەگەڵ عبدالله موهتەدی ل93

[2] هەندێك پێیان وایە ئەوە سیناریۆ بوو بۆ جێ بە جێ کردنی شەڕی براکوژی لەگەڵ حدکا کە لە لایەن ئێرانەوە پێیان سپێردرابوو ...لەوانە محمدی حاجی محمود لە یاداشتەکانی پێش مەرگایەتی باسی کردووە .

لەپشت (کەرەك) بوون ئەوکاتی. ئا لەو کاتەدا هێزە سەرەکیەکانی ئەوسا بریتی بوون لە (ی ن ك) و ئیسلامیەکان، ئینجا (پ دك) بوو، هاتنە ئەو ناوچەیە بۆ پەرینەوەی دیوی ئێران، وادیار بوو هەریەکە لە (ی ن ك) و ئیسلامیەکان ڕێکخستن و لایەنگیری تەنگانەیان زۆربوو، بەسانایی ئەوان لەو ناوچەیە و پشدەر و ڕانیە دەرباز بوون بۆ ئێران، بەڵامهێزەکانی (پ دك) کە خۆی لە زیاتر لە (200) پ.م دەدا بە سەرۆکایەتی مام نادر هەورامی، هاتنە ناوچەی ساردتکێی دۆڵی پڵنگان - کە باسم کرد- ، ئیتر وادیار بوو ئەوانە زۆر فەقیرحاڵو نەشارەزا بوون، دۆستی ڕاستەقینەشیان زۆر کەم بوو، باشترین بەڵگەی بێ وورەیی و نەشارەزاییان ئەوەبوو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەو شوێنە ترسناکە مانەوە بێ ئەوەی جێی خۆیان بگۆڕن، بەخۆم نامەم بۆ ناردن کە تەنها جێیەکەیان بگوازنەوە تاقەتیان نەبوو، لەراستیدا ئەو هێزەی (پ دك) وا بێچارە ببون لەبەر چەند هۆیەکی تر، یەکێك لەوانە (مام نادر هەورامی) سەرکردەی ئەو هێزە بوو، کەچی ئەو خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبوو، ئەگینا لەناوچەکانی سلێمانی و هەورامان یەکێ لە قارەمانترین پێشمەرگەی کوردستان بوە، ئینجاهێزەکانی (پ دك) وەك ئەوانی تر نەبوو زۆری لە خەڵك بکەن یان نەرمە پەیوەندیان بە حکومەت هەبێ تارادەیەك لەسەر ئەخلاقی پێشمەرگەی ڕەسەن مابوون، بۆیە دوچاری قەیرانی بێ وورەیی و بێچارەیی و ڕووخان بوون.. بەڵام خەڵکی دێی ساردتکی بە ئەندازەی شارەزایی کەمی خۆیان یارمەتیەکی ئێجگار زۆریان دان، هەرلەگەڵ هاتنی ئەو هێزە بۆ ئەو ناوچەیە پێشمەرگەیەکیان ناردە لای من بەناوی (عمر علی حمشین- جوتیار)*،ئیتر بەئاگاهاتینەوە لە بارودۆخیان و بەخێرایی جارمان دا کە ئەگەر بە هەموو لایەك یارمەتی ئەو هێزە نەدەین ڕەنگە بەتەواوی بکەونە بەردەستی حکومەت، وادیاربوو زۆر تەنگاو ببون، چونکە بەهەمان پێشمەرگەدا وەڵامێکیان بۆ من ناردەوە تیایدا هاتبوو: ئەگەر ناتوانن هەمووومان دەرباز بکەن ئەوا با (7 سەرکردە) لەوان ڕزگار بکەین!! زۆر بەو پێشنیارە دڵتەنگ بووم، بەڵام وادیار بوو ئەوە ڕەئی هەموو سەرکردەکان نەبوو، سەرجەم سەرکردەکانیان (11) ئەندام بوون، (2- 3) سەرکردە لێیان زۆر بە وورە و قارەمان بوون، منیش نامەیەکم بە هەمان پێشمەرگەدا نارد و بەتوندی سەرزەنشتم کردن، نووسیم بۆیان: ((ئێمە وا بە هەموو لایەك هەوڵتان بۆ دەدەین ڕزگارتان بکەین، چۆن دڵتان دێت ئەو پێشمەرگە نازدارانە بەرەڵا

*ئێستاش ماوە لە گوندی کونەسیخوڕەی شارۆچکەی مخمورە وئەو ڕاستیانەی لایە .

بکەن، ئەگەر وابکەن ئێمە دێین بەخۆمان سەرپەرشتیان دەکەین)) و بـەبیرم هێنانـەوە کـە تەنگاوی چەند ڕۆژێکە دەرگا دەکرێتـەوە، ئـیتر ئـەوە مێـژووە ئاگـاداربن بۆتـان دەبێتـە سەروەری..

زۆر باش بوو بەرەی وورە بەرزەکان زاڵ بوون بەسەر سەرکردە بێ وورەکان و وەڵامێکـی بەنووسـینیان بەهـەمان پێشـمەرگەدا بـۆ ناردمـەوە، ووتیـان هـەتا دنیـا مـاوە ئێمـە پێشمەرگەی تۆین..

لەو کێشمەکێشمەدا خەڵکی ناوچەکەو جەماعەتی سـوارئاغە بـە هاواریانـەوە هـاتن، تەنانەت حسێن شوعی، پێشمەرگەیەکی (ینك) بوو، وەك ئێمە زیز ببوو لەو ناوچـەیە لـە شەووڕۆژێکدا لەپێناو ئەو هێزەی (پ دك) سێ جار چووە پشت ئاشان و گەڕایەوە تا بزانێ ئاخۆ ڕێی دەرچوون هەیـە یـاخود نـا، زۆر مەبەسـتم درێـژەی ئـەو باسـە نیـە ودوای بـە هەموولایـەك دەرمـان چـوواندن، ئـەوەی مەبەسـتمە و پەیوەنـدی بـە (ح دکـا)وە لـەو بەسـەرهاتە ئەوەیـە، لـەدوای ڕێکـەوتنمان لەگـەڵ سـەرکردەی ئـەو هێـزە و مانـەوەیان لەگەڵپێشـمەرگەکان، ئـەوەبوو وتیـان دوو لـەو سـەرکردانەمان(کە زۆر بـێ وورە بـوون) نەخۆشن جێیان بکەنەوە، منیش ئەوەم لا ئاسان بوو، هەرچەندە ناوچەکە تـاك و تـۆی لـە پێشمەرگەی (ینك)و ئیسلامی لێ مابوو، دۆستیان زۆر بوو لەو ناوچـەیە بـە ئاسـانی لـە هەموو جێیەك جێیان دەبۆوە، بۆیە بەهاوکاری لەگەڵ (ئەرسـەلان کـاك همـزە- و فیصـل حقی ئاغە) ئامیرکەرتێکی (ینك) بوو، لەوکاتی لەگەڵ سوارئاغە بوو، چووین بۆ بارەگـای (حدکا) بۆ ئەوەی لە خەستەخانەکەی ئـەوان جێـی ئـەو دوو سـەرکردەیە بکەینـەوە، زۆر بەگەرمی وەکو هەموو جار وەریان گرتینـەوە، منـیش وتم کاکـە دوو پێشـمەرگەی ئێمـە (یەکێتی) نەخۆشن، دەیانهێنین با لاتان بن بە ئەمانەت، وتیان بەسەرچاو ئیش بـۆ ئێـوە، بەڵام ئێمە دڵنیاین ئەو پێشمەرگانە هی ئێوە نین، ئیتر زۆر بە هەڵچوون و دەنگ بەرزیەوە قسەیان کرد و وتیان ئەوا ئێوە تە کلیفـی موسـتەحیل دەکـەن، ئێمـە دەزانـین ئـەو دووە قیادەموەقەتەی خـائینن، لـەپاش بەبەریەکداچـونێکی زۆر قـەبوڵیان نـەکرد. هەرچـەندە پێشمان گوتن ئەدی ئەوەنیە کۆماری ئیسلامی کوردیش نیە وا هەموو کوردی وەرگرتەوە، بۆ ئێوە واناکەن؟ ڕۆژێك دادێت ئەوەتان بەچاودا دەدەینەوە، وتیان هەرگیز ئێمـە ئیشـمان بە قیادەموەقەتە نابێ، ئەگەر بوونە حکومەتش با دەرمان بکەن!! .

+ مامۆستا جمال مورتکـه- ئەنـدامی سـەرکردایەتی پ د کباسـی ئـەوکات وسـاتە تەنگانەی کردووە لەکتێبێك بـەناوی (چـیا دەدوێ)تیایـدا لـەلای خۆیـەوە سوپاسـی ئـەو یارمەتیانەی من وهەموو ئەوانەی ناوم هێناون کردووە .

## 2- كوردستانی توركیا

## پارتی كرێكارانی كوردستان ( پ.ك.ك )

ئەو باسە مێژوویەی كورد و سەرەتای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی لەلایەك و لەلایەكی تر ئەو بارە ناوخۆو ئیقلیمی و جیهانیەی لە قۆناغی نوێ بزووتنەوەی كوردایەتی باسمان كرد، دوو سەرچاوەی بەكارن لەسەر چۆنیەتی دروست بوونی (پ.ك.ك).

راپەڕینەكانی كوردستانی توركیا زیاتر شێوازی كوردستانیانەی وەرگرنەگرت تا سەرەتایسەدەی بیستەم، سەرەتای مەینەت و كێشەی كورد لە كوردستانی بەشی توركیا دەست پێ دەكا، بەجۆرێ كە لە سەردەمی عوسمانلی باری سیاسی كورد زۆر چاك بوو لەچاو ئیستا، دەسەڵاتی كوردی چ لە كوردستان چ لە ناوجەرگەی خیلافەت بەهێز بوو تەنانەت لەو سەردەمی جار وابوو والی بەغدا لەلایەن كورد دادەنرا، بەتایبەتی لە سەردەمی عەبدولڕەحمان بابان، ئینجا نەخشەی كوردستان لەو سەردەمی دوو هێندەی نەخشەی ئێستا گەورە بوو، ئەوسا میللەتانی تر بۆ ماف وەرگرتن لە كورد دەپاڕانەوە، كورد حوكمڕانی عەرەب و ئەرمەن و میللەتی تریشی دەكرد، بەرەبەرە ئەو دەسەڵاتەی كوردی لاواز بوو كاتێ لە ناوجەرگەی خیلافەت گۆڕانكارییەكی ترسناك ڕوویدا كە لە سەرەتای سەدەی 19 دەست پێدەكا، ئەویش سەرهەڵدانی تەیاری تەغریبی كە دوایی بووە عەلمانی نەتەوەگەری، بەتایبەتی لەدوای ئینقلابەكەیان كە لە 1908- 1909ز، ئینجا سەرهەڵدانی تۆرانیەت لە 1913و كەمالیەت لە1918 ولەكۆتاییدا هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی لە 1924/3/3 و دەسەڵات گرتنە دەستی عەلمانی نەتەوەگەری بە یەكجاری، ئیتر باری سیاسی كورد گۆڕا ،لە كاتێكا لە پێشتر (هادی پاشا) نوێنەری سوڵتان واحددین دانی بە مافی چارەی خۆنووسی كورد ناو لەگەڵ نوێنەری كورد (شەریف پاشا و عەبدولقادر شەمزینی) مۆریان كرد، هەمان ئەو دەستنووسەیان بردە (سیڤەر 1920)، لەوێش بە نێودەوڵەتی كرا،بەهەمان شیوەش علی ئحسان پاشای بەرپرسی ویلایەتەكانی موسل وبەغداو بەسرە بە رەسمی دانی بە دەسەڵاتی شیخ محمود هێنا، كەچی پاشان عەلمانیەتی توركی قایل نەبووهەلسالەگەڵ بەریتانیا و فەڕەنسا و وڵاتانی رۆژئاوا (لۆزانی 1923)یان گۆڕی و كورد بێ بەش كرا، لەو گۆڕان

و وەرچەرخانە تەیاری عـەلمانی کـوردی رۆڵێکـی زۆر خراپـی بینـی بـە پاڵپشـت کردنـی ئەتاتورك، تا کورد گەیشتە بن بەست و لە کاروان بەجێ ما، ئینجا شێخ سەعیدی پیران و کۆمەڵێك زانای ناوداری کورد لە 1925 جارێ شۆڕشیان داو داوای سـەرەکیان ئـەوەبوو یان وەك جاران خیلافەت بگەڕێتـەوە، یـان کوردسـتانیش سـەربەخۆ بێـت، ئـەو شۆڕشـە خەریك بوو سەرکەوێ، بەڵام دوایـی رۆژئـاوا و بەلشـەفیەتی (شـیوعیەکان) رووسـی بـە هەموو لایەك یارمەتی تورکیایان داو بەسەر ئەو شۆڕشەدا زاڵ بوون،لـەو سـاوە مەینـەتی کورد دروست بووە،دوای ئەوە دوو شۆرشی تری ئاگریداخ ودەرسـیم هەلگیرسـاو شکسـتی هێنا،،هەر لە شۆڕش و ڕاپەڕین دابووینە تا جەنگی جیهانی دووەم.

+ لەو مەودایەی پاش چلەکان جۆرە بێئومێدی و سستیەك باڵی کێشا، دیارە شۆڕشی ئەیلولیش ئەو ئاسەوارەی نەبووە لەسەر کوردستانی تورکیا بۆیە (پارتی – لقـی تورکیـا) بەرەبەرە پوکایەوە.

+ قۆنـاغی نـوێی کوردایـەتی و سـەرکەوتنی شـۆڕی ئیسـلامی ئێرانلـە 1979و بێجێگەی کورد لە دەستووری[1] تورکیـا و توونـد و تیژیـەکانی نـاو تورکیـا ئاسـۆیەکی ڕووناك وتاریکی بوژاندنەوەی هەستی کوردایەتی بوو.

+ لە سەرەتای هەشتاکان زیـاتر لـە 12 لایـەنی مارکسـی لـە کوردسـتانی تورکیـا پەیـدابوو، لەوانـە (کـاوە، دەنگـی کـاوە، ئـاڵای رزگـاری، ئـازادی، دەدەقـادە، حزبـی سۆشیالیستی کوردستان، پ.ك.ك..).

دروست بوونی پ.ك.ك

بەپێی تەقویمی خۆیان لە 1978/11/27 لەناوچەی ئامەد دروسـت بـووە، یەکـەم کۆنفرانس لە 15/تموز/ 1981 کـراو، یەکـەم چـالاکی پێشـمەرگایەتیش لـە 1984 دەستی پێکرد لەناوچەی شەمزینان، ئەو حزبە مێژووی زۆر بەندە بە سەرۆکەکەی (عبدالله ئۆجەلان –ئاپۆ)[2] کە لە ساڵی 1970 چالاکی خوێنکارانەی هەبووەو دەسـتگیر کـراوە،

[1]لەدوای دروست بوونی دەوڵەتی عەلمانی تورکیا لەدەستوورەکانی دا ئینکاری بـوونی کـوردی کـردوە، وەك ئیستاش ئەو نکولیەی کورد لەمادەی 66ی ئەنایاسا(دەستور)ی تورکیا بەرجەستە بوە.

[2]یەکەم سەرکردەی کورد کە نازناوی (ئـاپۆ)ی هـەلگرتبێ (عوسمـان سـەبری) کـە لـە بەلگەنامـەکان وادەردەکەوێ بەناوی حزبی خۆیبوون مۆری ئەو نامە بەکۆمەڵەی کردوە لە رۆژی 25-3-1920 بۆ لویدجۆرجی بریتانی،بە ئاپۆ بەناوبانگ بوو واتە مامە.

لەگەڵ چەند کەسایەتیەکی تری وەك (جمیل بابەق-  جمعە، علی حیدر قەیتان، عوسمان ئۆجەلان...)، بڵاوکراوەیەکی ناوەندی بەناوی (سەربەخۆبوون)ی دەردەکرد.

## ئایدۆلۆژیای :

هەست و سۆزی نەتەوایەتی ئەو دەروونە هەڵچووانەی بۆ دروست کرد کە جۆرە عەقیدەیەکی (مارکسی لینینی)ی توندی شێوە ڤێتنامیانە و (هۆشی مین)[1] وەربگرن، لەلایەکی تر ژانەکانی سەرمایەداری و پاڵپشت کردنی تورکیایەکی بێ ویژدان، (پ.ك.ك) ی بەو ڕەوتە بەرهەم هێناوە،[2] هەڵوێستیان بەرامبەر بوونەوەر، دروستکەر، کۆمەڵ، ئادەمیزاد، دادگەری، موڵکیەت، نیشتمان، مێژوو، ئایین... زیاتر توند بووە بێداهێنان، بەڵام ئێستا وەرچەرخانێك هەیە لەو عەقیدەیە لەپاش زەروزیانێکی زۆر.

## ڕەوتی (سیرە):

پەیوەندیەکی موکومیلەگەڵ (بەرەی میللی ڕزگاری فەلەستین-  جۆرج حەبەش) هەبووە، بۆیە گەریلاکانی لە لبنان ڕادەهێنا و (ئاپۆ) خۆی لە بیقاع بوو. (گەریلا زاراوەیەکی ئیسپانیە بەمانای وردەشەڕ، واتە لەشێوەی پارتیزانی)، جا سەرنج بدە (پ.ك.ك) ویستی زۆربەی چەمك و زاراوە کوردایەتیەکانی وەك پێشمەرگە وەرگێڕێ بۆ گەریلا بۆ ئەوەی مارکسیەتێکی خەست پەیڕەو بکا، ئەو داب و نەریت و زاراوەی کوردیش ڕاپێچ بدا.

+  لە ساڵی 1983 تورکیا و عێراقرێکەوتن هەریەکە بۆی هەبێت 20کم بچێتە ناو خاکی یەکتر* بۆ لێدانی پێشمەرگە، لەهەمان ساڵ تورکیا بۆ یەکەم جار هاتە ناو عێراق.

+  دروست کردنی گەریلا و چالاکیەکانی لەناو کوردستانی تورکیا لەدوای 1984 بووە هۆی زاڵ بوونی پ ك ك بەسەر لایەنەکانی تری مارکسی کوردلە سەرووی کوردستانی.

---

[1] سەرۆکی فیتنام وحزبی شیوعی بوو لەکاتی رزگاری ڤیتنام لە 1975.

[2] بروانە راپورتی کونفرانسی یەکەمی پ ك ك.

*ئەو جۆرە رێکەوتنە یەکەم جار لە نێوان کوردوئەرمەن کرا، لە مادەی (2)ی رێکەوتنی پارتی شۆرشگێری ئەرمەن (تاشناق) لەگەڵکۆمەڵەی سەربەخۆی کورد (خۆیبوون)لە 1927\10\29 مۆر کرا، لە 19 مادە پێك هاتبوو .

+ یەکەم چالاکی گەریلای (پ.ك.ك) لە 1984/8/15 لە شەمدینان دژی تورکیا ئەنجام درا.

+ دوای ڕاپەڕینی 1991 ئاسۆیەکی فراوانتری بۆ (پ.ك.ك) کردەوەو لە سەرەتادا زۆر لایەنە چەپیەکانی کوردستانی عێراقیش (ئاپۆ)ی بە رابەر و مونەزیری خۆی دەزانی. ئەگەر ئەو شکستەی بەسەر شیوعیەتی جیهانی نەهاتبایە ڕەنگە زۆربەی حزبە چەپیەکانی کوردستانی عێراق و بەشی زۆری یەکێتیش دەبوونە باڵێکی (پ.ك.ك) لە کوردستانی عێراق.

+ پرۆژەیەکی سیاسی و ئابوری باشی دارِشت، بووە هۆی فراوان و دروست بوونی ئەو حزبە و ئیزگەی (سەربەخۆی) کوردستانیان دامەزراند.

+ لە 1993 (یەکێتی و پارتی) بە هاوکاری سوپای تورکیا هێرشیان کردە سەر (پ.ك.ك) و بووە یەکەم چالاکی و شەڕی حکومەتی هەرێم.

+ دوای وەستانی ئەو شەڕە هەردوو حیزب زنجیرەیەك سەنگەری سنوریان وەرگرت لەسەر بودجەی تورکیا.

+ لە 1994/4/16 سکرتێری یەکێتی توانی یەکەم کەناڵی گفتوگۆی ناڕاستەوخۆ بکاتەوە لەنێوان (ئاپۆ) و (تورگوت ئوزال)، بە یەك لایەنی بۆ یەکەم جار (پ.ك.ك) شەڕی ڕاگرت، بەڵام بە مردنی کت وپڕی (تورگوت ئوزال) ئەو پرۆژە ئاواتەش مرد.

+ ئەوجارە تورکیا دڕندانەتر کەوتەوە شەڕ سێ هەزار دێی وێران کرد، زیندانەکانی پڕ کرد.

+ بەهۆی سوودوەرگرتن لە یاسا دەوڵیەکان و ئەوروپا (پ.ك.ك) توانی بەناوی دەزگای کەلەپور نەك بەناوی (پ.ك.ك) یەکەم کەناڵی ئاسمانی MED TV بکاتەوە.

+ بە یەك لایەنی تا ئێستا (4) جار شەڕی ڕاگرتووە و تورکیا گوێی پێنەداو بە ئاشکرا دەڵێ ئێمە سوپایەکی ئازامان هەیە تەنها بەهێز وەڵام دەدەینەوە.

+ لە 1995/8/25 لەناکاو هاتە ناو شەڕی ناوخۆی کوردستانی عێراق لەدژی پارتی، ئیدی تا سەدەی نوێ هەر ناکۆك بوون، لەکاتێکا بەپێی ڕای (پدك) (پ.ك.ك) فەرمانی تێکدانی ئەزموونی کوردستانە، ڕای (پ.ك.ك)ش وایە کە (پدك) لە ساڵی 1992 ڕا لەناو خاکی تورکیا شان بەشانی سوپای تورکیا شەڕی گەریلا دەکا.

+ له ساڵی 1999 به پلان و سیناریۆیەکی لێڵ و ئاڵۆز (شمدین سکاك) لەنزیك دهۆك لەلایەن فڕۆکەکانی تورکیا دەستگیر کرا، شمدین سکاك سەرکردەیەکی نزیك عبدالله ئۆجەلان بوو، خۆی تەسلیمی (پ دك) کردبۆوە، لەکاتی گواستنەوەی له دهۆك بۆ هەولێر بە هاوڕێیەتی پاراستن کەوتە ئەو بۆسەو گیرا،لە کاتێکا گومان بۆ ئەوە دەچێ کەسیناریۆیەك بیت لەنێوان پارتی وتورکیا بەڵام راگەیاندنی پارتی دەلی هەلیکۆپتەری تورکیا بێ پرسی ئیمه ئەو پرۆسەی ئەنجام داوە.

به هۆیەوە تورکیا زانیاریەکی باشی دەستکەوت لەبارەی عبدالله ئۆجەلان،کاتێ وەفدی تورکیا لای حافز ئەسەد بوون باسی شوێنی ئۆجەلانیان لە سووریا کردو ئەسەدیش ئینکاری کرد یەکسەر وەفدی تورکیا مۆبایلیان کرد بۆ ژمارەی ئۆجەلان و وەری گرت .. ئەوەش هەروایێدەچوو لە شمدین سەکاك وەرگیرابێ، لەکۆتاییدا دەستگیر کرا بەو هەنگاوانەی خوارەوە:

- لە ساڵی 1998 تورکیا و ئیسرائیل کەوتنە هاوپەیمانیەتیەکی ترسناك و ئوردنیشیان ڕاکێشاو چواردەوری سووریا گیرا، هەرچەندە ووتیان لەدژی میللەتانی ناوچەو عەرەب نیە، بەڵام هەر خێرا پێچەوانەی دەرکەوت و تورکیا هەڕەشە و فشارێکی توندی خستە سەر سووریا تا (ئاپۆ) دەرپەڕێنێ و سوریاش بەناچاری ملکەچ بوو.

- لە 1998 (ئاپۆ) چووە ڕووسیا، لەوێش بۆ ئیتالیا(1998/10/13) و دەستگیرکراو[*]دوای دەرچوونی بزربۆوە.

- هەرسێ مخابراتی ( سیای ئەمریکی + میتی تورکی + موسادیئیسرائیلی) لەگەڵ هەندێ مخابەراتی عەرەبی تر بەدوای بوون له هەموو جیهان سەرەتای تراجیدیای کورد و کۆنەبرینەکانی هاتەوەیاد و کەوتە داوێکی ئاڵۆزی هەڵخەڵەتێنەر.

- له 1999/2/15 دەستگیر کرا و بە نایاسایی (قرصنة + ارهاب + خرق السيادة الدولة الأخرى...هتد.) لەوێ بە سڕکراوی برا ئیسرائیل و لەوێوەش بۆ تورکیا. بەو شیوەیە لەو دنیایە جێی پەناگەی تێکۆشەریك نەبۆوە چەندە له سەر هەقیش بوو.

---

[*]ئەوەی جێی سەرنجە لەو دەمیدا ( 1998/12/11 )وەزیری دادی حکومەتی هەرێم(قادر جەباری) بەخۆی کۆمەلێك بەلگەنامە بەرەو ئیتالیا ڕۆیشت تابچێ سکالا لەسەر ئۆجەلان تۆمار بکا، دوای ئۆجەلان ئیتالیای بەجێ هێشت، ئەوەش بەدبەختی کوردە کەلەکۆنەوەهەروا لەساتە ناسکەکانیش دژی یەکتر بووینە.

+ دوای (پ.ك.ك) شەڕی وەستاند و هێزەکانی کشاندەوە لەناو خاکی تورکیا، جـاریٚ فەرمانی لەسێدارەدانی (ئاپۆ) هەڵپەسێردرا.

+ چەند ئینشقاقێکیان کرد، عوسمان ئۆجەلان لیٚ یان جیابۆوە، ناوی (پ.ك.ك) گـۆڕا بۆ (کۆنگرەی نیشتمانی) بەڵام دوای جارێکی تر لە 2005 گۆڕاوە بۆ (پ.ك.ك).

+ لەوەتەی حکومەتی نیمچە ئیسلامی (گەشە و پەرەپێـدان) دەسـەڵاتی حکومـەتی گرتۆتە دەست، بواریان زیاتر پیٚ دراوە، کەناڵی تەلەفزیۆنی کراوەتەوەو کێشەکەیان روو لە بەجیهانی بوونە، هەرچەندە رۆژئاوا و ئـەمریکا و کـۆنگرەی ئیسـلامی کـەمتر پاڵپشـتی کوردستانی تورکیان کردوە ،بەڵام کرانەوەیەکی بیٚ هاوتا لەچاو ئەو سـەدەیەی ڕابـووردوو بەڕێوەیە.

پەند و ئەزموون لە:

- خاڵە بەهێزەکانی:

1- ئەوانە خاوەنی ئەو سەروەریەی هەڵگیرسـێنەری شۆڕشـی نـوێن لـە کوردسـتانی تورکیای قەدەغەی زمان و نەریت و ئەو کۆنکرێتە مەزنەیان لەسەر کورد شکاند.

2- زۆر خـۆڕاگرن لـە نیمچـە مـەحاڵێك شـۆڕش و دۆزی کوردیـان هێنـا ئـاراوەو گەیاندیانە ئەو ئاستەی ئێستا وبەردەوامیە کەشی.

3- ڕێکخستنێکی پۆڵایین و نوێیان داهێنا، تا ئێستاش بەپێچەوانەی حزبە عەلمانیـە کوردستانیەکانی خواروو، دەردی گەندەڵی و خۆویستی نەپەڕیوەتەوە ڕیزی ئەو حزبە.

4- بـە شـارەزایی و بـەکارهێنانی سـەردەمانەی ئامرازەکـانی یاسـا، ڕاگەیانـدن، دەزگایی، لەهەمووی گرنگتربو یەکەم جار هەسـتان بـە دروسـتکردنی (HEDP- پـارتی گـەل) کـە لـە راسـتیدا بـاڵی سیاسـی و یاسـایی (پ.ك.ك) بـوو لـەناو تورکیـا، بـە سوودوەرگرتنی لە یاساو دەستوری تورکیا، ئەوە بەرهەمی پـرۆژەی سیاسـی یـە، ئەگـەر کارنامەکان بە پرۆژە بێت ئەوا چالاکی شاخ و شار، دەریا و زەمین،قەلەم وچەك، عـەقڵ و ماسولکە، ئەوروپا و ئیسلام... هەمووی دەڕژێتە ناو یەك دەریای ئامانج.

4- لە ناوچە شاخاویەکانیژێردەسەڵاتی (پ ك ك )ی لیٚ هەیە بەپیچەوانەی دەسەڵاتی حزبە کوردستانیەکان ئارامی و ئاسـایش و ریکخسـتن وتاراددەیـەك دادگـەری وخزمـەتی میللەت کردنی تیابووە و دوور بووینە لە گەندەلی وخو ویستی ودزی وریگری و...

- له خاڵە لاوازەکانی:

1- وەك حزبە مارکسیە کوردیەکانی تر بە درەنگەوە (مارکسی لینینی)یان پەیڕەو کرد، کە لە جیهان بەرەو گەڕانەوەو سەرایی قەیرانی لێ دەرکەوتبوو، لەکاتێکدا لە کوردستانی سەروو خواروو شەڕە پرۆلیتاریا بوو، لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە سەرەتای 1980وە سەندیکای کرێکاران دەستیان بە خۆپێشاندان کرد دژی سیستەمی شیوعیەت، بەتایبەتی سەندیکای پۆلەندا بە رابەرابەتی لیخ فاونسا، ئەوانە کرێکار بوون، کەچی دروشمی ڕوخانی شیوعیەتیان هەڵگرتبوو، مەزنترین کاریگەر بوو، چونکە شیوعیەت خۆی بە نوێنەری کرێکاران دەزانی.

لە فەڕەنسا و پرتغال و ئیتالیاش حزبە شیوعیەکان لە هەڵبژاردنەکان دەنگیان هاتە خوار، لە ئەفغانستان و ئێران رابوونی ئیسلامی دژی هەردوو جەمسەر سەری هەڵدا، بۆیە ئەو مارکسیەتە نەبووە پاڵنەر و ڕێخۆشکەری کوردایەتی بەڵکوبووە بارگرانی، پاساوو هۆکارێکە تا ئێستاش ئەو بوختانەی تیرۆر بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانی سەروو نووساوە.

2- دەبوایە وەك ستراتیجیەت ئێستا (پ.ك.ك) لە بەرەیەك بوایە دژی سەرچاوەکانی هێزی تورکیا کە ئەمریکا و ئیسرائیل و دەست و پێوەندەکانی، بەڵام بەو مارکسیەتەی ئێستای بێجگە لە کوردی بەدبەخت کەس خۆی بە میراتگری ئەو مەدرەسەیەش نازانێ.

3- زۆر ڕوونە هەم ڕۆژهەڵات (چەپی) و ڕۆژئاوای (لیبرالی) بەرپرسن لە دروست بوونی مەینەتی کورد، کەچی سەرکردەکانی کورد هەرجارەی بەلای رۆژئاوا یان رۆژهەڵات لەوێشەوە بناغەکانی سایکس- بیکۆیە بە زەحمەت ئەو دەرگا قوفڵ کراوانەی سەر کورد بەو کلیلانە دەکرێتەوە.

4- لەسەر هەمان ئایدۆلۆژی بووە هۆی شەڕی زۆر خوێناوی لەگەڵ حزب و لایەنە سیاسیەکانی تری کوردستانی تورکیا و کوردستانی تر. هەتا لەگەڵ داب و نەریتی کوردیش، ئینجالەگەڵ زۆربەی عەشایەرەکانی کوردیش.. کە زیاتر دەردی کورد ئاڵۆز دەکا.

5- سەرۆك (ئاپۆ) لە دوورە وولات بوو، واقعی کوردستان و دەوروبەری بە سەلامەتی بۆ نەقڵ نەدەکرا، بۆیە لە قەبڵاندنی ڕووداوەکان بە هەڵەدا دەچوو، هەر بەنموونە کە

هێرشی کردە سەر (پ دك) لە 1995یەکسەر (ئاپۆ) داوای لە (یشار قایـە)ی سـەرۆکی (کـۆنگرەی کوردسـتان) کـرد کـە پەرلەمانەکەیلـە ئـەوروپا بگوازێتـەوە (دهـۆك) و فدراسیۆنێکی دیمکراسی لەوێ دروست بکەن! ئـەو دهۆکـەی نێـوان دوژمنـی تورکیـای و عێراق و بەهۆی هێڵێکی لاوازی (36) ی یاسای دەولی 688 کەمێك پـارێزراوە ئینجـا لەدژی هەموو ئەوانەو لەدژی پارتی دەبێ چۆن بە یەشار قایە بکرێ پەرلەمان بگوازێتـەوە دهۆك ؟!.

6- خۆ تێ گلاندن لە کێشەکانی کوردستانی عێراق و دەست لـە کاروبـار وەردانـی بێمۆلەتی حزبە دەسـەلآتدارەکان و لەدوایشـدا هاتنـە نـاو شـەڕی کوردبـە کـورد، هـیچ پاساوێکی بۆ نیە جگەلە چەوتی ستراتیژیەت و تێکەڵآ کردنی (ئەوەلیات و سـانەویات) و ( واقع و ئاواتەکانە)..

7- خـۆی دژی ئیمپریالیزمـە، دژی بـەرەی ڕەجعـی و وابەسـتەی ئیمپریـالیزمی ناوچەکەشە کەچی نەیتوانی هێزی ئیسلامیەکانی گەشەسەندوو لە جیهان و لـە ناوچـەکەو لە ناوەخۆش بکاتە پاڵپشتێکی کێشە ڕەواکەی کوردی تورکیا کە زۆر مەزلۆمن کەچی بـە زالّم پیّشان بدرێن. واتە بەو ڕوانگەو فەرهەنگە نەیتوانی دوژمنی دوژمنیش بکاتە دۆست کە ڕێسایەکی سەرەتایی لۆژیکیە کەسی عەوامیش سود لەو ڕێسایە وەردەگرێ.

8- هەڵسوکەوتیلەگەڵ (خائینان) زۆر توند و (شۆڕشگێڕی) بـوو، ئیسـلاحی نـەبوو (بەپێی ئەو ئامۆژگاریە بەناوبانگـەی مـارکس خـۆی دەڵێـت(ئێـوە شۆڕشـگێڕ بـن نـەك ئیسلاحی) بووە هۆی زنجیرەیەکی نەبڕاوەی تۆڵەو تۆڵەسەندنەوە کە لە کۆتاییدا بە قـازانجی تورکیا تەواو بوو، جاشێکی زۆری بۆ پەیدا بوو.

9- لە (کۆمەڵەی نەتەوەی) و دوایش لـە دەزگـا جیهانیـەکان و بنـەماکانی (مـافی میللەتان) و لە زۆربەی بڕیارە جیهانیەکان سەبارەت بە دادگا وا هـاتووە کـە وەك یاسـای دەوڵی هەر میللەتێك بەزمانی خۆی بچێتە بـەردەم دادگـا، ئـیتر دەرفـەتێکی مێـژوویی نایاب هاتبوو کە لە دادگایکردنی (عبداللە ئۆجەلان) بەزمانی کوردی بدوابوایـە نـەك بـە تورکی.. ئیتر تورکیا و دەستورەکەی دەخستە ئەوپەڕی تەك و لۆ، کەچی ئەوەی نەکرد.

10- ئەو کۆت و زنجیرەی سەدەیەکە کـوردی بەنـد کـردووە وەك ڕوونـە عەلمانیـەتی تورکیایە، ئەوەش بەتەنها بەکورد هەڵناوەشێتەوە، لە دەنگ دانەکانی پەرلەمانی تورکیـا (پ.ك.ك) لایەنگیری بەرەی عەلمانیەتی دەکردو دەنگی دایـە یـەلماز نـەك ئیسـلامیەکان،

کەواتە (هەڵتەکاندنی دەستوری عەلمانیەتەکەی + سەقافەتی ئەتاتۆرك + پشتیوانە جیهانیەکانی) هەمووی وەردەگەڕا ئەگەر حزبی ڕەفاه بە تەواوی لە هەڵبژاردنەکە دەرچوبوایە، یان دەنگی بە مەرج و ڕێکەوتن بدابایە پاڵ دەنگی حزبی گەشەو پەرەپێدان.. کەچی (پ.ك.ك) ئەو ستراتیجیەی نەپێکا، وەك ستراتیجی عەلمانیەتی حزبە کوردستانیەکانی تری کوردستانی خوارووش، دۆست و دوژمنیان لە ڕووی ستراتیژیەوە تا ئەم ساتەش پێ دەستنیشان نەکراوە، بۆیە ئەوەندە کێشەی کورد لە بازنەی داخراو دەخولێتەوە. هەروەك دوای لە پرۆژەکانی ڕزگاری کوردستان، زیاتر باسی دەکەین

# بەشی شەشەم

## ئە نجام و ئەزموونەکانی عەلمانیەت لە جیهان و کوردستان دا

حزبە کوردستانیەکان تا ڕادەیەکی باش خەباتگێڕ بووینە،ناسنامەی شاخیان هەبووە، سەڵبیاتەکانی دەخەینە بەر توێژینەوەی ئەکادیمیانە بۆ پەند و وردبوونەوە،گەلێ جار حزبی بوێر خۆی بەو کارە هەڵدەستێت بۆ ئەوەی زووتر خۆی فورمات بکاتەوە بەمەدرەسەیەکی فکری تۆکمە، هەڵبەتەحزبەکوردستانیەکانیش سەربە یەکێ لەو مەدرەسانەن (یان ئاوێتەیەك لێی)،بۆیە شکست و سەڵبیاتی ئەو مەدرەسانەیە سەرچاوەی قەیرانی فکری و پەیڕەوی حزبە کوردسانیەکانیشە.

## 6- 1 مەدرەسەکان

1- مەدرەسەی شیوعیەت.
2- مەدرەسەی سۆشیالیستی.
3- مەدرەسەی لیبرالی دیموکراتی.
4- مەدرەسەی (ئیسلامی) ئاینی.
5- نیمچە مدرسەی نەتەوەگەری

لەپێشتر باسێکمان کردن، ئێستا لە سەرەنجامی ئەزموون و ئەنجامە زانستیەکانی وەك ڕەخنە دەوەستین زۆر بە کورتی.

## 1- مەدرەسەی شیوعی:

**أ/ لەڕووی فەلسەفیەکەی:** لەسەر چەند بنەمایەك داڕژرابوو، ئەوەش ئەنجامەکانیەتی:

- (لا نهائية العالم ووحدته) بێ سـنوری گـەردوون —وەك رای مـادی و دە هریـەكانی كۆن[1]،هەم سەردێری گەورەی هـەموو كتێبـەكانیان و بناغـەو سـەرخانی فەلسەفیەكەشـە كەچی زانستی نوێ یەكلای كردۆتەوە كە گەردوون سنووری هەیەو( لانهائی) نیە.

- (مادية الوجود) واتە هەموو شتێك ماددەیە: ئێستا زانسـتی نـوێی فیزیا،كیمیـا، بیركـاری، پاراسـایكۆلۆژیا.. نـەك هـەر (نامادیەتی)سـەلماند بـەڵكو هـەر دەیخـوێنن و (تطبيقات)ی لەسەر دەكەن. ئینجا نەیتوانی پێناسی فەلسەفی (ڕوح)، (عقل) و (توانا) و (راستی) و...هتد. بكات.

- هەموو شتێك ناكۆكە: ئەوە كرۆكی فەلسەفەی ماركسی بوو،كەچی تا ئێسـتاش لـە سروشت ناكۆكیەك نەدۆزراوەتەوە بەو مواسەفاتە دیالێكتیكیەی ماركسی كە:

1- سیفاتی جێگۆڕكێ هەبی.
2- هەریەكە مەرجی مانی ئەوی تریان بێت.

- ناكۆكی سەرچاوەی گەشەكردنە: یاسا نیە هەندێ جاری بەدەگمەن نمونەی هەیە.

- یاساكانی دیالێكتیك (قانون الوحدة وصراع اللأضداد)، (قانون نفي النفي)، (قانون التغيرات الكمية الى النوعية) هیچی یاسا نین، هەتا خۆشیان ئـەوەتا سـتالین لـە كتێبـی (المادية التأريخية والمادية الدياليكتيكيـة) (نفى النفى) پەڕانـدوە لـە یاسـایی، بـەڵام لـەو سەردەمە هەموو ئەوانەی سەروو بەڕوونی و لەژێر تاقیگای زانسـتی شـهادەی (راسـب)ی پێدراوە.

- هەرچەندە راستی لای ماركسیەت پیرۆز بووەو ڕۆژنامەی (پراڤدە—كەلـە سـوفیەت دەردەچوو) واتە (ڕاستی) بەڵام بەڕوانگـەی فەلسـەفی ماركسـی (راسـتی) و (دادگـەری) (بەها).. چەسپاو نیە، گوایە دەگۆڕێـت بـەپێی زەمـان و زەمـین و بـاری كۆمەڵایـەتی و چینایەتی، بەو شێوەیە مادام (راستی) چەسپاو نەبێت ئـەوا جیـاوازی نێـوان (فرضـية) و (تیۆر) و (یاسا) و (بۆچوون) نامێنێت، واتە دەشێت یاسـاكانی دیالێكتێـك و دەقـەكانی ماركس و ئەنجلس بگۆڕێن، بۆ ئەو كاتی لەوانەیە راست بووبی بەڵام ئێسـتا هەڵەیـە یـان پێچەوانەیە.

---

[1] ئەرستۆ دەڵێ لەو بارەیەوە یەك ڕەئی بـووین تـەنها لـە نیومانـدا ئـەفلاتون رای وابـوو گـەردون تەمەنی هەیەو دروست كراوەو دروست كەری هەیـە – تهافت الفلاسفه ص15 دەڵێ ئەرسـتۆ لـە كتیبی (الطبيعة) ئەو باسەی كردوە.

بەو شێوەیە ئەگەر كێشەیەك پەیدا ببوایە (وەك عێراقچی و كوردستانچی —لای خومان) ئەوا هیچ یاسا و دەقێكی چەسپاو نەبوو بگەڕێنەوە سەری بۆ (تحكیم)، بۆیە دەبینین لەو تەمەنە كورتەی شیوعیەت زیاتر لە (50) مەزهەبی شیوعی سەری هەڵداو زیاتر لە (200) زاراوەی تۆمەت هەر لە (ئەنسكۆلوبیدیای سۆڤیەت) هاتووە وەك (تحریفی، ماووی، ترۆتسكی، ئیسلاحی، جمود فكری عەقائیدی، دیماگۆگی،...هتد)، بەڵام بە سەرنجێكی سادە ئایا دەشێت 2+ 3=5 بێتە 7، یان راستی شاخی قەندیل بگۆڕدرێت و بڵێین كەوتۆتەخوارووی‌كوەیت؟.. راستی و بەها و دادگەری چەسپاوە.

- ئینجا ماركسیەت ویستویەتی لەڕێی سروشتەوە ئادەمیزاد بناسێ، فەلسەفەو یاساكانی سروشتی خۆی بە سەر ئادەمیزاد پەیڕەو بكاو چەوت دەرچوو، ئادەمیزادی نەناسی لەبەر هۆیەكی سادە: ئادەمیزاد تەنیا درێژكراوەی سروشت نیە وەك وای بۆ چووە.

### ب- لەڕووی ئابووری‌یەوە:

- ئابووری زۆر گرنگە بەڵام بەتەنیا بەرپرسیار نیە لە مێژوو وەك لە شیوعیەت هەیە، تاكە بنچینەی هەموو پەیوەندیەكانی تاك و كۆمەڵێش نیە[1].

- پێناسی (قیمة) و (فائض القیمة- زێدەبایی) لەگەڵ گرنگی زانستەكەشی نوقستانە و تاكە هۆی دەوڵەمەندی سەرمایەداری و هەژاری هەژاران نیە وەك لە شیوعیەت هاتووە، ئەوەتا ئیحتیكار، سوو، حرام و حەڵاڵ، ڕێكنەخستنەكانی كەرتە ئابووریەكان، موڵكیەتی تایبەتی بێ‌سنور، سەرخانەكانی دەوڵەت، سیاسەت، ڕاگەیاندن، ..لەدوای هەموو ئەوانە ڕۆلی ئینتمای چینایەتی وزیرەكی دەولەمەندەكەش هەمووی ڕۆڵی خۆی هەیە.

- موڵكیەی تایبەتی زیادەكەی دەردە نەك خۆی وەك لە شیوعیەت باوە، قەڵاچۆی موڵكیەت وەك ئەو دكتۆرە خراپە وایە لەبەر دەردێكی ئەندامێك بەتەواوی دەبڕێت، نازانێ چارەی بكات. لەوەشدا دەردەكە لەبەر بوونی موڵكیەت نیە بەڵكو بە زیادە ڕەوی و سنوربەزاندنەكەیە.

- مادام لە كۆتاییدا پرۆسەی بەرهەم و دابەش(توزیع) لێك ببچڕێ وەكلە بنەمای شیوعیەت هاتووە(بە پێی توانا ئیش كردن و بە پێی پێویست وەرگرتن )، ئەوا هەرگیز

---

[1]تێبینی: ئەو بابەتە نموونەی وردەكاری پێچەوانەی زۆرە بەڵام ماوە نیە.

ئـادەمیزادە بەرهـەم هێنـەرەکان دڵسـۆز نـابن بـۆ کارەکـەیان، مەگـەر ئـەخلاقی ئـەو کۆمەلککگەیە ستاندەر بیت، کە لە شیوعیەتیش ئەخلاق مادیە و توخمی ئاینی تیـا نیـە، نابێتە یارمەتیدەرێکی ئەو بەرهەمە کە هیچ بەرژەوەندیەکی خۆی تیا نیـە، بۆیـە جـۆری بەرهەم و پیشەسازیەکەیان گەلێ خراپ بـوو منافەسـەی بـازاڕی پـێ نـەدەکرا. هـەروەك بینیشمان لە ئەزموونی تەکنەلۆجیای وڵاتـانی سۆشیالیسـتی چـەندە کـەل و پەلـەکانیان خراپ بوو لەچاو سەرمایەداری.

### ج- لەڕووی مێژوویەوە:

- مێژوو تەنها لە ململانێی چینەکان (صراع الطبقـات) نەهاتووە وەك لای شیوعیەت باوە.

- ئابوریش گرنگە بەڵام یەکلاکەرەوە(عامل الحسم) نیە و تاکە ڤاکتەری دروسـتکەری مێژووش نیە.

- گوایـە کۆمەڵگـە (6) قۆنـاغی بڕیـوە (مەشـاعی- کۆیلایـەتی- دەرەبـەگی- سەرمایەداری سۆشیالیستی- شیوعیەت) ئەوە مێژووی توێژێکی کۆمەڵە نەك هەمووی، هـەرگیز (مشـاعی) سـەرەتای کۆمـەڵ نیـە، ئـەو بۆچـوونە لـە (تیـۆری پەرەسـەندن) هەڵدەقوڵێئەویش لە فەلسـەفەی گـەردوونی وەسـتاوی هەتاهەتایـەی (دەهـری) کـە بـە زانستیانەهەردووکیان چەوت دەرچوو.

- با بڵێین (مشاعی) راست بێت و (شـیوعیەت)یش کۆمەڵگـەی داهاتوومـان بێـت، ئەوا پرسیارێکی گرنگ: (خۆ لە مشـاعی چـینەکان نەبووینـە تـا ململانـێی چـینایەتی هەبێت، چۆن گەشەی کردووە هەر بەپێی یاسای خۆیان؟ لە شیوعیەتیش دیسان گوایە چین نامێنێ، چۆن گەشە دەکات؟ مـادام (صـراع الطبقـات مصـدر التطـور التـأریخی الوحیـد) بێت.

- لە کۆتاییشدا (الحتمیة التأریخیة)ی شیوعیەت ڕاست نیەو ناشبێت.

**د-** لەبارەی ئاینەوە:

- ئەو تێڕوانینە (الدین أفیون الشعوب) تەنها بۆ سەردەمی مەسیحیەتی (دەسـەڵاتی کڵێسا) نەك بۆ هەموو ئاین، ئـەوەتا ئیسـلام (نـەك ئـەفیون) بـەڵکو هـیچ هانـدەرێکی

ئادەمیزاد بە ئەندازەی ئیسلام نیە چالاکی بکات، بۆیە وابە بیچەوانە وبەتوند ڕەو وەسف دەکری*.

- ئایینیش لە فرەخواییەوە بۆ یەك خوایی نەهاتووە، لە ترس ونەزانین و بێتەفسیری دیاردە سروشتیەکان نەهاتووە.. ئەو تێڕوانینە ئەوەندە چەوتە بووەتە شەرمەزاری زانست لەو سەردەمەی تەکنەلۆجیا و زانست کە بە سەردەمی رابوونی ئاینەکان دەناسرێ.

- ئیسلام نە میسالیە لە ئایدۆلۆجیا، نە سەرمایەداریشە لە ئابووری، بە پێچەوانەوە بەشی هەرەزۆری لە قازانجی دەوڵەمەندان نیە، هەر بە نموونە لە سیستەمی ئابووری ئیسلام هاتووە:((..کی لا یکون دولة بین الأغنیاء منکم)).

- (بەپێچەوانەی پێشبینیەکەی ستالین) ئەوا ئەنجوومەنەکان و تەلەفزیۆنیش هات و ئاینیش بەهێزتر بوو.

- ئایینیش تەنها توخمێك نیە لەسەر خان و پێویستی ئابووری دیاری بکا، بەڵکوکۆمەڵە ڕژێمێکی ژیانە.

## هـ- لە رووی فکر و ئایدۆلۆژیا:

- فکر جولەو گەشەی سەربەخۆی هەیە تەنها رەنگدانەوەی واقع نیە. وەك مارکسیەکان وای بۆ چووبون، ئەگەر وابوایە چۆن بەپێش واقع دەکەوت و داهێنانی دەکرد و، فەلسەفە و بیرکاری و درۆ و زۆر شتی تر واقعەکەی نیە، کەچی لەفکر هەیە.

- ئەو مەبدەئەی مارکس (بوونی کۆمەلآیەتییەکەت هۆشمەندیەکەت دیاری دەکات، نەك پێچەوانە)، نەخێر بەهەردوو سەری راستە و هێشتا فاکتەری تریش هەیە لەو پرۆسە ئالۆزە بەشدارە.

- پێناسی هەر مرۆڤ و تەبیعەتەکانی گوایە لە سەرو کەللەی نیە بەڵکو لە بازارەکەیەتی، نەخێر زیاتر لە سەرو کەللەیەتی لەگەڵ کۆمەڵێك هۆکاری ئالۆزی ترە بە بازاڕیشەوە.

- راستە لە سەرەتادا فکر دیلی واقع و دەوروبەریەتی، بەڵام دوایی دەبێتە پێشڕەو و بزوێنەری هەمان واقیع.

---

*لە ڕاستیدا ئەگەر ئیسلامێکی ناسیاسی و سست بێ ئەوا پێی دەڵێن (افیون الشعوب )ە،ئەگەر سیاسی وبزێویش بێ بە توند ڕەوی وەسف دەکەن .

- ئینجا نەیتوانیوە بە ڕوانگـە فەلسـەفیەکەی جیـاوازی نێـوان عـەقڵی ئـادەمیزاد و عەقڵی ئاژەڵەکان بقەبڵێنێ و هەندێ جار یەکسانی کردووە. کە سەرچاوەیەکی بنەڕەتیە لە زۆربەی چەوتیەکانی مارکسیزم.

## ل- ئادەمیزاد

- ئادەمیزاد لە زنجیرەی پەرەسەندنی مەیمون.. نەهاتووە، ئەوە چەوت دەرچوو، بەپێی زانستی (ئەندازەی جینەکان) ئادەمیزاد لەکۆنەوە تا ئێستا هەر ئەو ئادەمیزادە بووە.

- گوایە" کار" ئادەمیزادی دروست کردووە. وەك لامـارك مەزنـدەی کـردو داروین ودوای تەواوی مارکسیەت زانستیشی پێ هەڵخەڵـەتا[1]. ئـەدی هـەر ئـادەمیزادیش کـاری دروسـت نـەکردووە، وەك مەسـەلەی هێلکـە لـە مریشـکە یـان بەپێچـەوانە.. لێـرە ئادەمیزادەکەیە.. ئەگینا بۆ ئەو کارە ئاژەڵێکی تری نەگۆڕی.

- ئادەمیزاد دەوری سانەوی نیە لە دروسـتکردنی مێـژوو و رووداوەکـانی ئێسـتاش، هەر بە نموونـە: لـە وەڵامـی گەشـەکردنی ئـادەمیزاد و کۆمـەڵ دەڵێـت: نـاکۆکی نێـوان پەیوەندی بەرهەم هێنان و هێزی بەرهـەم هێنـەرە، پەیوەندیەکـە چەسـپاوەو هێزەکـە لـە جووڵەیە، جا پرسیارەکە دووبـارە دەبێتـەوە، ئـەی هێزەکـە بەرهەمهێنـەرە چـۆن گەشـە دەکات؟ دەڵێن بەهۆی ناکۆکی نێوان ئادەمیزادەکەو ئامرازەکانی بەرهەمهێنەر[2].

ئالێرەدا دزەکە گیرا بە پرسیارێکی زیاتر، ئایا ئادەمیزاد خاوەنی ئامرازەکەیـە یـا بـە پێچەوانە؟ کامیان کامیانی دروست کردووە؟ هەڵبەتە ئادەمیزاد.. کەواتە هاتینەوە سـەر پرسیاری یەکەم بێ وەڵام لەدوای ماندووبوونێکی زۆر، بەو شێوەیە فەلسـەفەی مارکسـیزم وەڵامی پرسیارە نەمرەکانی پێ نادرێتەوە.

---

[1] ئەنجلس کتێبێکی بەناوی ( دور العمل فی تحول القـرد الی الانسـان)،ئەو عنوانـە لـە بنەچـەدا لـە ( فریدریك انجلس–دیالکتیك الطبیعة –دور العمل فی تحول القردال انسان ص194–208) هاتوە، دوای کرایتە کوراسەیەکی سەربەخۆ.

[2] تا ئێرە وەڵامەکەیە کە لە کتێبی (اسس مارکسیه اللینینیه) هاتووە.

- له ئادەمیزاد (گەدە) گرنگە بەڵام بۆ دروستکەری مێژوو بێت؟ ئەدی هەموو ئاژەڵێك گەدەی نیە؟ کەواتە دەبێت ( فاکتەریکی سەرباری _عامل اضافي) هەبێت ئەویش عەقڵەکە ناسنامەی مرۆڤە نەك گەدە وەك مارکسیەت وای بۆچووە.

## و- له رووی کۆمەڵایەتی و خێزانەوە

- کۆمەڵ دابەش بووە بۆ کۆمەڵێك توێژ و چین و دەستەو تاقم.. بەڵام لەسەر بنچینەی پەیوەندی بەرهەم هێنان نیە بە تەنها، ئینجامەرج نیە ووشیاری فکری یەکە و بیروبۆچوون و ئینتیما سیاسی جووت بێت لەگەڵ باری کۆمەڵایەتیەکەی و ئەویش لەگەڵ باری ئابووریەکەی، ئەوەتا پڕی نموونەیە چەندین ئاغە شیوعی بووینە، چەندین کرێکاریش دەوڵەتی بووینە.. هەر مارکسیەت لە دامەزراندنیەوە تا بڵاوکردنەوەو پەیڕەوکردنی هیچی سەرکردەی کرێکاری نەبووە بە مانا و پێناسی پرۆلیتاریا.

- پەیوەندی نێوان پرۆلیتاریا و برجوازیش هەر دوژمنداری دەرنەچوو.

- چینی ناوەندیش نەبووە پرۆلیتاریا وەك (مارکس) لە کتێبی (بؤس متزاید) پێشبینی کردبوو.

- له سەرەتای کۆمەڵیش (دایك سالاری) نەبووە[1]، خێزانیش هەر هەبوو لەگەڵ بوون و مانی ئادەمیزادە.

- پەیوەندی (هاوسەریش)یش ناکۆکی برجوازی و پرۆلیتاریا نیە وەك (انجلس) لە کتێبی (أصل العائلة..) و مارکسیش لە (العائلة المقدسة) وتوویەتی[2]، بەڵکو پەیوەندیەکی تەواوکەری یەکتریە، کوا کام مەرجی پرۆلیتاریا و برجوازی لە پەیوەندی ژن و مێردا هەیە هەر بەپێی مەرجەکانی خۆشیان؟

---

[1] یەکەم کەس ئەو ناوەی داهێنا (باخۆفن 1815-1887)ی سویسری بوو لەکتێبەکەی(حق الام) بە پێی **(مقدمة فی انثروبولوجیة الإجتماعیة ص31 )** .

[2] هەلویستەکانی مارکسی وشیوعیەت لە بارەی ئافرەت وهاوسەری و..لە کتێبێك بە ناوی: ئافرەت لە ڕوانگەی ئاینی وعەلمانی —دانەر بخوێنەوە .

## ن- لەڕووی سیاسیەوە:

- ئەگەر هاتنی شیوعیەت حەتمی بێ، ئی دی حزبایەتی و شۆڕش و ئەو هەموو خوێن ڕشتنەوەی بۆ چی بوو؟ ئەی گفت نەبوو لەکۆتایی ئەو سەدەیە بێت (وەك لینین لە مزگێنیەکەی دای)، بەپێی پێشبینیەکانی (مارکس- ئەنجلس- لینین) دەبوایە شۆڕشی پرۆلیتاریا لە وولاتە پێشەسازیەکان بکرابایە (ئەڵمانیا- فەڕەنسا- ئینگلتەرا..) کەچی لە ولاتە دواکەوتووەکان ڕوویداوکوتایسەدەی بیستەمیش تەواو پێچەوانە هاتەدی شیوعیەت تێك ڕووخا.

- ئەگەر دنیای شیوعیەت بەهەشت و سەرمایەداریش دۆزەخ ئەوا ئەو دیوارە شەرمەزارەیەی بەرلین بۆچ بوو؟ (ربیع پراگ) ئەو هەموو راپەڕینانە، سەندیکای کرێکاران، (خۆپێشاندانی مەیدانی تیانیامین لە چین... هەمووی بۆچی؟)

- زۆربەی ئەو بنچینە شیوعیەتە لەڕێی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوایەتی هاتەدی کە لە فەرهەنگی مارکسیەت بە (ململانێی سانەوی) حساب بوو، هیچی لەڕێی ناکۆکی هێزی بەرهەم هێنەر و پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنەر نەبووە تا شۆڕشێکی سەرتاسەری جیهانی و شیوعیەتی پێ دابهێنن.

- ئەگەر راستە شۆڕش لەسەر بنچینەی (بازدانی —پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان) دێتئەوا دەبوایە لەگەڵ یەکەم گڵپەی شۆڕش سەرتاسەری جیهانی بگرتابایەو لە قۆناغی سەرمایەداری بگوازرابوایە بۆ سۆشیالیستی وەك ترۆتسکی لە کتێبی (الثورة الدائمة) بۆی چووە و ڕاست بوو، کەچی لە دواییەکەی لەسەر ئەو بۆچوونەی تیرۆر کرا ترۆتسکیەت بووە تۆمەت.

- کوا تاکە یەك نموونەی سیاسی نیە کە دەوڵەتێکی سۆشیالیستی بەپێی مەرجەکانی مارکسیزمواتە لەڕێی ناکۆکی نێوان پەیوەندی و هێزی بەرهەم هێنەرەوە هاتبێت کە دەکاتە شۆڕش کرێکاری ڕووت.. کوا؟ چۆن دەبێتە یاساونمونەیەکی نەبێت. بەپێچەوانەوە بزوتنەوەی کرێکاری بوونە قەڵغانە لەدژی شیوعیەت و لەسەردەستی ئەوانە شیوعیەت داڕووخا.

**ی- لەڕووی پیادە واقعیەوە:**

- کۆمەڵگەیەکی نمونەیی شیوعیپێشکەتوویان پێ دروست نەبوو، چجای دادگەری.

- ڕژێمەکان بەناوی دکتاتۆری پرۆلیتاریا بوونە دیکتاتۆری تاك حزب و دوایش دیکتاتۆری تاکەکەسی. هەندێکیان بەرەو پادشایی شیوعیانە وەرچەرخان وەك لە کۆریاکیم ئیل سۆنگ مرد کوڕی هاتە جێی وئێستاش لەکۆبا فیدل کاسترۆ براکەی خۆی کردۆتە سەرۆك..لەگەڵ زۆر نمونەی تر.

- نیوەی جیهان کەوتنە خولگەی سۆڤیەت بەڵام زۆربەی سەربەخۆیی خۆیان لەدەست دا، ڕووداوەکانی (بوهاری پراگ) (داگیرکردنی کەمبۆدیا لەلایەن ڤیتنام) (داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن سوپای سور)...هتد.

- لەکۆتاییدا، کۆمەڵ و بەشەریەت تەزکیەی نەکردن و بە فکر و مەدرەسەو دەزگای سیاسیەوە تێك ڕووخا، بەڵام لە کوردستان هێشتا دان بەو شکستیەی ئەو مەدرەسە و خۆشیان نەهێناوە کە لەو مەدرەسە بوون و ئیتر زۆر بە خێرایی بەرەو مەدرەسەی لیبرالی و سۆشیال دیمکراسی پەرش بوونە.

بۆ دۆزی کورد

- هەڵوێستی سیستەمی سیاسی و دەوڵەتە شیوعیەکان بەرامبەر کورد نێگەتیڤ بووە زیاتر پاڵپشتی داگیرکەرانی بووینە.

- وەك ئەزموون دەرکەوت لەناو سۆڤیەتیش کێشەی نەتەوایەتی چارەسەر نەببوو ئەوەتا لەپاش مەرگی ئەو هەموو کێشە نەتەوەییەی بەجێ هێشتووە. کەچی جاران مارکسیەکانی کوردستان هەردەم نمونەیان بە سۆڤیەت دەهێناوە گوایە کێشەی نەتەوایەتی چارەسەرکردووە.

- شوێنی خەباتی گەلان لە فکری شیوعیەت دا وەك لە (مانفێستەکە) هاتووە (کرێکاران نیشتمانیان نیە)، بۆیە زۆربەی حزبە کۆمەنیستەکان هەڵوێستیان بەرامبەر کێشەی کورد سەلبی بووە، جار وابووە بە چەك دژی وەستاون، ئەو وەسفەی (کوردایەتی شەرمەزاریە) کە لەسەر دیوارەکانی کوردستان دەنوسرا لە دیدێکی رەسەنیمارکسیەوە هاتووە.

- هەر لەپێش و پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر1917ی رووسیا و شیوعیەت بەشێك بوون لە دروست کردنی مەینەتی کورد: هەتا ڕێکەوتنی (سایکس- پیکۆ — سازانوڤ

1916) به ڕەسمی خەملی، لینین خۆشی دژی بزووتنەوەی کورد بووە لایەنگیری کەمالیزم بوو. ئەزموونەکانی کۆماری مهاباد 1946 ئەزموونی شۆڕشی ئەیلول 1960- 1975.. چاکترین بەڵگەی بەرجەستەن.

- کوردی سۆڤیەتیش لەسەر دەستی هەریەکە لە ستالین و خرۆشۆف و بریجنێف پەرت و بڵاوکران.

- لە ساڵی 1974 دووبارە بە ناپاڵم و فڕۆکەی سۆڤیەتی بۆ ژن و منداڵی کورد هاتەوە مەیدان.

- حزبە کوردستانیەکانی تریش کە (مارکسی لینینی)یان وەرگرتبوو وەك (اهتداء) ئەوا کێشەی کوردسانی زۆر دواخست، بووە هۆی (ئینشقاقات) و (شەڕی کورد و کورد) (بێ ستراتیژیەتی) دەست نیشان نەکردن و تێکەڵاً کردنی: (دۆست و دوژمن)و (اولویات و سانەویات- موازنە)، (ئامانج و ئامراز)، (ئاسۆیی و ستوونی)، (ڕزگاری نیشتمانی و رزگاری کۆمەڵایەتی)،...هتد.

## 2- مەدرەسەی سۆشیالیستی

مەدرەسەی سۆشیالیستی باو ئێستا دوو بەشە:

أ- سۆشیالیستی زانستی.

ب- سۆشیالیستی دیموکراتی.

یەکەمیان هەمان ڕێبازی مارکسیزمە بەو (قۆناغەی گوازتنەوە لە سەرمایەداری بۆ شیوعیەت) دەگۆترێ، تەجرەبە کرا لە وڵاتانی سۆشیالیستی و دەرنەچوو، ئێستاش لە جیهان و لە کوردستانیش شتێك ماوە لە سۆشیالیستی زانستی هەروەك لەمەدرەسەی یەکەم باس کرا، بۆیە تەنیا باسی (سۆشیال دیموکرات) دەکەین.

سۆشیال دیموکرات:

بۆ تێگەیشتن زیاتر سەرنج بدە هەردوو خشتەکی بەراورد (سۆشیال دیموکرات و سۆشیالیستی زانستی)، باقیەکەی تر خاڵی هاوبەشن، ئەو تێبینیانەی لەسەر شیوعیەت و سۆشیالیستی زانست تۆمارکرا بۆ ئێرەشە، بۆیە هەر چەند خاڵێکی زۆرتایبەت بەکورتی لێ باس دەکەین:

1- سۆشیال دیموکراتی جاران شانازیان بە مارکس دەکرد جیایان دەکردەوە لە شیوعیەت و(مارکس- لینینی)، بۆیە (سۆشیال دیموکرات)ی ناونراوە چونکە دەشێت بە ئامرازی دیموکراسی و ئاشتیانە و خەباتی میللی و هەڵبژاردن نەك بە تەپ و تۆز و تۆقاندن[1]،بەلاّم لەدوای شکستی شیوعیەت ئەوانیش لە (مارکسیەتەکەش) پەشیمان بوونەوە، لەراستیدا سۆشیالیستی زانستیش و هەتا بەشێکی گەورەی حزبە شیوعی یەکانیش ڕەچاوی دیموکراسیان دەکرد، لە ئەوروپا هاتنە ناو هەڵبژاردن و دیموکراسی و ئاشتیانە (کە پێیان دەووتن: ئۆرۆ شیوعی) کەچی هەر شکستی هێنا، واتە ئەوانەی ئێستا لە جیهان و لە کوردستانیش سوشیالیستین و گوایە بەڕێگەی دیمکراسی پێڕا بگەن ئەوە تەنها تاقی (تاقیکراوەیە)، ئەنجامەکەی تاڵە.

2- ئەو جۆرە سۆشیالیستی دیموکراسی نەتەوایەتیە لە کوردستان ئێستا گەرمەیەتی هەرچەندە لەکوردستانی خواروو وا لەویش بیزار دەبن، لە ڕۆژهەلاّت نوێ نیە هەتا لە ناو عەرەبیش ئەوا ئەو ڕێبازەیە کە (جمال عبدالناصر) لە کتێبی (فلسفة الثورة)، (معمر قذافي )لە( كتاب الأخضر) بانگێشەیان بۆ کردووە، بەشێك لەو بنەما سۆشیالیستیەیە هەریەکە لەتۆرانیونازی وفاشی و بەعسیەتی لەسەر بیناکرابوو.

ئەو جۆرە سۆشیالیستیە ئاوێتەکە لە ڕێساکانی سروشت و سودی ئادەمیزاد، ئەوەش هەر لێکدراوێکی داروینەتی ئابووریەکەیەلەگەڵ مەزهەبی مەنفەعەی سەرمایەداری، ئەنجامەکەی نەهاتی بوو، ئێستا چۆوە سەر هەمان بنەمای پراگماتیزمی ڕۆژئاواو بەرژەوەندو بەرنامەی تاك خوازی و...هتد.

3- ئەو بنەمایەی سۆشیالیستیش (کل حسب عملە)، نە ڕۆژێك پەیڕەو کرا بە تیۆریش شوونی نەما، ئێستاش سۆشیال دیموکراسەکان خۆی لیّ ناکەنە خاوەن.

4- کێشەکانی :حوکم، نەتەوایەتی، ئافرەت، هەژاری، سوو، ...هیچی پیّ چارەسەر نەکرا.

5- حزبە کوردیەکان نوێن لەگەڵ سۆشیال دیموکرات، زۆربەی تازە سەنگەری فکروعەقیدەیان لە مارکسیەتەوە گواستۆتەوە ناو ئەو مەدرەسەیە، وا پێدەچیّ سەنگەرەکان لەوێش بگوازنەوە.

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە کتێبی (برنامج العمل- کاوتسکی).

6- (حدکا)ی ئێران و (د.قاسملۆ) پێشەمووان بیرۆکەیەکی سۆشیال دیموکراسی سادەیان هەبوو، هەروەها لە ساڵی 1981یش یەکێتی ئەو وڵاتە سۆشیال-دیموکراتەکانی بە گرنگ دانا نەك فکرەکە، ئێستا یەکێتی و (حزبی سۆشیالیست) راستەوخۆ و سەر بەو مەدرەسەن.

7- ئەو مەدرەسەیە واتە (عەقیدەی سۆشیالیستی) ئەوەندە بەهێز نیە تا بتوانێ:

أ- بیری ئەندام و لایەنگرانی پتەو بکات و یەکێی بیر و کردەو رێکخستنی گورج و گۆڵی پێ دروست بێت. بۆیە ئەو حزبانەی سەر بەو مەدرەسانە هەم یەکێتی هەڵوێست و بۆچوون و کردە و گفتەیان نابێ، هەم فرە تەیاری لەنێو دەخەملێ، پەرژینێکی فکری قایمی بۆ حزبەکەی دروست نابێ بەڵکو فکری تر بە ئاسانی دیوارە تەنکەکانی دەبڕێ و کارلێك کردنی خۆی دەکا،یاخود هەر خاوەنی فکرنابێ.

بۆیە ئەو جۆرە حزبانە لە جیهانی ئیسلامیدا ناچار دەبێ بەدوای دەسەڵات و سیستەمی دیکتاتۆری و زەبر و زەنگ و بچووك کردنەوەی خەڵکی تر بن تا خۆیان کەمێك دەرکەون.

ب- ببێتە حزبی بەرژەوەندی و پایە و سوود کە لە ئەنجامیدا ئەو دیاردە دزێوانەی (دزی، تالان، بەرتیل، گەندەلی، دەست تێکەڵاْ کردن، خۆویستی،...) لێ پەیدا بێت. بەڵکو بەرەو خراپتریشە و هیچ داینەمۆیەکی پەروەردەیی و بیناکردنی مرۆڤ لەو مەدرەسەیە ئێستا بەدی ناکرێ.

ج- کەواتە بەکورتی پەیڕەوکردن و هێنانیئەو مەدرەسەیە بۆ ناو وولاتانی جیهانی سێیەم و کورد دیسان دەرد و نەخۆشیە نەك چارە و دەرمان، لە چوارچێوەی دەردی (تقزم الثقافي) و (تقزم الحضاري والسياسي)دایە.

## 3- مەدرەسەی لیبراڵی

ئەو مەدرەسەیەش لایەنگری هەیە و جۆرێکە لە بەرنامەی ژیان،زیاتر لە ڕۆژئاوا پەیڕەو دەکرێت، جیاشە لەگەڵ دیمکراسی، ڕاستی یەکەی وایە حوکمەکەی دیمکراسیە، ئابووریەکەی سەرمایەداریە، کۆمەڵایەتیەکەشی لیبرالیە و لە ڕووی فکریەوە عەلمانی میسالی یە،لەگەڵ ئەوسەرەنجامانە:

أ/ له بنچینەدا ئەوەلە بەرامبەر سیستەمی دەرەبەگی بەئایدیۆلۆژیای ڕادیکال حساب دەکرا،دوای بووە مەدرەسەی کۆمەڵە فکری بێ ئنتما، تەنها بۆ مانەوەی خۆی هەوڵی داوە ڕەخنە لە مەدرەسەکانی تر بگرێت بێ بەدیل وەك (مذهب اللامذهبية).
ب/ فکرەی ڕێبازی میسالی، میسالی زاتی، وخودی، زاهیری، سروشتی، مبدأ اللذة... بەرهەمی ئەو مەدرەسەن.
ج/ ڕێبازە سەلبیەکانی: (مۆرگان لەبارەی مێژوو)، (فرۆید لەبارەی جنس) (دورکایم لەبارەی سۆسیۆلۆژیا)، (ئادم سمث- ئابووری) (فەلسەفەی وجودیەکانی ڕەش بین)،(تەتەوریەکان) (مەزهەبی مەنفەعەولەزەی بنتام،ستیوارت،هۆبز،لوك..تادەگاتەدەهری)،زۆربەی چەکی تیۆریە بۆچەوساندنەوەو ڕەگەزپەستی.
د/ هەرچەندە ئەو مەدرەسەیە بێ تەرازووە بۆ هەماهەنگی بەشەکانی فکری و سیاسی و کۆمەڵایەتی وتیۆری واقعی..،بەڵام بە ئەزموونێکی دوورودرێژی دەوڵەمەند،موگناتیسانە توانیویەتی ئەو شەبەنگە سیستەمە بکاتە نەریت و فەرهەنگ و کەلتوور و فەلسەفەو یاسا و دەستور و ڕێبازی سیاسی کە ڕێك لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری و زەمینەی پراگتیزمی بسازێ، بۆیە ئێستا لە جیهان بە تەرازوو وپێوانەکانی ئەوانەواعەولەمەی ئابووری و سیاسی و یاسایی دادەڕێژرێ، بێڕەچاوی ناسنامە و بەرژەوەندی و حساباتی میللەتانی تری دواکەوتوو یان هەتا چینی هەژاری جیهانی.
هـ/ هەندێ ڕێسای سروشتی بایۆلۆجی ودارستانی کراوەتە فەرهەنگی ژیانی ئەو جۆرە کۆمەڵگەی کە ناشێت بۆ باری کۆمەڵایەتی.
و/ ئینجامێژووی ئەوروپی لە دۆزینەوەکان و (أرقام القياسيە) و بەبۆچوونی ئەوان مێژووی هەموکۆمەڵە و (تەهمیش) کردنی خەڵکی ترە، هەمان ڕەگەزپەرستی کۆنە بەشێوەیەکی فراوانتر و ڕێکتر.
ز/ تیۆرەکانی جیاجیای تەفسیری ئاینی و ئەخلاقی هۆکارێکی بەهێزی داڕووخانی بەهای ئەو کۆمەڵگەیە.

چەند لایەکی تری لیبرالیزم:

1- لە ڕووی ئایینەوە (حیادی):زۆربەی سەرچاوەکانی ئەو تیۆر و بۆچـوونە چـەوتانەی سەبارەت بە ئاینن لەو شەبەنگە دەردەچێت، هەر بە نموونەهەندێ راو بۆچوونیان سـەبارەت بە ئاین تۆمار دەکەین:

- تایلر: ئاین لە گیانە عفریتیەکان هاتووە.
- سپنز: لە چیرۆکی مردووەکان هاتووە.
- لیڤی پرۆل: لە بێعەقڵی و نەخوێندەواری هاتووە.
- كوندريت مولر: لە ترسی کارەساتە سروشتی یەکان هاتووە.
- بزر: لە مەزنی سروشت هاتووە کۆتایش دێت بە کۆنترۆڵ کردنی سروشت.
- فرۆید: لە پشیمان بوونەوەی باپیرە کوژراوەکەیان هاتووە.
- فیورباخ: ئاین نامۆیە، لە بەرهەمی ئادەمیزاد نەك خودا.

لە سەرەنجامی ئەومدرسەیەدا عەیارەکان تێـك دەچـن کۆمەڵگەیـەکی دوور لـە ئـایین بەدەیان سەرەنجامی تری سەلبی ترسناکی لێ دەزێتەوە،کۆمەڵگەیەکی پر لە تاوان دروست دەکا،کۆمەڵە یاسایەك هەیە لە فەرهەنگ و ئەنسکلۆپیدیەکان بـەناوی (قـوانين اجتماعيـة الكونيـة- Univarsal social law)هـاتووە وەك دەقـی خـۆی (ژمـارەی تـاوان لـە کۆمەڵگەیەك زیاد دەکات ئەگەر ئایین رۆڵێکی پەراوێزی هەبێت)[ت]، هەر سەرنج بدە جاران لە شارستانی (مایا) تەنها ئاخری ساڵ ڕۆژانی فرِوفێڵ و هەڵگەڕانەوە و درۆ بـوو یـان لـە (1)ی نیسان.. بەڵام ئێستا درۆ و فێڵ لـە سەرتاسـەری سـاڵە، لـە چوارچـێوەی یاسـا و تیۆری سیاسی وفرِوفێڵ و بەرژەوەند پەرستی و خودپەرستی و درۆ ڕەوایی پـێدراوە، لـەو (15) سـاڵەی دەسـەڵاتی کـوردی لیبرالیانـە ئـەزمونێکی تاڵـە زیـاتر بەرهـەمی تـاك دەسەڵاتی (حزب القائد)، براكوژی، خۆویستی، بەرژەوەنـدی تایبەتی،خۆسـەپاندن بەسـەر بەرژەوەندی گشتی، بێئەمەکی، بێبەڵێنی، نادڵسۆزی، گیرفان پڕکردن، گـوێ نەدانـە ڕای گشتی،..لەگەڵ زۆر سەرەنجامی خراپ تری بەرهەم هێناوە.

[ت] موسوعة العلم الاجتماع ل506. هةروةها بروانة: مةوسوعةى جودى ل255

2- لەڕووی ئابووری (سەرمایەداری)

أ- بازاڕی ئازاد وەك (ڕۆجیە گارۆدی) گۆتەنی بریتی یە لە ئازادی هەڵلووشینی هەژارەکان لەلایەن سەرمایەداری[1].

ب- ئەنجامی ئەو بازاڕە هەژاری زۆر و دەوڵەمەندی زۆر دەوڵەمەند پەیدا دەکات لە یەك کۆمەڵگە و لە یەك وڵات و لەیەك شار تەنانەت لەیەك خێزانیش.

ج- لە ئاماری 1998ی نێونەتەوەیی دەرکەوت دوای لە (کۆنگرەی زەمین)یش لە جوهانسبرك دووپات کرایەوە، (خەڵکی سەروو)* لە 20٪ی دانیشتوانی جیهان پێك دێنن کەچی لە 86٪ی داهاتەکان دەخۆن، (خەڵکی خوارووش) لە80٪ دانیشتوانن کەچی لە 14٪ دەخۆن، بەپێی ئامارێکی (رۆجیە گارۆدی- لە کتێبی پێشوو) هەریەك ملیۆنێری ئەمریکی بایی50 ماڵی ئەمریکی ساماندارە، لە کوردستانی خۆشمان نەفەر هەیە داهاتەکەی یان فەرمانبەری حزبی هەیە مووچەکەی (50) هێندەی فەرمانبەرێکی ترە، لەسەر ئەو بنچینە محمد باقر الصدر دەڵێ: لە سەرمایەداری بەسەربەستی دەست پی دەکات بە بەندایەتی هەموو لایەك کۆتایی دێت ، کەچی بەندایەتی خودا بە بەندایەتی دەست پێ دەکات بەسەربەستی کۆتایی دێت[2].

د- (سوو+ پاوانکردنی بازاڕ) بنچینەی ماڵداری ئابووری ئەو سیستەمەیە، {مارکس ناوی نا (فائض القیمة) بەدزیەکی یاساییانەی لەقەڵەم دا} ، هێشتا زیاتریشە.

هـ- قەرزەکان بە قازانج، وولاتانی جیهانی سێیەم کەوتنە ژێر قەرز،بۆ زیاتر بڕوانە مەرجەکان وسروشتی (سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی )، هەر تورکیا وەك (ئەربەکان) لە ئامارێکی (بۆ قەناتی جەزیرە لە مانگی 12/1999) ئاشکرای کرد: 88٪ی باجەکانی تورکیا بەو قازانجە دەڕۆیشت تا حکومەتی داد وگەشە هات ڕادەیەکی بۆ دانا .

ع- لەو مەدرەسەیە (إذا نطق المال سكت العقل)،و(إذا نطق القوة سكت الحق)، و(إذا جاء المصلحة ذهب المبادىء).

---

[1] روجیە گارودی- امریكا طليعة الأنهيار ص184 .

* مەبەست لە خەلکی سەروو ئەمریکاو وولاتانی ئوروبای روزئاوا دەگریتەوە

[2] محمد باقر الصدر -الإنسان والمشكلة الإجتماعية ص86

ق- بنەمای (بەرژەوەندی) سەرچاوەی هەموو دەردێکی کۆمەڵایەتییە، کەچی وەك ئایدیۆلۆژیاو سیاسەتیش شەرعیەتی هەیە، جۆرج بۆش(باوك) لە ووتارێکی (ئەکادیمی سەربازی) ووتی: (نابێت مەبادیئی هیچ میللەتێك لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ناکۆك بێت) دروشمی بەناوبانگیشیان (نەدۆستایەتی هەتا سەر نە دوژمنایەتیش بەڵکو بەرژەوەندی هەتا سەر).

ئەو بنەمایە مرۆڤایەتیانەی جارِیشی دەدەن زۆربەی سەرِابە، هەر لە سەرەتای ئەم سەدە لە 1918 سەرۆکی ئەمریکی 14 بنەمای بلاوکردەوە بۆ سەربەخۆیی گەلان، لەساڵی 1949 (جارِنامەی مافی مرۆڤ)، چەندین جار دووبارە بووەتەوەو، لەم سەدە نوێیەش چەند جار (مەبادیئ)ی تر بلاوکراوەتەوە،هەروەها لەبارەی کوردیش.. کەچی ئەو هەموو شەرِو شۆرِ و ستەمە لە میللەتان کراوەو دەکرێ و لێی جێبەجێ ناکرێ[1].

ك- با سەرنج بدەینە عەرەبێکی عێراقی و ماڵەکوردێك یان ماڵە کوێتیەکی هاوخوێنی خۆی تالان دەکات، یان هەر لە کوردستان کوردێك ماڵی کوردێکی تالان و وێران دەکا، ئەوە ئەگەر راست بڵێین نەك مەبدەئی ئیسلام نیە، بەڵکو مەبدەئی (شیوعیەت)یش نیە، بەڵام مەبدەئی بەرژەوەندیە، ئەو دیاردانە بەرهەمی مەدرەسەی لیبرالی بەرژەوەندی پەرستیە جا چ سەر بەو مەدرەسەیە بن یان نا،کاتێ ئەومەرامانە ئاشکرا دەبن کەبوار دەرەخسی .

3- لەرِووی کۆمەڵایەتی (لیبرالیەت)

أ- لەو کۆمەڵگەیە جیاوازی چینایەتی شەرعیەتی یاسا و نەریتیشی هەیە، تەنانەت دەزگای سیاسی و راگەیاندن و کەرتە ئابووریەکان هەرگیز لەدەست چینی خواروو نیە، لە کوردستانی خۆشمان چینی (ئاغا، دەرەبەگ، شێخ، سەرۆك خێڵ، کێخوا، خاوەن موڵك، ماڵە مەسئول، ئامێر، بەرِێوەبەر، وەستا..) چینی سەروون، رەنجبەرانیش بریتین لە: (جوتیار، هەژار، مسکێن، شوان، شوانکارە، کرێکار، پاڵە، سەپان، دۆخۆر، ئاوخۆرەوە، چاپەست، قاوەچی، شاگرد، کەتاف، خزمەتکار، پێشمەرگەی سادە، فەرمانبەر،...)، ئەو دابەشیە شەرعیەتی وەرگرتووە هەتا لە پرِکردنەوەی موچەو فەرمانبەریش، وەك دابەشی چینایەتی هندی لێهاتووە لەبراهماو شادراو چینی خوارووش(منبوز).

---

[1] ناکرێ نکولی لەوە بکەین کە لەدوای جەنگی سارد تا رادەیەك ئەو بارو دۆخە بەرەو چاکترە ،بەڵام لەهەموو دۆخەکان تا ئەو کاتە جیهانی ئیسلامی لەهەموو رژێمەکانی سەر زەوی خراترە.

ب- ئینجا سپی و ڕەش، ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتیـ نـەژادی ئـاری و سـامی،.. بـەجیا سەیر دەکرێن، میللەت هەیە نوێنەری لە (un) نیە و هەشـە ڤیتـۆی هەیـە، کـورد چـل ملیۆنە دەوڵەتی نیە،دەوڵەتیش هەیە ژمـارەی تـەنها(1000) کەسـە، کێشـوەر هەیـە کیشوەرێکی تر دەچەوسێنێتەوەو خۆ بە (سـۆپەرمان) تێـدەگاو خـەڵکی تـر بـە (خزمـی مەیمون)، هەر بە نمونە لە ساڵی 1992 لە کەنەدا خۆپێشاندانێکی نایاب کـرا لـە یـادی ساڵێك بەسەر جەنگی کەنداو، بەڵام 183 هێماو خاچیان هەڵگرتبوو، کە نیشانەی تەنها 183 کوژراوەکەی ڕۆژئاوابوو لەو جەنگە!دیاربوو نەك کوژراوی عێراق، کـوژراوی وڵاتـە هاوپەیمانەکانی وەك سعودیە و ئیمارات و کوێت و مصر.. حسابی بۆ نەکرابوو.

ج- پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی زۆر لاواز دەبـێ، ڕەوشـت و ویـژدان و بـەهاناهاتن و هاریکاری کۆمەڵایەتی زۆر سستە، ئەو کەمە پەیوەندیـەی کـە هەشـە لەسـەر بنچـینەی بەرژەوەندی مادیە.

د- لەبەر نەبوونی میکانیزمی ئەخلاقی بنەماکانی (مافی مـرۆڤ) بـەجیا داڕشـتراوە بەپێی میزاجی سیاسی و ئـابووری بـەکاری دەهێـنن، خـۆ ئەگـەر لیبرالیـەت بەعـەیار و دادگەر بێت، (مافی مـرۆڤ) بـۆ چـیە، هـەروەك یاسـاش ئەگـەر تـەواوبێت (سیسـتەمی محامات)ی بۆ چیە؟

ع- لیبرالیەتی تەواو و سەربەستی موتڵەق دەبێتە هۆی تێکدانی سەربەستی خـەڵکی تر، سەربەستی (کۆ) دەبێتە بەراگێڕی سەربەستی (تاك) ئی دی ئەوە دەردی هەموو بنەما ڕەوشـتی و ئـابووری و حقـوقی و سیاسـی و نەتـەوەیی و.. وەك ئـەو کەشـتیەی لـە فەرموودەکە هاتووە، مەسەلەی سەربەسـتی بـەبێ کـۆنترۆڵ وەك مەسـەلەی (داتلێشـانی ناوکی) وایە، ئەگەر بە کۆنترۆل بێت ئـەوا خزمـەتی بەشـەریەتی پـێ دەکـرێ لـە ووزەی کارەبـــایی، میکـــانیکی، کارگـــەی مـــەزن، گواســـتنەوە،.. بـــەڵام ئەگـــەر بەسەربەستیڕەهابێکۆنترۆڵ بێت ئەوا بۆمبا ئەتۆمیە وێرانکەرەکەیە.

ق- هەر ئەو جۆرە سەربەستی یە تاکیەیە وا لەخێزان دەکاتهێزی لێك هەڵوەشـانەوەی لە هێزی یەکگرتنی زیاتر بێت و کۆمەڵێك سەرەنجامی ترسناك پەیدا دەکا.

ك- لەسەر ئەو بنەما بەهێزە وتراوە: ڕۆژئاوا کۆمەڵی ڕووخانـد، ڕۆژهـەڵاتیش تـاك و جیهانی سێیەمیش هەردووکیان.

4- لەرووی سیاسی (دیموکراسی):

أ- دیموکراسی ئیستا لە چاو دیکتاتۆریەت بوویتە دەرمان ، بەلآم وەك ڕۆسۆ گوتەنی: ئەو دیموکراسیە*100٪ پەیڕەونەکراوەو ناشکرێت[1]، ئێستا بە مانای (دەسەلآتی گەل) هەر نەماوە، مەگەر دیموکراسیە گالتە جاڕیەکەی لیبیای معمر قەزافی ،دیموکراسی ئەسینی بووە یۆتۆپیا.

ب- حوکمی هەموو گەل نیە، یان لەنێوان چەند حزبێکی خاوەن نفوز کە نوێنەرایەتی سەرمایەدارەکان دەکەن یان کەمایەتیەك دەبێتە نوێنەرایەتی هەموو میللەت (لە پەرلەمان)، پەرلەمانیش خۆی ناوێکە حوکمەکەی ئەکەوێتە سەر ناوەرۆکەکەی، هەر ئەو پەرلەمانە بوو لە 3/3/ 1924 خیلافەتی ئیسلامی هەلۆەشاندەوەو هەم ئیسلامی قەدەغەکردو هەم کوردیشی قڕ کرد، هەمان ئەو پەرلەمانەش بووە لە سالآنی 1999 بۆ 2000 سێ ویلایەتی نایجیریای لە عەلمانیەوە گۆڕی بۆ شەریعەتی ئیسلامی، هەمان پەرلەمان مۆلەتی جەنگەکانی جیهانی و سیستەمی ئیمپریالیزمی داوەو، کەواتە دیموکراسی و بەرلەمان چاکەو خرابە، رەش وسپی هەلدێنی، شیوعیەت ولیبرالیەت لێ بەرهەم دێت، سوشیالیستی وئیسلام دەدا، فاشی ودادگەریش دەدا ..خۆشی نە رەشەو نە سپی، نەچاك ونە خراب، نەئیسلامیە نەلیبرالیش، ..بەلکوو وەسفی دەکەویتە سەر بەکارهینەرەکانی .

ج- دیموکراسی ئێستا مانای (دەسەلآتی گەل) نیە، زیاتر مانای (هەلبژاردن- پەرلەمان- دەستگۆڕی دەسەلآت، سەربەستی بیرورا، مافی یاسایی‌رەخنەو معارەزە ..)، لە تەقەلایەکی تاقانەدا بۆ تەواو پەیڕەوکردنی دیموکراسی لە لیبیا ( بە پێی یاسای ژمارە 71حزبایەتی قەدەغەیە) (پەرلەمان) (هەلبژاردن) بە خیانەت لەقەلەم دراو[2] لەجیاتی (امانات شعبیە) وەك (تشریع) و (لجان شعبیە)ش (تنفیذ).. گوایە ئەوە ڕاستەوخۆ (حوکمی گەلە) سەرۆك کۆماری نیە، (معمر قذافي) ڕابەری شۆڕش بوو نەك سەرۆك، کەچی لە کۆتاییدا هەر کەمایەتیەك نوێنەرن و هەر شێوازێکی ترە لە (پەرلەمان+

---

*مەبەست دیموکراسی ئەسینیەکەیە، جاروایە دیموکراسی میلیشی پێ دەووترێ یان دیموکراسی ڕاستەوخۆ .

[1] جان جاك روسو- فی العقد الإجتماعی ص118

[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە (الکتاب الأخضر- معمر القذافي ص19).

حكومەت+ مجالس البلديات) و سەرباری دەردێكی تری كوشندەی نەگۆڕینی سەرۆك كە بەڕای زۆربەی لێكۆڵەرەوەكان داهێنانێكی ترە لە دیكتاتۆریەت.

ع- ئەو دیموكراسیە بڕوایەكی پتەوی نیە بۆ پابەندی، واتە دیموكراسی پەروەرانی لێ دروست نابێت، بۆیە ڕۆژئاوا ئەگەر خۆشی دیموكراسی بێت، ئەوا هاندەری دیموكراسی نین، زیاتر هاندەری دیكتاتۆرین لەجیهانی سێیەم و بە تایبەتی وولاتانی عەرەب، هەریەكە لە ڕووداوەكانی دوایپرۆسەی دیموكراسی لە: جەزائیر، تونس، توركیا، پاكستان، چیچان،فەلەستین...نمونەن كە چۆن هاندران لە دیموكراسی یەكەی خۆیان هەڵگەڕێنەوە مادام ئیسلامیەكان دەنگی زۆر بهێنن.

ك- لەخودی هەڵبژاردنیش مەرج نیە دەنگی زۆرایەتی دەنگی هەق بێت.

م- جار وایە چارەسەری كێشەیەك بە دەنگ نیە بە پسپۆڕیە، هەر بەنمونە ڕای پزیشكێك بۆ چارەسەری نەخۆشیەك ڕاست ترە لە ڕای 1000 تاكی سادە، بۆیە لە هەڵبژاردن دەنگی زانا و نەزانێك یەك دەنگە، كە ئەوەش گەورەترین ستەمە.

ل- لەو مەبدەئە (عوام) بنچینەی دەنگەكانن، كەچی ئەوانە بەپێی توێژینەوە دەرونی وئەنترۆپۆلۆژی وسیاسی یەكانی وەك هەریەكە لە: میكافیلی، دۆركایم، هتلەر، زۆربەی زانایانی تریش پێیان وایە میللەتی عەوام * هەردەم هەڵخەڵەتاون، واقعیش ئەو گەواهیەی داوە، نیشانەی میللەتی خراپ وا دەردەخات با ئیسلامیش بێت (سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَإِنْ يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لاَ يُؤْمِنُوا بِهَا وَإِنْ يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لاَ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً وَإِنْ يَرَوْا سَبِيلَ الغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا

---

* بۆ زیاتر سەرنج بدە ئەو لیستە بەراووردە لە نێوان كۆمەڵگەی ستاندەر(ئومەت) و كۆمەڵگەی عەوام(رەمەكی)

| كۆمەڵگەی عەوام | كۆمەڵگەی دروست (ئومەت) |
| --- | --- |
| 1- كۆدەبنەوەلەسەر هەلەوملكەچی | 1- لەسەر هەق كۆ دەبنەوە |
| 2- بەهێزی هەر كزە بایەك لار دەبنەوە | 2- پتەو دەوەستن |
| 3- لایەنی شەڕیان سانا تر دەووروژێ | 3- لایەنی خێریان |
| 4- لەبەرامبەر هێزدارنەرم وبۆ بەبێ هێزیش دل رەقن | 4- پێچەوانە |
| 5- یان بێ بیروباوەرن یان بیریكی چەوتهەق | 5- بیروباوەرێكی چەسپاوی |
| 6- بەرژەوەندی تایبەتی لەسەرووی بەرژەوەندی گشتیە | 6- پێچەوانە |
| 7- هەلەشەو توورەو لاوازیڕەووشت | 7- لەسەرخۆ ولێبوردە و پتەوی رەووشت |
| 8- لەسەر نەریت وئاینی گەورەكان وشاكانیانن | 8- لەسەر ئاینی خوایین |

لەگەڵ زۆر لایەنی تر......

عَنْهَا غَافِلِينَ)الاعراف/146. ئیمامی عەلی دەڵێ: (العوام –غوغاء- ینحنون بکل ریاح، إذا تجمعوا ضرّوا وإذا انتشروا نفعوا..)، کەواتە کۆدەنگی (ئیجماعی دەنگ)ی هەڵخەڵەتاوان جیایە لەگەڵ کۆدەنگی کۆمەڵگەیەکی رۆشەنبیر و خاوەن مەبادیئ و ڕەوشتی مەزن .

جا سەرنج بدە بەو چەواشەییە خەڵکی عەوام دەنگە ناهەقەکەیان دەدەن و پەرلەمانی پێ دروست دەکەن، ئەو پەرلەمانەش بەو شەکەتیەی سەرۆك کۆمار و ئەنجومەنی وەزیر دروست دەکا، یاسای نادادگەری دروست دەکا، سەرۆك و دەسەڵاتیش بەو شێوازەو نادروستیە حوکمیان لەسەر دەکەن، بەڵام هەر ڕاستە لە چاو دەسەڵاتی بەشەری بە دەسەڵاتی خیلافەتی ئەمەوی وعەباسی وعوسمانیشەوە چاکترین داهێنانە .

س- لە کۆمەڵگەی وادا کێ دەزگاکانی (بینین و بیستن)ی لەبەردەست بێت، ئەوا بە سانایی دەتوانێ ئەو تۆزوبا و (ریاح)ە دروست بکەن و زۆرایەتی یەکە چەواشە بکەن و ئەنجامێکی ویستراوی داڕێژراو بێنن و هەقیش شکست دێنێ.

و- فرەلایەنیش لەگەڵ ئەو هەموو ئیجابیاتەی هەندێ سەلبیاتی هەیە، دەبتە هۆی پارچەپارچەبوونی میللەت، ئەگەر دوژمن نەتوانێ لایەنێك بکڕێت ئەوا لایەنێکی سەربەخۆی دروست دەکات، کە لە قۆناغێکی وەك ئیستای کورد دەردە نەك دەرمان، ئینجا زیانەکانی فرەلایەنی (ناشەریف) وەك زیانەکانی کێشەی ناوخۆیە، ئەگەر بە عەیار نەبێ، ئەوانەی سەروو بەگشتی لەچاو (سیستەمی دیکتاتۆری قێزەون) ئەوەندە جوان دەردەکەون ئەگینا لەچاو دادگەری ئەوەش ناشرینە.

ر- دیموکراسی لە کۆمەڵگە ستونیەکان شێوازی دەفری پێکهاتەکان وەردەگرێ لە نەخشەی ئاینی و تایفی و ڕەچەڵەکی و خوێن و.. بەتایبەتی لەو سەردەمەی کە ئایدیۆلۆجیا لە بەرامبەر بەرژەوەندی تایبەتی لە پاشەکشەیە، هەتا لە کۆمەڵگە مەدەنیەکانیش، بۆیە دیموکراسی و عەلمانی و کۆمەڵگەی مەدەنی و سەرمایەو بازاڕی ئازاد نایەتەدی، بەڵکودەبێ کاریگەریە کلاسیکیەکانی کۆمەڵایەتی بەسەر تاك هەڵوەشێتەوە و لەجیاتی کاریگەری بڕوایی و ئایدیۆلۆژی ئاسۆیی بچەسپێ، ئینجا دیموکراسی ڕاستەقینە بێ دەمارگیری پەیڕەو دەبێ.

ز- تێکدان هیچ پلان و ڕێکخستن و زانستێکی ناوێ و سانایە، بەلام بۆ بیناکردن بەرنامە و نەخشەو پلانی پێویستە، بۆیە ئەو ئازادیە ڕەهایەو نەبوونی سنور سەلبیاتی ترسناکی هەیە و تێکدانی زنجیرەیەك بینای کۆمەڵە کە ترسناکترین فاکتەرە.

## 5- دیموکراسی و کێشەی نەتەوایەتی

دیموکراسیش ئەو دەرمانەی هەموو دەردان نیە، هەندێ لایەنی کوردستان دیسان لە بەرنامەکانیان وەك مارکسیایەتیەکەیان بەپەلە تۆماریان کردەوە دیمکراسی دەرمانی هەموو دەردێکە[1]، نەخێر ئەوەتا هند، تورکیا، ئیسرائیل،.. کێشەی نەتەوایەتیان پێ چارەسەر نابێ، ئەگەر بڵێین هێشتا دیموکراسیەکە تەواو نەبووەو تا دەگەنە ڕێزی ولاتە پێشکەوتووەکان چارەسەر دەبێت.. ئەوا ڕاست نیە، چونکە:

أ- دیموکراسی قۆناغ نیەو زەمینەیەکی کۆمەلایەتی وای پێویست نیە زیاتر پرۆسەیەکی سەرووە نەك خواروو، لە عەقڵە نەك تەکنەلۆجیا، لەگەڵ ئادەمیزادە نەك مێژوو.

ب- لە ولاتانی ئەوروپاش ئەو کێشەیە هەیە، ئەوەتا بەریتانیاو ئێرلەندا، فەڕەنسا و کۆستاریکا، ئیسپانیا و باسك، ئەمریکا و ڕەشەکان و هندیەسورەکان، سربیا و نەتەوەکانی تر...

هەڵبەتە بەو دروشمەی دیموکراسی بۆ ئێراق شۆڕشی کوردیش زیاتر لەنیو سەدەیە پێی سەرقاڵ بوون، کەچی دەرکەوت ئەو دروشمە و دیموکراسیە بۆ عێراق چارەسەر نیە،لەناکاو گەڕانەوە سەر (تەوافوق)و ئیتر زاراوەی(دیموکراسی تەوافوقی) جێی گرتەوە.

ئەو دیموکراسیەی داوا دەکرا ڕێی بە ئیمپریالیزمی جیهانی دابوو جیهان دابەش بکەن، بۆمبای ناوکی و کیمیایی بەکاربهێنن، هەر دەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ڕێکخراوەکان و دەنگی پەرلەمانی ئەو زوڵم و زۆریە کراوە، سایکس پیکۆ، سان ڕیمۆ، لۆزانی هێناوەتە دی، هەمان دیموکراسی و پەرلەمان یەکەم جار لە 1923 لە ئەنجومەنی نیشتمانی تورکی قەدەغەی زمانی کوردی پێکرا، تا ئێستاکە بەردەوامە، کەچی ئێمە داوایدیموکراسیمان دەکرد، ئەوە تیغ بوو بۆ ملی خۆمان تیژ کرد وەك (خالد بەگ)پێش بینی کردبوو.

[1] بروانە: راپۆرتی سیاسی هەردوو کۆنگرەی(1 و2)ی ( ی ن ك )

**قەیرانی جیهانی سەرمایەداری:** ئەو قەیرانە لە سەرەتای 2008 دەستی پێکـردو تـا ئەو ساتەش بەردەوامە ،پێشوو تر وا جاڕ درا گوایە سیستەمی سەرمایەداری دوا قۆنـاغی گەشەی کۆمەڵەو هەرگیز ڕووبەڕووی قەیران نابێتەوەو خـۆی خـۆی چـاك دەکاتـەوە ،ئـەو تیۆرانینـە زیـاتر پتـەو بـوو لـە دوای شکسـتی شـیوعیەت ،هەریەکـە لـە هینـدیکتۆن وفۆکۆیاما وکۆمەلێکی تر بەشدار بوون لە دارشتنی ئەو تیۆرەپـەڕەگرە،دوای وادەرنەچـوو ڕووبەڕووی قەیرانێکی سەخت بۆوە،سەرەتاکەی لـە بەشـی (عـەقارو بانکـەکان )دەسـتی پێکرد وهەمووڵایەکی گرتەوە،کورتیەکەی ئەوەیـە:ئابوری سـەرمایەداری لـە ئابووریـەکی واقعیانە وەرچەرخاون بۆ ئابووریەکی خەیالی پشـت بەسـتو بـە دراوی کاغەزی،ئـەو دراو وسەنەدانەش ڕاستەوخۆ وەك جاران نوێنەرایەتی ئـابووری سـەر زەوی ناکا،بـە جۆرێـك وا دەقەبلێنرێ کـە نرخـی پـارەو دراو سـەنەدات بگاتـە هـەزاران جـار زیـادە لـە ئـابووری ڕاسـتەقینە، تەنانەت،مەگـەر 6هەسـارە زەومینـی تـری بـۆ قـەرز بکـەی ئینجـا ئـەو یەکسانیەی نێوان ئابووری دراوی وڕاستەقینە بێتە دی ،ئەوەش هەڵاوسانێکی بـێ شـومار مەلاس دەدا بۆ هەر ئەگەرێك وقەیرانێك، پرۆسەی کاری سەرمایەداری زۆربەی جار تـەنها لە چوارچێوەی ئەو دراوەیە بێ ئەوەی بێتە سەر ئەرزی واقیع وبەرهـەمیێکی نـوێ بێننـە کایەوە کە ئەوە ئەسلی پـەیامی مرۆڤە،تەنانـەت بناغـەکانی ئـەو معامەلانـە لـە سـەر سیستەمێك بە ڕێوە دەچێ کە پێی دەووترێ (نظرية هرم المقلوب) بە پێچـەوانەی ئـابووری ئیسلامی وسۆشیالیستی ئەو جۆرە تیۆرە حرام وقەدەغەیە ، کاتێ خانوەك دەفرۆشـرێ بـە نرخێکی ڕاستەوخۆ بە پێی نووسین وشایەد مەعمەلەیەکی تـەواوە ،بـەڵام ئـەو سـەنەدەی نێوانیان وەردەچەرخێ بۆ دراو دەفرۆشێتەوە بە نرخێکی گران تر ئەویش دەیداتـە یـەکێکی تر بەگرانتر وبە زنجیرە دەڕوا بێ ئەوەی معاملەکە پالپشت بکاتـە سـەر خـانوە ئەسـلیەکە ،زیاتر ڕێبازی قەرزی بە سوو وەردەگرێ ،واتە قەرزیش جارێکی تر دەفرۆشرێتەوە ،لـەوەوە (نظرية هرم المقلوب)دروست دەبێت ،لەسەر ئەرز پانتایەکی بچوکە دوای ئەو زنجـیرە کـڕین وفرۆشتنە نرخەکەی زۆر زیاد دەبێ وگەورە دەبێ بێ ئەوەی بنکەی گەورە بێـت و تـادەڕوا سەری گەورە دەبێو بنکەشی هـەر خالەکـەی سـەرەتاییەو وەك قووچـەکیکی وەرگـەڕاوی لێدێت،کە بە پێچەوانەی قووچەکی ئاسایی زۆر نا ئارام دەبێ وئامادەیـە بـۆ وەرگـەڕان ، لەوێ دەولەمەندی وەهمی گەلێ زۆر دەبێ لە دراوو سەنەد زۆری هەیە ،هـەر لـەوێش بـە ئاسانی لەلایەن دەسەڵات وکۆمپانیا گەورەکان بچـوکەکان هەڵدەمـژرێن لـەڕێی زیـاد لـە

چاپ دانی دراو سەنەدات و چەك، هەڵبەتە وەستانی ئەو جۆرە معاملەیە لە چوارچێوەی ( هرم المقلوب) وسەنەدات دەوەستێتە سەر متمانە ،هەر کەمترین کاریگەری (ملموس) وەك پوولی دۆمینە یەکەیەکە ئەو زنجیرەی لە سەرەتاوە باسمان کردو هەڵنرابوو هەریەکە ئەوی تر دەڕووخێنێو هەڕەمەکەش (کە دەکاتە)سیستەمی سەرمایەداری هاوچەرخ دەڕووخێ ،ئەوە بەکورتی لایەك بوو لەو قەیرانە ترسناکەی سیستەمی سەرمایەداری کە هەموو دەم ئەگەری دووبارە بوونەوەی هەیە بەتایبەتی لەکاتی جەنگ وکارەسات .

## 4- مەدرەسە(یان)تەوژمی نەتەوایەتی

ئەوە مەدرەسە نیە،[1] لەبەر ڕێزبەندی وڕەچاوی قۆناغی ئێستاش کە بووەتە ئامانجی هەموو حزبە کوردستانیەکان بە ئیسلامی و شیوعیەشەوە، بۆیەش بە مەدرەسە تۆمارمان کرد و بەگشتی باسیان دەکەین.

بوون لە نەتەوە ئاساییەو لەکاتی خۆشی دا ئەرکیشە، بەڵام ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی بە هەموو پێوانەیەك ڕەگەزپەرستیە، هەر لەبارەی هەڵوێستی ئیسلام بۆ بانگێشەی نەتەوایەتی هاتووە: (لیس منا من دعا الی العصبیة)، لەبارەی شانازی بەڕەچەڵەك و نەتەوایەتیش هاتووە (لینتهین أقوام یفتخرون بآبائهم الذین ماتوا، إنما هم فحم جهنم.. الناس بنو آدم وآدم من تراب)، واتە زۆر بەتوندی دژی ناشیۆنالیزم و ڕەگەزپەرستیە، بەڵام لایەنگری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازە (بێ ڕەگەزپەرستی).

بوون لە نەتەوە ئینتمایەکی ستونی میراتیە، چەسپاوە، بەدەرە لە ویستی خۆت، کەچی ئایدیۆلۆژیا موکتەسەبە میرات نیە، وەلائە ئینتیما زکماکی نیە، گۆڕاوە چەسپاو نیە، تۆبزیی نیە بەویستی خۆتە، ستونی نیە ئاسۆییە.. بۆیە بۆچوونەکەی (ساطح حصري) و هەندێ لەبۆچوونی واش لە کوردستان لەمەر گوایە (نەتەوایەتی ڕەسەنترە لە ئایین) بەهەڵەدا چوونە، هەرخودی بەراوردەکەدروست نیە، خودی پرسیارەکە لە ڕووی لۆژیکیەوە چەوتە،چونکە دوو تەوەری تەك و لۆن، لە سەر یەك تەوەر نین تا بەراورد بکرێ، نەتەوایەتی میراتەو چەسپاوەو ئاینیش (ئایدیۆلۆژیایە) موکتەسەبەو شایستەی گۆڕانە لە ئاینێکەوە بۆ ئایینێکی تر.

---

[1] وەك لە سەرەتادا هات بەمانای خاوەنداریەتی (عقیدە و شریعە و بەرنامەی ژیانی ئادەمیزاد) نەتەوایەتی ئەو بنەمایانەی هەڵنەگرتووە، زاراوەیەکی ستوونیە نەك ئاسۆیی.

نەتەوایەتی ئینتمایە نەك وەلا، بایەلۆجیە نەك ئایدیۆلۆجیە، خوێنــە نــەك سیاســەت، هەستە نەك عەقلّ، فسیۆلۆجیە نەك سۆسیۆلۆجی، جموجۆڵە نەك حزب، شـعر و پەخشــانە نەك فكر، هەڵچوونە نەك زانست، وەختیە نەك دائم، كێشەكەش لە (كارو كاردانەوە) پێك دێت بەجۆرێك (كار)ەكەی شۆڤێنیستی و داگیركردنو چەوساندنەوەیە، بەڵام كاردانەوەكـەی خەباتی ڕەوای گەلانە، كەواتە (ئینتما)و (وەلا) یەك نین، ئینتیما زگماكی ڕەوایــە، بــەڵام "وەلا" بۆ زگماكی حەرامە (أحل الله الإنتماء وحرم الولاء).

نەتەوایەتی فێرگەی چاكەو خراپە نیە، ڕێنیشاندەر نیە، ڕەوشتێكی دیــاریكراوی نیــە، حەڵاڵ و حەرامی نیە، بۆیە ناكرێتە بەرنامە، نوقستانە خۆی پێویســتی بــە مەدرەســەیەك هەیە،تەنانەت ئەو مەرجانەی یـۆ دروســت بــوونی مێژوویيانــەی نەتــەوەش دەكـا گوایــە زمانوئــاین وخــاك ومێــژوو نەتــەوەو نەتەوایــەتی دروســت كــردووە جێــی هەلوەســتەو پێداچوونەوەیە.

واتە كوردایەتی مانای خەباتی ڕەوای نەتەوایەتی یــە نــەك ئایــدیۆلۆژیای نەتەوایــەتی وەك بەشێك وای لیّ تێگەیشتون، چونكە (كار و كاردانەوە) یاســایەكی میكانیكیــە نــەك كۆمەڵایەتی، نابێت ئێمە لە كاردانەوەی شۆڤێنیست، شۆڤێنیست بین و كوردێكی خراپــان پیّ لە عەرەبێكی باش چاتر بێت، هەروەك ئێستا خەریكە لــە سەرانســەری عێــراق زیــاتر بەرەو شۆڤێنستیانە بڕۆین.

كەواتە خەباتی نەتەوایەتی جەماوەریەو شۆڕشی پیّ دروست دەبێت، بــەڵام حزبــی پــیّ دروست نابێت بەپێی پێناسی ئێستای، بۆیە حزبە نەتەوەییەكان یان:

1- حزبێكی تەواو نەتەوەییەو دەبێتە ئایدیۆلۆژیایەكی ڕەگەزپەرست.

2- یــان ئایدیۆلۆژیەكــەی بــە یــەكیّ لــە مەدرەســەكان (سۆشیالیســتی، شــیوعی، دیموكراسی، ئیسلامی..) تەواو دەكات، جا لێــرە مانــا و پاســاوی بــوونی ئیســلامی لــە كوردستان بەڕوونی دەردەكەویّ دەیەویّ ئیسلام لەجیاتی ئەو مەدرەسانە ببێتە سەرچــاوەی كوردایەتیەكە. واتە پرۆژەی ئیسلامی لە كوردستان (لەو بارەیەوە) گەڵاڵەیــەكی سیاســیە دەیەویّ لەرێگەی ئاشتیانە بیسەلمێنیّ كە بەستنەوەی كوردایەتی بــە ئیســلام چــاكترە لــە بەستنەوەی بە مەدرەسەكانی تری وەك شــیوعیەت و لیــبرالی و سۆشیالیســتی، هــەروەك سەركردە ئاینیەكان لەپێش شیخ سعید تا مەلا مستەفا وایان داڕشتبوو .

3- ئەو حزبە لیبرالیەی بیەوێت ئەو بۆشاییە فکریە بە شەبەنگێك لە ئەزموونی جیاجیا پڕبکاتەوە، نابێتە حزبێکی پێکوە نووساو، زیاتر لە بەرەیەك دەچێت چونکە بە سروشتی خۆی کۆمەڵێك تەیاری ئەو مەدرەسانەی لەنێو دەخەملێ، هەر بۆیەش دەبینین (جزبە نەتەوەییەکان) هەم لەناوو هەم لە ناوەڕۆکدا ئاوەڵناوی مەدرەسەیەکی پێوە بەندە وەك (حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیسی، حزبی سۆشیالیستی کوردستان، حزبی دیموکراتی ناسری، حزبی سۆشیالیستی نەتەوایەتی، حزبی دیموکراتی کوردستان، بزووتنەوەی نەتەوایەتی ئیسلامی کوردستان،... هەتا (جمال عبدالناصر) داهێنەرێکی ناشیونالیزمی بەتوانابوو کەچی بە دیموکراسی وسۆشیالیستی ئایدۆلۆژی و پڕۆژە نەتەوایەتیەکەی پێ تەواو کردبوو.

تا ئێستا حزبە کوردستانیەکان ڕەگەزپەرست نەبووینە، ئایدۆلۆژیای نەتەوەییان نیە، شانازیبە مێژووی کورد ناکەن بە سەلبی و ئیجابییەوە، ناشیانەوێ نەریت و بەهای کورد بەسەر میللەتانی تر بچەسپێنن، بەڵکو دەیانەوێ:

1- ڕزگاری کوردستان. 2- سیستەمێکی دادگەری

یەکەمیان کوردایەتیەو، دەڤەریە و وەختیە، دووەمیشیان مەدرەسەییە، دائیمە، جیهانیە، هەر حزبێك بەشی دووەمی نەبێت (یان جووتی بکالەگەڵ یەکەم) و تەنیا یەکەم بەیرەو بکات ئەوا حزبێکی شۆڤێنیە.

لە ئەوروپا ئەو قۆناغە تێپەڕی جگە لە (سربیا و کەمێك لە ئالْمانیا و فڕنسا و نەمسا)، ئەگینا ئاسەواری حزبی نەتەوایەتی هەر نەماوە وەرجەرخان زیاتر بو حزبی نیشتمانی، هەتا مەسەلەی ئیرلەنداش (زیاتر کێشەی مەزهەبی یە)، لێرەش حزبی نەتەوەیی لەناو میللەتێکی ڕزگاربوو شۆڤێنیە، بەڵام بوونی لەناو میللەتێکی ژێردەستی هەق و ڕەوایە لە قۆناغی خۆی.

## تەقەلاکانی بە ئایدیۆلۆژی کردنی نەتەوایەتی

لەبەرئەوەی نەتەوایەتی ئایدیولوژیا نیە، بۆیە زۆر تەقەلا دراوە بۆ ئەو مەبەستە، بەکورتی ئەمانەن:

1- هەڵبەتە یەکەم وروژێنەری ڕەچەڵەکیەتی (شەیتان) بووە، کە ئەو سزا گەورەی پـێ درا، کاتێ خۆی بە گەورەتر زانی لە (ح- ئادەم) ووتی ڕەچەڵەکی من لە ئاگرەو ئـەو لـە قوڕە.

2- بەشێك لە فەیلەسوفەکان وەك (دی گۆپینـو)[1]، (شـامپرلین)، (بـەواس)، (فیشـەر).. وای بۆچووبوون کە توانای ئەقڵی نەتەوەیەك لەگەڵ نەتەوەیەکی تر جیایە،سـتالینیش (بـە ڕوانگە مارکسیە چینایەتیەکەی)پێی وابوە توانای عەقلی وەك یەك نیە بە پێی چـینایەتی دابەش بوە،بزوتنەوەی زایۆنیش بە پێی پرۆتۆکۆلی (5) دەڵێن خوا زیرەکیەکی تایبەتی بە ئیمەی یەهودی بەخشیوەو بەخەلکی تـری (ئومـەمی –جـویم-اغیـار) نەبەخشـیوە، لـە پرۆتۆکۆلی (10) دەلێ:( أنه لا مساواة في الطبيعة، وأن الطبيعة قد خلقت أنماطاً غـير متساوية في العقل والشخصية والأخلاق والطاقة)[2].ئەرستۆ لەکتیبی(رساله السياسـه- بۆلیتیك)دەلیـت لـە بنەچـەدا خـوا بەشـەرەکانی وەك دەمـی شـانە دروسـت نەکردوە،هەندێکی بۆ خزمەتکاری وهەندێکیش خزمـەت کراو،ئەوانـەی تـەنها دەزانن هێزی جەسـتەو ماسـولکەیان بـەکاربهینن ئـەوا بەنـدەو خزمـەتکارن، ئەوانەی عـەقلیش بـەکار دەهیـنن ئـەوە ڕابـەرو خاوەنەکانن،پەیوەنـدی بەنـدەو خاوەن وەك پەیوەندی عـەقل وجەستەیە[3]،فارابی ودوایـش تـۆینبی لـە (مختصـر دراســـە التـــأريخ)دەلێ کۆمـــەل وەك لەشــــی ئــــادەمیزاد فەرمانبـــەرو فەرمانپیکراو،مانـــدوو وحەســـاوە،گرنگ ونـــاگرنگ، هەنـــدێك لـــە عەرەبـــە شۆڤینیستەکانیش جار وایە هەمان بانگێشە دەکەن ودەلێن ئێمە لە ئاین زیاتر لە عـەجـەم

[1]ئەرسەر دی گۆپینۆ1816- 1882 لەکتێبێکی بە ناوی (مقال عن عدم المساوات بـين الاجنـاس البشريه )دەلیت توانای بیرکردنـەوەی هەمووميللـەتيك وەك يـەك نيـە بۆيـە تـەنها ميللـەتی ئـاری شايستەی ئەو سەرکردايەتيە، ئيتر ئەو تێ روانينە کۆمەلێك تيۆری سياسی رەگەزايەتی ترسـناکی لێ پەيدابوو .يەهوودی وعـەرەبی شۆڤينيش تا ڕاددەيەك ئەو پاگندەيە دەکەن .

[2]بروتوكولات حكماءالصهيون- ت:عباس محمود العقاد ط5 1980 بروتوكول رقم:1 .

[3] ج لويس- مدخل الى الفلسفة ص64

تێدەگەین بۆیە ئێمە دەبێ دەسەڵاتدار بین و خەلکی تریش لە خزمەت ئێمە دابێ زاراوەی موالی وشعوبی لێ هاتە کایەوە ..،جاروایە ئەفریقیەکانیش ووتویانە خوا لە ئیمەیەو ڕەشە،چینیەکان ووتویانە زەردەو لە ئیمەیە بۆیە ئیمە میللەتی خۆشەویستی خوایین وئاقل ترین،بەڵام هەریەکە لە (ڕاتزل) لە کتێبی (حضارة تقلیدیة) و (باستیان) لە کتێبی (وحدة النفس) بۆچوونێکی وەك ئیسلامی ڕاستەقینەیان سەلماندووە، تیایدا هاتووە توانای ئەقڵی ئادەمیزاد یەکسانە با ڕەگەزیشی جیا بێ، ئەوانەی سەروو بۆچونێکی ڕەگەزپەرستی لێ دەفامرێتەوە، کە لەکۆنەوە ئەوروپا لە بوارەکانی (فکر) و (خۆبەزلزانی) (سەرشارستانی) و (خۆ بە پێشەوا زانین)* و.. دەردە کۆنەکەی ڕۆمی هەیە هەرچی دژایەتی (ڕۆم)ی بکردایە بە (بربر)یان لەقەڵەم دەدا، تەنانەت وەك (شیشرون 106- 43پ ز)گوزارشیدەکا لەسەر زاری (هیرودوتس –کەبە باوکی مێژوو ناوزەد کراوە )جەنگی نێوان ئاسیا وئوروپی بەجەنگی بەربەرو وشارستانی لە قەلەم داوە .

3- کۆتایی گەشەسەندن: هیگڵ پێی وابوو کە واهاتووە هەرجارەی نەتەوەیەك پێشڕەو بووە، ئێستاش نەتەوەی ئەڵمانیا پێشڕەون و گەیشتوونە لوتکەی گەشەسەندن، بۆیە نەتەوەی ئەڵمانیا دەبێ ببێتە سەرکردەی جیهان و ئیدی ئەو بانگێشەی ئاریەتی و پاکێتی توخم و نازیەت[1] و جەنگی جیهانی لێ هاتەدی، جینۆساید و پاکتاوی جەستەیی یەهودیش لەوەوە هات، گەشەسەندنیش نەوەستاوە، ئەو تیۆرە چەوت دەرچوو، هەروەك لەدوای (ناکۆکی پرۆلیتاریا و برجوازی) بەڕوانگەی مارکس دوا ناکۆکی نەبوو، ئێستاش (کۆتای مێژوو) نیە وەك (فۆکۆیاما) بۆی چووە.

---

*هەر لەو چوارچێوەدا هەولی داوە مێژووی زانیاری بۆ خۆی پاوەن بکا، بۆیە ناوی لە زانایانی کۆنی خۆی ناوە باوکی زانست وەك:هیرۆدتس- باوکی مێژوو، ئەبیکرات- باوکی پزیشکی، سیۆکریتشس –باوکی هونەر،هیرکلیتس- باوکی دیالکتیك، ستراپۆ- باوکی جوگرافیا، بیتلیمۆس –باوکی گەردووناسی، ئەفلاتوون وئەرستۆش –باوکی کۆمەلێك لقی زانستی تریان پێ بەخشراوە...کەچی لەپێش ئەوانە باس لەو بابەتانە کراوە،هەمووی ئەوباوکە نینە.

[1] نازی لەکورت National so zialis Tishe Deutsche Arbeieer partei کراوەی Nazi لە وەرگێڕانی (نازی-لە پیتەکانی یەکەمی پارتی سوشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانیا- naze)بەهەرسێ جۆر هاتووە (حزبی سوشیالیستی نیشتمانی ئەڵمانی)، بە (حزبی سۆشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانی)، بە (حزبی سوشیالیستی ئومەی ئەڵمانی)ش هاتووە

4- ڕەسەنایەتی نەتەوە : (ساطعالحصري)[1] نووسەر و بیریـاری ناشـیۆنالیزمی عەرەبـە، ، تیۆرێکی ئەورووپی گۆڕیە سەر عەرەبی لەسەروبەری دروستبوونی دەوڵەتـە نەتەوەییـەکانی فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیسپانیا، باوی ئەو بیرۆکەیە هەبوو.. دەووترا پێش ئەوەی مەسـیحی بین ئاری بووین، یـان لاتینـی یـان ئەنگلۆسـکۆنی..بووین، لـە گوتـاریکی (فیختـە) بـۆ میللەتی مەزنی ئەلمانیا دەلێ ئیوەی ئاری پێش ئاینەکان پێشڕەوی جیهانن، ئیوە دەتـوانن گەشە بە میللەتانی جیهان بدەن[2]، یەهودو عەرەب هەریەکـە بـە جۆرێـك پاگنـدەی ئـەو بۆچوونەی فیختەی بۆ خۆی کرد، (ساطح حصري) و کۆمەڵێك لە ناشـیۆنالیزمی عـەرەب ئەو بیرۆکەیان بەو شێوەیە گۆڕی و جاڕیان دا کە : ئەوان پێش ئیسلام و مەسیحی عەرەب بوونە. (ساطح حصري) دەڵێ: تا ئێستا عەرەب سێ ئـاینی گۆڕیـوە، بـەڵام عەرەبایـەتی نەگۆڕیوە، کەواتە عروبیەکەی ڕەسـەن و موکـوم تـرە لـە ئاینەکـەی،ئیتر بـەپێی (معجم الشامل للمصطلحات الفلسفية) ساطع الحصرى یەکەم کەس بوو زاراوەی (الامة العربيـة)ی لـە جیـاتی (ناشـن) دانـا، هەرچـەندە پـێش ئـەویش نجیـب عـازوری کتیبـی لەسـالی 1905(يقظة الامة العربية )نووسیە، بەهەمووبارێك مێژووی بەکارهێنانی امـە العربيـە لە سەدەیەك تێ ناپەڕێ،خراوەتە پێش ئیسلاموبەگرنگ تر حساب کراوە.

(شبلی العیسمی) دەڵێ: (إن الإسـلام وليـد العروبـة)، هـەروەها هەریەکـە لـە کتێبـە عەلمانیـە میانڕەوەکـانی (کتـاب الأخضـر- معمـر القـذافي) و (فلسـفة الثـورة- جمـال عبدالناصر) و هاوشێوە بیرێکی نەتەوەیی لـە کوردسـتانیش دا سـەری هەڵـداوەو دەڵێـت نەتەوایەتی لە هەموو عـامیلێکی تر بەهێزتر و ڕەسـەنترە، لـە (کتـاب الأخضـر) هـاتووە (العوامل الإجتماعية هي العلاقة القوميـة)، (..ينتصـر حتمـاً العامـل الاجتمـاعي علـى

[1] پێشـتر قائمقـامی مەکـدۆنیا بـوو،دوای دروسـت بـوونی عێـراق وەزیـری پـەروەردەبوە، بەڕەسـەن یەمەنیە،زۆری کتیب هەیەلەهەمووان نەتەوەیی تر(**محاضرات فى النشوء القومية**) .

[2] جانماریبیلت- عودةالوفاقبين الإنسانوالطبيعة—ت:محمدعثمان ص232

العامل السياسي)[1]، ملك فيصل دەڵێت: (.. واننا عرب قبل موسى وعيسى ومحمد)[2]. دروشمی حزبی بەعسیش ئەوە بوو: (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة)[3]، (ئیبراهیم احمد)ی شاعیر و بیریاری کوردیش بەهۆنراوە دەڵێ:ئێمە کوردین و هەرکورد دەبین، ..پێشی ئەدیان هەر کورد بووینە ....،سرودی نەتەوەیی کوردیش (ئەی ڕەقیب) دەڵێ :دینمانە ئاینمان هەرکوردستان ..

بەڵام بە سەرنجێکی سەرەتایی چەوتیەکان دەردەکەوێ، (عاملی نەتەوایەتی) تەمەنی هەردوو سەدە دەبێت و سەرەتای کۆتایشی وا دەرکەوتووە، لە ئاین ڕەسەنتر(خالد)ترنیە، ئینجا جیهان بەرەو سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایە، بەتایبەتی لە (عەولەمە)دا، ئەوە یاسای گەشەسەندنە، هەموو پرۆژەکانی‌نەتەوایەتی عەرەب شکستی هێنا، هەموو عەرەب گەیشتنە ئەو بنەمایە (اتفق العرب على أن لا يتفق)! ئێستاش بە ئاشکرا دەڵێن تەنانەت کۆبوونەوەی سەرانی عەرەب مۆڵەتی ئەمریکا و ئیسرائیلی دەوێت.. واتە عاملی نەتەوایەتی ئەو هێزەی نەماوە، لە عاملی نەتەوایەتیش بەتەنیا یان شۆڤێنی یان داگیرکراوی هیچیان بەختەوەری ئادەمیزادی تێدا نیە.

ئینجا ئەو بەراوردەی ڕەسەنایەتی نێوان ئیسلامی و عەرەبی یان ئیسلامی و کوردی هەڵەیە لە لۆژیکدا، چونکە ئیسلام توخمێکی ئاسۆییە واتە (موکتەسەبە) کەچی عەرەبایەتی میراتی و ستونی یە، بەراورد ناکرێن، ئی دی لەو چەوتیەی زۆر پرسیاری لێ دروست بووە بە هەڵەی لە کوردستانیش وەك ئەوەی دەڵێن تۆ کوردی لەپێشدا یان ئیسلامی؟ ئەو دوو چەمکە لەسەر یەك هێڵ نین تا وەڵامی پاش و پێشی بۆ بدەیەوەو هەریەکە لەسەر تەوەرێکە، ئیسلام لەسەر تەوەری‌ئاسۆییە ونەتەوەش لەسەر تەوەری ستونیە، بەداخەوە خاوەن پرسیار لەو کێشە لۆژیکیانە بێ‌ئاگایە بۆیە پرسیاری وا دەکا.

بەردەوام دەبین لە سەر تەقەلاکانی بە ئایدیولوژی کردنی بیری نەتەوایەتی

---

[1]معمر القذافي-الكتاب الأخضر ص123لە بنەچەدا ئەوە بۆچوونی (گیزۆ)ی فرنسی بوو دەیووت ژیرخانی سیاسی بۆ ژیرخانی کۆمەلایەتی‌دەگەڕێتەوە.

[2]شبلي العيسمي-العلمانية والدولة الدينية ص39.

[3]لە دەستوری حزبی بەعس واهاتوە:المادة (15) :- الرابطة القومية هي الرابطة الوحيدة القائمة في الدولة العربية التي تكفل الانسجام بين المواطنين وانصهارهم في بوتقة واحدة، وتكافح سائر العصبيات المذهبية والطائفية والقبلية والعرقية والاقليمية.

5- مێژوویی: دەڵێن پەیوەندی خوێن وەك لە (إ. غـزالی)و(ابن خلـدوون) بـەهێزترین پێوەندی بووە، پەیوەندی خوێنیش بریتی یە لە پەیوەندی خێلەکی وئێستاش نەتەوایـەتی، بۆیە نەتەوەییە عەرەبەکان پێیان وایە کە (العامل القومی) هـو (المحـرك الحقیقـی والـدائم للتأریخ)[1]، چەوتیەکەی لەوانەی خوارەوەیە:

أ/ پەیوەندی خـوێن لەمێـژوودا پەیوەنـدی نەتەوایـەتی نـەبووە، زیـاتر بنەماڵـەیی و خێڵەکی بووەو لە خانەی مرۆڤایەتی شارستانیش نەبووە.

ب/ (عامل القومی) بزوێنەری مێژوو نیە هـەردەم، ئـەی پـێش پەیـدابوونی (عامـل القومی) خۆ مێژوو نەوەستاوە، چۆن گەشەی کردووە؟

ج/گوایە نەتەوایەتی یـەکێتی دروسـت دەکـات: لـە تەقەلایـەکی نـامۆتر لەسـەرەتای دروستبوونی (دویلات) لە پەنجاکانیش بە فکر لەناو عەرەب سەری هەڵـداو وا ئێسـتا لـە کوردسـتانیش بـاوی وەرگرتـووە، دەڵـێن ئـاین دەبێتـە هـۆی پارچەپارچـەیی نەتـەوە، نەتەوایەتیش دەبێتە یەکێتیەکەی، لە (کتـاب الاخضـر) هـاتووە: (العامـل الـدیني الـذي یقسم الجماعة القومیة) لذا(القاعدة السلیمة هو أن لکل قوم دیناً) واتە یان ئاین بنچـینەو مەرجێکی نەتەوە بێت یان با نەبێت، بۆیە لە ڕاپۆرتی کـۆنگرەی حزبـی بـەعس هـاتووە: (یعطوا الدعوة للوحدة العربیة مضمونا دیمقراطیا اشتراکیا بعیداً عن صبغة الدینیة). ئـەو بیرۆکە بوو جیهانی ئیسلامی پێ پارچەپارچە بوو بە کوردستانیشەوە، بەو پێیەو مەبەستە ئیمپریالیزمیەش (عصبة الأمم)ی پێ دروست بووە.

هەرچەندە ئەو بۆچوونە شکستی هێنا، بەڵام بۆ پەند بۆ خۆمانی کـورد ئـەوا.. ئێسـتا وڵاتانی عـەرەب 22 پارچەن و لە ژێر دۆخێکی نەتەوەیی زەلیل دان، خـۆ (مضـمون)ەکـە (دیمقراطی اشتراکي) بوو ئیسلامی نەبوو، شیوعیەتیش نەیتوانی بەو هەمووهێزە تەنانەت لە یەکێتی سۆڤیەت نەتەوەو تایەفەکانی یەك بخات، هەموو پارچەپارچە بوونەوە.

هـەر لـە یـەك وڵات (لبنـان، سـۆماڵ، روانـدا، بۆرۆنـدی، ئیرلەنـدا، هنـد، عێـراق، یۆگسلافیا، یەکێتی سـۆڤیەت..) بـەناو دیموکراسـیوعەلمانیو بەشـێکی سۆشیالیسـتیش بووینـە، ئـاینی نەبووینـە، کەچـی بـووە شـەڕی هـەموو تایفـەکان لەگەڵهـەموو، لـە کوردستانیش تا ڕابەری ئاینی بوو یەکێتی هەبوو، بە وەرچەرخانی بۆ ڕابەری عەلمانی بووە پەرتەوازەیی.

---

[1] معمر قذافي - الکتاب الأخضر ص123- 143

7- تەقەلای ئاینی: جاران ڕۆمیەکان وگەلی یۆنان خۆیان بە گەورەو نەجیب زادە دەزانی تا ئەو ڕادەیەهەریەکەلە ئەفلاتون وئەرستۆ باسیان لەوە کردوە کەهەموو مرۆڤ لە قوڕن بەڵام قوڕەکەی گەلی یۆنان زێڕیشی لەگەڵ بوە ،بۆیەهەموو مرۆڤەکان وەك دەمی شانە یەکسان نین، یەهودیەکانیش دەڵێن ئێمە (شعب الله المختار)ین، ( زایف یهوذاك 1891-1982) دەڵێت: (بۆ هاتنی مەسیح نیشانەی داوە دەسەڵاتی جیهان لەدەست یەهودی بێت، جا هەر دابەزینێك لەو مەبدەئە دواکەوتنی مەسیحە لە هاتنی)[1]،لە پروتوکولات حکماء صهیون- هاتووە: ((وقد منحنا الله العبقریە کی نکون قادرین علی القیام بقیادە العالم ))[2]، لە(تیلمۆد -کە بریتیە لەتاکە تەفسیری موعتەبەر لەلای یەهودی) تەشریعاتی زۆر ڕەگەزپەرستی وسەرسوڕهێنەری تیدایە، غەش کردن زینا کوشتنو ئەزیەت بۆ یەهودی وغەیرە یەهودی زۆر لێك جیایە، لەناو عەرەبیش ئەو تەقەلایە گەیشتە ڕادەی هۆنینەوەی (فەرمووده)ی وەك (حب العرب ایمان)، (العرب مادة الإسلام، إذا ذل العرب ذل الإسلام)،تا ئەو ڕادە لە کتێبی (العروبە بین الشعوبیە والإستعمار)دەلێ خواش بۆ پیادەکردنی پەیامەکانی پێویستی بە ئەخلاقی عرب هەبوە!!، لەکۆتاییدا دروشمی (امة عربیة واحدة ذات رسالة خالدة)ی لێ هاتەدی،ئەو تەقەلایە ڕەگ وریشەیەکی هەندێ مەزهەبی فقهی ئیسلامی هەیە،لەلای موسولمانانی شیعەو سونە (لە کاردانەوەی یەکتر)بەبڕی جیا ئەو ڕیشەیەی هەیە،لەناو شیعە بنەماڵەی پێغمبەر(د خ) بە (افضل)تر هەژمار دەکرێت،هەرچی ئەهلی سونەو جەماعەشە لایوایە عەرەب(افضل)ترە لەکوردوعەجەم وتورك و..ئەو جۆرە ڕەگەزپەرستیە گەیشتۆتە ڕادەیەك بگاتەپرسی ژن وژنخوازی ،مارەیی عەرەب لە عەجەم نەهاتوە،چەندین زاناو مەزهەبی گەورە لەوبۆچوونە هەلەیە تێوەگلاون ،وەك لەو نمونەیەی هاوسەری زانایەکی کوردبە ئافرەتێکی عرب چیان بەسەر هێناوە.. حَدَّثَنَا سَعِيد بن أسد ، حَدَّثَنَا ضمرة عن ابن شوذب قَالَ: تزوج بن سيرين عربية وكره الموالي لما يدخلهم من السيي. قَالَ: فذهب بن عون يتشبه به فلم يحمل له العرب ذلك ، فرفعوه إلى بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري فضربه وفرق بينهما ، قال له: طلقها. قَالَ: هي طالق. قَالَ: ثلاثًا قَالَ: واحدة تبتها. قَالَ: أقول له ثلاثًا وهو يبتها. وقال له: طلقها. قَالَ: هي طالق ثلاثًا. قَالَ: واحدة. قَالَ: أقول له ثلاثًا وهو يفتيني بطلاقها[3].

---

[1] روجی غارودی-أمریکا طلیعة الانهیارص18 ئەوە لە بنەماکانی بزوتنەوەیەکی ناشیۆنالیزمی ئاینی یەهودی هاتوە.

[2] بروتوکولات حکماء صهیون—پرۆتۆکۆل رقم: 5

[3] المعرفة والتاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوي، المحقق: د أكرم ضياء العُمَري ج2 ص63

لەزۆر سەرچاوەی تری فقهی بە ڕوونی دەری دەخا کە ئەهلی سونە وجەماعــە پێیــان وایــە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیە ، لە کتێبی(مسـبوك الـذهب فـی فضـل العـرب- بـە فەرموودە یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب وعەجەم دەكـا) هەروەها(المعرفـه والتـاريخ - أبو يُوسُف يعقوب بن سُفيان الفسوی)ئەو سەربردەی تەلاقەکە باس دەكا،شيخ الإسلام ابـن تيمية - دەڵی : ( فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم، روميهم وفرسيهم وغيرهـم)[1]دەشلێن عەرەب عاقل تـرن وکوردو عەجەم دەبێ لە خزمەتيان دابێ..یەکەم جـار گومـانی زۆرم لـەوە هـەبوو کەئـەو عیبارانەی (فەزلی عەرەب بەسەر عەجەم) لەدوای نووسـينەوەی مێژوو(لـە سـەدەی 19 و20) لە سەر دەستی عەلمانی عروبی ئەو دەستکاريە کرابێ ، هـەروەك چـۆن کۆمـەلێك لەو فەرموودانە لە سەردەمی ئەمەوی دەستکاری کران، چونکە لەکتێبی (فقه اللغه وسـر اللغه)لە ص25 نوسخە ئەسليەکە ئەو (فەزل)ەی تێدا نیە کەچـی لـە نوسـخەکانی دوای تێيدايە، بەلام دوای بينيم ئەو کێشەيە لە مێژوو هەبوە بۆيە کورد زۆر رەحمی بە عـەرەب کردوە، زۆريش لە بنەمالە کوردەکان بەو هۆيەوە خۆيان بردۆتەوە سەر رەچەلەکی عـەرەب ، لە شيعرێکی شێخ رەزا روو لە عەرەب دەکاو دەلێ ئێـوە ئـەفزەل تـرن لـە ئێمـە، بـەو ڕەگەزپەرستيە بێ بنچينەيە زۆربەی میللەتانی لاواز لە شـام وسـەرووی ئـەفريقا لـە نێـو عەرەب توانەوە بەلام کورد نەتوايەوە ،وەك لەو بەلگەنامـە بريتانيـە دەردەکـەوێ: CO 161/2 /730....ينطق الكرد باللغة الكردية التي تعود الى اللغـات الاريـة ولا تربطهـا شيء بالعربية ذات الاصل السامي. بينما استطاع العرب ان يفرضوا لغتهم على الشـعوب الغير العربية في سوريا ومصر ومناطق اخرى فلم يستطيعوا ذللك في كردستان حيـث لا زال الكرد يتكلم بلغته الاصلية... ، بە کورتی دەبێ زانايانی پسپۆر لەو بارە بە جوانی ڕوونی بکەنەوە نەك داپیۆشن ئاخۆ ئەو پرسە چۆنە تا چيتر کوردو ئاينی ئيسـلاميش لێـی زەرەر مەند نەبێ.

تـەیاری عروبـی هاوچـەرخ سـودی زۆری لـەو فقهـە سـەقەتە وەرگرتوە،تـا ڕادەیـەك توانيويانە(فکری قومی) دەولەمەند بکەن بەوەی کە نەتەوەی عەرەب پـەيامی ئيسـلامی بۆ هەموو نەتەوەکان هەلگرتووە، وەك شبلی عيسمی دەلـێ: (أحيانـاً العروبـة أوسـع مـن

[1] ابن تيمية-اقتضاء الصراطالمستقيم ج1ص419

الإسلام)[1]، میشیل عفلق دەڵێ: (العروبة جسم والإسلام روحها)،لەکتێبی ( العروبە بین الشعوبیەووالاستعمار)دەلیت ئیسلام ومرۆڤایەتیش پێویستیان بە ئەخلاقی عەرەب بووە نەك پێچەوانە، ئیتر ویستویانە تەسکی ئەو بیرە لە فراوانی بیری ئیسلام بلکێنن.

بەڵام زۆر روونە لە ئیسلام و لە هیچ ئاینێکی ڕاستەقینەی ئاسمانی جیاکاری لەسەر بنچینەی ڕەچەڵەك و خوێن و ڕەنگ نیە، (..ان اكرمكم عند الله أتقاكم)، (لا فضل لعربي على أعجمي ولا أبيض على اسود..)،لەدوا وەسیەتی پێغەمبەر(د خ) ئەوانەی ساغ کردەوە، ئەو جۆرە بانگێشەیە بە نەفامی (جاهیلیەت) حساب بووە لەلایەن ئاینی ئیسلام بەپیچەوانەشەوە لەلایەن نەتەوەگەری عەرەب مانای "شعوبی"بەخشیوە بۆیە ئومەی ئیسلامیان گۆڕیوە بۆ ئومەی عەرەب.

لێرەوە زاراوەی (امە) و (نەتەوە)یان تێکەڵآ کردووە و (امە) بەکاردەهێنن، ئەوەش تەقەلایەکی بە ئایدیۆلۆژی کردنی بیری نەتەوەییە، ئەگینا (امە) زاراوەیەکی ئاسۆییە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بەپیل بانگی ئیسلام چووینەودەچن، جا کوردە، عەرەبە، فرەنسیە،... واتە رۆجیە گارودی و سیدقطب و سعید نورسی و إ.خمینی یەك ئومەتن، بەڵام یەك نەتەوە نین، نەتەوەیی زاراوەیەکی ستونیە زۆر دوورە لە (امە)،"ولاء" بۆ ئومەیەو "ئینتما"ش بۆ نەتەوەیە. بۆ زیاترسەرنج بدە ئەو لیستە جیاوازیانە

| **ئومە** | **نەتەوە** |
|---|---|
| 1- ئاسۆییە | 1- ستوونیە |
| 2- مەودایکراوەوجیهانیە | 2–مەودایداخراوو دەڤەریە |
| 3- پرۆسەیەو وەرگیراو | 3- میراتی و وەستاوە |
| 4- ئایدیۆلۆجیە | 4- بایۆلۆجیە |
| 5- فرە زمانی | 5- یەك زمانی |
| 6–وەلائە | 6- ئینتمایە ( زگماکیە) |
| 7- سیاسیە | 7- کۆمەلایەتیە |
| 8- لەو سەردەمە دەگمەنە | 8- زۆر بلاوە |
| 9- پرۆسەی(أمر بالمعروف والنهي عن المنكر) | 9- پرۆسەی لای بەسەرکەوتوان |

[1] العلمانية والدولة الدينية ص213 .

8- لەكاتی بەهێزی ماركسیەت هەمان تەقەلای لەگەڵ بەكارهاتووە، بە تەئویلی گۆتەكانی ماركس لەبارەی مەسەلەی ئێرلەنداو داهێنانی زاراوەی وەك سۆشیالیستی نەتەوایەتی، نەتەوایەتی بەگیانێكی ماركسی،.. ئەوانەش نەشیاوە، چونكە مەدرەسەی ماركسی ئاسۆییە، ستونی نیە تا جێی نەتەوەی تیا بێتەوە.

9- لە كوردستانی ئێستاش هەندێ تەقەلای تایبەتی هەیە وەك:

أ/ دەڵێن (بەها) و (نەریت) و (مێژووی كورد) دەكەینە مەدرەسەو ڕێنوێنی سیاسی خۆمان.. بەڵام مادام ئەو بەهاو نەریتە موڵكی هەموو كوردە، بە چاك و خراپەوە، جا بەها و نەریتی كامە لایەنی هەڵدەبژێری؟ هەر بەنموونە لە دوا قۆناغی كوردایەتی زیاتر لە 300 فەوجی كورد و هەزاران پیاوی ڕژێم هەبوو، بەشداریان كردووە لە ئەنفال و تالآن و كیمیاویش، لەكاتێكدا تەنیا بە هەموو لایەك 10000 هەزار پێشمەرگەیەك هەبووەو كەمایەتین.. جا (بەها)ی كام لا بۆ ئەو ڕێنوێنیە هەڵدەبژێری. ئی كەمایەتیەكە یان زۆرایەتیەكە؟ وە بۆچی؟ وە بە چ پێوانەیەكی نەتەوایەتی؟ خۆ كەمایەتیەكەش سەلبیاتی زۆری وای هەبووە ناشێ بۆ ڕێنوێنی.

ئەو ڕێسایە بۆ هەموو نەتەوەكانە، بزانین ئاخۆ عەرەبیش بەها و نەریتی كام چین و توێژ و دەستە و تاقم دەكەنە پێشەنگ، هێڵی فەرمانڕەوایە سەوداكەرەكان یان هێڵی بەرگری ئیسلامی و نیشتمان پەروەرە بەڕاستیەكان.

ب/ لە تەقەلایەكی تر لە كوردستان دووبارە دەكرێتەوە، دەڵێن: خۆ نوێژ و ڕۆژوومان لێ قەدەغە نەكراوە لەلایەن حكومەت، بەڵكو خاكمان داگیركراوەو نەتەوەكەمان چەوساوەتەوە.. بەڵام ئەگەر تەنیا مەسەلە خاكە بۆ ئەو هەموو كوردە لایەنگیری ڕژێمیان كرد؟ مادام چەوساوەش بوون (كە فعلەن چەوساوەش بوون)، لەلایەكی تر ئایا داگیركردن و زوڵم كردن و هەق خواردن مەسەلەیەكی ئیسلامی نیە.

ئەو تێڕوانینە كۆنە تێڕوانینی جیاكردنەوەی ئیسلامە لەژیان*، بۆیە تووشی ئەو

*یەكەم بانگێشەی جیاكردنەوەی ئاین لەژیان لە مێژوودا لەلایەن زانای ڕۆم (سینكا) هات،لەناو عوسمانیش یەكەم ئیتحادیە تۆرانیەكان بوون، یەكەم پەیڕەو كەریش ئەتاتورك بوو، لەكوردستانیش یەكەم بانگێشەی وا لە لایەن ڕۆژنامەی (یەكێتی كورد )هات كەلەلایەن ئۆفیسی بەریتانی دەردەچووو .

تێڕوانینە چەوتیە دەبن، ئەگینا هەمان پرسیار ڕووی تری هەیە، باشە خۆ داگیر کەر سۆشیالیستی و شیوعیەت و لیبرالیەتی لێ قەدەغە نەکردووین، بۆ ئەو حزبانەی کوردستان شیوعی و سۆشیالیستی و لیبرالیین ؟ ئینجا لە ئاینی ئیسلامدا زۆرداری و خاك و ماڵ داگیرکاری حەرامە، بەڵام کوا لەو مەدرەسانە حەرامن؟ ئەی ئەو مەدرەسانە خاوەنی سایکس پیکۆ و دابەشی کوردستان نین؟

## زیانەکانی ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی

1- بۆ پڕکردنەوەی ئەو نوقستانیانەی لە ئایدیۆلۆژیای حزبە نەتەوەییەکان دا هەیە، پەنایان بۆ کۆمەڵێك مەدرەسە و ڕێباز و ئایدیۆلۆژیاوباوکێکی تر بردووە وەك (ئاین، دیموکراسی، لیبرالی، سۆشیالیستی، مارکسی، سەروەری مێژوویی، میکافیلی،..) سەرەنجام ئایدیۆلۆژیەکی لێکدراوی ئاوێتەی لێ دروست بووە بەشێوەیەك ئەگەر ئەو باوکە نامرۆڤایەتی بێ حزبی دڕندەی لێ دەرچووە، پێچەوانەش بە پێچەوانە،هەروەك دەبینین فاشی ونازی وبەعسی پێك هاتوون لە زاو زێی نێوان بیری نەتەوەیی و ئایدیۆلۆژیای سۆشیالیستی توند ئیتر ئەو سەرەنجامەی هەبووە .

2- کورد هەڵگری ئەو ئایدیۆلۆژیە نەتەوەییە نەبووە و نین، بەڵکو قوربانی ئەو ئایدیۆلۆژیایەیە، هەر لە ڕاستیدا لە جیهانی ئیسلامیداخێراتر لەنێو میللەتی (تورك و عەرەب) ئەو ئایدیۆلۆژیە ڕەگەزپەرستیە پەرەی سەند*، بووەتە دەردەسەری بۆ خۆیان و بۆ نەتەوەی دراوسێکانیش، ئەگینا میللەتانی تر کەمتر هەڵگری ئەو ئایدیۆلۆژیایەن.

3- هەموو دیاردەکانی (فاشیەت، نازیەت*، بەعسیەت، شۆڤێنیەت،زایۆنیەت، تۆرانیەت...) نیوەی دیکتاتۆریەکان بەرهەم و زادەی ئەو ئایدیۆلۆژیانەن.

---

*ئەوەش روونە وەك لە تویژینەوەکانی ابن خلدوون و د علی وردی وئیتریش بۆی چووینە دیارە پەیوەندیەکی بە ژینگەی تورك وعەرەب و هەردووبیابانی مەغول وعەرەبستان هەیە .

*حزبە نەتەوەگەری- سیکولارە عەرەبیەکان دوایش دەستورەکانیان بە ئەزموونی نازی وفاشی کاریگەرن، لە مادەی (4)حزبی سوشیالیستی کریکاری ئەلمانیا- نازی هاتووە :(هاولاتی ئەلمانیا ئەوانەن کە خوینیان ئەلمانە)،کت ومت مادەی (66)ی دەستوری تورکیا یە بە ئەدریسی (تورك فەتەنلەر)وادەلیت، **هەمان مادەی 7ی دەستوری حزبی بەعسە:المادە (7) :- الوطن العربي هو هذه البقعة من الارض التي تسكنها الامة العربية** .دەستورەکانی عەرەبیش دووپاتی ئەوە دەکەنەوە بە پیدانی ناسنامەی عەرەبی بە وولاتەکەیان ،سەیری دەستوری عێراق 1968 بکەو ودوایش هەردووبارە دەبۆوە: المادة الأولى: .. الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها. دەستوری سوریاش1970 و، 1973: المادة الأولى ..القطر العربي السوري جزء من الوطن العربي.

4- ئەو ئایدیۆلۆژیانە هەر بۆ نەتەوە ژێردەستەکان دەرد نین،بەڵکو بۆ هەڵگرانیشی، ئەوەتا عەرەب لەسایەی ئەو ئایدیۆلۆژیە بوونەتە 22 پارچەی ڕەسمی، لە بەرامبەر ئەو (ئیسرائیلۆکە) چەند سەرشۆڕ و پەرتەوازەن، کەچی بەرامبەر نەتەوەیەکی زۆرلێکراوی وەك کورد یەکبوون، حکومەتی دیکتاتۆریشن بەسەر گەلانی خۆیان، تەنانەت لەدژی نەتەوەییشن، تا ئەو ڕادە لە مانگی 1999/11 دەسەڵاتداری فەلەستین و ئوردن و ئیسرائیل و ئەمریکا هاتنە ناو هاوپەیمانیەك لەدژی حزب الله و حماس و جیهاد، کە تاکە بەرەن بەرهەمی نیشتمانیان بۆ نەتەوەی عەرەب بووبێت. ئەگەر حزبی (عداله وتنمیه) لە تورکیا ئەو دەنگە زۆرەی نەهێنابوایەو مەیلی ئیسلامیانەی نەبوایە، ئەوا تورکیایش پاڵێورابوو بۆ ئەو هاوپەیمانیەتیە.

5- نمونەی تورکیاش هەمان ڕەوتە (بەڕوانگەی نەتەوایەتی) تورکیا سەرکردەی جیهان بوو تا (ئایدیۆلۆژیای عەلمانی نەتەوەیی) نەهاتە جێی خیلافەت، کەچی ئێستا بچووك بۆتەوەو بەدوای مەرجەکانی ئەوروپا ڕادەکا و پێی ناگا.

6- ئەنجا ئەو دوو خەتە نەتەوەییەی تورك و عەرەب لەگەڵهەموو نەتەوە دراوسێکانیان ناتەبان، نمونەی ئەوروپاش ئێستا (سەربیا) لەسەر ڕێبازی نەتەوەییە لەگەڵهەموو نەتەوەکانی دراوسێی ناکۆکە و خۆشی وێران بووە.

7- ئەو جۆرە حزبانەی نەتەوەیش قەیرانێکی وەك وڵاتانی عەرەب و تورکیایان هەیە لە ناسنامەدا، ئێستا نازانرێ تورکیا ئاسیاییە یان ئەوروپی؟ عەلمانیە یان ئیسلامی؟ نەتەوەییە یان عەولەمی؟ دیموکراسیە یان دیکتاتۆری؟ هەمووەو هیچیشیان نیە.. هەروەها ئەو قەیرانە ناسنامەییەی ئایدیۆلۆجی (بەشێوەیەکی کەمتر) لە حزبە کوردستانیەکانی خەتی نەتەوایەتی بەدی دەکرێت، ڕوون نیە ئاخۆ دیکتاتۆرین یان دیموکراسین؟ ئومەمین یان نەتەوەیین؟ رادیکالین یان ئیسلامین؟ ڕۆژئاواین یان ڕۆژهەڵاتین؟ عەلمانین یان ئاینی؟ عێراقین یان کوردستانی؟ چینایەتین یان جەماوەری؟ هەموون و هیچیشیان نین بەتەنیا، وەك ئەو پزیشکەیە بڵێت من پسپۆڕم لە هەموو شتێك، لە کۆتاییدا پزیشکێکی تەنیا مەسڵەحیە، ئەوەی هەمووی بوێت هەمووی دەدۆڕێنێت.

---

،لەو دەستورە 59جار ووشەی عەرەبی لێهاتوە بۆ یەکجاریش ناوی کوردی تیا نەهاتوە.تەنانەت فلستین ژێردەستیشە کەچی لە مادەی (1)دەستوریان تۆماریان کردوە کە فلستین بەشێکە لە نیشتمانی عەرەبی !!المادة 1: فلسطین جزء من الوطن العربي الكبير، والشعب العربي الفلسطيني جزء من الامة العربية والوحدة العربية هدف يعمل الشعب الفلسطيني من اجل تحقيقه .

8- عەلمانیەتی نەتەوایەتی عەرەب دەڵێن ئەوروپا لە ئاین ڕزگار بوو پێشکەوت، ئێمەش وا پێویستە بگەڕێینەوە سەر ڕەسەن. ڕاستیەکەی ئەوەی ئێستا جیهان بەڕێوە دەبات (ئەمریکا و ئیسرائیل) هیچ ڕەسەنایەتیەکیان نیە لەمێژوو، ئەو بۆچوونەی گوایە خاوەن سەروەری و نەتەوە ڕەسەنەکانن پێشڕەوی جیهانن، وا دەرنەچوو، ئێستا ڕۆم و فارس و هند هەتا ئینگلیز و نەمساش لە پەراوێزن لەجیهانکە نەتەوەی ڕەسەنن، ئینجا ئیسرائیل بەناو مانا و ڕێباز و دەستوری(چاوەڕوانکراویان) و دەوڵەتەکە لەسەر بنچینەی بیری ئاینی دروست بووەو بۆیەش وا زاڵە بەسەر عەرەب کە ئاینی خۆیان بەجێ هێشتووە، لەسەر ڕێبازێکن کە ئیسرائیل خۆی بۆی داڕشتوون.

دەبێ دووبارە لە کۆتاییدا بیلێینەوە کە خەباتی رزگاری- نەتەوایەتی جیایە لەگەڵ بیری نەتەوایەتی، یان بەسادە تر :میللەتیك بەچارەنووسی دەوڵەت گەیشتبێ هەرجۆرە جم وجۆڵێکی نەتەوەیی رەگەز پەرستیە، بەڵام میللەتانیك بە چارەنووس نەگەیشتوون و ژێر دەستەن ولەکاردانەوەدا بەلای دەمارگیری نەتەوەیش دەچن ناهەقیان نیە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی سادەن .

**زیانەکانی لەکوردستان:**

لەوەو پێش باسمان کرد کەجگە لەهەردوو نەتەوەی تورك وعەرەب لە جیهانی ئیسلامیدا کەمتر میللەتانی تر بە دوای بیری نەتەوەیی بووینە، ئەوەی کوردیش زیاتر کاردانەوەیە، ئەویش بە چەند قۆناغێك تێپەڕیە :1- سەرکردەیەکی ئاینی کلاسیکی وحزبی عەلمانی هەتا سالی 19752- سەرکردەو حزبی مارکسی تا19913- لەدوای ئەو مێژووە بیری ناشیۆنالیزمی ویستراوە پەیرەو بکرێ،ئەوەیجێی سەرنجە لەونێوانەی کە سەرکردەی ئاینی بووە چاکتر توانرابوو کەمایەتیە ڕەگەزی وئاینیەکانی کوردستان بەشداری پێ بکرێ بێ هیچ حەساسیەتێك، بەو دەروازەیەش دەچینە نێو زیانەکانی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی لەکوردستان :

1- لەپێشدا دەبێ بزانین ئێمە قوربانی ئەو بیرەین، عەرەب وتورکیش قازانجی لەو بیرە نەکردووە بەڵکوبەهۆیەوە تا ئیستاش لە قەیرانی سیاسی وشارستانی وفەرهەنگینە، هەر بە بەراوردێکی سادە :بەهۆی ئەو بیرە عەرەب بوویتە 22پارچەو لە ئاست ئیسرائیلێکی وا بچووك ڕیسوایە، تورکیش بەهۆی ئەو بیرە لەو ئیمپراتۆرە گەورەیە بچووك بووینەوە بۆ

تورکیایەکی وا بچووك کە لە یەکێتی ئەوروپی وەرنەگیرێن کە لە سالی 1848 عوسمانیلیێی وەرگیرابوو.

2- بە هۆی ئەو بیرە کوردستان بۆ یەکەم جار لە مێژوویدا کەمە نەتەوەو ئاینی پالّدا بۆ بەخۆداچوونەوە لەمێژوو وکەلتوورو فەرهەنگیان بە جیا لەگەلّ کورد، پێش تر هەموو بەبیّ ئاوێر بە فەرهەنگ وزمان و کەلتووروو نەتەوەییشەوە خۆیان بە کورد ناسیوە هەتا سەردەمی مەلا مستەفاش .

3- لەناوەخۆش پارچە پارچە بووینە ,

4- ئەزموونێکی دەسەلاّتی زۆر ناشرینی پێش کەش کرد لە ڕووی ئیداری وسیاسی وئابووری و کۆمەلاّیەتی ..

5- بۆ یەکەم جارە سەنگەری کوردایەتی و ئاینی لێك جیا کرایەوە و ئەوەش سەرچاوەی دەیان موزاعەفاتی ترە .

6- بۆ یەکەم جارە لە مێژووی مەینەتی کورد وەك زالّم پێشان بدریّ کە خۆی مەزلوومە .

7- بە هۆی پەیڕەوی ئەو بیرە زۆربەی دۆستە جیهانی وعەرەبیەکانی سارد کردەوە .

کۆی ئەزمونی دەسەلاّت لە جیهاندا

دوای ئەو هەلسەنگاندنانە بەگشتی دەبینین زۆربەی ئەو مەدرەسەو تەوژمانە لە ئیستا یان لە قۆناغی رابوردووی نزیك تاقی کرانەوە،دەرکەوت ئەزمونەکانی ناشیۆنالیزمی وشیوعی سەرکەوتو نەبوون، ئەزمونی دیکتاتۆری ئەو دوولایەو لایەنە سەلبیاتەکانی لیبرال دیموکراسی و رۆژ ئاوایی بەگشتی بوویتە میرات بۆ بەشێکی زۆر لە وولاّتانی جیهانی ئیسلامی ،سەرەنجام ئەزمونێکی گشتی سەرکەوتوی نەبوە،بەتایبەتی لە وولاّتانی عەرەبی کە ئێستا وا شۆرشیان لە سەر دەکریّ،لەگەلّ ئەو هەموو ڕەخنەو هەلسەنگاندنەش بۆ ئەزمونی ڕۆژئاوا دەکریّ دەتوانین بلّیین ئەزمونی ئەوان لەجیهاندالەچاو ئەوانی تربەرچاوترە لە دەست گۆڕی دەسەلاّت ومافی مرۆڤ بەرپرسیاریەتی ژینگەو سیستەمی جیهانی وگەشەی شارستانی و تکنۆلۆژی و سەروەری یاسا وڕەخساندنی بەیەکسانی دەرفەتی کارو مافی هاوولاّتی و ...زۆر لای تر ،بەلاّمەهەموو ئەوانە لە چاو دادگەری هێشتا زۆر لاوازە.

# بەشی حەوتەم

## - كاریگەری عەلمانیەت لەسەر كۆمەڵگەی كوردەواری-

## ئاكامەكانی لە كوردستان

لە ئەنجام و ئەزموونی لە كوردستاندا بۆمان دەركەوت كە كوردایەتی ئایدیۆلۆژی و مەدرەسە نیە تا خاوەن (ئەقیدە و شەریعەی تایبەت بێت) بەڵكو خەباتی ڕەوای گەلێك و خاكێكی داگیر و دابەشكراوە، موڵكی ئەو مەدرەسەیە كە بەو ئەركە پیرۆزە هەستابێت ئی دی:

1- هیچ حزبێكی كوردستانی هەنجەتی نەكردنی نەما لەبەر هۆی فكری.

2- هیچ حزبێكیش ناتوانێ ئەو ئەركە بەتەنیا بخاتە ئەستۆی خۆی یان پاوەنی بكا، كێ زیاتر پێی هەڵسێ موڵكی ئەوە.

3- هیچ بواری ململانێی سیاسی ناوەكی ڕەوا نامێنێ، بەتایبەتی لەو قۆناغە، بەڵكوهەموو زەمینەكانی ساز و ئامادەیە بۆ یەكخستنی خەباتی گشت لایەك بۆ ئەو ئامانجە هاوبەشە، دەروازەی گفت و گۆی پرۆژەی یەكگرتنی كوردیشە، ئەوە وەك ئەنجامی ئیجابی ئەو لێكۆڵینەویە.

دیارە نەتەوایەتی هەست و جموجۆڵە، ڕاپەڕینە، دۆخی شۆڕشگێڕی لێ دروست دەبێت، بەڵامشۆڕش وبزوتنەوەیەكی سیاسی پێ دروست نابێت، بۆیە حزبە كوردستانیەكان بە ناچاری بۆ پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییە فكریە یا پەنایان بۆ زانایەكی ئایینی بردووە بۆ یەكخستنیان یان بۆ مەدرەسەیەكی فكری مەوجود، بەو شێوەیە وا سەدەیەك لە ئەزموونی فكری عەلمانیەت تەواو دەكەین بەتایبەتی چارەكە سەدەی دوای لەگەڵ حزبە كوردستانیەكان، ئەوەش ئەنجامەكەیەتی:

1- بزوتنەوەی كوردایەتی تا زانای ئایینی سەرپەرشتی كردووە لەجیاتی ئایدیۆلۆژیای عەلمانی ئەوا میللەت یەك پارچەو بەهاریكار و كەم (خائین و گیرفان پڕكەر) بووە، بەڵام دوای ئەو هاوكێشە وەرگەڕاوە بە پێچەوانەیی لەگەڵ بە عەلمانی كردنی ناوەڕۆكی كوردایەتی و سەرهەڵدانی سەركردەی عەلمانی.

2- ئەو مەدرەسە عەلمانیانە هەروەك لەڕووی دووەلی نەبووە پشتیوان بۆ کورد، لەڕووی ناوەخۆش تەنها بوونە ماندووکردنی شۆڕش و کوردایەتیەکە،لەوانە: لێکترازان، تۆمەت، ناکۆکی، شەڕی براکوژی، تەسك بیرکردنەوە، لاسایی کردنەوە، داڕووخانی بینای ڕەوشتی کوردەواری،... لە کۆتاییدا ئەو دیاردە دزێوانەی پەیداکرد: بێئەمەکی، بێ متمانەیی، دزی، تالآن، دیل کوژی، خیانەت، جاشایەتی، بوونە بەعسی، بوونە عەرەب و تورکمان، مەبدء فرۆشی، لایەنگیری سەرکەوتوو، ناهەقی، فێڵبازی،...ئیتر ئەوکولەگە بە هێزانەن بوێپەیدا کردنی ئەو گەندەڵیە وێرانکەریە،هەرە دواییەکەش لە کورتی دانی گیانی بەرگری و شەڕە دەسەلآتیکی بە زەقی و کانتۆنیایەتی.

3- بەرێکەوت نەبوو لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو مەدرەسە عەلمانیەتە لە ناوچەکەو لە کوردستان مەینەتی کوردیش سەری هەڵدا لە پەیمانی سایکس پیکۆ 1916 تا جەزائیر 1975 و تا ئێستاش، بەردەوامیەکەشی لەگەڵ بەردەوامی عەلمانیەتە، ئێستا کە ئاسۆی ئاوابوونی عەلمانیەت دەرکەوت، ئاسۆی ئومێدی سەرکەوتنی کوردیش تارادەیەك دەرکەوتووە.

4- هەر ئەو مەدرەسانەن بوونە هۆی لێ تێکەڵبوونی هەریەکە لە (پشتیوان، دۆست، بێلایەن، ناحەز، دوژمن) لە ئیقلیمی و دەولی و هەندێ جاریش تەواو پێچەوانە.

5- لە کۆی ئەزموونەکان، بەتایبەتی عەلمانیەتی نوێ تا ئەو ساتەش، ئەگەر وا هەڵکەوتبێ بەرژەوەندی نیشتمان و بەرژەوەندی حزبایەتیەکەی ناکۆك بن ئەوا هەردەم نیشتمانیەکە ژێرکەوتووە.

6- نەبوونی ستراتیژیەتێك بەدیدێکی قوڵ و هەمەلایەن و چارەنوس ساز.

7- لەبارەی ئێستایاندا هەمووی گوایە دیموکراسین، کەچی تا ئێستا دەستگۆڕی دەسەلآت لەناو خودی حزبەکە نیەو بواری هەموو ڕەخنەیەکیش لە سەرۆکەکە نیە.

8- دیاردەی لاسایی کردنەوەو هێنانی نەریت و شەریعەتی هەندەران، سەردەمێك ئەو زاراوانە باوی بوو (پرۆلیتاریا، حتمیە تاریخیە، ئیمپریالیزم، دیالیکتیك، ڕەجعیەت، برجوازی، بەکرێگیراو، سەرمایەداری، دیکتاتۆری پرۆلیتاری، زەحمەتکێش، صراع طبقي).. ئێستا بێ هیچ بنچینەیەکی کوردانە گۆڕاوە بۆ (دیموکراسی، مافی مرۆڤ، دژەتیرۆر، ئاشتی، دیالۆك...) بۆ زیاتر سەرنج بدە ئەو خشتە بەراوردەی (پێچەوانەکانی هەڵوێستی خۆی).

حزبە عەلمانیـەکان بەسـتەمەوە ئـاین و کێشـەی کوردیشـیان کردۆتـە بـەراگیڕی ئـەو مەدرەسانە، بەتایبەتی لە قۆنـاغی نوێـدا هـەر حزبێـك لـەدیوی نـاوەوەی عەلمانیـە یـان مارکسیە بە پێشەوایەکی ڕەمزی ئاینی یـان نیشـتمانی دەیشـاریتەوە تـا خـۆی دروسـت دەکات، نمونەی (کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردسـتانی ئێـران) مارکسـیە تەنانـەت ئـەو دەدەقیقە قورئانیەی پـێش بەرنامـەکانی رادیـۆش ناخوێنـێ، کەچـی (م. شـێخ عزالـدین حسینی) کردبووە پێشڕەوی وەختی خۆی.

بەو شێوەیە ئێستا گشتیان بە هەر ناوێك بێت چـەند زانایـەکی ئـاینی دەکەنـە دیمـەن تەنها لەکاتی پێویست، هەروەها ئەو بڕە قورئان خوێندنە، یەك دەرسی ئاین، نیو وەزارەت تـەرخان کـردن، جیاکردنـەوەی زانایـانی ئـاینی و ژیـان،.. هـەموو یـەك مەبەسـت و ماهیەتە،بەکورتی پەیوەنـدیان لەگـەڵ ئـاین تـاکتیکی بـووە بـەهیچ بارێـك پێـی قایـل نەبووینە، ئەگەر بێ دەنگ ومـات بـووبێ ئـەواناوی لێنـراوە (أفیـون الشـعوب)، ئەگـەر ڕاپەڕی ناوی تیرور وچۆن دەبێ ئاین تێکەڵی سیاسەت بکرێ..،لەسالی1982 مام جـلال رینماییەکی بە هەندێ کادیری تایبەتی دا تا پەیوەندی بە ماموستایانی ئـاینی وەبکـەین ئاخو بۆچی دانیشتوون شورش ناکەن، منیش لەسـەرئەو ڕێنماییـە یەکـەم پەیوەنـدیم بـە ماموستای دەرگەلە وبەردگرتکە کرد،کەچی کـە ماموسـتایان هەلسـانەوەو بزوتنـەوەیان دروست کرد ئەو دەنگە سەری هەلدا ئەری مەلاو چەکیان گوتیە !! .

ئینجا سەرنج بدە ڕەوتی حزبە کوردستانیەکانی دەسەڵاتدار هەتا دیوەکانی کوردستانی ئێران و تورکیاش دەبینن هەریەکە بەهۆی عـەلمانی بوونەکەی چەندە بـاری کـوردی قـورس کردووە، زۆرجار لەگەڵدەوڵەتی داگیرکەر بەهۆی هەڵگرتنی ئەو بـیرە عەلمانیـە مافـەکانی کوردی پێ نەسەلماندراوە، هەتا لە دواپێکهـاتنی لیسـتی کوردسـتانی و شـیعی، بـەهۆی داوای عـەلمانی بوونی عێراقی لەلایەن لیسـتی کوردسـتانی زۆرێـك لـە مـافی کـورد کـرا قوربانی ئەو داوایە، جا گرفتەکە لەوەشە هەر عەلمانیەتیش بووە ئەو هـەموو مەینەتیـەی لەداگیر و دابەش و وێران و ئەنفال و کیمیایی بە کورد بەخشـیوە، سـەرەڕای پەیـدابوون و سەرهەڵدانی ئەو هەموو ناکۆکی و شەڕی براکوژی و لێکترازانەی بەهۆی عـەلمانی بـەناوی چـــەپی و ڕاســـتی، چـــینی و شـــۆڤێنی، پرۆلیتـــاری و برجـــوازی، لیـــبرالی و سۆشیالیستی،...هتد.

10- گوایه ئەو مەدرەسانە بۆ ئەو مەبەستەن ناوەرۆکی شۆڕشی کورد لە خێڵەکی و بێسەروبەری و بێنەخشەیی ڕزگار بکات کەچی تەنها ناوەکان گۆڕاون، ئاغە نەما بەڵام بەشێوەیەکی توندتر دروست بۆوە، بۆیە لە نوێترین کتێب (دیفید ماکدۆیل)[1] دەڵێت: شۆڕشی کوردیش سەرباری ئاغەی جاران ئاغەی نوێشی دروست کرد، مەبەستی بەرپرسەکانە.

11- لەکۆتاییدا بەهۆی ئەو عەلمانیەتە توندە و بەپێی بنەمای (باکۆنین): (کل تحطیم للقائم هو الخیر لإنسانیة)[2] ئەوە زۆربەی بناغە ڕەوشتیە کۆمەڵایەتیەکانی کوردەواری وێران کراو بەدیلیشی نەبووە بووە هۆی سەرچاوەی هەموو ئەو دیاردە دزێوانە.. بەتایبەتی جاشایەتی.

12- ئێستاش حزبە کوردستانیەکان لە کۆمەڵێك قەیرانی فکری و سیاسی و گەندەڵی ئیداری و میللی زۆر سەخت دان سەرەڕای قەیرانەکانی دووبەرەکی و نیشتمانی و ئیقلیمی و دەولی (کە لێرەدا بوار نیە باسی بکەین)، چارەنووسی ئەو حزبانە لەسەر ئەوسکەیە وێستگەکەی دیار و ئاشکرایە و بەرەو قەلۆشیە، هەموو هەنگاوەکان ناکۆکە خۆبەخۆ، هەر لە نمونەیەکی دووردا عەلمانیەتی کوردستان وەك عەلمانیەتی زۆربەی وڵاتانی ئیسلام بەو تێڕوانینە سادەیان بۆ ئیسلام پاساوی تیۆرەکەی (صراع الحضارات) دەکەن کەچی خۆی بۆ ئامادە ناکەن و بەپێچەوانەوە هێشتا زیاتر داکۆکی لە (شارستانیەتی ڕۆژئاوا) دەکەن کە بەو گفتەیە بێت ڕۆژێك لەڕۆژان یەکتر دەهاڕن، عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامیش لەسەر شارستانیەتی ئیسلام حیساب کراوە، واتە لایەنگیری شارستانیەکە کە سەرکەوتنی هەم نەمانی عەلمانیەتە ژێرکەوتنیشی هەر نەمانە، خۆی لەو ململانێیە خستۆتە خانەیەك لەشێوەی (قۆڵی پێنجەم).

دیارە لەوەیەوە هەندێکیان گەیشتونە ئەو ئەنجامەی کە لە دنیای پێشکەوتنی زانست و ئادیدیۆلۆژیای ئەوڕۆدا بڵێین: (ئایدیۆلۆژیا سقوتی کرد!) تەواو ڕاستە لەگەڵ تەعدیلێك (ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت سقوتی کرد).بەکورتی ئەو سەرەنجامانەی بووەو دەبی :1-

---

[1] بە ئینگلیزیەوتەرجومە نەکراوەAmodern Historey of The Kurds-1995

[2] مبادیء الثورة - ئەو کتیبەیە کەناوبانگی باکۆنینی پێ دەرچوو تیایدا داوا دەکا دام ودەزگای ئیمپریالیزم هەلتەکینرێ بە چاکوخراپەوە، ریکخراوە تیرۆریستیەکانی وەك بادرماینهۆڤ وئەلویە ئەلحمرا و..لەو تیۆرە سەرچاوە دەگرن.

لەرووی‌ئابووری –گرانی2- لەرووی‌ئیداری- گەندەلی3- لەرووی کومەلایـەتی –ویرانـی بەها و ئەخلاق وبەرتەوازەیی4- لەرووی‌زانستی –دواکەوتووی 5- لـەرووی فەرهـەنگی- لاسـایی‌کردنەوەی‌بێ داهینـان(تقـزم الثقـافی)6- لەرووی‌سیاسـی – میکافیلیـەت 7- لەرووی‌حوکم رانیەوە- دیکتاتوریـەت 8- لـەڕووی پەیوەنـدی –کراهیـەت9- لـەڕووی نیشتمانیەوە- بێ ئینتمایی (واتە هەلوەشاندنەوەی کوردایەتی )... لەکۆتایی ماوە بلـێین عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامی دیمەنێکی ناشرینی هەیە، خـۆی بەسـتۆتەوە بەدەسـەلات و سوپا و زل هێزانـی جیهـان، ئەگـەر تـەنگاو بیـت زۆر بەسـانایی دەسـت بـۆ دوژمنـانی میللەتەکەی دەبـا ولـە دژی ئۆپۆزیسـۆنی، ئیسـتا دۆسـتەکانی رۆژئـاوا زۆربـەی لایەنـە عەلمانیە دیکتاتۆریەکانن، بۆیە رۆژئاوا لەجیهانی ئیسلامی دیموکراس خواز نیە.

## خشتەیەك تەنها بۆ ئەو هەلۆیستانەی حزبە کوردستانیەکان کە لەدوای 1990 پێچەوانە بونەتەوە

ئەوە هەموو خالە جیاوازیەکان نیە، تەنها ئەوانەیە کە پێچەوانەی هەلۆێستی خۆیان بوونەتەوە

| پێش ڕووخانی شیوعیەت- 1990 | دوای ڕووخانی شیوعیەت |
|---|---|
| 1- دژی دیموکراسی، مافی مرۆڤ، کۆمەلگەی مەدەنی، ئازادی، هەلبژاردن بوون بە ئاشکرا و لە نووسینەکانیاندا. | 1- زۆر جەخت لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ و کۆمەلگەی مەدەنی و ئازادی و هەلبژاردنن لە نووسین و ئاخافتندا. |
| 2- ئیسلام ئاینی میسالی یە و گەڕانەوە بوو بۆ (قرون الوسطی) | 2- بە گفتە بانگێشەی ئیسلامی دەکەن، نابێت لە سەنگەری کوردایەتی جیابێتەوە، زیاتر گۆتەیە نەك کردەوە. |
| 3- لایەنگری شیوعیەت، دیکتاتۆریەت، بەرەی ڕزگاری و سۆشیالیستی جیهانی بوون. | 3- دژی دیکتاتۆرین، دژی شیوعیەت و هەتا بەرەی ڕزگاریشن. |
| 4- نەتەوایەتی، ڕەسەنایەتی، بەهاو نەریت بە ڕەجعیەت حساب بوو (کوردایەتی شەرمەزاریە) دروشم بوو لەسەر دیوارەکان دەنوسرا.سرودی (ئەی رەقیب)یش گۆڕابۆ سرودی ئنتر ناشیونال | 4- زیاد لەپێویست نەتەوەیین و کوردایەتی شەرەفە. |
| 5- لایەنگیری مافی گەلان بوون. | 5- تووتیانەدەیلێنەوەبە تیرۆر و نایاسایی |

| | |
|---|---|
| | باسیان دەکەن. |
| 6- دژی ڕۆژئاواو ئەمریکا بوون بە هەموو ئاڕاستەیەك. | 6- بەو خەستیە پێچەوانەییە لایەنگیری ڕۆژئاوان سەرمەشقی ئەزمونەکانیشیانە. |
| 7- ئاغە و شێخ و دەرەبەگ و سەرەك خێڵ بەرەی ڕەجعیەت بوون. | 7- بەبنەماڵەی‌نەجیب زادە(بیاو ماقوول)حسابن دەسەڵاتیان دراوەتێ. |
| 8- هەر زانایانی ئاینی هۆی شکست بووینە بوکورد | 8- هەمووحزبێك لقێکی(یەکێتی زانایان)ی‌هەیە. |
| 9- مواسەفاتی پێشمەرگە:دەست و دەم و داوێن پاك، مەبدەئی، (چەکی بێ بیروباوەڕ سێدارەی جەماوەرە)یان پەیڕەو دەکرد | 9- مواسەفاتی ئێستای پێچەوانەیە. |
| 10- حزبایەتی‌ئامرازە،ئامانجیش سۆشیالیزمە. | 10- حزبایەتی ئامانجەوئامرازیش کوردایەتیشە. |
| 11- لە گەرمەی چەپ گەری لایەنە سەلبیەکانی شیوعیەتیان بۆ دەهێنایین نەك ئیجابیەکانی. | 11- ئێستاش لەجیاتی لاسایی دیموکراسی ڕۆژئاوا و تەکنەلۆجیاکەی تەنها لیبرالیەتی کۆمەڵایەتیەکەی ڕۆژئاوامان بۆ دێنن کە لایەنە سلبیاتیانە. |
| 12- زۆر ئایدیۆلۆجیایی بوون نەك مادیانە. | 12- زۆر مادیانەن و بی ئایدیۆلۆجیا و بنەمان. |
| 13- بەرژەوەندی گشتی لەسەرووی بەرژەوەندی تایبەتی بوو. | 13- بەرژەوەندی تایبەتی لە سەرووی گشتیە بە هەموو ئاڕاستەیەك. |
| 14- ئەندام و لایەنگریان وشیار و لەخۆبوردوو پلەی بەرگری بەهێز بوو، وڵات پەروەر و پارێز بوو. | 14- ئەندام و لایەنگرانی ناوشیار و لەرزۆك و خۆویستن بێ‌ئیرادە و بێورە و بێ ئینتمان. |

* * * * * * * *

## 7- 1 براکوژی لە کوردستان

وەك زاراوە و وشە هەڵقوڵاوی ژانی دووبارەی ناکۆکیەکانی توندی ناوخۆیە، مەبەست لێی (لەو سەردەمەدا) ململانێی خوێناوی باڵەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری کوردستانە، ئەگینا وەك ماهیەت کۆنە،لەشێوەی ئەو دۆخانەی پێی وتراوە (حرب الاهلیە) یان (حروب الداخلیە)، بنەچەی ئەو زاراوەیە دەگێڕنەوە بۆ ناکۆکیە خوێناویەکەی نێوان ئیمامی عەلی و معاویە، بەشێکی‌تر پێیان وایە بە جمکی لەگەڵ هاتنی مرۆڤ و جەنگی نێوان قابیل و هابیل ئەو زاراوەیە سەری هەڵداوە.. هەڵبەتە ئەو ناکۆکی ناوەکیە بریتی بووە لە پانتایی مێژووی زۆربەی میللەتان، بۆیە گەلێ جار هەندێ زانا وەسفی (مێژوو)یان کردووە بە (تۆمارگای تاوانەکانی مرۆڤ)، کەواتە (براکوژی) مانای جەنگی نێواندەسەڵاتدارە زۆردارەکان نەبووە ئەگەر ناوەکی و میللی و یەك ڕەگەزیش بووبن، زیاتر بەمانای ناکۆکیەك دێ لەنێوان خەڵکانێکی ستەملێکراو کە پەیوەندیەکی بەهێز کۆیان دەکاتەوە. ناکۆکیەکەیان شایەنی پلەی یەك و توند و خوێناوی نیە، بۆیە زاراوەی براکوژی تایبەتی‌ترە لە (حروب الاهلیە وحروب الداخلیە) وەك لە ئەمریکا و ئیسپانیا و وڵاتانی تر ڕوویدا، چونکە گەلێ جەنگی ناوەکی و میللی هەیە براکوژی نیەوەك لە لبنان، لەبرِوندی و ڕواندا، لە بەلکان، لە ئیرلەندا، لە زۆر شوێنی تر، چونکە جەنگ بووە لەنێوان ڕەگەز و ئاین و تایفە و بەرژەوەندی جیا ، کەچی لە ئەفغانستان برای سەنگەری ئاینی بووینە، لە کوردستانیش برای سەنگەری هاوخوێنی بوینە، کەواتە براکوژی دوو ڕەهەندیهەبووەو هەیە ئاینی (وەك ئیمام عەلی و معاویە)، هاوخوێنی (وەك هابیل و قابیل)، دوور نیە لە کوردستان هەردوو ڕەهەندی لێ کۆبێتەوە، واتە برای ئاینی و برای خوێنیشن، بۆیە براکوژی زاراوەیەکی پڕ بەپێستیەتی، چونکە جەنگ بووە لەنێوان باڵە سیاسیەکانی یەك میللەتی چەوساوەی ماف خوراوی یەك ڕەنگ و یەك ئاین و یەك ئامانج و..، وادیارە ناکۆکی نێوان ئیمارەتە کوردیەکان بە براکوژی نەهاتووە چونکە لە چوارچیوەی ئامانج و ماهیەتی ئیمپراتۆرایەتی بووینە، لەکۆنەوە بە ناکۆکی و چەنگی بنەماڵەیەك خۆبەخۆ و

یان یەك هۆز وتراوە براكوژی، گوایە ئەو زاراوەیە یەكەم جارلە كوردستان سیاسیانە بەكارهاتووە لەسەر زاری (شێخ شەهاب) لە بەتلیس، كاتێ هەندێ عەلمانی كورد(بەرەچەلەك لە شێخەكانی تەریقەتبوون) چوونە پاڵ لەشكری تورك لەدژی لەشكری شێخ شەهاب و ئەویش لە مەیدانی جەنگ كشایەوەو وتی: با شەڕی براكوژی دروست نەبێ[1].

ئەو زاراوەیە جارجار لەسەرەتای سەدەی بیستەم لەگەڵ سەرهەڵدانی مەینەتی كورد سیاسیانە بەكارهاتووە، بەڵام لەمێژووی نوێی كورد بەزەقی لەساڵەكانی 1964- 1966 سەری هەڵدا، كاتێ باڵی (م.س.- پ.د.ك) لە سەركردایەتی بارزانی جیابوونەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەو باڵە كەوتنە ڕیزی دوژمن ئەو زاراوەیە كوژایەوە، لەساڵی 1972- 1975 جارێكی تر خەریك بوو سەرهەڵبداتەوە لەگەڵ (ح.ش.ع) بەڵام دیسان حزبی شیوعی كەوتەوە سەنگەری داگیركەر، بۆیە ئەو زاراوەی براكوژی زەق نەبۆوە مادام جەنگی شۆڕشی كورد لەگەڵ جاشی حكومەتە داگیركەرەكان بە براكوژی حساب نەبوو بەپێی پێناسەكەی .

براكوژی بە تەوژم سەری هەڵداوە لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێی ساڵی 1976 بەڕابەرایەتی (ی.ن.ك)، بەتایبەتی لە كارەساتی هەكاری بەدواوە لە 1977- 1978- 1980- 1982 كە زیاتر لە 800 پ.م.ی یەكێتی تیاچوو، ئەو براكوژیانە زۆربەی مێژووی سیاسی نوێی كوردستان پێك دەهێنێت لە هەموو پارچەكان، لە كوردستانی خواروو شەڕی نێوانیەكێتی لەلایەك و یەكەیەكە لەگەڵ (پ.د.ك) و (حسك) و (حشع) و (پاسۆك) و (لەشكری ئیسلامی 1982) لەگەڵ چەند وردە لایەنی تریش، دوای ڕاپەڕینیش دیسان لەگەڵ پارتی و بزوتنەوەو پەكەكە، هەروەها لەلایەنی پارتی كەوتە براكوژی لەگەڵهەریەكە لە (حدكا) و (كۆمەڵە) لە كوردستانی ڕۆژهەڵات و پەكەكە لە كوردستانی سەروو، لەگەڵیەكێتی و پارتی گەلی دیمكراسی كوردستانی خواروو، ئینجا لە كوردستانی ڕۆژهەڵات (حدكا) و (كۆمەڵەش) خۆبەخۆ، لە كوردستانی سەرووش پەكەكە لەگەڵ زۆربەی لایەنەكان،هەرلەگەڵ دروستبوونی حكومەت وپەرلەمان دا یاسای ژمارە یەكیان بریتی بوولەهێرش بردنە سەر( پ.ك.ك)لەمانگی ئۆكتۆبەری 1992 بەهاریكاری سوپای توركیا .

---

[1]بڕوانە: (ناودارانی كورد)- اسماعیل حقی.

هەڵبەتە لە زۆربەی براکوژیەکان لایەکی (ی.ن.ك) بووە،هەرچەندە بەشێکیش پێیان وایە یەکەم جار (پ د ك) لێی بەرپرسیارە بەڵام بەردەوامیەکەی لە ئەستۆی (ی ن ك)ە، هەر لە یەکەم بەیاننامەی دامەزراندنی یەکێتی زۆر بەتوندی و گیانی ململانێ هاتوونە گۆڕەپان و وەسفی (پ.د.ك) و سەرکردەکەی بە (خێڵەکی) و (سەوداکەر) و (ڕجعی) دەکا و دەڵێ: ((..مثلما أكدت الأحداث أعقبتها عجز القيادة العشائرية البرجوازية اليمينية المساومة وفشلها في قيادة الكورد..))[1], ئەوە لە کاتێکا بووە کە مام جلال نامەی دلنیای بۆ بارزانی ناردبوو کە ئەو شۆرشە نوێیە لەدژی ئەوان نیە[2]،بەردەوام ئەدەبیاتی حزبە سیاسیەکانی هاوچەرخ (کراهیەت)بووە .

هۆیەکانی براکوژی گەلێ زۆرن، مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئایدۆلۆژی و...، پلانی دوژمن و داگیرکەر و.. بەڵام لە قۆناغی نوێدا سێ هۆکاری نوێش هاتە پاڵ:

1- (ی.ن.ك) زیاتر لەسەرەتاوە 1976 خۆی بەخاوەنی شۆڕش و رابەری کوردایەتی نواندووە، چونکە ئەو بوو یەکەم بڕیاری دەست پێکردنەوەی شۆڕشی هەڵگرت، هەڵبەتە سەرکردایەتی پارتیش بزوتنەوەی کوردایەتی زیاتر بە موڵکی خۆی دەزانی بۆیە ئەو براکوژیە زۆربەی مێژووی شۆڕشی نوێی پێکهێناوە.

2- حزبە کوردستانیەکان لە قوناغی نوێدا- واتە لە دوای 1976- رەوتیکی مارکسیانەیان وەرگرت، هەڵبەتەپێشەنگیان یەکێتیبوو، کاتێ ئەو بەرەو مارکسی وەرچەرخا بەرەبەرە حزبە کوردستانیەکانی تریش بەرەو مارکسیخزین، هەتا (پ.د.ك) لە کۆنگرەی (9) بەزەقی هاتە سەر مارکسیەت.

هەڵبەتە مارکسیەتیش بناغە و بنەچەی لەسەر ناکۆکی و ناتەبایی دروست بووە، بەپێی یاسای سێیەمی دیالیکتیك (وحدة وصراع المتناقضات) کە یاسایەکەو پێیان وایە ناکۆکی ناوەکی سەرچاوەی گەشەو پێشکەوتنە، بەپێی ئەو یاسایە هەریەکە خۆی بە نوێنەری پرۆلیتاریا ناو دەناو بەرامبەرەکەشی بە برجوازیەت و سەر بە ئیمپریالیزم و سەرمایەدار، وەردەگەڕانە یەك لە هەموو پارچەکانی کوردستان، هەر دیسان سەرنج بدە لە یەکەم بەیانی دامەزراندنی (ی.ن.ك) هاتووە: ((وأثبتت فشل القيادة العشائرية

[1]سەرنج بدە: البيان الأول للأتحاد الوطني الكوردستاني- 1975.
[2]باسی ئەو نامە لە:چەند لاپەرەیەك لە مێژووی ی ن ك –ل46 (مقابلە نەوشیرەوان ) .

البرجوازيــة في قيــادة الكــورد مجـدداً ..وأن دوائـر الاسـتعمارية وعلـى رأسـها الأمبرياليــة الأمريكية أعداءألداء الشعب الكوردی)) له هەمان بەیانی یەکەمی دا دۆسـت و دوژمـن بەو شێوەیە ڕێـز دەکـا بـەپێی ئـەو یاسـایەی دیـالیکتیکی مارکسـی: ((ان الامبرياليـة والصـهيونية والرجعيةوالشاهنشـاهية و الطورانيـة والعربيةالشـوفينية والرجعيـة الكرديـة العميللة تعتبر العدوة الرئيسية الأولى.. بينما تعتبر القوة الثورية العربية وحركات التحـرر الوطني في العالم الثالث والقوة الاشتراكية العمالية والثوريـة في العـالم حليفنـا الرئيسـية)).
جا سەرنج بدە (رجعية الكردية) بە دوژمنی سەرەکی پلەیەك داناوە، لە مارکسـیەت ئـەو پلەیەی ناکۆکی مانای ناکۆکی خوێناویە، بۆیە بەپێی مارکسیەت و ئایدیۆلۆژیای یەکێتی شەڕی براکوژی نەك هەر دەشێ و ناشێ، بەڵکو ناچاری و ئەرکە، ناوی شـەڕی براکـوژیش نیـە، بـەڵکو ئـەوە نـاکۆکی سروشـتی برجـوازی و پرۆلیتاریایـە، نـاکۆکی دووبـەرەی ئیمپریالیزمی ئـەمریکی و سـەرمایەدارە لەگـەڵ بـەرەی ڕزگـاریخواز، بۆیـە دانوسـتان و شەڕەوستان تاکتیك بووە، وەختی بووە، هەناسە و حەسانەوە بووە،خۆئامادە کـردن بـووە، ئەگینا ئەسڵ و ستراتیژ جەنگ و براکوژی بووە،ئەگەر سـەرنجێکی زۆر بـە ووردی بدەینـە ئەو رێکەوتنەی مانگی5/ 1982نێوانمەڵبەندی 2ی (ی ن ك)لە گوندی حاجی مامەنـد بـە سـەرکردایەتی مـەلا بەختیارلەلایـەك وبەشـێکی حزبـی شـیوعی لـە ناوچـەکە بەسەرکردایەتی بهائەدین نوری تا هیچ لایەکیان بەشداری شەڕی برا کوژی قڕناقـەو پشـت ئاشان نەکەن،لەو دەم سەرکەوتو بوون بەڵام لەدویدا هەردوولایان لەلایەن حزبەکەی خۆیـان سزادران وزیندانی کران[1]،واتە براکوژیەکە کاری سەرەکی بوە، لەناوی (براکوژ)یش کێشەی لەسەر بووە، تا لەدوای ڕاپەڕینیش گەلێجار بەئاشکرا لە دیمانەی تەلـەفزیۆنی و سـیمینار و مێزگردەکان پرسیار ئەوەبوو ئاخۆ ئەوە شەڕی براکوژییە یاخود نا؟ گەلێ جـاری تـریش لە براکوژیەکانی شاخ ئەوەندە ڕەت دەبوون نـەك هـەر دوژمنـی ئەسـڵی(داگیرکەر) لـەبیر دەکراو خانەیەکی (ناکۆکی) بۆ نەدەمایەوە، دەبـووە دوا ئەڵقـەی دوژمـن، بـەڵکو گـەلێ جاریش بـەپێی پۆلینـەکانی مارکسـی حزبـی بـەعس کـە ناسـنامەیەکی سۆشیالیسـتی هەڵگرتبوو لایان نزیکتر بوو لە لایەنێکی کوردی شاخی کە ناسۆشیالیستی بووە، ئـەوەبوو

[1]زیندانی کردنی مەلا بەختیار زانراوە لای هەمووڵایەك بەڵام ڕەنگە نەزانرابێ کە بهادین نوریش لەلای حزبـی شـیوعی زیندانی کراوە بڕوانە: محمدشاکەلی-لەبزوتنەوەبۆ حزبی سۆشیالیستی کوردستان لاپەڕە هەڵنەدراوەکان- ل42 .

جورئـەتی بەلایـەنی شـەڕی براکـوژ دا کـە جارجـار پـەنا بـۆ داگیرکـەریش ببـا لـەدژی بەرامبەرەکەی.

3- بەرەو عەلمانیەتی، ئەو هۆکارە زیاتر لەدوای ڕاپەڕین 1991 کاریگەرە، هەڵبەتە لەدوای جارڕدانی بەرەی کوردستانی لە 1988 و هەڵگیرسانی ڕاپەڕین وا زەین چـوو کـە جـارێکی تـر شـەڕی براکـوژی سـەرهەڵنەداتەوە، واش پێدەچـوو، بەتایبـەتی لـە لێدوانەکانیسکرتێری گشتی یەکێتی، کە شەڕوئاشتی زیاتر لەدەست ئـەوان بـووە، گـەلێ جاردەیووت: (شەڕی براکوژی ئاووئـاو چـوو، هـەرگیز جـارێکی تـر نایبینینـەوە)، هـەتا بەبۆنـەی گەڕانـەوەی (ئـاڵای شـۆڕش) کـە لـەناو زەحمەتکێشـان جـارێکی تـریش جیابوونەوەهاتنەوە نێو (ی.ن.ك)، مام جەلال ووتی: (ئێمە هەموو لایەك شێت بووین، لەو شەڕی براکوژی و ئینشقاقانە، جارێکی تر شەڕی براکوژی ئاووئاو چـوو نابێتـەوە)، تـەواو ڕاستە چاکترین هەڵسەنگاندنە، شێت بوون بوو. کەچـی دیسـان شـێت بوونـەوە و شـەڕی براکوژی زۆر بەخەستی و گەرمی و هەمەلایەنی هاتـەوە، ئـەوجارەیان هۆکـارێکی تـریش هاتە پاڵی.. ئەوەبوو ئەو ڕووکارە عەلمانیەتـەی حزبـە کوردسـتانیەکان لـەدوای شکسـتی (عەلمانیەتی مارکسی) بووە کۆمـەڵێك بنەمای بەرژەوەندی بێپـەروەردەیی و ئیمتیـاز و.. لەدەستدانی ئایدیۆلۆژیا و پەروەردە کە داینەمۆی حزبایەتیە، بەو شـێوەیە لـە دەسـتدانی ئەو داینەمۆیە بووە هۆی قەرەبۆکردنەوەی بەهۆی دەسـەڵات، واتـە حزبـە سـەرەکیەکانی کوردستان جگە لە دەسەڵات کەمتر ئامرازی فکری و سیاسی و نیشتمانی بەدەستی مـاوە تا ئەندام و لایەنگرانی پێ پارێزگاری بکا و زیاد بکا، بۆیە هەروەك عەلمانیـەتی عـەرەب ئاسادەسەڵات بووە تاکە پارێزگارییەکی بوونی ئەو حزبانـە، بەناچـار هـەموو ئـامرازێکی ڕەواو ناڕەوا بەکارهاتووە بۆ پارێزگاری لەو دەسەڵاتە، جا ئەگەر ناوی دیمکراسی و ئـازادی و پەرلەمان و.. نرابێ، یەکێ لەو ئامرازانە دیسان شەڕی براکوژی لەسەر دەسـەڵات کـرا، بەمانایەکی ڕاشکاوانەتر ئەوانە شـەڕیان لەسـەر دەسـەڵات کـردووە نـەك لەبـەر ئـەوەی پەیامێکی کۆمەڵایەتی یان پەیامێکی ڕزگاریان هـەڵگرتبێ بـۆ جێبـەجێکردنی، بـەڵکو لەپێناو دەست بەسـەراگرتنی سـامانی گشـتیتا بیکەنـە یارمـەتی حزبـی بـۆ ئەنـدام و لایەنگرانیان پێ زیاد بکەن یان بەلایەن کەم لەکورتی نەدەن، بۆیە گەلێ جـار پـەنایان بـۆ دوژمنی داگیرکەریش بردووە تەنها بۆ پارێزگـاری ئـەو دەسـەڵاتە، هەڵبەتەهـەموو زاراوە سەلبیەکانی وەك: دیکتاتۆری، شمولی، ئیستبدادی، تاکڕەوی، ئۆتۆکراسی، تۆتالیتـاری،..

هەتا دیاردەکانی ترسناکی فاشی و نازی و لەو دەروازەیە سەرهەڵدەدا، ئیتر سەرەنجامە خراپەکانی هەر تەواو نابێ وەك:

أ- پەیداکردنی دیاردەکانی جاشایەتی بێسنور، خۆفرۆشی، بێمەبدەئی، بەدئەخلاقی سیاسی، گەندەڵی، خۆویستی، بەرژەوەندی تایبەتی خستنە سەر بەرژەوەندی گشتی و نیشتمانی، هەلپەرستی، بێ بیروباوەڕی.

ب- بووە هۆی ڕەسەن کردن و ڕەوایی پێدان بەناکۆکی ناوەکی و لەبیرکردنی داگیرکەر بە هەموو ستراتیژ و دەروازەکانیەوە.

ج- ڕەتکردنی دەرفەتە زێڕینەکان کە بەدەگمەن بۆ کورد دووبارە دەبێتەوە.

د- پەیداکردنی دوژمنایەتی خوێن لەناوەخۆ و کەلێن دروست کردن بۆ دوژمن.

ع- دارمانی بناغەکانی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی و بێمتمانەیی و هەڵوەشانەوەی ئینتماییەکان.

ق- هەڵس و کەوتی دڕندانە بەرامبەر بە یەك کە بووبە پاساوو بۆ هەڵس و کەوتی داگیرکەریش، ئەوەتا لە ئەنجامی براکوژی دیاردەی دڕندانەکانی سەربڕین، دیل کوشتن، تاڵان، بەگۆڕنانی بەکۆمەڵ، دزی، ڕێگری، داگیرکردنی ماڵ و سامان، ئابلۆقەی ئابووری، سزای بەکۆمەڵ،.. هەمووی لێرەو لەوێ ئەنجام دراوە.

ك- هەر ئەو براکوژیە بوو گەلێ جار وای لێدەهاتلایەنەکانی شەڕی براکوژی ببنە (ستونی چەکدار بۆ هەر کارێك) وەك بینرا: شەڕی پێشمەرگەی کوردستانی ئێران و، کوردستانی تورکیا کرا، بۆ دەوڵەتی ئێران و تورکیا، شەڕی ناوەخۆی تر کرا بۆ دەوڵەتی عێراق، شەڕی ئیسلامیەکان کرا بۆ دەوڵەتی مەزنتر،.. ئەوەش هەمان پێناسی (مرتزقە)یە کە فڕنسا و ڕۆم و.. جەرمانەکانیان بەکرێ دەگرت بۆ هەرکارێکی سەربازی.

ئەگەر بتەوێ سەرەنجامی نێگەتیڤەکانی بژمێردرێ ناژمێردرێ، ئاسەوارە ترسناکەکانی بەدەیان ساڵی تریش دەمێنێ و ڕەنگە بەمانەوەی ئەو دوو حزبە ئەو ئاسەوارە هەر زیاد بکا، هەروا میللەت دوو لەت بووە لە زمان و زاراوەو ئنتما و سنوری جوگرافی و دەسەڵات[1] و... و .. ئەگینا ئەوەی ئێستا هاتۆتە دەست دەیان قات زیاتر دەبوو.

---

[1] عبداللە پەشێو لە شیعرێکی دەڵێ:

لەم نیشتمانە چارەڕەشەدا

چیتان هێشتووە دابەشی نەکەن

وەك ڕەزی خۆتان

هەر بە شەهیدان سەرمان بڵند بوو

ئەوانیشتان کرد بە پەزی خۆتان

## کێ لێی بەرپرسیارە؟ چارەسەری:

لەڕەوتی باسی براکوژی ڕوونتر دەردەکەوێ کە کێ لێی بەرپرسیارە، بەڵام ئـەوە مانـای وانیە لاکانی تریش بێتاوانن، هەتا ئەو لایەنانەی بێلایەنیشبووینە بەشێکی بەردەکـەوێ، مادام نەیانتوانیوە وەڵامی ئـەو پرسـیارەی سـەروو بدەنـەوە بـە هەڵوێسـتەوە، هـەروەك ئیمامی عەلی کاتی خۆی بەو کۆمەڵە خەڵکەی (گوایـە بێلایـەن بـوون لـە ناکۆکیەکـەی لەگەڵ معاویەدا) وتبوو: ((أولئك خذلوا الحق ولم ينصروا الباطل))، بۆیە ئـەو حـوکم دانـە گـەلێ سـەخت وئـالوزە چـونکە براکـوژی ڕیشـەی مێـژوویی و فەرهـەنگی و زەمینـەی کۆمەڵایەتی و ئایـدیۆلۆژی قـوولی هەیە،هەرچـەندە ڕای دروسـت ئەوەیـە دەڵـێن شـەڕی براکوژی یەکەم جار (سەرکردایەتی کاتی هەلیگیرساند)بەڵام (ی ن ك) درێـژەی پێدا،بـەڵام لە قۆناغی نوێدا زەقتر دەست پێشخەریەکانی براکوژی لەلایـەن (ی.ن.ك) وەدەرکـەوتووە، چونکە:

1- ئەو لایەنە خۆی بە خاوەنی شۆڕشی نوێ دەزانـێ و ڕاستیشـە، ئەگـەر (ی.ن.ك) نەبوایە شۆڕشی نوێ دروست نەدەبۆوە، پاساویشـی ئـەوەبوو بـا فرەمیلیشـیایی دروسـت نەبێ، هەڵبەتە پاساوێکی ڕەوایە،بەڵام یەکێ لە پاساوەکانی دروسـت بـوونی یـەکێتی لـە 1975ئەوە بوو کۆتایی بە تاك حزبی لە گۆرەپان بهێنرێ کەچی لە شەرەکانی برا کـوژی هەر کۆتایی هێنان بوو بە لایەنی تر و خۆ هێشتنەوە بوو بە تاقی تەنها .

2- وەك باسمان کردیەکێتی لـە دیـاردەی نێگـەتیڤ و پـۆزەتیڤ پێشـەنگ بووینـە، چالاك تر بووینـە دەستپێشـخەرییەکان لای ئـەو دەسـتی پێکـردووە، بـەڵام ئـەوەی ئـەو بۆچوونەی سەروو کـز دەکاتەوە،واتەبەرپرسـیاریەتی بـرا کوژیتـەنها لەئەسـتۆی یـەکێتی ناهێلی ئەوەیە جەنگەکانی براکوژی (پ.د.ك) لەگەڵ هەریەکە لە (حـدکا) و (کۆمەڵـە)ی ئێران، پەکەکە، پارتی دیموکراسی گەلی کوردستان،.. بەچی لێك دەدرێتەوە کـە (ی.ن.ك) لایەك نەبووە. واتە گیانێکی دیکتـاتۆری سـتالینی دەسـەڵاتخوازی تـاکڕەو لـە دەروونـی سەرکردە کلاسیکیەکانی کوردستان هەیە، هەر بۆیەش ئەو جۆرە سەرکردانە لـەناو خـودی

---

ناوێرم قەڵەمێك هەڵگرم
ڕووتان ڕەش بێ
بڵێم خوێندکار یان قوتابی
لە هەرماڵێك ئاگردانێکتان کرد بەدوو
هەموو دنیا یەك سەرکردەی لێ بەڵایە

ناوێرم کراسێك لەبەر بکەم
خۆ ڕەنگەکانیشتان بەش کرد
ژن یان ئافرەتڕووتان ڕەش بێ

ئێمە لەویش دوومان هەیە .

حزبەکانی خۆشیان پاوەنی ئەو دەسەڵاتە دەکەن، قایل نین بەدیلیان پەیدابێ.

3- لەنێو شار زیاترو بەزەقی دەرکەوت کەیەکێتی دەست پێشخەری شەڕە،زۆر بەڕاشکاوانە ئەنجامی هەلبژاردنی ڕەت کردەوە، ئینجا(وەك لەبروسکەی کاك مسعود بۆ ئەندام ولایەنگرانی دەردەکەویێ )وارێکەوتن لە دوای 4 مانگ هەلبژاردن بکرێتەوە،پارتی زیاتر سوور بوو یەکێتی بەلای دا نەدەچوو، لە هەلبژاردن ترسا بوو، بۆیەش بە ڕاشکاوانەتر (فەرەیدوون عبدالقادر)ووتی هەلبژاردن مل شکانی تێدایە، بەو شێوەیە شەڕی براکوژی لە جیاتی هەلبژاردن هاتە کایەوە .

ڤاکتەری بابەتی و دەرەکیش یارمەتی دەر بوو، لەڕووی تیۆریەوە زۆر ڕوونە ئەو ئایدیۆلۆژیە هاوردانەی چەپ و ئەزموونەکانی جەنگە ناوخۆکانی ئەنگۆلا، چاد، یەمەن، ڤیتنام و کەمبۆدیا، هەردوو باڵی (پەرچەم )و (خەڵق) لەنێو حزبی شیوعی ئەفغانستان، ..هتد بەئیجابی وزەوقەوە باس دەکرا بە تایبەتی لایەنی سەرکەوتوویان کە هەمیشە مارکسیەکان بووە .

لە واقیعیشدا پلانی (فرق تسد) کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنی کاتێ داوای لە (ئەرستو)یمامۆستای کرد ئاخۆ چی بکا و چۆن بەسەر خەڵکی ڕۆژهەلات زاڵ بێ بەتەواوی، لە وەلامدا ئەرستۆ داوای لێکرد لێکیان جیابکاتەوەو ناکۆکیان بخاتە نێوانیان و..[1]، کەواتە ئەوە پیشەی هەموو داگیرکەرێکە، بۆ

---

1: **نامەی ئەسکەندەر:** أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة، وأنه رأي لهم هيآت وخلقا، لو كان عرف حقيقتها، لما غزاهم، وأنّه إنّما ملكهم بحسن الاتفاق والبخت، وأنّه لا يأمن – إن ظعن عنهم – وثوبهم، ولا تسكن نفسه إلّا ببوارهم. **وەلامی ئەرستۆ:** « فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب، فصاروا أعداءك وأعداء عقبك بالطبع، لأنّك تكون قد وترت القوم، وكثرت الأحقاد على أرض الروم منهم وممن بعدهم، وإخراجك إياهم في عسكرك مخاطرة بنفسك وأصحابك. ولكني أشير عليك برأى هو أبلغ لك في كلّ ما تريد من القتل، وهو أن تستدعى أولاد الملوك منهم، ومن يستصلح للملك ويترشح له، فتقلّدهم البلدان، ويتوليهم الولايات، ليصير كل واحد منهم ملكا برأسه، فتتفرّق كلمتهم، ويجتمعوا على الطاعة لك، ولا يؤدّى بعضهم إلى بعض طاعة، ولا يتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم. » **سەرچاوە:** ج1 **ص23**تجارب الأمم- ابن مسكويه.

داگیرکەرانیش ڕۆڵی گرنگیان هەبوو، پەیوەندیەکی دیالیکتیکی لەنێوان پۆلاینی دەستی دوژمن لەناو خودی شۆڕش و لەگەڵ هۆیەکانی براکوژی هەبوو، هەروەك لەدوایش دەرکەوت بەشێکی زۆری بەرپرسی حزبەکانی شەڕی براکوژی مەلەفیان لەنێو بەعس هەبوو، ئەرکیان نانەوەی شەڕی براکوژی بووە بەرامبەر هەندێ پارەی ڕێسوا، بۆیە لەکات و ساتە ناسکەکان لەشاخ و شار شەڕی براکوژی هەڵدەگیرسا، لەو کاتانە کە حکومەتی بەعس دووچاری شکست دەبوو لە کوردستان شەڕ هەڵدەگیرسا. ئەو دەستەی بەعس بڵاوبوو بەزەقی[1]، بەڵامڵەنێو سەرکردایەتی کوردیش گیانی تاکرەوی و زەمینەی براکوژی تیابوو، بۆیە مام جلال بەشانازیەوە لە کۆبوونەوە فراوانەکەی مەرگە (عزیز داود)ی تقدیمی د فؤاد معسومکردو ووتی دکتۆر ئەوە بوو گوللەکانی بە ئاسمان وەنابوو گۆتبووی مام جلال تەنها شەڕی خوای* مایە پێم بکا ئەوە ئەویشم کرد!،بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو پرسیارەی سەروو با لایەك لە (یادی پێشمەرگایەتی) بڵاوکەینەوە:

"لەساڵی 1982 نزیك جەژن مانگی 7، ملازم عمر عبداللە بەرپرسی (م- ع)ی ( ی ن ك) لە سەرکردایەتی نێوزەنگ دابەزی بۆ ناوچەکانی شاربازێڕ، لە دانیشتنی دووەم ئەمنیش بەشدار بووم،ئەو کاتی کارگێڕی لقی* یەکی سولەیمانی بووم، سلاوی سەرکردایەتی پێ ڕاگەیاندین، دیاربوو بۆ چەند مەبەستێك دابەزیبوو، پیاچوونەوەی ڕێکخستنەوەی پێشمەرگایەتی و لێدانی لەشکری ئیسلامیش[2]، ئێمەش لێمان پرسی:

---

[1] بڕوانە دۆسیەی مەلەفدارەکان

*عزیز داود پێش مەرگەیەکی زور قارەمان بوو، راست و ئاین پەروەر بوو، ئەو ڕووداوەش لە وەرتی کردبووی لە بیزاری شەری براکوژی، هەڵبەتە ئەوە بەسادەی دەردەکەوی بەڵام لەناخ دا وامانا دەبەخشێ کە دەست پێشخەری شەری براکوژی لەلای یەکێتی بووە .

*ئەو کاتی یەکێتیش لە سەر سیستەمی لق دەڕۆیشت دوای سیستەمی "مەڵبەند"هاتە کایەوە.

[2] لەشکری ئیسلامی: هێزێکی چەکداری بێ ڕێکخستن و ئادیۆلۆژیا بوون، لە سەرەتای جەنگی عێراق- ئێران 1980 سەری هەڵدا بە سەرۆکایەتی عەباس شەبەك، کە بارەگای سەرەکی لەکەرەج- تاران بوو، بەڵام ئەو لەشکرە لە دروستکراوی ئێران نەبوو وەك وا باوە، ئیسلامیش نەبوون، بەڵکو سەر بە لیبیا بوو، کلاشینکۆفەکانیشیان هەر بەناوی (لیبی) ناوزەد بووە تائێستاش، بە مۆلەتی (ی.ن.ك) هاتنە کوردستان، پێکهاتبوو لە خەڵکانێکی بێبڕوا و ڕاکردووی سەربازی و پەناهەندەکانی ئێران، بەشێکی زۆریشی تیپ و کەرتی (ی.ن.ك) بوون بە (خط مائل) لەناو ئەو لەشکرە بوو، شایانی باسە بەهۆی لێدانی لەشکری ئیسلامی لەلایەن (ی.ن.ك)وە پەیوەندی کورد لەگەڵ (عقید معمر قەزافی)

لەبەرچی لێیان بدرێ؟ ووتی: بڕیاری سەرکردایەتیەیە، ووتمان: چی خراپیـانکردووە؟ ووتـی: نەخێر.. بەڵام چەکمان دەست دەکەوێ و با زیاتر میلیشیا و فرەچـەکداری لـە کوردسـتان دروست نـەبێ،هیچ پێچەوانەیەکیشـی لەگـەڵ رووحـی مارکسـیەتا نیـە .. منـیش بـیرم کەوتەوە کە لەساڵی 1981 سەرم لە (عەباس شـەبەك) سـەرۆکی لەشـکری ئیسـلامی دابوو، نامەی (مام جـەلال و سـید کریم)یشـم پێـدابوو، لێشـم پرسـی ئـاخۆ ناگەڕێنـەوە کوردستان لە وەڵامـا ووتـی: مـن لەشـکری ئیسـلامیم بـە مـام جـەلال سـپاردووە وەك ئەمانەت!. بەڵام دیارە سیاسەت (فن الممكن) لەو سەردەمە (بەڵێن و سـپاردەیی تیانیـە) بۆیە گەڵێ جار بە (اعوذ بالله من الشيطان والسياسة) ناوزەدکراوە.. بەهەرحاڵ نەخشـە و پلان و دابەشی بوتیپەکان کرا، دیاربوو لەشکری ئیسلامیش بێئاگابوو، لە سەعاتی سـفر لێیان دراو پلانەکـەی (ی.ن.ك) بـەخێرایی سـەرکەوت لـەرۆژی 1982/7/25، تـەنها بەشی سەرگەڵووبەرگەڵوو بەرگریەکیان کرد بەدۆشکە و لـە نزیـك مـن صـلاحی مهنـدس (ئامیر کەرتێکی چالاکی یەکێتی بوو) شەهید کرا، ئینجا دوایی ئـەو ناوچـەیەش گـیرا و شەڕ کۆتایی هات.

کە ئێوارە بەکۆمەڵ دانیشتین بـۆ گـوێگرتن لـە ڕادیـۆی دەنگـی یـەکێتی، زۆربـەمان سەرسام بووین لەو بەیاننامەیەی خوێندیەوەو زۆر بە هەلچـوون و سـۆزەوە ووتـی: ئیمـڕۆ هێزەکانی لەشکری بەناو ئیسلامی بـەفیتی بێگانـە بۆسـەیەکیان بـۆ پۆلێـك پێشـمەرگە لەنێوان گاپیلۆن و سەرگەڵو داناوەو صلاحی مهندسی تیا شەهید کـرا!! ڕادیۆکـە دەسـتی بەهەڕەشە کرد و ووتی تۆڵەیان لێ دەکەینەوە! (شەڕیش تەواو ببوو).

ئەوە دەمەتەقێیەکی خەستی بۆ مەجلیسەکە دروست کرد، وای لە من کرد سـەرلەنوێ لەو مێژوو و ڕووداوانەی پێشووی براکوژی هەڵچمەوە هەتا کارەساتی هەکاریش، دووبـارە لەناوچەکە گەڕام، پرسیاری ووردی هۆیەکانی شەڕی براکوژیم کرد،بـە تایبـەتی شـەرەکەی نێوانجمالی علی بابیر (یەکێتی)و شێرکۆی شیخ علی(حسك)، بـۆم دەرکـەوت ئـەوەی مـن تێیگەیشتبووم زۆربەی چەوتە و بگرە پێچەوانەشە.

چوومە سەرکردایەتی، وام زانی ئەوان ئاگادار نینە، هەموو ڕووداوەکانم بۆ (د.خدر معصوم- بەرپرسی ئەوسای م.س) گێڕایەوە، نیشانم دا کە ئەو شەڕە براکوژیانەی

---

سەرکردەی شۆڕشی لیبیا تێکچوو، کە تاکە سـەرۆکەکی عـەرەب بـوو دانـی بـە مەینـەتی کـورد نـابوو، بانکێشـەی سەربەخۆیی بۆ کوردستان دەدا.

لەخوارەوە دەكرێ زۆربەی خەتای ئێمەیەولەگەڵ ئەو زانیاریانەی لاتانە لێك جیایە..
دیاربوو ئەویش پێی ناخۆش بوو، بەلام بۆی ڕوونكردمەوە كە ئەوان وەك (م.س) و سكرتێر ئاگاداری هەموو شتێكن و هیچ شتێك نیە بێی ئەوان بكرێ. وتی: ئیتر چی بكەین فرەمیلیشیا ئەوە چارەنووسیەتی،ووتی برایانی كۆمەڵە زیاتر كرێارِی شەڕن.

ئیتر لەوساتیەوە دەزانم هەر واقعێكی شەڕی براكوژی لەگەڵ سەربردەی هەر لایەك جیایە..

لەبارەی هەڵگیرسانەوەی شەڕی برا كوژی لەدوای ڕاپەڕین دووبارە دەردەكەوێ كە (ی ن ك)بەرپرسیارە ،هەرچەندە لەودواییە كە پارتی زیاتر دەسەڵاتدار بوو دەركەوت گیانی تاك ڕەویان تیایەو پشكێك لەو بەر پرسیارەتیە هەڵدەگرن ،بەلام لەنامەكانی مام جلال (كەلەوبەڵگەنامانەی خوارەوە بخوێنەوە) دەردەكەوێ كەلەیەك كات وبەیەك پێنووس لەلایەك ڕێنمایی شەڕ دەنێری بۆ نێو یەكێتیو لەدوەمیشدا بەجۆرێكی تر كاك مسعود دڵنیا دەكاتەوە:

## 7- 2 جاشایەتی لە کوردستان

وەك بەشی پێشوو ئەو زاراوەیەش زۆر تایبەتە بە کورد و جیایە لەگەڵ (مرتزقە)، بۆیە وا لە هەندێ کتێب و نووسینی بیانیش بە (Jash)[1] دەنووسرێ، زور ناوی تری هەبووە، وەك : ساریجە،لیفی، تەیاری،حوشی، شەبانە،چەتە،حفیز*،...

لە کوردستان بەو خەڵکانە وتراوە (جاش) کە چەکی دوژمنی داگیرکەری هەڵگرتووە لەدژی شۆڕشی کوردستانی و داواڕەواکانی بەرامبەر هەندێ پارە، بێ ڕەچاوی کۆڵەگەکانی رەوشت و پیاوەتی، نامۆترینپیێشە بووە، بۆیە ئەو ناوە دەگمەنەی (جاش)ی بۆ هەڵبژێردراوە، بارێکی هەرە تایبەتی کەسانێکی دەروون نزمە لە بەیەك گەیشتنی سێ دۆخی سەلبی ئابووری، سایکۆلۆجی، سیاسی دروست دەبێ لە زاڵ بوونی:

1- بەرژەوەندی تایبەت بەسەر بەرژەوەندی گشتی.
2- دەروونێکی نەخۆشی بێ بیروباوەڕ بەسەر ڕەوشتی باڵا.
3- میکاڤیلیەتی سیاسی بەسەر سیاسەتی بنەمایی و ئەخلاقی.

بەو شێوەیە کۆمەڵگەی جاش هەردەم : بێبەڵێن، دەست پیس، تاڵانچی، بێسپاردەیی، درۆزن، دەروون شکاو نزم، ترسنۆك، مادی، بێئۆقرە و متمانە، گومانـاوی، بێشەرم، بێپەروەردە،.. لە هەموو (سەوابت) و خووڕەوشتێك دارنراوە، بۆیە هەتا لەلای دوژمنان (کە جاشەکانیان بەکرێ گرتووە) ناوی جاش قوڕس و ناشرین و بێڕێزە، کاتی خۆی بە ناپلیۆنیان ووتبوو ئەوە جاشێکی دڵسۆزمانە دۆقەیەکی لەگەڵ بکە! وتبووی: شایەنی دۆقە نیە، بڕۆن برێ پارەی پێبدەن و لایبەن..!!

لەهەمووی ترسناك تر ئەگەر بە هەڵمەتێکی فەرهەنگی و ئاینی و ئایدۆلۆژی و یاسایی و سیاسی و شۆڕشگێڕانە بەری نەگری ئەوا بەخێرایی ئەو بەهایانەی دەتەنیتەوەو دەبتە زۆرایەتی، هەروەك ئێستا دەبینین ئەو بەهایانەیە بوویتە بنچینەی پەیوەندی کۆمەڵگەی کوردستان و ترسناکترین نەخۆشیە، ڕاستە لەو دەمە داگیرکەر نەماوە، بەڵام تۆوی ڕەوشتی چێنراوی داگیرکەرە، بۆیە زۆر ئاساییە ئەو دیاردە ترسناکە بە قەبارەیەکی فراوانتر دووبارە بێتەوە لەگەڵ رەخسانی زەمینەی ناوەکی و دەرەکی.

[1] سەرنجی کتێبی ..The madern ی ماکدۆیل بدە .

*لەسەردەمی داگیرکردنی عێراق لە لایەن بریتانیا، بەو خەلکانە ووتراوە (حفیزی)کە هاموشۆی (office ئۆفیز)یبریتانیان کردووە بەپەنا دزە، وابێدەجی ئەو ناوە گۆرابی لە کوردستان بۆ (حییز) .

سەرهەڵدانی:

مێژووناسان دیاردەی (مرتزقە) یەکەم جار بۆ سەردەمی کێشە ناوخۆییەکانی ڕۆم دەگێڕنەوە، کاتێ لایەکیان هەندێ جەرمان و سلاڤیان بەکرێ دەگرت لەدژی ڕۆمەکانی تر، لە سەدەکانی ناوەڕاست دیسان فەڕەنسیە پڕۆتستانیەکان ئەڵمان و ئینگلیزیان بەکرێ گرت لەدژی فەڕەنسیە کاتۆلیکیەکان، لە هەڵمەتەکانی فەڕەنسا بۆ جیهان تیپێکی تایبەتی بیانی هەبوو ژمارەیان (22000) بووە، زۆربەیان ئەڵمانی بوون، دوای ئەوانە بوونە کرێگرتەی جیهانە هەرچی کاری جەنگی هەبوایە بەکرێ بۆیان دەکرد وەك پێشە، ئیتر دوایی لە جەنگەکانی جیهانی و جەنگی تر ئەو دیاردانە بە فراوانتر بەکارهاتووە، بەتایبەتی سوپای داگیرکەر هەردەم پێویستی بە چاوساغی نێو میللەتەکە هەبووەو هەیە، (مرتزقە) وەردەچەرخێتە جاش کاتێ ئەو کارە بکا بۆ داگیرکار، دژی میللەت و نیشتمانی خۆی، دیاردە و ناوی جاش لە کوردستان لە بنەچەدا بۆ ئەو سەرەك هۆزە خۆفرۆشانە دەگەڕێتەوە کە پێشەیان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ هاوکاریکردنی داگیرکەران بووە، سوارەی (حمیدی) لەدوای 1908 بەجاشایەتی حسابە، بەڵام لەپێش ئەو مێژووە ئەو پێناسەی (جاش) هەڵناگری هەرچەندە کارەکەشیان نێگەتیڤ بووە، دەبێ ئەو سەردەمە مێژووییانە بەوردی لێك جیابکرێتەوە، نابێ تێکەڵاَ بکرێ، بەڵام لەدوای سەدەی بیستەم (بە وردتر لەدوای 1908) مانای جاشایەتی وەرگرتووە لەگەڵ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد،لەشۆرش وڕاپەڕیتەکانی: شیخ عبدالسلام، ملاسلیم، شیخ سعید،ئیحسان پاشا،شیخ محمود،قازی محمد جاشایەتی قەتیس بوو لەسەرۆك هۆزەکان،بەڵام لەڕەوتی شۆڕشی ئەیلولی 1961 زیاتر پەرەی سەند، بەدوو هەنگاوی کاریگەر:

(1) ناکۆکی باڵی (م.س)ی (پ.د.ك) لەگەڵ مەلا مستەفا و لە ئەنجاما وەرچەرخان بەلای حکومەتی عێراق و چەکیان لەدژی شۆڕش هەڵگرت لە 1966- 1970 کە بە جەلالی ناسرابوون، (2) چەك هەڵگرتنی حزبی شیوعی عێراقی لە 1973- 1975 (تەنیا لە هەرێمی کوردستان) شان بەشانی داگیرکەر لەدژی شۆڕش، ئەو دوو هەنگاوە ئاسۆیەکی ترسناکی فکری و سیاسی و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی وەرگرت. ئەو دیوارە شەرمەی شکاند و لەنامۆییەوە وەریگێڕا بۆ ڕەسەنایەتی، بۆیە جاشایەتی لە نەفامی یەتی (عەوامیەوە) پەڕیەوە بۆ جاش قەڵەم، جاش ئایدۆلۆژیا، جاش سیاسی و.. ئەوەش

زیاتر دەتەنێتەوە کاتێك بناغەکانی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی تێك ڕووخاو بێ، بۆیە لە شۆڕشی نوێدا دیاردەی جاشایەتی گەورەترین قەبارەی وەرگرت لەمێژووی کوردستان و بگرە جیهانیش، ژمارەی جاش و خۆفرۆش 450 جار بەقەد پێشمەرگە بوو، بەشدارییەکی فراوانی تاوانەکانی بەعەرەب کردن، ڕاگوازتن، وێرانکردن، ئەنفال، کیمیایی،.. ڕۆڵێکی گرنگیشیان لە داڕووخانی ئەخلاقی کۆمەڵگەی کوردەواری هەبووە، ڕۆڵی مازدەکی، مانی.. بۆ دەسەڵاتداران بینیوە.

هۆیەکانی:

ئەگەر بەوردی سەرنجی بدەینێ دەبینین سەردەمی سەرهەڵدانی و گەشەی زۆر پەیوەستە بەبیری عەلمانی، هەرچەندە بەشی هەرەزۆری عەلمانیە شۆڕشگێڕەکانی کوردستان شاخی بووینە، بەڵام بیرو ئایدۆلۆژیان یارمەتیدەری ئەو دیاردەیە بووە، کەواتە جاشایەتی زادەی سیستەم و تەرزێکی تایبەتی کۆمەڵگەی نەفامی و مەدرەسەی فکری و سیاسیە، لەو کۆمەڵگە داڕووخاوانە شین دەبێ کە بناغە ئەخلاقی و پەروەردەیی داڕماو بێت، بەتایبەتی لە کۆمەڵگەی ستونی دوورە ئاین، کۆمەڵگەی کوردستانیش کۆمەڵگەیەکی ستونی و نەریتی عەوامی و خێڵەکی زیاتر زاڵە، بۆیە کاریگەری ئاینی ڕێگردەبێ لەو دیاردە نێگەتیڤە پەنگ خواردووەکان، هەروەك لەیاسای بنەرەتی گەردوون هاتووە: (تائاین بەرەو لاوازی بروا ئەوادیاردەی تاوانو خوفروشیوبی ویژدانی زیاد دەکات)[1] .

کەواتە ئەو دیاردەیە زادەی کۆمەڵگەو مەدرەسەی نائاینیە، بۆیە دەبینین بەرەبەرە لەگەڵ پتەوبوونی عەلمانیەت لە کوردستان ئەو دیاردەش پتەو بووە، کاتێ عەلمانی دەیەوێ جێ بە ئایین لەق بکا لە پێشەنگ و سەرکردایەتی بیخاتە ڕیزی دواوە یان خانەنشینی بکا ئەوا بەخێرایی بۆشایی مەزن پەیدا دەکا و دیاردەی جاشایەتی و سەدان دیاردەی هاوڕەگ وەك دەرد ئامادەیە سەرهەڵدا ئەگەر بوورووژێنرێ، هەربۆیەش تا سەرکردەکانی کورد ئایینی بووینە، ئەو دیاردەیە لە کەمایەتی و شەرمەزاریی قەتیس مابۆوە،. دەبینین لەگەڵ وەرچەرخانی سەرکردایەتی ئاینی لەدوای 1976 بۆ سیستەمی سەرکردایەتی عەلمانی ژمارەی جاش نزیکەی 150 هێندە زیادی کرد، ئێستا بنەماو بەهای جاشایەتیە باڵی بەسەر پەیوەندی سیاسی و حزبایەتی و بناغەکانی کۆمەڵ کێشاوە با ئەو ناوەشی

[1]بروانە —موسوعە علم الإجتماع ص506

نەبووبێ، سەرەڕای ئەو هەنگاوە چەند هۆیەکی تریش هەیە کار لە زیادبوونی دەکا بەخێرایی تۆماریان دەکەین:

1- ناکۆکی ناوەخۆیی و شەڕی براکوژی.

2- پەڕینەوەی ئەو دیاردەیە لە خەڵکێکی عەوامی دواکەوتە بۆ نێو خەڵکانێکی سیاسی و حزبی و ڕەوشەنبیر.

3- تەنینەوەی بەهاکانی عەلمانی و سیاسەتی میکاڤیلی و بازاڕی ئازاد و بیری سەرمایەداری و ڕەوایی بەرژەوەندی تایبەتی.

4- تێك ڕووخانی بناغە ئەخلاقییەکانی ڕێگر لە دیاردەی نێگەتیڤ (لەوانەش جاشایەتی) لەو بناغانەی کە ڕێگر بوون: ڕاستگۆیی، دەست و دەم و داوێنپاکی، بەڵێن، سپاردەیی، متمانەیی، مەزەندەی چاك، دڵسۆزی بۆ گەل و نیشتمان، کوردایەتیەکی پاك، ئاین پەروەری، ڕێز و پیاوەتی، بەئەمەکی، خۆشەویستی نیشتمان، بەرژەوەندی گشت خوازی. کۆمەڵگەیەك خاوەنی ئەو بنەمایە ئەخلاقیانە بێ جاشایەتی لەنێو شین نابێ.

5- قازانج بۆ جاش و زیانیش بۆ دڵسۆزان، لە هەردوو باری دەسەڵاتی کوردی و دەسەڵاتی داگیرکەر.

6- گوتاری سیاسی سەرکردەو نادادگەری و پەیڕەوی حزبایەتی تەسك و خۆویستی و.. کاریگەری هاندانێکی قووڵی دەروونیە بۆ فەزای نێگەتیڤ.

7- دروست بوونی جۆرێك لە ڕای گشتی لە کوردستان سەبارەت بە چەند ڕاستیەك کە لەدوای ئەزموونێکی زۆر لای خەڵك وا دروست بووە گوایە (هەمووی بۆ گیرفانیەتی)، (هەرکەسی بۆ خۆیتی)، (هەر هەژار تێچوونە)، (ڕاستی نەماوە)، (پارە بوویتە هەموو شتێك).. ئەوانە بەسادەیی دەردەکەونبەڵام بنەمای گەلێ ترسناکن.

لەدوایڕاپەرینی 1991ئەودیاردەیەقەلاچۆ نەکرابەهۆی وەرگرتنیان بێهیچ فلتەرێکی ئەخلاقی لەهەمووان ترسناك تر ئەوەبوو (ی ن ك)لاسای رۆم وفرنسی وداگیرکەرانی کردەوە لەگەڵ یەکەم گۆبەندی شەری براکوژی لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی جاشەکانی برادۆست و هەرکی و سورچی بەکارهێنا وەك گەلە جاش، ئەوەش ئەودیاردەیەی رەسەن وجوان کردەوەولەنامۆییەکی دەگمەن (دەخیل)کردیە ئاسایی و خۆمالی .

کۆمەڵگەی ئێمە هەموو ئەو خاڵە نێگەتیڤانەی تیایە، بۆیە مەترسی دووبارەبوونەوەی هەیە لەگەڵ هاتنی بارودۆخەکانی دژواری و تەنگی، ئینجا مەرج نیە هەر ئەو دیاردەیە

هەر بوونی ئەو زەمینە نێگەتیڤە لەنێو کۆمەڵگەی کوردستانی ئامادەیە بۆ سەرکێش هەموو دیاردەیەکی نێگەتیڤی وەك گەندەڵی و پەرتەوازەیی و دەروون تەنگی و بێئۆقرەیی و بێبەرگەیی و زۆربەی بنەماکانی تری ئەخلاقی، هەروەها دەبتە هۆی قایل بوونبە هەموو جۆرە د یاردە و دەسەڵات و دیفاکتۆیەکی نەویستراو .

## 7- 3 دەردی لاسایی و پاشکۆیی

ئەوەی ئێستا سەرنجێکی بەدیقەت بداتە حزبە کوردستانیەکان بە ناوو ناوەڕۆك و هەڵس و کەوت و ناوی ڕۆژنامەو جۆری ئایدیۆلۆجیا و هەتا جۆری گوتاری سیاسی.. دەبینی لاساییکردنەوەیەکی پەتی بیانیە، بێ داهێنان،ئەو سەردەمی حزبەکوردستانیەکان بەئایدیۆلۆژیای ڕۆژهەلاتی سەرسام بوون تەنانەت ناوو دروشم وبلاوکراوەورۆژنامەکانیشیان کت ومت لەوان وەرگرتبوو: لەکوردستان حزبی سوشیالیستی یەکگرتوو هەبوو لاسایی حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی ئەلمانیای 1919 بە سەرۆکایەتی روزا لوکسمبورگ ،دوای حزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی فرنسی 1961دروست بووە، حزبی زەحمەتکیش وکریکاران ورەنجدەرانمان...هەبوو ئەوەتا ناوەئەسلیەکانیان:،حزبی زەحمەتکیشانی ئەلبانی،کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی لاوس،پاسۆکمان هەبوو ناوەکەی لەحزبی سۆشیالیستو پاسۆك لە یۆنان وەرگیراوە، پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان هەبوو ئەوەتا ناوو ناوەڕۆکی لە پارتی کاری سەربەخۆی کۆریاوەرگیراوە بە سەرۆکایەتی کیم ئیل سونگ، لە کوردستان ڕەوتی کۆمەنیست هەبوو ئەوەش لە ڕەوتی کۆمەنیستی ئیتالیاوەرگیراوە،پارتی گەل ودوای پارتی گەلی دیموکراسیمان هەبوو ئەوە لە پارتی گەلی ئەفغانستان وەرگیراوە کە لە 1946 دامەزراوەلە سالی 1920 (حزب الشعب السوری)یش هەبوە، پارتی گەلی تورکیاش هەبوولە سالی 1962 دروست بوو ،پارتی کریکارانی کوردستان (پ ك ك) لە جیهانی شیوعی زۆر بلاوە پارتی کریکارانی بلجیکی 1885 دروست بوە،پارتی کریکارانی مەجەری لە1918 دروست بووە،پارتی کریکارانی ڤیتنامی پارتی کریکارانی ئەلبانی،پارتی کریکارانی ئەلبانی،پارتی کریکاران لە بریتانیا لە1923 دروست بوە بەلام ئەوەی کوردستان لاسایی ئەو نیە ،کەچی هەموو پارتە کریارەکانی تر لە ناو چوون تەنها ئەوەی بریتانیا ماوە...،رۆژنامەکانی کوردستانسودیان لەو ناوانە وەرگرتوە:ڕیا تازە —ئەرمینیا،ڕێگای گەل —کۆریا،تورکیای نوێ،برایەتی-هندستان،خەبات-فلستین،ئالای ئازادی-لبنان،اتحاد-زبیان..با کەمێك

هەلوەستەلە ڕۆژنامەی (یەکسانی)دەست پێ بکەین کە لەلایەن کۆمەڵە ئافرەتێکی عەلمانی چەپی لە کوردستان لە ساڵانی دوای ڕاپەڕین دەردەچوو.. ئەوە کت و مت بەناو و ناوەڕۆك و مەبەستەوە، لاسایی‌کردنەوەی ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانی بوو بەناوی (گلایخایت- واتە یەکسانی) لەسالی1891ز دەردەچوو، واتە پێش 104 ساڵ لەمەوپێش، ئەویش کۆمەڵێك ئافرەت بەڕێوەیان دەبرد، ئەو ئەزموونەی گلایخایت 25 ساڵی خایاند و شکستی هێنا، جا سەرنج بدە ئێمەی کورد هاتووین لاسایی ئەزموونێکی شکست خواردووی پێش 104 ساڵ لەمەوبەری ئەوروپی دەکەینەوە، ئەوددەردە تایبەت نیە بە چین وتوێژو لایەنێك بەڵکو زۆربەمانی گرتۆتەوە هەتا موفەکیرە گەورەکانیشمان، مام جلال کە گەورەترین مونەزیری ئەو سەردەمەیە لە بەراوردی نێوان ئیسلام وسۆشیالیستی ڕای وایە کە سۆشیالیست بەهەشتی پێیە بۆ ئەو دنیایە ، هەرچی ئیسلامە دەڵێ خۆ ڕاگرن بەهەشتان لە دواڕۆژ پێ دەدەم [1]،ئەوە دەقی ڕای ئەنجلسە لەبارەی مسیحی دەڵێ : (أن الفارق بين الحركتين يتمثل في أن المسيحيين الأوائل قد نقلوا الخلاص إلي الآخرة بينما تتصوره الاشتراكية في هذا العالم الدنيوي)[2]، ئەوەش لە بنەچەدا دروشمی شۆڕشی ئاینی تۆماس مونزیر بۆ رزگاری جوتیاران لە 1513 کەبریتی بوولە: وامەزانن تەنها ئاسودەیی بۆ رۆژی دواییە بەڵکو ئاینەکەمان ئەو بەهەشتە بۆ دنیا دەهێنێ[3]،هەمان بەراورد موفەکیری گەورەی کورد عبدالله ئۆجەلان دەیکا دەڵێ: پێغەمبەرو ئیمام علی لە ئێمە سۆشیالیزم تر بووینە ئەوە دەقی وەسفی مارکس وئەنجلس لە مانیفیستی شیوعی دەڵێن سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەکاتی خۆی سەرکەوتن بوو بۆ مێژووش[4]، د جورج حناش کەدەڵێ پێغەمبەرەکان سۆشیالیستی بووینە پێش ئەوەی سۆشیالیستی بێتە

---

[1] بڕوانە :دەقی ووتارەکەی مام جلال بە بۆنەی یەکگرتنەوەی ئالای شۆرش و(ی ن ك).

[2]مایکل لوفي - **الماركسية والدين** ترجمة : بشير السباعي ص3

[3]روجيه غارودی- ماركسية قرن عشرين ص150

4 ماركس— انجلس بيان الشيوعی ص64

کایەوە[1].. لەوەوە زیاتر ئەو دەردە شۆڕ بوویتەوە بۆ خوارەوە،کتیبی سەگوەڕی محمد موکری کە لەسالی 1982 دەرچوو شۆڕشی کوردی بە (سەگوەڕ)شوبهانبوو .. لە بنەچەدا ئەوە کت ومت لە (بروتوكولات حكماء الصهيون) شۆرش بە سەگوەڕ واهاتوە:(ان الثورة ليس أكثر من نباح كلب على فيل، ففي الحكومة المنظمة تنظيماً حسناً من وجهة النظر الاجتماعية لا من وجهة النظر إلى بوليسها، ينبح الكلب على الفيلمن غير أن يحقق قدرته. وليس على الفيل الا ان يظهر قدرته بمثل واحد متقن حتى تكف الكلاب عن النباح، وتشرع في البصبصةبأذنابها عندما ترى الفيل)[2]،هەموو ئەوانە بریتیە لە تەقەلای تاقی (تاقیکراوەی شکست) بکەینەوە،لایەنی عەلمانی کورد لەسەرەتادا بناغەیەکی چەوتی بۆ کوردایەتی وێنە کرد، کورد گیرۆدەی دەستی عەلمانی وئیتحادولتەرەقی وکەمالی بون، کەچی ئەوان سەرسام بوون بەمەدرەسەکانی ئەوان، ئەوەتە سەرچاوەی هەموو حزبە کوردستانیەکانی(عەلمانی) بۆ (پ د ك)دەگەڕێتەوە، ئەویش بۆ (هیوا)، هیواش بۆ(حزبی دارکەر) بە سەرۆکایەتی رفیق حلمی، با بزانین ناسنامەی ئەو حزبە لە کێ ساغ دەبتەوە؟ دارکەر کت ومت کۆپی (کاربۆناری ئیتالیایە)[3] کە(تورکیای لاو) لەچاوکرایەوە،دوایش (ئیتحادولتەرەقی) دژ بەکوردی لەتورکیا هێنا ئارایەوە، چ لەوە چەوت تر هەلسیت موعجیب بیت بە دوژمنت ولاسایی داگیرکەرت بکەیتەوە،چ لاساییەك ئەزمونی شکست خواردووی نێوان1807-1830.

دیسان سەرنج بدە بەو ماوە کورتە، زۆربەی حزبە کوردستانیان لەڕووی ئایدیۆلۆجیا چەندین ئەوبەرو ئەوبەریان کردووە لە لاسایی کردنەوە، تاڕادەی پێچەوانە، بۆ زیاتر بڕوانە

[1] د جورج حنا- قصة الإنسان ص65

[2]بروتوكولات حكماء صهيون - بروتوكولرقم:19

[3]کاربوناری لە سالی 1807 لە ناپۆلی ئیتالیا بە مەبەستی یەکخستنەوەی هەموو ئیتالیا لەسەر بنەمای نەتەوایەتی ودامەزراندنی حکومەتیکی دەستوری دروست کراوە ،ماناشی دارکەرە(یان ڕەژووکەری)،دوای لە 1830 شکستی هیناو (ماتزینی)ئیتالیای لاوی لە 1831 لەجێی کاربۆناری دروست کرد.

ئەو لیستەی بەراورد کە بەنمونە لە 1986 هەتا 2007تۆمارمـان کـردووە، بـەووردی دەری دەخا کە ئێمەی کورد بەرهەمی فکری خۆمان نیە، بەدوای پێخوستی خەڵکی تـرین لەدوورەوە، بۆیە گەلێ جار دەگەینە کۆلـەڕێ، گـەلێ جـاریش کارەسـات، جـاریش وایـە ئەوەندەی ڕۆیشتووینە دەگەڕێینەوەو لەعنەت لەو ڕابوردووەمان دەکەین.

هەڵبەتە ئەو دۆخە ئاسایی نیە بەدەگمەن لەنێو گەلانی جیهانی تـر نمونـەی وا هـەبێ، ئەو دۆخە لە (فەرهەنگی دەروونی سیاسی) پێی دەوترێ (تقزم الثقـافي) کە لـە کۆمـەڵێك (تقزمی) تر دێت (تقزم العلمی)، (تقزم الفکری)، (تقزم السیاسی)، (تقزم الحضـاري). بەرە بەرە دەگاتە بارە هەرە کاریگەریەکەی ئەوەنـدە پتـەو دەبـێ دەبتـە (صـدمة الثقافیـة) و (انصهار الثقافي) لەکۆتاییدا دەردی (تقزم الثقافي) لێ بەرهەم دێت، ئەوەش کۆمەڵێك هـۆ و پاساوی خۆی هەیە، گرنگترینیان ئەوەیە لەدوای مەینـەتی کـورد لـە 1908 بـەدواوە شکسـت لـە کرۆمۆسـۆمەکانی تـاکی کـورد گیربووە،کـەمتر متمانـەی بـەخۆی مـاوە، کاریگەری سیاسی و دەروونی و فەرهەنگی قووڵی بەجێ هێشتووە، بۆیە لای کۆمەڵگـەی کورد وادەرکەوتووە هەرچی لەدەرەوەی کورد بێت مـەزن و گـرنگ و پتـەو بەچارەنووسـە، هەرچی لای خودی کوردیشـبێت بچـووك و دەڤـەری و لـەرزۆك و بێچارەنووسـە، تـا وای لێهاتووە شـەرمی پێبێـت، بۆیـە دەبیـنین ئینتمـای نیشـتمانی و نەتـەوەیی و ئـاینی و فەرهەنگی لاواز بووە، بەخێرایی دەگۆڕێن، بەخێرایی جلوبەرگ و دیمەنی خۆیـان دەگـۆڕن، زمان و نەریتیان دەگۆڕن، نەتەوەیان گۆڕی، هەتا ئاینیش دەگۆڕن.

ئەوەیە (تقزم الثقافي)، هەربۆیە دەبینین هەتا ئەو ساتەش هیچ تەیار و مەدرەسـەیەکی عەلمانی نادۆزیەوە لەسەر ڕێبازی زانا و ناودارێکی کوردستانی بێ، بۆیە باسی کـەلتوور و نەریتی کوردستان بەنێگەتیڤی دەکرێ، خۆ لە فکر و فەلسەفە و تیۆری سیاسی بەتایبەتی لە مارکسیەت، مام جەلال گەلێ زیرەك و داهێنەر و بلیمەتێکە بەدەگمەن لـە رۆژهـەلاتی ناوەڕاست و وڵاتانی عەرەب بە ئەندازەی ئەو بیریارە شارەزا هەبێ، کەچی تەیارە عەلمانیە کوردستانیەکان بەهۆی دەردی (تقزم) هەریەکە لە هۆشی مین، ئۆگسـتینیتۆ، ترۆتسـکی، ماو.. هەتا (ڕەوتی کۆمەنیست-کوردستانی باشـور) بـەو دواییـە کەسـی وایـان دەسـت نەکەوت (منصوری حکمەت)یان کردە پێشەوا، چـونکە کـورد نـەبوو (فـارس) بـوو، خـۆ (عبداللە ئۆجەلان) مارکسیەتی واقعی و شۆڕشگێڕتریش بوو بەڵام کورد بوو پێـی تێرئـاو نەبوون.

ئـــەو دەردە ئەوەنـــدە كوشـــندە و خەســـتە تارادەیـــەك بەشـــێكی ئیسلامیەكانیشـــی گرتۆتەوە،زۆربـــەیان لـــە گفتوگـــۆ پالپشـــت دەكەنـــە ســـەر زانایـــەكی غەیرەكورد،هـــەروەها ڕەچەلەكی بزوتنەوە ئیسلامیەكانی كوردستان دەدەنـــە پـــالّ ئیخـــوان یـــان فكـــری بیانیـــەك كەچی دەتوانین بلّێین ئیسلامی سیاسی (بەزاراوەی باوی ئیستا)یەكەم جار لە كوردستان لە سەر دەستی نەوڕەسی سەری هەلّدا، كە لەخانەی خۆی باسیان دەكەین..

كۆمەلگەی كورد ڕاســتەوخۆ لــەو دەردە بەرپرســیار نیــە، بــەلّكو مونــەزیرەكانن، بــا بڕوانین، ئێمە باسی بلیمەتی و پێشەنگی (ی.ن.ك) كرد و زۆربەی حزبە كوردستانیەكانیش لاســـایی كـــەرەوەی سیاســـی و فكـــری و فەلســـەفی و ئیـــداری .. ئـــەوان بەچـــاك و خراپیەوە،كەچی ئەگەر زیاتر لێی وردبینەوە دەبینین ئەو لەپێش دا لــەو دەردە ئــالاّوە، بــا سەرنج بدەینە ناوی (یەكێتی نیشتمانی كوردســتان) و پێكهاتــەو ئــەو تیــۆرەی لەســەری دەڕۆیشت و وا لەسەری دەڕوا، وەك ئەزموونێكی نوێیــە لــە كوردســتان، كەچــی دەبیــنین ئەوەش كت و مت لاسایی كردنەوەی ناوو ناوەڕۆك و ئــەزموونی هەنــدێ حزبــی جیهانــە، لەوانە:

1- ئەزمون وناوی (یەكێتی نیشتمانی سودانی(سانو) كە لە 1958 دروست ببو بە سەرۆكایەتی جوزیفئودوهو ،دروشمی دیموكراسی بۆ سودان وفیدرالی بۆ خواروو بوو .

2-ئەزموونی(یەكێتی نیشتمانی ئەنگۆلی)كە لــە ســالی 1966 دروســت بــووە بــە سەرۆكایەتی سافیمبی(لە دایك بووی 1934).

**3-- ئەزموونی یەكێتی نیشتمانی زیمبابۆی(زانۆ)كە لە (زابۆ) جیا بۆوە لە سالی 1961،لە سەرەتا ڕێبازێكی ماركسی ماویانەی هەبوو.**

4-- ئەزموونیيەكێتی نیشتمانی كینی لە ســالّی 1960 دروســت بــوو لــە 3 بــالّ (بزوتنەوەی سەربەخۆی كینیا، كۆمەلّەی هەلّبژاردە، هێلّی گشــتی ئــەفریقیا) ئــەی ئــەوە كتومت و ناو و ناوەڕۆكی یەكێتی نیەكە پێكهــاتبوو لــە ســێ بــالّ (بزوتنــەوە، كۆمەلّــە، خەتی گشتی).

5- ئەزموونی (اتحاد الوطنیعێراقــی- یــەكێتی نیشــتمانی عێراقــی)بەســەروكایەتی عبــدالفتاح ابــراهیم لـــە ســـالی 1946 وەك ڕەوتیكـــی ماركســـی لـــەژێر پـــەردەی یەكێتیهێزەنیشتمانیەكانی نەتەوەگەری وبەعسی وشیوعی .

بڵاوكراوەكـانی یـەكێتیش هەمدیسانلاسـایی بوو،(شـرارە) یەكـەم بڵاوكـراوەی بـوو ئەوالاسایی ئەو شەرارەیە بووەكە(لینین)دەری دەكرد لە سالی 1900بەناوی (ئایسـكرا)، هەروەهارێكخراوێكی ئەرمـەنی بـەناوی (یـەكێتی قوتابیـانی سوشیالیسـتی دیموكراسـی هەشناقی)لە سالی 1911دەری دەكردبەناوی (غایدز-  واتە- شرارة) .

جا دەردێكی تری تەقەزوم ئەوەیە كە حزبە كوردستانیەكانی بەشی عەلمانی كردوویانـە ئەوەیە لەنێو ئەو ئایدیۆلۆجی و تیۆری سیاسی و فەرهەنگی و ئەزموونەكان زیـاتر لایەنـە نێگەتیڤـەكانیان هـاوردووە، نـەك پـۆزەتیڤ[1]، سـەرنج بـدە لـە ئـەزموونی بزوتنـەوەی شیوعیەت، ئۆرۆشیوعیچـاكتر بـوو لـە سـتالینیە شـیوعیەكان، كەچـی ماركسـیەكانی كوردستان ستالینیانە بوون، ووردتر بچینە ناو توێژێكی هەرە بابـەتی تـر، ئـەو تـەیارەی پێیان دەووتنوجودیەكان، لەنێو وجودی جیهانی تەیاری سارتەری زیـاتر بـێبڕوا و تونـد و ڕەشبینە، تەیاری (كیركیجاردی) زیاتر بەلای میانڕەویە.. كەچی وجودیـەكانی كوردسـتان سارتەری بوون نەك میانڕەوەكە.

بە هەمان شێوە وا ئێستاش كە ڕوویان وەرگەڕاوە بە 180 پلە ئـەوەی 30 سـاڵ زۆر بەخەستی لەدژی بوون ئەمجارە بووەوە سەرمەشقیان و دیسان لەو سەرمەشقیە نوێیەش لای سەلبیەكانیان وەرگرتووە، خۆ ئەو عەلمانیەتەیڕۆژئاوا یەك شت نیە، هەر ئـەو عەلمانیەتـە سیستەمیئیمپریالیزم وهەردوو جـەنگی جیهـانی و تـۆرانی ونـازی وفاشـی* و شـۆڤینی وبەعسیەتی هێناوەتە بەرهەم..، سەرەرای دەردی لیبرالیەتی كۆمەڵایەتی، بـازاڕی ئـازاد، چینایەتی و ڕەگەزپەرستی، دوورە ئاینی و ئەخلاقی ..وەك لایـەنی سـەلبیەكەی، لایـەنی ئیجابیەكەیڕۆژئاواشبریتیە لە دیموكراسـی وپرۆسـەی سیاسـی، مەدەنیـەتی، دەسـتگۆڕی دەسەڵاتی، تەكنەلۆجیاكەی، ئازادی ڕادەربڕینی، سەروەری یاسـا، خۆشەویسـتی وولات.. جا با وردبینەوە دەبینین عەلمانیەتی كورد هاتووە لە دیموكراسـی و ئـازادی و دەسـتگۆڕی

---

[1]ئەگەر لایەنە عەلمانیەكان تووشی ئەو دەردە خەستە بووینە، ئەوا لایەنەئیسلامیەكانیش توشی لاسایی خەتی ئیسلامی عەرەبی بووینەوە،بەڵام لاسایی لایەنە سەلبیەكانیان ناكەنەوە وەك عەلمانی كوردلاسایی لایەنی سەلبی عەلمانی عـەرەب دەكاتەوە.

*ئەو عەلمانیەی ئیستا لە جیهان پەیرەو دەكری ئەندازیارەكەی (مۆسـۆلینی سـەرۆكی بزوتنـەوەی فاشـیە ) لـە سـالی 1929 جاڕی دا كە ڕێكەوتنی لەگەڵ پاپا كـردووە بـۆ دابەشـی دەسـەڵاتی ئـاینی ودونیـایی بـەو شـیوەیە .:مـرۆڤ لەبوونیەوە تامردن بۆ مۆسۆلینی بیت لە دوای مردنیش بۆ پاپا بیت هەتا قیامەت!! بڕوانە (مەوسوعەی جودی-دانەر).

دەسەڵات و زانسـت و تەکنـەلۆجیا ڕاسـتەقینەکە لای داوە یـان تـەنها نـاوی وەرگرتـوە، یەخەگیری باقی سەلبیاتەکانی تر بووە هێناویەتی بەسەر کوردیدا پەیڕەو دەکا.

ئەگەر چی ئەزمونی حزبە ئیسلامیەکان سـاوایە کەچـی ئـەوانیش لـە دەردی لاسـایی دەرنەچون،لاسایی ئەوان لە ئەزمونی عەرەبی ،لە کوردسـتان حزبـی ئیسـلامی بـە نـاوی نەهزەو (جماعە-کۆمەل) وبزوتنەوە ئەوناوانەش لە نەهزەی تونس وتاجیکسـتان وەرگـیراوە ،ئەوانەش لە حزبی نەهزەی ئیسلامیان وەرگرتوە کە لە 1920 لە شۆرشی بیست چالاك بوو،کۆمەل لە کۆمەلی پاکستان وبزوتنەوە لە بزوتنەوەی ئیسـلامی فلسـتین و...لاسـایی کردنەوەکە تا ڕادەی کەسێتیش بوە .

بەوشێوەیەش وا ئێستا بەبێبەرنامە چووینە نێو عەولەمە وەك ئافرەتێکی نەشـارەزای دەشـتەکی لـەناکاو وبـەبێکۆنترۆل بکەویـە شـارێکی وەك ئەنکـەرە، هەموومیللـەتان بەبەرنامەیەکەوە چوونە نێـو عەولەمـە کەنەبێتـە دەرد بۆیـان، چـونکە عەولەمـە چـاك وخراپت پێکەوە بۆ ڕاپێچی ناو ماڵ ومیللەتەکەت دەکا، مەرج نیـە نـەریت وفەرهـەنگی وولاّتانی تکنۆلۆژیدار هەمووی ئیجابی بێت، زۆر لایـەنی سـەلبی وای لەگەڵـە بـە پێـی یاسایی وئاینی پێیان پاك نەکرایتەوە وەك فایرۆس دێت، پێویستە دەسەڵاتی کوردی ووریا بێت لایەنەچاکەکان وەرگرێ نەك خراپە .

لە ڕۆژئاوای ئێستا ئەو لایەنە چەندە جوانە پەیڕەوی کەلتوری ئیسـلام بـە فـەرمودەی (الناس سواسية كأسنان المشط) دەکەن و دەبینی بەرپرسان و سـەرۆك و خـەڵکێکی سـادە یەکسانن بەرامبەر یاسا، بەڵام عەلمانیەکانی جیهانی عەرەبی و کوردی پەیڕەوی کـەلتوری ئەوروپا دەکەن بەپێی فەرموودەی ئەرسـتۆ کـە دەڵـێ (النـاس ليسـوا متسـاوون كأسـنان المشط)، دەبینین بەرپرس و سەرۆك و خزمەکانیان ڤیتۆیان هەیە، لەسەرووی یاسان، حـزب و دەسەڵات وەك موڵك بۆیان بـەمیراتیش دەمێنێتـەوە، پێکهاتـەی جەسـتەی بەرپرسـان لەزێرەو ئی هاووڵاتیش لە تەنەکەیە، پلەیان جیاوازە وەك ڕۆمـی کۆنـو براهمـا وشـادرای هندین، خۆ ئەگەر عەلمانیەتی ئێرە باوەڕی بە کەلتووری ئاینی نیە لەو فەرمودەی سەروو، دەبا پەیڕەوی ڕۆژئاوا بکەنەوە لەو لایەنە پۆزەتیڤـە، نایکـەن و ئـەو جیاوازیـە زۆرەی لێ پەیدا بووە، وەك لەو خشتە بەراوردەی خوارەوە دەردەکەوێ.

| بەرپرس و سەرۆك لێرە | بەرپرس و سەرۆكی ڕۆژئاواو وولاٌتانی یاسا سەروەر |
|---|---|
| 1- لە سەرووی یاسا و لێپێچانەوەو ڕای گشتیە. | 1- پابەندە بە یاساو موئەسەسات ورِای میللەت. |
| 2- دیكتاتۆرەو شایەنی ڕەخنەو بەخۆداچوونەوەو هەڵسەنگاندن نیە. | 2- ئازادانە ڕەخنەی لێ دەگیرێ،دادگایی دەكرێ، لادەدرێ، كارەكانی هەڵدەسەنگێنرێ. |
| 3- ژیانێكی فیرعەونانەو لە كۆشك و تەلار و دەسەڵاتێكی رەهای سیاسی و مالی و دەستوری هەیە | ژیانێكی سادەو دەسەڵاتەكانی بەپێی دەستورەو تەنها موچەی خۆی لەدەستە. |
| 4- حزب و دەسەڵات مولٌكی خۆیەتی. | 4- دەستگۆڕی دەسەڵات هەیە. |
| 5- خەڵك و نیشتمان و پیرۆزیەكان و ئاسایشی نەتەوەیی لە خزمەتی سەرۆكن. | 5- سەرۆك خزمەتكارە. |
| 6- بەرژەوەندی تایبەتی سەرۆك لە سەرووی هەموو بەرژەوەندییەكە. | 6- بەرژەوەندی وولاٌت لە سەرەووی هەموانە. |

هەڵبەتە ئەو دۆخە لەنێو ڕۆژهەڵات و هەموو جیهانی ئیسلامی نیە، هەتا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش، ئەوەتا هەر لە نزیك خۆمان، بینیمان (أ. خمینی) چ جۆرە ژیانێكی سادەی لەو خانووە كۆنە سادەیەی بردە سەر تا مردن، بێ مولٌك و سامان، ئەوا لە ماوەی (26) ساڵ پێنج سەرۆك كۆمار بگۆڕن بە هەڵبژاردن، ئەو دەردە زیاتر لەنێو دەسەڵاتدارانی عەرەب هەیە، دەسەڵاتدارانی كوردیشتی گرتۆتەوە.

## ڕیشەی هەندێ دیاردەی دزیوی ئیستا

زۆر بەکورتی تەنها ناسـنامەیەکی ڕەچـەڵەکی بـۆ ئـەو دیاردانـە دەدۆزینـەوە تـا لـە ئەستۆی لای تر نەشـەتی،دیاردەکان:گەندەلی، تیرۆرتونـدی، نادیموکراسـی،، نامەدەنیـەت وعەوام کردن یان چەواشە..

## گەندەڵی :

گەورەترین دەردی سەردەمە، لەکۆمەلێك هۆکـاری ئـالۆز دێـت، لەبناغـەڕا لـەوەدێت کەکۆمەڵە خەڵکێك پێکەوە لەموئەسەسەیەك ئـیش دەکـەن ئەوانـەی سـەروو لـەژێرناوی جیاجیا بەشی ئەوانی ترو میللەتیش دەخۆن، یان بـە واتایـەکی تـر خـراپ بـەکارهێنانی دەسەلآت و یاسالە پێناو بەرژەوەندی خۆت سـەر دەکێشـی بـۆ گەنـدەلی، ئـەو دیاردەیـە لەکوردستان ولەهەموو جیهـان کـەم شـتێك هـەر دەبـێ، مـادام دەروونـی مـرۆڤ حـەزی بەتەمەلوك و زۆر کۆکردنەوە هەیە، هەرکاتێ ئەو دەروونە زاڵ بوو وبواریشی بـۆ بڕەخسـێ هەلمەتی بۆ دەبـا، بـەلأم لەبنەچـەدا کـاری بنچـینەیی دەولـەت ئەوەیـە سـەروو سـامان ومولکیەتی گشتی بپارێزێ لەدەستئەو هەلمەتانەی مولکیەتی تایبەتی، چونکە مولکیـەو بەرژەوەندی گشتی لەژێر هەڕەشەی ئەو هەلمەتانەن، ئیتر دەولەت وحکومەت کاری ئەوەیە بەرژەوەندی گشتی و سامانی گشتی بپارێزێ، دەسەلآت کاتێ دەبێتە گەندەڵ ئەگەر ببێتە بەشێك لەو هەرشەیە، نەرم ترین زاراوە بۆ حکومەت وا ووشەی "حکومەتی چینایەتی"یە

.

مێـژووی ئەوگەندەڵیـە بـەو تەوژمـەی نوێیـە، ئـەوەش بەشـێکە لـەدیاردەکانی وەك جاشـایەتی و براکـوژی و توندووتیـژی ..بەشـێکە لـەو داڕزانـەی ژێرخـانی ئـەخلاقی کوردەواری، رەنگە لەمێژووی کۆنی دەسەلآتی سیاسی کوردستان نمونەی وانەبوبێ، ئەوەش زۆر پەیوەندیدارە بەو سەرکردایەتیە علمانیە نوێیەی بزوتنـەوەی کـورد، جارجـار جۆرێـك لەگەندەلی باس کراوە لەشۆڕشی ئەیلول لەلایەن دۆستانیش ( هەروەك کەمیك لـەو باسـە لەلایەن هەژارموکرایانی کراوەو لە ووتارەکانی بـارزانیش گلـەیی وپـێش بینـی وا کـراوە سەبارەت بە بەرپرسان ) ... بەلأم بەو قەبارەیە دیاردەیەکی نوێیە .

ئەگەربەوردی پەنجە لەسەر سەرەتاو ڕیشەی ئەودیاردەیە دابنـێین رێـك دێتـەوە لەگـەڵ مەنتوقی ئەو رێسایەی کە : زۆربەی ئەو دیاردانە بەچاك و بەخراپییەوە سەرەتاکەی بۆ (ی،

ن، ك)ی‌ویستیڤالیای کوردستان*ده‌گه‌ڕێته‌وه‌، بۆیه‌ ده‌بێ سه‌ره‌تا و ڕه‌گه‌کانی له‌وێ بدۆزینه‌وه‌، هه‌ڵبه‌ته‌ له‌سه‌ره‌تای شۆڕشی نوێ که‌به‌ئایدۆلۆژیایه‌کی مارکسی مه‌بده‌ئی که‌وتنه‌ کار زۆر دووربوون له‌و جۆره‌ دیاردانه‌... تاسه‌ره‌تای هه‌شتاکان، ئینجادوودیارده‌ که‌وته‌ نێو شۆڕش، یه‌که‌میان به‌ره‌ به‌ره‌ بناغه‌ی فیکری مارکسی که‌وته‌ داڕزان و ناچار کۆمه‌ڵه‌ی ره‌نجده‌ران بۆ پارێزگاری له‌و ده‌سه‌لاَته‌ی له‌نێو یه‌کێتی په‌یدای کردبوو جۆرێك له‌ئیمتیازو لێ بووردنی سزاودیسپلینی به‌ئه‌ندام ولایه‌نگرانی به‌خشی به‌تایبه‌تی عه‌شایره‌کان، ئه‌وه‌ له‌لایه‌ك له‌لایه‌کی تر دانانی باره‌گاو ماڵ و حاڵ بۆبه‌رپرسان و پێنه‌دانی نه‌سریه‌ (بودجه‌) بوو وای کرد بنه‌مای (خۆتان بژیه‌نن )په‌یڕه‌و بکرێ، ئیتر له‌پاڵ ئه‌وه‌ بواردرا ده‌ست که‌وت و چه‌کی زیاده‌ بفرۆشن** و سه‌ره‌تای گه‌نده‌ڵی ده‌ست پێ بکا، به‌تایبه‌تی له‌جه‌نگه‌گه‌وره‌کانی وه‌ك شه‌ڕی پشت ئاشان ودوایش بێتواته‌، به‌لاَم ئه‌وه‌ی زۆر ئه‌ودیارده‌یه‌ی زه‌ق کرده‌وه‌ شه‌رمی شکاند ئه‌و ڕووداوه‌بوو له‌بێتواته‌، له‌دوای جه‌نگی بێتواته‌ له‌ 1983 ئه‌وناوچانه‌ی (ئه‌نوه‌ربه‌گی بێتواته‌ ) که‌وته‌ده‌ست شۆڕش، ئیتر نه‌ك هه‌ر باره‌گاو ماله‌جاشه‌کان به‌ڵکو به‌گشتی ئه‌وناوچانه‌ تالاَن کران، کاتێ مام جه‌لال وسه‌رکردایه‌تی یه‌کێتی به‌هه‌ڵچونه‌وه‌ لێژنه‌یه‌کیان پێك هێنا بۆ بن بڕ کردنی ئه‌ودیارده‌ ترسناکه‌ به‌سه‌رۆکایه‌تی (علی حه‌وێز– ئه‌ندامی مه‌کته‌بی سیاسی ) ڕوداوێکی زۆر ده‌گمه‌ن ڕوویدا، ئه‌وه‌ بوو له‌کاتی لێکۆلیه‌نه‌وه‌ وسه‌ین وبه‌ینی دا کلاشینکۆفه‌که‌ی (علی حه‌وێز) یش له‌لایه‌ن گه‌نده‌لچی وتالاَنچیه‌کان دزرا، یه‌کسه‌ر ئه‌و لیژنه‌و به‌رنامه‌که‌ش تێك وپێك ڕووخاو ده‌نگی دایه‌وه‌ و بووه‌ هاندان و پێشبڕکێ له‌ سه‌رکۆکردنه‌وه‌ .... ئیتر ئه‌وباروده‌خه‌ ده‌روونی وئابووری وسیاسی و فیکری ئاماده‌بوو بێ کۆنترۆل، راپه‌رینی 1991یش بواری ره‌خساند و به‌رپرسان ولایه‌نگرانی ( ی.ن.ك )ده‌ست پێشخه‌ری ئه‌وکاره‌بوون بێ لێپرسینه‌وه‌ ناویشیان لێ نرا هێزی ( ئاڕئاڕ)، ئه‌و هێزه‌ شانازی پێکراو بوونه‌ خاوه‌نی ده‌سکه‌وتی مادیبه‌ هۆی هه‌مان ده‌ستکه‌وت شوێنی باشیشیان بۆدابینکرا، ئه‌وه‌ی زۆر ده‌سکه‌وت و تالاَنی هه‌بوایه‌ پێیان ده‌ووت بۆ خۆی بوه‌ پیاو!!واته‌ جۆرێك له‌ ڕای گشتیشی وه‌رگرت، ئیتر ئه‌ودیارده‌یه‌ له‌نائاسایی و دزێوی وه‌ك دیارده‌ی جاشایه‌تی

*سه‌ره‌تای زۆربه‌ی چه‌مك ونه‌ریته‌ نێو ده‌وڵه‌تیه‌کانی ئه‌وروپی به‌ چاك وخراپیه‌وه‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ ویستیڤالیای 1648 .

**به‌ تایبه‌تی له‌و سه‌رده‌میش وا ڕێکه‌وت پێش مه‌رگه‌یه‌کی زۆر ته‌سلیم ده‌بوونه‌وه‌ وچه‌کیان به‌ جێ ده‌هێشت .

ئاسا _ پەڕیەوە بۆدیاردەیەکی باوو سروشتی وتائەورادەیە ئەوەی پیێ ی هەڵنەسایەو نـاوی نرا نەزان و بێ ئەقڵ، ئەو چینە گەندەلچیە شـارەزایی شـاری کـەم بـوو وەکـو مەنجـەل و سەرقەپاخ (پێش لیبووردن) بوونە هاوپەیمانی جاشە تالاّنچیەکان لەو پێناوەدا، بەو شێوەیە ئەودیاردەیە پەڕیەوە نێـو حـزب و لایەنـەکانی تـر بـەخێرایی ... ئـەوەی زۆر بـەرگری و دژایەتی ئەودیاردەیەی کـرد ( مسـعود بـارزانی ) بـوو، لەسـالی 1991ەوە نـاوی نـان (مافیا)، بەلاّمپێشی پێنـەگیراو ئێسـتا حزبەکـەی ئـەویش زیـاتر لەهـەمووان دووچـاری ئەودەردە بووە .

دوای شـەڕەکانی براکـوژی (ی.ن.ك )لەگـەڵ (بزوتنـەوە)دوایی لەگـەڵ (پـارتی) ....، پاڵنـەری بنچـینەیی شـەڕکردن تـالاّن و دەسـکەوت بـوو، ئـیتر هێزەکـانی ئەنفالچـی لەعەشایرەکانیش هاتنەوە بەئاسایی پێکەوە نوسانەوە لەگەڵ ئەو گەندەڵیە ... و تەنانەت مام جەلال بەئاشکرا گوتی هێزی (ئارئار)لەهەمووهێزەکان ئامـادەترو ئـازاترن .... ئـیتر ئەوحکومەتەی کوردستان لەوانە پێك هاتوە یاخود بڵێین لەمافیا پێك هـاتوە ( (هـەروەك کاك مەسعود )ناوی نـان ....، مانـای چـارەی زۆر بەزەحمـەت دەبـێ لەچوارچـێوەی ئـەو حزبانـەی ئـەو دەردەیـان گرتـووە، تاڕادەیـەك ئـەو حزبـەخاوەن ئایدۆلوژیانـەی وەك ئیسلامیەکان وچەپەکان لەوانە حشع و پەکەکـە ) کـەمتر ئـەو دەردەیـان گرتـوە، دەشـێ قەلاّچۆکردنی ئەو گەندەڵیە بەدەسەڵات گرتنەدەستی ئەوانە چارە سەر بکرێ.

**حزبەکوردستانیەکان و مەدەنیەت :**

لە پێش ڕاپەرین بەو ئەندازەیی لەشاخ پاگەندەی مارکسیەتی کرا لـەدوای ڕاپـەڕینیش ئاوا پاگەندەیەکی بێ تامی مەدەنیەت و هێنانی کۆمەڵگەی مـەدەنی کـراوە، لەڕاسـتیدا زۆربەی جار لایەنە کوردستانیەکان ڕێك پێچەوانەی گوتەی خۆیان دەبنەوە، هەر لەو مـاوە کورتەی پاش و پێش ڕاپەرین زاراوەی وەك: دیموکراسی، کۆمەڵگـەی مـەدەنی، برجـوازی، سەرمایەداری، بازاڕیی ئازاد ... ئەوەندەتاوان بوو سەری قوت دەکرا، کەچی ئیستا بویتـە پێشەنگ و دروشم، بۆیە ناهەقی عەوامێك نیە وەسـفی سیاسـەت بـەمانای "درۆ" لێـك بداتـەوە، بـا هەڵوەسـتەیەك لەسـەر کۆمەڵگـەی مـەدەنی بکـەین: هەڵبەتـە لەبنەچـەدا کۆمەڵگەی مەدەنی بریتیە لەوەرچـەرخانی تاکـەکانی ئـەو کۆمەڵگەیـە لەژێرکاریگەریـە کۆمەلایەتیەکان بۆکاریگەری یاسایی، یان جاروایە مانایـەکی وەختـی تـریش وەردەگـرێ بریتیە لەوەرچەرخان لەکاریگەری فاکتـەرە سـتونیەکان بۆفاکتەرەئاسـۆییەکان، کەئـەوەی

دوای ( ئاسۆییەکان )شمولی ترە، لەپاڵ دامودەزگای یاسایی هەریەکە لە سیاسی و زانستی و شارستانیش...دەگرێتەوە، ئەو وەرچەرخانە سادەو ئاسان نیە بەچەند دروشمێك بێتـەدی، ئینجا گۆبەندێکە سەرەنجامی فرە ڕووە لە سەلبی وئیجابی بەتایبەتی بۆ میللـەتێکی وەك کورد کە لە قۆناغی رزگـاری نیشـتیمانی دا پێویسـتی بەپەیوەنـدی کۆمەلأیـەتی بـەهێز هەیە، چونکە شۆڕش و راپەڕین وکوردایـەتی وهاریکـاری و...لەفەرهـەنگی کۆمەڵگـەی مــەدەنی دەگمەنــە*، بەتایبــەتی بــەو شــێوازە رێبــازەی علمــانی کوردســتان گرتویانەبەر،گوایەکۆمەڵگــەی مــەدەنی وەك ئــەورووپا لەڕێگــەی گەشــەی مــادی وسەرمایەوبازاڕی ئازاد دەهێننەدی، هەڵبەتە ئەو شێوەیە کۆمەڵگەی کوردی بەناسنامەوە تەرت و وێران دەکا هەروەك وا وێرانی کردووەودەکا، چونکە کۆمەڵگەی کوردی لـەرەگ و ریشەوە زۆر جیایە لەگەڵ ئەورووپا، بۆیە هەربنەمایەکی کۆمەڵگەی کـوردی هەڵدەتـەکێ بنەمایەکی وێران کەری بەرژەوەندی خۆویستی تاکانەی دێتەجێ ی، ئینجـا یاسـا بـەتاقی تەنها کۆمەڵگەی وای بێ کۆنترۆڵ ناکرێ، بەتایبەتی ئەو جۆرە یاسـا لەنگانـەی هـەرێمی کوردستان، کەتائێستاش یاسایەکی نەفامیە،بـەهێز فیتـۆی هەیـە وهـەژاریش پێوەبـوە، بەئەزمون سەلمێنراوە وادەشبینین بەمەدەنی کردنی کۆمەڵگەی کـوردی لـەڕێی شارسـتانی بوون و پەیوەست کردنی بەژیانی مـادی سـەرمایەداریەوە، دەبێتـە هـۆی هەڵوەشـانەوەی ئینتیمـای رەسـەنی کوردایـەتی، چـالاك تـرین نمونـە ئـەودیاردە نامۆیـەی وەرچـەرخانی ئینتیمای نەتەوەیی کورد بەرەو زمانی تورکمانی لەهەولێر ..، ئێستاش بەمـەدەنی کـردن بەبێ کۆنترۆڵی عەقیدەیی ئەوا ئینتیمایـەکانی سـەلامەت نـابێ، لەگـەڵ هەڵوەشـانەوەی ئینتیما کلاسیکیەکانی یەك سەر کێش دەبێ بۆبازنەیەکی دەرەوەی رەسـەنی کوردایـەتی، لەکۆمەڵگەی وادا گۆڕینی کۆمەڵگەیەکی کلاسیکی بەرەو مەدەنیەت مـەرج نیـە بـەڕێی ئەوروپیانــەو لــەڕێی بــەها ســەرمایەداری و مادیــەکان ئــەنجام بــدرێ، دەکــرێ بــەهۆی ئایــدۆلوژیاو ئــایین و دەزگازانســتیەکانی وەك زانکــۆ ســەنتەرو رێکخــراو حزبــە خــاوەن

*هەر بۆیەش شۆڕشی رزگاری زیاتر لەلادێ سەرهەلدەدا، جاران کەریژەی دانیشتوانی شار لـە جیهـان لەنێوان (5- 7)٪ بوو ریژەی ئەو شۆرشانە زیاتر بوو، دوای رابـوونی پیشەسـازیریژەی دانیشـتوانی شارەکان زیادی کرد بۆ 25٪ وئیستاش نیوە بە نیوەیە، بۆیە بزوتنەوەی شۆرشگیری کـەم بوویتـەوە، تەنها لە توانای مدرەسەکانی خاوەن ئایدیۆلۆژی ماوە، هـەروەك بینیمـان لـە شۆرشـی ئێـران لـەنێو کۆمەلگەیەکی مەدەنی کرا بە هۆی فاکتەری ئاینی، ئیستا زیاتر لایەنە ئاینیەکانە شۆرشـی رزگـاری پێ دەکرێ.

بنەماكانیش بێتە دی، كۆمەڵگەی مەدەنی ستاندەر بەند نیە تەنها بەباروو دۆخی ئابووری و تەكنەلۆجیا و زەمەن و زەمین ...، ئەكتیڤ كردنی ئینتیما ئاسۆییەكان و زاڵ كردنی بەسەر ئینتیما ستونیەكان چاكترین دەروازەیە بۆ ئەو وەرچەرخانە، لەڕاستیدا ئەگەر بێن بەراوردێكی بەووردی ئاكارو چالاكیحزبە كوردستانیەكانبكەین دەبینین بەشی هەرەزۆری لەو كارانەیان "ئەنتی مەدەنیە" بریتیە لە وەرچەرخانی كۆمەڵگەی كوردی بەرەو كۆمەڵگەیەكی عەوام، واتە جاران زیاتر مەدەنی تر بووینە نەك ئیستای سەردەمی تكنۆلۆژیای پێش كەوتوو، هەر بەكورتی با سەرنج بدەینەتوخمەكانی مەدەنیەت لە كۆمەلگەی كوردەواری:لە سەردەمی میرنشینەكان بە پێی شەریعەتی ئیسلامی هاوولاتی بوون لێیان ماوەی 15 ڕۆژ بوو، پێكەوە ژیانی ئاینەكان لە كۆمەلگەی كوردەواری بەناوبانگە لە فەرهەنگە جیهانیەكان تەنانەت لیژنەی نێو بژی ویلایەتی موسل ئەو دۆخەی بە دەگمەن وەسف كردووە،ئینجا هەمووتاكێك بەرپرسیەتی و پاسەوانی سامانی گشتی لە ئەستۆ بوو بۆیە بیٚ ئەوەی پۆلیس هەبیٚ مال و سامانی خەلكی لەو گۆڕە بوو پاراستراویش بوو، وەك ئیستا دەسەڵات چرِ نەكرابۆوە بۆ كەم خەلكێكی ناشایستە وهەموو كارێك هەر حكومەت بیكا، تەنانەت لەو سەردەمی خوێندنیش مەدەنی بوو لەشارو لادێكان لە سەر زەكات و خێری خەلكی بەڕێوە دەچوو، تەنانەت پاریزگاری ژینگەش لە ئیستا گەشە سەندووتر بوو بیٚ ئەوەی وەزارەتیشی هەبیٚ، هەموو خەلكی خۆی لە پیس كردنی ئاوو، سووتاندن، ڕاوی ئاژەل لەساتی زاووزیٚ،چاندنی دارو دروخت ...هەموو ئەوانە بەشێك بووە لەباوەڕی ئاینی (النظافة من الإیمان ) لەگەڵ زۆر باسی تر كە لێرە مەودا نیە باسی بكەین .

## سەرچاوەكانی توندو تیژی :

گەلیٚ پرس هەیە هەریەكەو دەیەویٚ لەخۆی دوور خاتەوە ولەملی بەرامبەرەكەی بشەتێنیٚ، لەئایدیۆلۆژیای شۆڕشی نوێدا تەقەلایەكی بەهێز هەبوو كە پیٚ ناسی فاشی بدرێتە پاڵ سیستەمی سەرمایەداری، بۆیە ڕاستەوخۆ نەدەبوایە بەحزبی بەعس بووتریٚ حزبێكی فاشیە دەبوایە بلێی رەفتارفاشی، چونكە(گوایە)حزبی بەعس سۆسیالیستیە ناشیٚ دیاردەیەكی سەرمایەداری وەك فاشی بۆ بەكار بهێنیٚ !.

هەڵبەتە ئەو ( تەنزیراتانە ) لەکوردستان لەلایەن (ی، ن، ك ) دەکرا حزبەکانی تری کوردستانیش لاسایان دەکردەوە، کەچی ئێستا پاکانە بۆ سیستەمی سەرمایەداری دەکەن و لە هەموو گوناهێك دایدەڕنن، لەراستیدا فاشی و نازی فالانژیسی و شۆفێنی و تۆرانی وبەعسیەت .... هەموو ئایدۆلۆژیایەکی رەگەزپەرستی ئاوێتە بووە لەجۆرە سۆشیالیستێك و تێکەڵ بە فەلسەفەی نەتەوەیی وزەمینەی رۆژئاوایی، ئیتر ئەوە پەیوەندیبە سیستەمی سەرمایەداری بەتەنها نەبووە، ئەوە لەهەناوی سوشیالیستی و چەپی لەبڕگەی دیکتاتۆری پڕۆلیتاریەوە دێت .

لەو سەردەمەش دیسان کۆمەڵێك دیاردەو چەمك هەیە بەزۆرەملێ دەیانەوێ لەملی مەدرەسەی تر بشەتێنن، لەوانە توندو تیژی و ئیرهاب و تیرۆر، لەراستیدا توندو تیژی بەندێکی گەردوونیە شان بەشانی گۆڕانی هێواش هەیە، لەوانە وەك : سوپەر نۆڤا، تەقینەوەی ئەستێرەکان، یەکگرتن وداتلێشانی ناوکی، ئەستێرە رەش و سپیەکان، بڕکانەکان، گەردەلول و زریانەکان، تاڤگەکان .... هتد، بێ ئەوانەش ژیان دەوەستێ، لەنێو کۆمەڵگەش ئاوا چۆن گۆڕانی هێواش پێویست ودائیمە گۆڕانی توندو تیژیش لەکات و دۆخی خۆی پێویستە وەك: شۆڕش و راپەڕین و هەڵچون وزیندانی و لەسێدارەدان ..... ئەوانە بەشێکن لەژیان، هەڵبەتە توندو تیژی و هەتا تۆقاندنیش ( ئیرهاب) بەشێکە لەژیان بەتایبەتی بۆ تاوان باران ئەگەر تاوان بار و بکوژ ودز نەترسن ئەوانە تاوانی مەزن تر دەکەن، ئەگەر بەرگری زۆردارو داگیرکەر نەکەی ئەوا رزگارت نابێ، ...بەڵامهەموو ئەوانە ئەگەر لەزەمان و زەمین و بەپێ ی مەرجی خۆی بەکار نەهێنرێ دەبێتە سەلبی، هەر وەك ئەو توندو تیژی و تۆقاندنانەی دەسەڵات بە کاری دەهێنێ لە پێناو پاراستنی دەسەڵاتەکەی یان ئەوانەی دژی دەسەڵات لە پێناو گرتنە دەستی دەسەڵات، ئەوانەی سەروو بنەمای گشتی توندوتیژیە بابزانین لەکوردستان سەرچاوەکانی لەکوێ هاتوە ؟ .... ئەوەی سەروو تێڕوانینێکی گشتی بوو، مێژووی مرۆڤایەتی بێجگەلەئاییینە ڕاستەقینەکان ئەگینا بەو تووندوتیژیەهاتوە، بەکورتی توندوتیژی و تیرۆر ناسنامەی نیە لەهەموو مەدرەسەو نەتەوەو ئایدۆلۆژی و ئایین وبزوتنەوەیەك ئەگەری سەرهەڵدانی هەیە .

لەکوردستانیش سەرەڕای ئەو زەمینە گشتیە ئەوا لەمێژووی نوێش لەدوای داگیرودابەش کردنی دووچاری شەڕوشۆڕوتوندوتیژی بویتەوە، لەنێو خۆشدا لەشۆڕشی نوێ _ واتە لەدوای 1975- بەپێی تیۆروئەدەبیاتی مارکسی هەمووی لەسەر توندوتیژی

بیناکراوه، لێك بوردن تۆمەت بوو، مارکس خۆی ئامۆژگاریەکی بەناو بانگی هەیە دەڵێ : ( ئێوە چاکسازمەبن بەڵکو شۆڕشگێڕبن)، ئەنجلس کتێبێکی هەیە بەناوی (دور العنف فی التاریخ ) لینینش لەکتێبی ( من أین نبدأ) دەڵێ : دەبێ مارکسیەکان پەنا بۆتیرۆریش ببەن بۆهێنانەدی ئامانجەکانیان، ئیتر بەپێ ی ئەو تیۆرەسیاسیانە مێژووی نوێ ی کورد هەربراکوژی توندووتیژی بووە، کاروسزای شۆڕشگێڕی جێ ی شانازی بووە، وەك :دیل کوشتن، سەربڕین، بەتەورکوشتن، لەسەرشاخ فڕێدان، مرۆڤ سوتاندن[1]،تالاَن،ماڵی یەکتر داگیرکردن....ئەوانەهەمووی سەرچاوەیەکی بەرچاوی دائیمە بۆبەرهەم هێنانی توندوتیژی، بۆیە نابێت ئەودیاردە ناشرینانە بدرێتە پاڵ کەلتوری کوردی، لەراستیدا زیاتر ئەزموونی قۆناغی نوێ ی بزوتنەوەی کوردایەتی لێ ی بەرپرسیارە کەلەدوای 1975 دەست پێ دەکا تائەوساتە.

## ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی 1991- 2009:

هەڵبەتە ئەو هەموو بارودۆخە ناوەکی و دەرەکیەی بەسەر کورد هاتبوو لە ناکۆکی و براکوژی و بەهاکانی عەلمانی و ڕێبازی میکاڤیلی لە سیاسەت و شکستەکان.. هەموو لەلایەك، لەلایەکی تریش وەك بەشێك لەو عێراقە لەو ماوەیەی (76) ساڵێدا جگە لە دیکتاتۆری و بیری ناسیۆنالیزمی عەلمانی عەرەبی و ئینقلاب و ڕەگەزپەرستی و تالاَن و سوتان و.. شتێکی واچاکی لێ نەبینرا، لەچاو ئەوانە ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی لەدوای ڕاپەڕینی 1991 زۆر خراپ نیە، بەڵام باری ئێستای کۆمەڵگەی کوردی لەچاو 1991 زۆر خراپتر بووە، با بزانین هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتداران و بیری عەلمانی و ئەزموونی دەسەڵاتەکەی یاخود بۆ خودی کۆمەڵگەی کوردی؟.

ڕاستە دوژمن لە تەقەلا ونەخشە و پلانی بێووچان بووە بۆ تێکدان و داڕزانی بناغەو ژێرخانی ئەخلاقی کۆمەڵگەی کوردستانی تا بتوانێ بە یەکجاری داگیری بکا بێ بەرگری و بۆی نەدەکرا، بەڵام هەتا ڕاپەڕینیش هێشتا ئەو کۆمەڵگەیە بەو ڕادەیەی ئێستا دانەڕزابوو، هەر بە نموونە بینیمان ئەو میللەتە بوو ڕاپەڕینی بەرپاکرد، زیاتر لە 150000 ئەفسەر و سەربازی عەرەب و بەعسی بەدیل گرت، کە پێش دوو ساڵ ئەوانە

[1]لە هەمووی نموونە هەیە بەڵام درکاندنی بۆ ناوبانگی کورد خراپە .

بوون کوردیان ئەنفال کردبوو، کەچی لە بەرامبەردا مەردانە بە نان و ئـاو و جـل و بـەرگ پێدان ئازادیان کردن، نەك تۆڵەیان لێ بسێننەوە، ئینجا هەر ئەو میللەتە بوو خۆبەخشانە ئەرکی نیشتمانی دەبینی چ لەشاخ چ لە دوای ڕاپەڕین، کارمەند و مامۆسـتایان هاتنـەوە قوتابخانــە بــەبێ مووچــە ئــەرکیان بــەجێ دەگەیاندلــە ســەرەتای ئیــدارەی کوردســتان لە1991- 1992، بەڵام بەرپرسانی حزبـە دەسـەڵاتدارەکان لـەو ساتیشـدا خـەریکی کۆکردنەوەو تالآن بوون، سەرۆکی هەرێمی ئێستاناویانی بـە "مافیـا" بـردن، ئـیتر حزبـە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بەخۆ بەوبەرپرس* و بـیرو پرانسـێپە عـەلمانی و پـەروەردەیی پێشمەرگەیان نەیان تـوانی ئـەوەی دوژمــن بـە کۆمەڵگـەی کـوردی کردبـوو نـەك هـەر چاکەنەوە، بەڵکو ئەوان زۆر بە ترسناك تر درێژەیان پێداو کاریگەریەکەی قـووڵ تـر بـوو، لـەدوای 16 سـاڵ لـە ئـەزموونی دەسـەڵاتی کوردیـدا ئێسـتا کۆمەڵگـەی کوردیلـەو دۆخانەدایە :

1- لەڕووی ئەخلاقی: کۆمەڵگەیەکە بەهاکانی( مادیی، بێ متمانە، فێڵبازی، لێـك ترازاوی، مەزەندە خراپ بەیەکتر، بێئۆقرەیی، خۆویستی..) باڵی بەسەردا کێشاوە.

2- لەڕووی سیاسی: بنەماکانی سیاسەتی میکاڤیلی باڵی بەسەر کێشـاوە، هـەموو خەتێکی سوور، چەسپاوی، پیرۆزی بەکارهاتووە بو بە سیاسەتێکی نارەوا.

3- لەڕووی چینایەتی: کۆمەڵگەیەکی دابەش بووی چینایەتی چـینێکی دەسـەڵاتداری زۆر تێرو بەشێکی هەژاریش، موچەخۆری وا هەیە 450 جـار بـە ئەنـدازەی موچـەیەکی ئاسایی وەردەگرێ، بە ئەندازەی جیاوازی نێوان براهما وشـادرا ومـەنبووز هندۆسـی لێـك جیان، لەڕووی سیستەمی ئابووریش بووینە هۆی " گرانی ".

4- لەڕووی کۆمەڵایەتی: کۆمەڵگەیەکی عەولـەمی دابـەش و دووبـەرەك و مـادی و بەرژەوەندیە تایبەتیەکان زاڵن بەسەر بەرژەوەندی گشـتی و.. (نـەگۆڕەکان) گـەلێ تەسـك بووەتەوە، لەو نێوانەی دەسەڵات زیاتر کۆمەلگە بەرەو ئەنتی مەدەنی بووە.

5- لەڕووی دەروونی: تاکی کورد زۆر چاوشکاو ڕەشبینە، خۆویستە، توانای بـەرگری زۆر لاواز بووە، بێ متمانەیە، دەروون تەنکە.

---

*مانای وانیە هەمووميللەتی کورد وای لێهاتبێت بەڵکو مەبەست زۆربەیان بەتایبەتی لە دەسەڵاتداران .

6- لەڕووی نیشتمانیەوە: ئینتیما نیشتمانی و نەتەوەیی زۆر لاواز بووە، بەرگری و کوردایەتی هەر باوی نەماوە، پارێزگاری لە دەسەڵاتی حزبایەتی لەسەرووی نیشتمانی و ئاسایش و خەتی سوورەکانیەتی.

7- لە ڕووی ئابووریەوە : لە کۆنەوە کوردستان بە بەرووبووم بە ناوبانگ بوو ئیستا هەموو بەرهەمێك لە دەرەوە دەهێنرێ ،تەنانەت لەکاتی وێران کردنی کوردستان لە 1985 تا 1998 خراتری بەسەر هاتوە جگە لە وێرانی ژێرخانی کشت وکالی وبازرگانی وتەکنۆلۆژیش .

8- لەڕوەکانی ڕاگەیاندن وپەروەردەیی وفەرهەنگی ونەریتی تا دەگاتە ژینگەییش سەقەتە،هەرخودی تێك دانی ژینگە لەمێژووی مرۆڤایەتی لە وەرچەرخانی کۆمەلگە لە کشت وکالەوە بۆ پێشەسازی دەست پێ دەکا ،لە کوردستان بێ هیچ هۆیەکی زانستی کشت وکال وێران کراو بەسەدان هەزاران ئۆتۆمبێل و ماشێنی سوتێنەر هێنراوە (بێ بەرهەم)،ژینگەی کوردستانی تێك وپێك داوە

9- لەڕووی ئەزموونی دیموکراسیەوە: دەمانەوێ لەوەوە زیاتر بوەستین بزانین ئاخۆ چەندە ئەو دەسەڵاتەی کوردی دیموکراسی بووە، هەرچەندە تەنها ووردبوونەوە لە هۆیەکانی شەڕی براکوژی کە خۆشیان دانیان پێدەهێنا ئەوە شەڕە لەسەر دەسەڵاتە کۆتای بەو پرسیارە دەهێنێ و مانایەك بۆ دیموکراسی ناهێڵێتەوە، بەڵام هەر یەکە شتێکی لەسەر دەوەستین.

هەڵبەتە دیموکراسی ئێستا (دیموکراسی هاوچەرخ)ی پێ دەووترێ یان دیموکراسی ناڕاستەوخۆ، جیایە لەگەڵ دیموکراسی ڕاستەوخۆ یان (دیموکراسی ئەسینی)، ئێستا زیاتر ئەو بەشانە دەگرێتەوە: (هەڵبژاردنی ئازاد، سەروەری یاسا، ئازادی بیروڕا، دەستگۆڕی دەسەڵات، شەفافیەت، مافی یاسایی معارەزە، لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، لامەرکەزی..)، هەر بەکورتی لەسەر هەریەکەیان هەڵوەستەیەك دەکەین بەبەراوردەوە لەگەڵ ئەزموونی کوردی:

هەڵبژاردن: هەرلە یەکەم هەڵبژاردن قایل نەبوون و ئەنجامەکانی هەڵوەشێنرایەوە و بووە تەوافوقی * لەدوای ئەوە هەر هەڵبژاردنێکی تری شارەوانی و سەندیکایی و ڕێکخراوەیی کرابێ سەرەنجامەکانی تەواوەن جووت بووە لەگەڵدەسەڵاتی عەسکەری لە هەرلایەك، جگە لە تەزویر و زۆرداری و چەواشەیی و دەنگ کڕینی بەئاشکراو..

سەروەری یاسا: یاسا لە سەرووی هەمووان نەبووە، تیغێك بووە زیاتر ملی بێهێز و هەژاری بڕیوەو دەسەڵاتدار و هێزدارەکانیش ڤیتۆی بچووك و گەورەیان هەبوە، هەتا دەسەڵات و پەرلەمان و دوو حکومەتەکان یاسایی نەبوو، بەپێی یاسایی تەواو هەردوو حزبە دەسەڵاتدارەکەش نایاسایی بوون، مادام هێزی داگیرکەریان بۆ سەر کوردستان هێنا، کەچی سەرنج بدە (حزبی کاری سەربەخۆی کوردستان) هەڵوەشێنرایەوە بەپێی یاسا، بە پاساوی پەیوەندی هەبوون بە وولاتێکی بیانی!!

پەرلەمان: لە سیستەمی دیموکراسیدا دەسەڵاتی یەکەمە، کەچی لێرە بێدەسەڵات بوو، لەژێر ڕێنمایی (م.س) بووە، هەردەم بڕیارەکان بەکۆدەنگ یان سفر بووە، ئەوەش هەمان نیشانەی ئەنجومەنەکانی نیشتمانی عێراقی و سوری و میسری بووە.. کە گەلێ جار دەستی قایلیان بەرز کردۆتەوەو نەیانزانیوە بۆچیە! جگە لەوەی ئەندامانی نوێنەری خەڵك نەبوونەو یەکتریان نەناسیوە، ئینجا ماوەی مانەوەی لە هەموو پێوانەیەکی یاسایی ڕەت بوو، هەتا لەعێراق هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان نەکراوە لە کوردستانیش نەکرا.

حکومەت: حکومەت و پەرلەمان داهێنانێکی بلیمەتانەی سیاسی بوو،خەڵکی کوردستانی مەزن پێی گەشبین بوون،بەڵام هەر بەخێرایی بە تەوافوقیانە پەرلەمان دروست بوو، دوای دوولەت بووبێ ئەوەی هیچیان ڕادەی یاسایی تەواو هەبێ، حکومەتی سلێمانی (44٪ )، حکومەتی هەولێریش (46٪)* دەنگی میللەتی هێنابوو، ئینجا ئەو دوو

---

*تەوافوقیش مانای دیارە، لەژێرسایەی تەوافوق زۆر بەزەحمەت کارو چالاکی دیموکراسیانە ئەنجام دەدرێت، دام ودەزگاکان سست دەبن و هەتا یاساش سەروەر نابێ،بۆیە ئەو شێوازە دەگمەنە تەنها لەو ولاتانە پەیرەو کراوە کە لەدووپێکهاتەی جیا دروست کرا بێ وەك چیکوسلوڤاکیا ی پێشوو قوبرس تا ڕادەیەك لبنان وعێراقی ئیستاش ...

*ئەو ژمارەیەی 49٪ و51٪ڕاستەقینە نەبوو، بەڵکو ئەوە زیادەی دەنگی ئەو حزبانە بوو کە نەگەیشتە ڕێژەی 7٪,

حکومەتە زادەی شەڕی براکوژی بوون، کە لەسەکۆی پەرلەمانی کوردستانەوە (تحریم و تجریم) کرابوو،تا حکومەتی هەرێم تا(پێنجەم کابینە) ئەگەر بەووردی بیپشکنین دەبینین زادەی پەلامارەکەی 31ی ئابە کە یەکێتی وای لە پارتی کرد ئاوا پەنا بۆ دوژمن ببا، کەواتە ئەو دوو حکومەتە نەك یاسایی بوو یاخود نا، بەڵکو ئەوەندە نایاسایی بووە تا ڕادەی دژی پەرلەمانی لەشێوازی حکومەتی یالتسن لە ڕووسیا کاتێ بە دەبابە لە پەرلەمانی دا لە ساڵی1993، ئینجا ئەو دوو حکومەتە بەپێی (یاسای ئیدارەی ئینتقالی بەندی - 1- لە مادەی 53) عێراقیش نایاسایی بوو، سەرەڕای ئەوەی بەرجەستەیەکی زەقی فیدراڵیەتی ئوستانیە کە کورد بە تێکڕایی ڕەتی کردۆتەوە و گەلاڵەی داگیرکەرانە کە دەڵێن عێراق فیدراڵیەکی ئوستانی بێ، سەرەڕای ئەو هەموو بێیاساییە هەریەکە لەلای خۆی نەیدەشاردەوە کە حکومەتی حزبە، واتە بە سیستەمی (حزب القائد) داڕژرابوو، هەروەك کاك مەسعود بە ئاشکراتر لە دهۆك درکاندی لە چوارچێوەی هەڕەشەکانی لە دژی گەندەلی .

ئەوەی سەروو تا تێکەڵ بوونەوە ئاوا ناقانونی بوو،تائیستاش دەسەڵاتی کوردی بریتیە لە حکومەتێك ودوو میرنشین و شتێك زیاتریش، ناسنامەکەشی بریتیە لە :1- سیتەمی دیارشی کۆنی یۆنانی 2- سیستەمی مۆبۆکراسی 3- تەوافوقیەکیدەگمەن[1] 4- ڕەگێکی عەشایری ،لە وولاتانی عربی (کە شۆرشیان لەسەر کرا)یەك حزبی قائد هەبوو لەکوردستان دووحزبی قائد، پێویستە لەسەر ئەوەش بوەستین دیموکراسی تەوافوقی لەو وولاتانە پیادەکراوە کە دوو پێکهاتەی جیان وەك چیکۆسلۆڤاکیای پێشوو ،قوبرس، لبنان ،عێراقی ئیستا،لەهیچ کونجێکی ئەو جیهانە نەبوە لە نێو یەك میللەت سیستەمی تەوافوقی وەك ئیستای کوردستان ئەوە 18 سالە وا پیادە دەکرێ ،لە شوێنان دیموکراسی تەوافوقیە ئینجا ئاوا زەحمەتە لە کوردستان تەوافوقیەکەی خەستەو دیموکراسیەکەی کاڵە،هەڵبەتە ئیئتلاف کردن ئاساییە بەڵام تەوافوقی نائاساییە[2] .

---

[1]لە مادەی 3ی ڕێکەوتنامەی ستراتیژی (پ د ك) و(ی ن ك) هاتوە.

[2]بۆ لێك جیاکردنەوەی ئیئتلاف لەگەڵ تەوافوق بڕوانە :ارنت ليبهارت-الديمقراطية التوافقية فى المجتمع المتعددص47- یەکەم کەسەباسی لە(دیموکراتی تەوافقی)کردوە دژ بە دیکتاتۆری زۆرایەتی، تیایدا 3 نیشانەی بۆ تەوافوق داوە :1- بوونی فیتۆ بۆ هەردوولا 2- دابەشی دەسەلات ونوێنەرایەتی لە

ئازادی ڕادەربڕین: ئەوەیان تاڕادەیەك باش بووە لەچاو دەسەڵاتدارانی عەرەب، بەبوونی کۆمەڵێك ڕۆژنامەی جیاواز و کەنالی تەلەفزیۆنی و فرەلایەنی و...

دەستگۆڕی دەسەڵات: لەڕاستیدا کرۆکی دیموکراسی لەو خاڵەیە، بەڵام لە کوردستان نەك دەستگۆڕی دەسەڵاتبەڵکو بە (لامرکزی) و بە دابەشی یاسایش قایل نین و شەڕی براکوژی لەسەر کرا، ئینجا ئەوانە نەك لە حکومەت و دەسەڵات لەنێو حزبەکانی خۆشیان دەستگۆڕی دەسەڵات ناکەن، بۆیە وەك دەسەڵاتداری عەرەب وەزیر و سەرەك وەزیر و پایەکانی تر دەگۆڕن، بەڵام بەو مەرجەی هەر خۆیان لە سەرووی هەموو گۆڕانێك بن، ئیتر پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆیان لە سەرووی ئاسایشی نەتەوەیی کورد و ئامانجەکان و نەگۆڕەکان و پیرۆزیەکان و بەهاکان..

شەفافیەت: هەڵبەتە لە بارودۆخی وادا هەموو بوارەکانی ئیداری و سیاسی و مالی و یاسایی.. لێڵە، لە خەڵك دیار نیە هەمووی لەژێر پەردەو بەدەر لە یاسا دەکرێ، نەك خەڵکی هەتا وەزیر و لێژنەی بەدواداچوونی ڕەسمیش تەنها هەندێ ئامار و ژمارەی سادەی لایە، ئەگینا لە دیموکراسیدا شەفافیەت مانای وایە هیچ بڕیارێکی سیاسی، ڕێکەوتنەکان، یاسایی ئیدارە، بودجە، دەسەڵاتی مالی.. دەبێ لەوپەڕی ئاشکرایی بێ.

مافی یاسایی معارەزە: لە وڵاتانی دیموکراسی معارەزەو دەسەڵاتدار وەك یەك مافی یاساییان لە پێکهاتەی دەسەڵات هەیە، بەڵام لە کوردستان معارەزە زیاتر تاوانبارەو ئابلۆقەکانی یاسایی و ئیداری و سیاسی و مادی و ماڵداریشی لەسەر بووە، زۆر بەخێرایی توندوتیژی و تۆقاندنی لەدژی بەکارهاتووە یان بەسەربازیانە ڕاستەوخۆ یان لەڕێی دەزگاکانی یاسایی لەژێر ناوناتۆرەی جیاجیا، بێبەش بووە لە هەموو داهات و ئیجابیەکانی وڵات.

---

ئاستەکانی تری خوارووش لەگەڵ دابەشی بودجەش 3- سەربەخۆییەکی نیسبی بۆ هەدوولا لە ناوچەکانی خۆیان .. ئەوە تەوافوقەو بەرجەستەکەی ڕوونە لە کوردستان، هەرچی ئیئتلافە تەنها لە حکومەت وئەنجومەنی وەزیران دابەشیەکە هەیە نایەتە خوارەوەو سەربەخۆیی نیسبی تیانیە .

لێك جیاكردنـەوەی دەسـەڵاتەكان: لـە وەسـفێكی (ڕۆسـۆ)[1] دەڵـێ: لـە دیموكراسـیدا دەسەڵاتدارزۆر ترن لە گەل،لە ئورستقراتیدا دەسەڵاتدار كـەمترن لەگەڵ،لـە دیكتاتۆری‌ـدا دەسەڵات یەكسانە بە گەل، هەروەك لە ئەزموونی فەڕەنسی دیكتـاتۆر (لویسـی چـواردە) دەیگوت من یاسام و حكومەتم، لەزۆربـەی وولاتـانی عـەرەبیش، لەسـەر دیوارەكـانوەك عێراق دەنوسرا: (إذا قال صدام قـال العـراق)! جـا لـە كوردسـتانیش نـە پەرلـەمان و نـە حكومەت و نە دادگا.. دەسەڵاتی نـەبووە لـەژێر ڕێنمـایی (م.س) بـووە، ئـەویش لـەژێر فەرمانی كەسی یەكەمیان بووە، مەركزیانە.

**ناسنامەی:** بەكورتی ناسنامەی ئەو حكومەتەی لەو دووحزبە دروست بووە بریتی یە لە شێوە دەسەڵاتێكی زۆر دەگمـەن، زۆر بـە زەحمـەت پـۆلین دەكـرێ، چـونكە شـێوازی زۆر كۆنە،پێكهاتنەكـەی بریتیـە لـە تـەوافوقی – دیارشی،نواندنەكەشـی بریتیـە لـە جـۆرە حكومـەتێكی بلۆتۆ كراسی ئۆلیگارشـی ، دەتـوانین بلێین بریتیـە لـەمیراتگری ئـەزمونی لایەنە سەلبیەكانی یۆنـانی كۆن،دەسـەڵاتی ئیسـتای عربـی ،هەنـدێ ڕیشـەی عەشـایری میرنشینەكانی خۆمان.

** ** ** **

بەو شێوەیە ئەزموونی دیموكراسی لە كوردستان نەبووە نمونەیەكی سەرمەشق، هەتا بـۆ دەوروبەریش، ئەوەتا لەئێران و توركیا و عێراقی نوێش وا دەستگۆڕی دەسەڵات و دابەشی و یاسایی و بوونی معارەزە و ئازادیەك.. هەیە، هەتا ئەزموونەكەی كوردستان چۆوە سـەر ئـەزموونی دەسـەڵاتدارانی عـەرەب*، ئـیتر پاسـاوی گوایـە دیموكراسـی پێویسـتی بـە كۆمـەڵگەیەكی عەلمانی و مەدەنی و بازاڕی ئـازاد و سـەرمایەداری و.. هەیـە،یان دەڵـێن

[1] جان جاك رۆسۆ-فی العقد الاجتماعی ص116-

*ئەوەی جێی سەرسورمانە دەسەڵاتی كوردی زۆر دژی دیاردەی تەعریبەوهـەقی خۆشـیەتی، هـەنگاوو بەرپرسەكانیی ئەو دیاردەش دیارن، بەڵام تەعریبی عەقلیەتی دەسەڵاتی كوردی لەكێ هـاتووە؟ زیـاتر لەوەش هەروەك نەریتی بەرپرسـانی كەنـداوی عـەرەبی عاشـقی مۆنیكـاو سـەیارەی بـەرزن، ..بۆیـە دەسەڵاتی كوردیش وەك عـەرەبی ئەو دوووەسفە سەرەكیە هەڵدەگری یەكەمیان: كوردیش ڕیك كەوتوون كەرێك نەكەون .

دووەم: وەسفی دەسەڵاتداری عەرەب بەسفر كراوە لەكۆنەوە(یەكـەم جـار سـعد زەغلـول ووتـی سـفرن) تەنانەت معمر قەزافی بە (- 1)یشی وەسـف كـردوون دەبیـنین دەسـەڵاتی كـوردیش ئـەو وەسـفە و سەرەنجامەكانی هەڵدەگری تا ئەونوسینەش .

زۆرمان ماوە بگەینە قۆناغی دیموکراسی ..، ئەو جۆرە پاساوانە قەلۆشیە، پێشتریش لە سەردەمی گەرمەی مارکسی دیسان نووسەران و سیاسەتمەداری کورد بە هەڵچونەوە دەیانگوت قۆناغێکی زۆر ماوە تا 100سال بگەین بە مارکسیەت، لە سۆشیالیستیەکەش هەروا، ئێستاش دیسان خۆیان دیموکراسیەکەیان پێ قەبووڵ ناکرێ، ئینجا دەیخەنە ئەستۆی کۆمەڵگەو زەمەن گوایە ئەوە پێویستی و زەمینەسازیدەوێ بۆ دیموکراسی.. کەچی دەبینین کۆمەڵگەکانی ئەفریقی و هندی و ڕۆژهەڵاتی تر زۆر لە کورد پاشکەوتووترن، بەڵام وا دیموکراسین، کوردستانیش هەروا لە خولگەی نادیموکراسی دەخولێتەوە تا نووسینی ئەم بابەتە،بەڵام لەدوای یەکبوونی هەردوو حکوومەت زۆر بەهێواشی بەرەو چاکتریە.

لەبەرامبەر ئەو کەللە ڕەقیەی هەردوو حزب بەرامبەر ڕای گشتی کوردی دەیکەن و ئامادە نین چاکسازی بکەن ئەوا باجی گەورەیان داوە لە هەموو ئاستەکان ،ئەگەر وەك ژمارە هەلبژاردنەکان بکەینە پێوەر ،لەگەڵ ئەو هەموو چاوسورکردنەوەو بەکارهێنانی ئامرازی ناسەردەمیانەی جۆراو جۆر کەچی هەروا دەنگیان لە کورتی دەدا ،لەیەکەم هەلبژاردنی سالی 1992دا 50بە 50 بوون ،دوای هەلبژاردنی دوەم هاتنە 41بە 41،ئینجا هاتنە خوار تر بۆ 36بە36 ،ئیستا لەو هەلبژاردنە هەریەکە تەنها 29 کورسیان ماوە،هێزێکی تر بەناوی (گۆڕان )25 کورسی هێناوەو نزیك بوویتەوە لێیان .

## چارەسەریەکانی:

هەڵبەتە ئەوە بەچەند دێر و پەرتوکیش تەواو نابێ، چونکە وەڵام و چارەسەری بریتیە لە کێشەیەکی مەدرەسی جیهانی، بەڵام هەر زۆر بەکورتی وروژانێکی لێ باس و بەراورد دەکەین.

لە سەرەتای سەدەی ڕابردوو و پێش دروست بوونی مەینەتی کورد عەلمانیەتی کورد بەڵێنی بە خەڵکی دا ئەگەر خەڵکی کورد ڕوو لە عەلمانیەت بکەن، ئەوا دەوڵەتێکی کوردستانی خاوەن تەکنەلۆجیایان بۆ دروست دەکەن، کەچی ئەوە سەدەیەکە نەك هەر ئەو بەڵێنانە نەهاتە دی، بەڵکو باری کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئایدیۆلۆجی و نیشتمانیان بەو دۆخە گەیاندووە، جا ئێستا زۆر ڕوونە ئەو بارودۆخ و پەرتەوازەییەی کورد نە بە لیبرالیەت، نە بە سۆشیالیزم و شیوعی و نە بە سۆشیالیزمی پەتیش ڕاست ناکرێتەوە،لەبەر هۆیەکی زۆر سادە :چونکە ئەو مدرسانە هێزی گۆڕان وچاکسازیان زۆر

لاواز بووە، کەواتە وەك دەرباز دەبێ بەدوای فاکتەرێکی زۆر کاریگەر بگەڕێین کە هەموو لایەکی کورد کۆکبن لێی، با سەرنج بدەینە ئەو گوفتارەی لە کۆنەوە لەسەر کورد وتراوە، چەندین جار لە شەرەفنامە و لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسەکان دووبارە بووەتەوە، دەڵێن میرنشینەکانی کورد، خەڵکی کورد، خێڵە کوردیەکان، سەرکردە سیاسیەکان.. یەك ناگرنەوە، تەنها ئەگەر لەسەر (شەهادەو ئیمان)[1].. ئەوە مانای چىیە؟ مانای وایە هەرکاتێ کورد تەواو ئاینی ئیسلامیان پەیڕەو کردبێ ئەوا یەکگرتوو و سەرکەوتوو و سەربەخۆ بوونە، هەروەك د.حکیم مختار کردوویە بە پاساو دەڵێ: (حیثما کان الإسلام بلا اسلام فحریة بلا حریة، کان للکورد ثورة وجهاد)[2]، پێچەوانەش بە پێچەوانەوە، ئێستاش ئەو بارودۆخە بە عەلمانیەت چارەسەر ناکرێ، پرۆسەی عەلمانی و بەردەوام بوونی هەر ئەو زیانانەی سەرووی نیە، بەڵکو دەبێتە هۆی لاوازکردنی ئینتیما تاکی کوردستانی بۆ وڵات و مێژوو و کەلتوور و فەرهەنگی کوردستان، دەبێتە هۆی توانەوەی فەرهەنگی و پچڕانی لە کەلتوور و کۆڵەگەکانی ناسنامەی، بۆیە سەرەنجام کاری نێگەتیڤی ترسناکیش دەکاتە سەر هێزی بەرگری نیشتمانی، لەگەڵ کۆمەڵێك سەرەنجامی تر، تەنها گەڕانەوەی سەرتاسەری بۆلای ئاین عەیارەکان دەگێڕێتەوە، هەموو ئەو دیاردە دزێوانە چاك دەکاتەوەو سەروەریەکانی کورد دەخاتەوە سەر ڕەسەنایەتی خۆی، کە لە هەموو فەرهەنگەکانی کۆن کورد بە میللەتێکی بەزەبر و دلێر و ڕەوشتبەرز تۆمارکراوە، هەتا ناوبانگی بە (قوڕەیشی عەجەم)[3] دەرکردبوو، بەو ئاینە یەکیشی دەکرنەوەو دەروازەی ڕزگاریشی دەدۆزێتەوە، بەو پێیە دەچینە نێو ڕابوونی ئیسلامی لە کوردستان، کە لەو پێویستیە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و نیشتمانیانە سەرهەڵدەدا، لەهەناوی شکستی عەلمانیەت .

---

[1] بروانە :شەرەفنامە –شەرەفخانی بەدلیسی ل36

[2] معضلة کردستان.. البدیل الأمثل.. ص43.

[3] بروانە:شفاء العلیل ص3 هەروەهاقلقشندی-صبح الأعشی ج4ص379 هەموو ئەوانة لة شەرەفنامە ل104 پیشەکی وەرگیراوە .

# بەشی هەشتەم

## ڕابوونی ئیسلامی

## حزبە کوردستانیەکانی ئیسلامی

لێرە بەو لاوە توێژینەوەکەمان بە پێی ڕاو بوچوونی ئیسلامیەکانە...، لایەنە ئیسلامیەکان لە فەزایەکی فراوانتر لە شێوەی ماسی ودەریاخەملیون کە پێی دەووترێ ڕابوونی ئیسلامی، بۆیە هەلوەستەیەك لەسەر ئەوە دەکەین لەپێشدا.

8- 1زۆر بە کورتی هۆیەکانی ڕابوون لە کوردستان:دووبەشی سەرەکیە، هۆکارە گشتی وتایبەتیەکان :

**A/هۆکارە گشتیەکان، ئەوەش چەند بەشێکە:**

أ/ هۆیە واقعیەکان:

1- گۆڕانی زانست:

زانستی کۆنی فیزیا و کیمیا و بایەلۆجیا و گەردوون و تەنانەت زانستی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەرە دوورەکە (بیرکاری) لە پشتیوانیەکی ڕاستەوخۆی فیکری عەلمانی وفلسفی مادی بوو، دژی بەهای ڕۆحی و راستیەکانی ئیسلام بوو،ئەو چوار تیۆرانینە سەرەکیەی خوارەوەی دروستکردبوو:

أ/ ئادەمیزاد لە ئادەم نەهاتووەو بەڵکو لە پەرەسەندن هاتووە.

ب/ ئەو جیهانە تەنها مادەی جولاوە، غەیب و روح و جیهانی ئەودیو (قیامەت) تەنها هورێنەیە.

ج/ ئەو گەردوونە هەر هەبووەو هەر دەشمێنێ بێ سنوور و بێکۆتایشە (هەموو تیۆرەکانی پەرەسەندن لێرە سەرچاوە دەگرێ)..

د/ ئایینیش لە نەزانین هاتووە، مرۆڤ ئاینی دروست کردووە نەك خوداوەند.

بەڵام لە سەرەتای ئەم سەدەیەو دوای پەنجاکان شۆڕشێکی زانستی گرنگ ڕویداو ڕەوتەکەی وەرگێڕا بەرەو لای ڕاستیەکانی پەیام، لە زانستی نوێدا گەردوون سنووری هەیە و تەمەنیشی هەیە و دروستکەریشی هەیە، فیزیا و کیمیاش سەلماندیان بوونەوەر و

سروشت هەر مادە نیە، لە بایۆلۆجیاش تیۆرەکانی پەرەسەندن و داروینیەت بە (ڕاسبی) کۆتایی هات، ئەنسرۆپۆلۆژیا و کۆمەڵایەتیش بەرەو لای شەریعەت هاتنەوە.

بەم شێوەیە زانستە نوێیەکان بە پێچەوانەی زانستی کلاسیکی پاڵپشتی چەمکەکانی ئاینی کرد، بیری مرۆڤی نوێی بە ڕووکاری ئاینی گۆڕی، زانست و پەرەی زانستی بووە کەرەستەیەکی لەبن نەهاتووی بانگێشەو تیۆری سیاسی ئیسلامی، بەپێچەوانەشەوە مەدرەسەکانی عەلمانی مارکسی و سۆشیالیستی لەگەڵ زانستی نوێ ڕووبەڕوو بونەوەو تیۆری سیاسی و فکریان کەوتە شکست. کەواتە (جان کۆریس) هەقی بوو کە لە سەدەی ڕابردوو لە کتێبی (حقيقة العالم الملموس) گوتی: من نایەمە ناو سیاسەت هەتا چاك لە گەردوون نەگەم، بەو شێوەیە لە شوێنی تێڕوانینەکانی جاران جۆرە بڕوایەکی تر خەملیبریتیە لە:

أ- پەروەردگارە دروستکەری هەموو شتێك.

ب- بۆ هەر شتێکیش فەرمان و بەرنامەیەکی بەستاندەری پێ سپاردووە کە پێی دەڵێن (یاساکانی سروشت).

ج- کەواتە هەر ئەویش دەزانێ چ یاساو بەرنامەیەك بۆ ئادەمیزاد چاکترە کە یاساکانی کۆمەڵە (پەیام).

بەم شێوەیە ئەو گۆڕانە زانستیە کاریگەرێکی گرنگ بوو لە بەخەبەر هێنانەوەو ڕابوون خودی زانست وبەرهەمەکانیبوەتە بەشێکلە پاڵدانی عەقلی مرۆڤبەرەو ئاین ((ويرى الذين أوتوا العلم الذي أنزل اليك من ربك هو الحق..))سبأ/6.

لەکۆنەوە زانای ژیری ئیسلامی زانیویەتی زانستی ڕاستەقینە یارمەتیدەری ئاینی ڕاستەقینەی دوور لەخورافیاتە،با ئەو زانستە لەلایەن هەرلایەك بێت، سینکا لەکۆنەوە ووتویەتی:(کەس ناتوانی بە زوڵم درێژە بە دەسەڵاتی بدا،بەڵامدەسەڵاتی میان ڕەو دەوام دەکا)[1] ئەوە نزیکە لە ڕاستی (ان الملك تدوم بالكفر ولاتدوم بالظلم) بریتیە لە(كلمة الطيبة) ، لەسەر ئەو بنچینە ئیبن روشد هەولی دا شریعەت وفلسفە یەکبخاو دەلی(ان الحكمة صاحبةالشريعة والأخت الرضيعة)[2]،ئیبن حەزمی ئەندەلوسی دەلیٓ(لا خلاف فيه بين

---

[1] سسبینوزا-رسالة فی اللاهوت والسیاسة ص211

[2]بڕوانە: ابن رشد- فصل المقال فيما بين الحكمة والشريعةمن الإتصالص58- هەردووکی بە دەستە خوشك وەسف کردوە

أحد من العلماء بالفلسفة ولا بين أحد من العلماء بالشريعة)[1]،ئیمام غـزالیّ و رازی و هەتا ابن تیمیەش ووتویەتی عەقلی دروست ودەقـی راستەقینە تیـك نـاگیرێن[2]، لـەلای ئەوروپاش ئەو تەقەلایەی دراوە ،باسكال هەولیدا وەك ابن رشـد ئـاین وزانسـت وفلسـفە ئاشت بكاتەوە[3]...هەموو ئەوانە لە قازانجی ئاینی ڕاستەقینەیە.

2- وەرچەرخانی ئینتما لە دەڤەری و نەتەوایەتیەكانبەرەو جیهانی عەولەمە:

فكرەو ئەزموونی نویّ سنووری نیە (عابر القارات)ە، لەو داخراویـەی جـاران دەرچـوو، بۆیە ئادەمیزادی نویّ كوڕی خێزانەكەی، نەتەوەكەی، سیستەمی حوكمەكەی.. نیە، كوڕی جیهانە، یەكسەر تەفاعول لەگـەڵ جیهـان دەكـا، لەسـەر بنچـینەی كیشـوەر و نەتـەوەو سنووری جوگرافی دابەش نابن، تەواو بە پێچەوانەی فكرەی (صموئیل هنـدكتۆن —صـراع الحضارات) بەڵكو لە یەك نەتەوەو شارستانی و بگرە لە یەك خێزان ئادەمیزادەكان وەلائـی جیهانی جیاجیایان لیّ پەیدا دەبێت، ئەو پرۆسەیەش لە كۆتاییدا دەبێتە (صراع المـدارس) نەك (صراع الحضارات) و كام مەدرەسەش دەوڵەمەندتر بێت ئەو دەیباتەوە..

هەڵبەتە مەدرەسـەی ئیسـلامیش لـە هـەموو ڕووەكـان لـە مەدرەسـەكانی عـەلمانی (لیبرالی، شیوعی، سۆشیالیستی، ..)دەوڵەمەندترە، بۆیـە بـەخێرایی فكـری بەشـەریەتی كۆنترۆڵ كرد، پەرێوە لە میراتی، چـونكە لـەو سـەردەمەی عەولەمـە چـەمكەكانی (دار الاسلام، دار الكفر، دار الحرب، دار السلام،...) هەروەها فەرمایشـتی ئێمـەی ئیسـلام و ئێوەی كافر، ئێمەی سوننە و ئێوەی شیعە،.. دەقیـق نـین، دەكـریّ بڵـیّی ئێمـەی كـورد ئێمەی ڕۆژهەڵاتی و باقی ستونیەكان بەڵام بـۆ ئنتمایەكانیئاسـۆیی سـنوری جـوگرافی و نیشتمانی نەما،لێك جیابۆوە، دەكریّ لە هەر كیشوەر و وڵاتێكـی ئـەو جیهانـە لـە یـەك

---

[1] ابن حزم - الفصل في الملل والأهواء والنحل - فصل في الكلام على من أنكر الشرائع من المنتمين إلى الفلسفة بزعمهم وهم أبعد الناس عن العلم بها جملة.

[2] ان الحجة العقلية الصريحة لاتناقض الحجة الشرعية الصحيحة —ابن التيمية —مجموع الفتاوى، ط2\1998م، دارالوفاء-مملكة العربية السعودية ج5 ص149 لە ئەسلدا ئەو ڕیسایە لە رازی وەرگیراوە بروانة: الفخر الرازي - أساس التقديس220

[3] دجورج حنا - قصة الإنسان ص153

کاتدا ئنتما بۆ هەر چوار مەدرەسەی سەرەکی (شیوعی،سوشیالیستی، لیبرالی، ئاینی) هەبێت، ئەوەش ئاسۆیەکی زۆر فراوانی بۆ ڕابوونی ئیسلامی کردەوە کە بتوانێ لە زیندانی کلاسیکی میراتی دەرچێ و تەفاعول لەگەڵهەموو جیهان بکا و ئەو هەموو کەرەستەیەی خۆی بخاتە بازاڕی جیهانی.

لەو ڕووەش هیچ گومان نیە ئیسلام لە هەمووان شمولی وتر و تێروتەسەل و ڕەگ پتەوترە. هەریەکە لە مەردسەکانی تریش کە تەزووی فکری عەلمانی دروست کردووە (بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامی) زۆر دەستکورتن لە بیروبڕواو کەرەستەی بازاڕی جیهانی فکری و بەرگەی ململانێکانی شارستانی و مەدرەسی زۆر لاوازە.

خودی عەولەمەش هاندەری رابوونە، چونکە ئەو فاکتەر رێگرانەی وەك :سنوری دەوڵەتی نیشتمانی وبەرژەوەندی تایبەتی تاك یان کۆمەلگەیەکی نێو دەوڵەتیکیاخود نەتەوەیەك، ...هەموو ئەوانە لە عەولەمە تەخت دەبێ بۆ ئیسلام ئامادەکاری زیاترە و کەرستەی جیهانی زیاتر پێیە، هەر بەنمونە هەرێمی(سنوردار) یەکێکە لە کۆلەگە یاساییەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ کەلەبنچینەدا لەگەڵهەرێم(لە روانگەی ئیسلام دا لێك جیایە) کە بریتیە لە هەرێمێك سنورەکەی هەموو زەویە، کەواتە مقەوەماتی سیستەمی نا ئاینی لە جیهانی ئیسلامی بەرەو نەمانەو ئیسلامیش بەرەو هەلسانەوەیە بەخێرایی .

3- داڕوخانی شیوعیەت و کزبوونی عەلمانیەت:سەرەتایعەلمانیەت بۆدوای 1908ز دەگەڕێتەوە،نەوەی یەکەمیان بریتین لە:د عبدالله جودت وئیسحاق سکوتلی وحسن خەیری ورەفیق حلمی وتۆفیق وەهبی و زیا کوك وبرنجی زادەو...،ئەوانە هەموویان لەململانێ نەبوون لەگەڵ ئاینیەکانی کوردستان بەلاًم یارمەتیدەری عەلمانی تورکی بوون، بەشێك بوون لەدروست کردنی مەینەتی کورد ئەگەر چی ئەوەشیان نەویستبێ، لە دوای ئەو مەینەتیە جۆرێك لەڕیککەوتنی نارەسمی وادروست بووکە سەرکردایەتی بۆزانایەکی ئاینی بێت و حزبایەتیەکەش بۆعەلمانیەکان بێت، تا دروست بوونی (پ د ك)لە1946،ئەو چینە گەلێ جار ویستویانە لەو ڕێسایە یاخی بن و جۆرێك لە ناکۆکی

به ناوی (مەکتەب سیاسی- م س)و ملا مستەفا ڕوویداوە، لـە راسـتیدا ئـەوە سـەرەتای ناکۆکی عەلمانی وئیسلامی بووە لەکوردستان، بـەڵام عەلمانیـەکان لـە کۆتاییـدا کەوتنـە باوەشی داگـیر کـەران و شکسـتیان هێنـا، تاشکسـتی سـەرکردایەتی مـلا مسـتەفا لـە 1975، ئینجا ئەو چینە عەلمانیە زۆر بلیمەتانەو لەخۆبوردوانە شورشیان بۆیەکـەم جـار دەست پێ کردەوە بێ هێماو پێشەوایەکی ئاینی، بە ناوەڕۆکێکی ڕاشـکاوانەی مارکسـی، دوای ئەوەی (پ د ك)یش بـە ڕەسمـی لـە کـۆنگرەی(9)ی1979جـاڕی مارکسـیایەتی خۆیاندا* جاڕی کۆتایی ئەو ڕێسایەش بوو ئـیتر شـۆڕش وحـزب و کوردایـەتی بەتـەواوی کەوتە دەست عەلمانیەت —ترازی مارکسیەت.

بەڵام لەسەر ئاستی مارکسیەت قـەیرانی سـەخت سـەری هەڵدا،لـە سـەرەتاکانی 1980 قەیرانەکانی ئابووری و میللی زیـاتر لـەناو وڵاتـانی سۆشیالیسـتی سـەری هەڵدا، لەڕووی فکریشەوە لە ئەنجامی ئەو وەرچەرخانە زانستی و فکری و فەلسەفی و سیاسیانە نقومی تەنگژەو لـەدوای بەتـەواوی ڕووبـەڕووی فکـر و زانسـت بوونـەوە، (دەزگای چاودێریان) لەسەر دانا، تا لە ساڵی 1990 بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری تری کۆمەڵایەتی و سیاسی و سایکۆلۆجی و احوال شخصی،... ئەو بلۆکە بە تەواوی ڕمـا بە مەدرەسەو حکومەتەوە، دیارە حزبە عەلمانیـەکانی جیهـانی سـێیەم بـە تایبـەتی کوردستانیەکان سەرچاوەی فکـری و سەرمەشـقی ئەزموونـەکانیان لـەو مەدرەسـەیە هەڵدەقولاَ لەڕووی فکریەوە قەلۆش بوونەوە، ئێستا حزبە عەلمانیەکان هـیچ ئەنـدام و

---

*لە کۆنگرەی - 9- المنهاج والنظام الداخلی للحزب الدیمقراطی الکردستانی (منهاج)وایان تۆمارکرد :

المادة الخامسة\ یسیر الحزب فی نظاله السیاسی والاجتماعی والاقتصادی علی ضوءِ النظریة الماركسیة اللینینیة ویقوم بتثقیف النظریة المارکسیة وتسلیح کوادره ومنتسبیه مرکزیاً بها، کما ویستفید من التجارب الشعب الکردی وتراث البارزانی الفکری، ومن التجارب حرکات التحرر الوطنی فی العالم .

المادة السادسة \نناضل من اجل حکم دیمقراطی ائتلافی تقدمی منتخب من الشعب وتحقیق اعمق التحولات الاجتماعیة والاقتصادیة وفق الاسس الاشتاکیة العلمیة فی جمیع المجالات وضمان الحریة الاراء والمعتقدات والصحافة والنشر والتنظیم الحزبی لکافة المواطنین ..

لایەنگرێکیان نەماوە، بەهۆی فکری و بنــەماکانی حزبایــەتی، تەنهادەســەڵات تاکــە سەرچاوەی ڕاگریانە.

هەر بۆیەش بۆشاییەکی مەزنی لە گۆڕەپانی سیاسی دروست کرد، لەگەڵ ئەو شەپۆلەی ئازادی و دیموکراسیەش بەخێراتر بۆشاییەکە دەرکەوت و ڕابوونیش تیا بلاَو بــۆوە لــەجێی، کە لە ئەنجام و ئەزموونەکانی عەلمانیەتی کوردستان باسمان کرد.

4- هەردوو شۆڕشی ئیسلامی ئێران و ئەفغانستان:

زۆر هاوکێشەی ستراتیجی و سیاسی و کۆمەڵایەتیان وەرگێــڕا، یەکــەمیان گــەورەترین قەڵای ڕۆژئاوای تیادا ڕووخا، دووەمیشیان سوپایەکی شکاند کە لە شکاندن نەدەهات بەو (ناتۆ)یەی ڕۆژ ئاواش .

** ****

سەرجەم ئەو هۆیە گشتی و واقیعیانەی سەروو شۆڕشێکی عەقڵی وای دروست کرد کە لە واقعی خورافیات ڕزگار بێت، ئەو بەربەستەی نێوان عەقڵ و پەیامی شکاند کە لە مێژووی کۆنی عەقڵی ئادەمیزادەوە بە ناتەبایی و تەریبی هاتبوو، سەرنج بدە ئەو ناتەباییە بوێری دابوو بە (دانتی) و (هوایتهد) و (شبلی عیمسی) زۆربەی عەلمانیەتی ئەو سەردەمەش داکۆکی لە بۆچوونەکەی (ابو علاء المعري- سەدەی 11) بکەن کە دەڵێت: (خەڵکی سەر زەوی یان عاقڵن و بێ ئاینن، یان ئاینین و بێعەقڵن..)هەروەها دەڵین: سەرکەوتن بۆ زانست و مۆدێرنەو شکستیش بۆ ئاین[1]، هەرلەوەشەوە (همنکوای) دەڵێ بەسروشتی خۆی هەموو عاقڵێك مولحید دەبێ، بێ عەقلیش ئایینی دەبێ، مارکسپێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بیت پێویستی بە ئەقڵێکی لەنگ هەیە ئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیە[2]،لە شوێنێکی تر لە(مخطوطات 1854) دەڵێت بۆ ئەوەی مرۆڤ پێی بووترێ مرۆڤ دەبێ مولحید بێت[3]،**واتە** بۆ جیبوونەوەی ئاینی لەکۆمەلگە پێویست بە عەقلی لەنگ هەیە، مەرگی ئاین لەگەڵپێشکەوتنی عەقلە، رزۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایەیان هەبوە لە نوییەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەڵێت:سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقلمەند چۆن یەکسەر تەسلیمی فەلسەفەی مادی نابن کە تاکە چارەنوسیانە[4]،بەلاّم لەناکاو دەرکەوت کە: تەبیعاتە بنچینەییەکانی ئادەمیزاد (فطرة)- یاساکانی سروشت- پەیام- لەسەر یەك هێڵی ڕاستن یەکتریش پاسادان دەکەن، عەقڵیش کۆتایی بە یاخیبوونی بەرامبەر پەیام هێنا، ڕابوونی لێ پەیدا بوو.

---

[1]شبلی عیسمی لة(العلمانية والدولة الدينية ص105) دةليت شيخ محمد عبدةش ئةو بؤضوونةى هةبوة: ((اذا تعرض العقل والنقل أخذ بما دل عليه العقل) . هةروةها برِوانة: مجتمع جديد أو الكارثة- د.زكى نجيب.

[111] كارل ماركس-بۆس الفلسفه ص256نامەکەی مارکس بۆئینینکۆف.

[3] مارکسیه قرن عشرين ص145

[4]المثالية والمادية وازمة العصر ص95

ب/ هۆکارە مێژووییەکان:

بیرو ڕسکانی ئادەمیزاد وا دارِشتراوە تا زیاتر تێکەڵاَ بە یەك بن ئاسۆی بـیری فـراوانتر بێت، وەك لەئیمامی عەلی هاتووە: ((تەنیا دەفری عەقڵە تا تێی کەی فراوانتر دەبێـت))، بۆیە ئادەمیزاد سەرەتای هۆش و بیری زۆر سادە بووە، زۆر پێویستی بە کارکەری دەرەکـی و ژمارەیـەکی زۆری پێغەمبـەران (د خ) هـەبووە، هـەرکاتێ لـە پـەیام دابـڕابن بەشـی هەرەزۆری دەگەڕانەوە سەر عەقڵیەتی ستونی خێڵـەکی و نەریتـە دواکـەوتووەکان ئەگـەر بەناوو شـێوەش لەسـەر ئاینەکـە بمابوونایـە، ئیـدی دەبـووە کێشـەی نێـوان دڵسـۆزان و وشـیارانی ڕاسـتەقینەی ئاینەکـەو خـەڵکی (عەوامەکـە) و تـا دەگەیشـتە بـانگی پێغەمبـەرێکی نـوێ، دژی دەوەسـتان و گۆتـەی وەك: ئێمـە چ عـەیبمان هەیـە؟ بـاب و باپیرانمان هەروا بووە؟ ئێمەش بڕوامان هەیە؟ ئاینێکی نوێمان نـاوێ؟ تـازە فێـرە دینمـان دەکەن؟! ئەوە مەبەستتان لەژێرەوە هەیە؟ ئەوە سیاسەتە، فڕوفێڵە...هتد.

کۆمەڵگە بەو هەلبەز و دابەزە گەیشتە ئاستێکی ئاسۆیی وا جیهانوێك بێتەوە، ئیدی وەختی هاتنی دوا پەیامی جیهانی شمولی هات، هەڵبەتە دیسان سروشتی ئادەمیزاد وایـە هەر لەدوای ( خ- ڕاشدین) دەسەلاَت و شەریعەتەکە بەرەبەرە خانەنشین کرا، بەلاَم ئیسلام ئاینێکی زۆر زیندووە بەهۆی چەسپاوی ئایەت و فـەرموودەکان ناوەنـاوە نـوێ دەبێتـەوە، هەرچارەی بەهۆی پرۆسەیەکی مێژوویی.

تجدید (نوێکردنەوە):

عەلمانیەکان بەگشتی و بەشێکی بچووکیش لە (مەدرەسەی قصـدی- ئیسـلام) ڕایـان وایە وەك (شبلی عیسمی) لێی نەقل کردوون: ((...تجدید الدین وفهمه بما یتلاءم مـع روح العصر ومنطق العلم والتطور))[*] ئەوەیان تایبەتە بە ئاینی تر و ڕێبازی تـر نـەك ئیسـلام. هەمان گۆتەیە کـە لەلایـەن زۆربـەی وەزارەتـەکانی ئـەوقافی عـەرەبی و ئیسـلامی بـە چاوساغی هەندێ مەلای (ئایەت فرۆش) دەگۆترێتەوە، لە کوردستانیش بەنەزانی جارجـار دەیلێنەوە، نەخێر، مانای گۆڕینی ئاین نین، گونجانی ئاینیش نیـە لەگـەڵ واقعـی خـەڵك، بەڵکو گێڕانەوەی خەڵکەکەیە بۆ سەر سکەی ئیسلام، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجـە هەمیشـەییە بێتـەدی ((ولقـد بعثنـا في کـل أمـة رسـولاً أن اعبـدوا الله واجتنبـوا الطـاغوت..))،

[*] العلمانیه والدوله الدینیه ص74

کەواتە(نوێکردنەوە)دوو پرۆسەمانا لەباوەش دەگرێ: 1- نوێکردنـەوەی فکـری ئیسـلامی (نەك ئیسلام خۆی) و پێشخستنی تا پێشـڕەوایەتی بزوتنـەوەی عـەقڵ وەرگرێتـەوە. 2- گێڕانەوەی خەڵکی بەرەو ئەو فکرە و پەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلامە لەژیاندا.

جا ئەو نوێکردنەوەیە لە هەر سەردەمێك بە ئامرازی جیاجیا خۆی دەنوێنێـت بـەپێی بارودۆخی سەردەم، لە سەردەمی خەلافە و سوڵتانەکان - لەگەڵ نوقسـتانیش - (تجدیـد) بریتی بوو لە چاککردنی تاك بە هۆی (امر بالمعروف والنهی عن المنکر)، لەو سـەردەمەدا (نهی عن المنکر) بێ هێزی (تەنفیزی) و بێ دەسەڵات و حکومەت ناکرێت، کـە دەروازەی گۆڕانە، سەردەمی ئێستاش گۆڕینی دەسەڵات بـەهۆی بزوتنـەوەی سیاسـیـیە، بۆیـە ئـەو (تجدید)ە لەژێردەسەڵاتی عەلمانی مانای ئەو رابوونە دەدا، مانـای بزووتنـەوەی ئیسـلامی دەبەخشێ بەپێی باری سەردەم، هـەروەك چـۆن ئیـدارە و جـۆری دەعـوەی مەکـە لەگـەڵ مەدینـە جیـابوو، لـە پێغەمبـەر (د خ) بـۆ حـەزرەتی عومـەر جیـابوون لـەوێش بـۆ سـەردەمەکانی تـر جیـابووە، هـەر سـەردەمەو ئـامرازێکی نـوێ بـەکارهاتووە لەگـەڵ گەشەسەندن و فراوان بوونی حوکمی ئیسلامی سوود لە ئـەزموونی بەشـەری وەرگـیراوە.. بۆیە دەعوەی پەیامی لە سەرەتاوە لە سەردەمی جادوو بە دژە جادوو کـراوە، بەلاغـە بـە دژە بەلاغە، فکر بە دژە فکر.. ئێسـتاش سیاسـەت بـە سیاسـەت.. لەگـەڵ جیاوازیـەك (دژەجـادوو، بەلاغــە، فکـر، ... سیاسـەت)ی ئیسـلامی جیایـە لـە جەوهـەردا لەگـەڵ بەرامبەرەکانی.

ئـەو میکانیزمــە مێژووییــەی ئیسـلام هۆکـارێکی بـەهێزی بـەرپابوونی (ڕابـوون) و دروسـتبوونی بزووتنـەوە ئیسـلامیەکانە، هـەمان ئـەرکی (تجدیـد) و درێـژکراوەی (خـط الأنبیـاء)ە، گیروگرفتەکان و پرسیارەکانیش هەمانن کە ڕووبەڕوویان بویتەوە، وەك: ئـەرێ تازە بەتازە ئیسلاممان دەکەن؟ باب و باپیرانمان هەر وابووینە؟ بۆ خۆت باش بە هـەقت لـە خەڵك نەبێت؟ ئەوە حزبایەتیە! ئەوە سیاسەتە! خەڵك هەڵخەڵەتاندنە! ((وانهـم لیصـدونهم عن السبیل ویحسبون أنهم مهتدون))زخرف/37.

ج/ هۆكارە نەقلیەكان:

واتە ئەو ئایەت و فەرمودانەی كە داكۆكی لە (جماعە) و (حوكمی ئیسلامی) و (حوكم بە قورئان و سوننە) و باسەكانی سیاسی دەكات و ئەركی شەرعی دادەڕێژێ كە بزوتنەوەی ئیسلامی دروست بكرێ لەو بارودۆخەدا.

+ لەبارەی بێكەم و كوڕی ئیسلام وەك بەرنامەی ژیان: ((الیوم أكملت لكـم دیـنكم)) ((افحكم الجاهلیە یبغون ومن أحسن حكما لقوم یوقنون))المائدە:50.

+ لەبارەی حوكم تەنها بە قورئان و سوننە: ((ان الحكم الا للە..)) ((ألـیس اللە بـأحكم الحاكمین)).التین/8

+ لەبارەی حوكمی نائیسلامی و عەلمانی هەر بەزۆرداری نیشـان داوە: ((ومـن لم یحكـم بما أنزل اللە فأولئك هم الظالمون، ..فاسقون،.. كافرون)).

+ قورئان وەسفی خۆی دەكا ((تبیانا لكل شـيء)) بە گشتگیری و بـێ بەجێهێشـتنی هیچ بوارێك بۆ یاسای تر.

+ ئیسلام سەركردەیە نەك تابع: ((كذلك جعلنـاكم أمـة وسـطا لتكونـوا شـهداء علـى الناس..))البقرة/143 ((أفمن یهدي الی الحق أحق أن یتبـع أمـن لا یهـدي الا أن یهـدی فما لكم كیف تحكمون))یونس/35.

+ لایەنگیری ئیسلام نەك فـەرمانڕەوای سـتەمكار (بـا ئیسـلامیش بێـت)، ((اتخـذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون اللە..))التوبة/31.

+ لەبارەی گەڕانەوەی حوكمی ئیسلام و ڕابوونی ئیسلام ((ولقـد كتبنـا في الزبـور مـن بعد الذكر أن الأرض یرثها عبادي الصالحون))الأنبیاء/105. ((سیبلغ هذا الدین ما بلـغ اللیل والنهـار))فـەرموودە. ((بـدأ الإسـلام غریبـاً وسـیعود غریبـاُ فطـوبی للغربـاء))رواە مسلم.

+ لەبارەی گوێڕایەڵی بۆ (سەركردە و حـوكمی ئیسـلامی) و دژایـەتی (سـەركردایەتی عەلمانی). ((المرء مع من أحب)). ((لا تتخذوا الكافرین أولیاء من دون المؤمنین))السـبأ/144. ((الم تری الی الذین یزعمون أنهم أمنوا بما أنزل الیك وما انزل مـن قبلـك یریـدون أن یتحاكموا الی الطاغوت..))نساء/60. ((ان هذا صراطي مستقیما فأتبعوە ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبیلە))الأنعام/153.

+ لەبارەی پەیڕەوی عەلمانیەتی وڵاتانی موسوڵمان نشین: (ویقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض ويريدون أن يتخذوا بين ذلك سبيلا))النساء/150.

+ لەبارەی خەبات و تێکۆشان و جیهاد بۆ هەموو سەردەمێك: ((قاتلوا الذين لا يؤمنون بالله ولا باليوم الآخر ولا يحرمون ما حرم الله ورسوله ولا يدينون دين الحق))التوبة/29.

+ ئەو فاكتەرانەی ئیسلام تێکدەکەن: ((ومن الناس من يقول آمنا بالله واليوم الآخر وما هم بمؤمنين))البقرة/8. ((وإذا قيل لهم لا تفسدوا في الأرض قالوا انما نحن مصلحون))البقرة/11. ((أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض))البقرة/85. ((ومن الناس من يعجبك قوله في الحياة الدنيا ويُشهد الله على ما في قلبه وهو ألد الخصام))البقرة:204. ((ويقولون للذين كفروا هؤلاء أهدى من الذين آمنوا سبيلاً))السبأ/51. ((قالوا آمنا بافواههم ولم تؤمن قلوبهم))المائدة/41.

هەروەها ئەو چین ودۆخانەش تێکدەری ئیسلامن:(الأئمة المضلين، العلماء امام باب الأمراء، ولاء لغير الإسلام، ظهور دعوة الجاهلية، جدال المنافقين بالكتاب، مصادقة الكذاب، السلطان الجائر، سبيل الذين لا يعلمون، المتنطعون، قول بلا فعل، زلة العالم، لومة اللائم، نقض العهد، اذا ائتمن خان، ظالمي أنفسهم،...هتد).

ئەو بناغە ئاینیانە ڤاكتەری بە هێزن بۆڕابوونی ئیسلامی. بە پێچەوانەی ئاینی مەسیحی وهەندێ ڕاو بۆچونی فقهی ئیسلامی وینەیەکی ناشرینیان بۆ ئاین کیشاوە ، دەلێن ئەزیەت وقبول کردنی چەوسانەوە پاداشی ڕۆژی دوای لەگەڵە،بیرلە دونیاو نەخشەو پلان مەکەنەوە خوا بە خۆی بۆت دەنیری،لە ح مسیحەوە نەقل کراوەدەلێ: ئێوە بیر لە سبەینێ مەکەنەوە،سبەینێ خۆی چارەنوستان بۆ دیاری دەکات(فلا تهتموا للغد.لأن الغديهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره)[1]،.هەمان گەوهەر لەلایەن ئیمامی شافیعی بە شیعر هاتوە:

---

[1].كتاب المقدس-العهد الجديد مت(34:6).

سـهرت أعيـــن ونامــت عيــون في أمــــور تكون أو لا تكون

فادرأ الهم ما استطعت عن النفس فحملانـــك الهموم جنــــون

إن ربـــا كفـــاك بالأمس ما كان سيكفيك في غد ما يكـــون

له بەرامبەریشد نارِەزایيەکی زۆر لەو (متناقظ) هەیە کە مرۆڤ هیچی لەدەستە خۆ نەبێت وسزاش بدرێ،خیام دەڵێ:

بـۆ هەرچـــی دەچم لەدەسـتی خوا ڕیشـــم

هیچ کارێ بەدەست خۆم نیەهەرچی دەیکەم

ئـەو پێـمی دەکـاهیشـــتا گوناحباریشـم[1]

ابوعلامعری بەشیعر دەڵێ:(ما ولاحیاتی فهل لی بعدمیلادی ولاهرمی بإختیاری) ، ولیم بلاك( 1757– 1827 )بەشیعردەڵێت ئایین وا دەکا مرۆڤ متمانەی بە خۆی نەبێ وئامادە بێ بۆ خۆ بەدەستەوە دان وملی چەماندنەوە بۆ زوڵم ،بەشی زۆری هێزی مادی لە فەلسفە،عەلمانی لە سیاسەت،سەرمایەداری لە ئابوری،..لەو(متناقظ) هاتوە، قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملکوت الله)دەڵێ (بۆیە خواعەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[2]لەوانەوە (ئاین تلیاکی گەلان- الدین افیون الشعوب) لەلای مارکس هات[3]، لە پێش ئەویش بارون دولباخ ووتبوی ئاین هونەری سڕ کردنی میللەتانە تا هەست بە چەوسانەوە نەکەن[4]، پێش ئەوانە خەلیفەیموسولمانان (ولید بن یزید88-126ه) بە گالتەجاڕی بە خواو قورئان لە وەلامی ئایەتی (واستفتحواوخاب کل جبارعنید) دەداتەوە

---

[1]چوارینەکانی خەیام- و: هەژار موکریانی ل19

[2]روجیە غارودی- مارکسیة قرن عشرین-ت:نزیە الحکیم ص146

[3]. دەقی ووتەکەی مارکس لە کتیبی(نحو نقد لفلسفة الحق الهیجلیة- 1844م) وانوسراوە: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي . إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة ، هـو قلـب عـالم لا قلـب لـه ، مثلما هو روح وضع بلا روح . إنه أفيون الشعب .

[4]مارکسیة قرن عشرین ص143

وده‌لێ:

أتوعد كل جبار عنيـــد فهـــا انـــاجبـــــار عنيـــد
فأن لاقيت ربك يوم حشر فقل: يارب خرقني الوليد [1].

له‌گه‌ڵ زۆر ڕاو بۆچونی سوردراو كه‌ واله‌و كۆمه‌لگه‌ ده‌كا ئه‌گه‌ر بیه‌وێ پێش كه‌وێ ئه‌وا ده‌بێ خۆی له‌و چه‌مكه‌ ئاینیانه‌ ڕزگاربكـات كـه‌ بریتیـه‌ لـه‌ پالدانـه‌وه‌و بـێ نه‌خشـه‌یی ،به‌وشێوه‌یه‌ش تا ئه‌وروپا لێی رزگار نه‌بوو پێش نه‌كه‌وتن ،چونكه‌ بیر نه‌كردنه‌وه‌ له‌ به‌یانی ده‌بته‌ هۆی وه‌ستانی گه‌شه‌و پلان، هه‌رچی له‌ ئیسلاما به‌ پێچـه‌وانه‌وه‌ بـه‌ ده‌یـان ئایـه‌ت داوای به‌رگری له‌ ماف ده‌كا ،ئینجا به‌ ڕاشكاوانه‌ ده‌ڵێ :اعمل لدنياك كأنها تعـيش أبـداً .. یان ده‌ڵێ نابێ ئه‌وڕۆ و به‌یانیت وه‌ك یه‌ك بیـت ده‌بـێ پـێش بكـه‌وی ،كه‌واتـه‌ ئه‌گـه‌ر لادانی ئاینی له‌ ئه‌وروپا فاكته‌ری گه‌شه‌یان بوه‌ ئه‌وا لادانی ئاینی لـه‌ جیهـانی ئیسـلامی فاكته‌ری دواكه‌وتنی بوه‌ .

## B/هۆكاره‌ تایبه‌تیه‌كانی رابوون:

هۆكاره‌ گشتیه‌كان زیاتر په‌یوه‌ست بوو به‌ بواره‌كانی دادگه‌ری و كێشـه‌ كۆمه‌ڵایـه‌تی و سیاسی و فكری‌یه‌كانی گشتی واته‌ ( ڕزگاری- كۆمه‌ڵایه‌تی) كه‌ كوردیش وه‌ك میلله‌تانی تر لێی هاوبه‌شه‌، سه‌رباری ئه‌وه‌ له‌ كوردستان (ڕزگاری- نیشتمانی) تایبه‌ته‌ بـه‌ خـۆی و كێشه‌یه‌كی سه‌ره‌كیشه‌ له‌و قۆناغه‌.

ماوه‌ی سه‌ده‌یه‌كه‌ میلله‌تی كورد به‌ش به‌ش كراوه‌و به‌ هه‌موو جـۆر چه‌وسـێنراوه‌ته‌وه‌، له‌ به‌رامبه‌ردا وه‌ك ئه‌ركی ئاینی به‌رگری وجیهادی فـه‌رز ده‌كـات، ئـه‌و ئه‌ركـه‌ زانایـانی ئاینی پێ هه‌ڵساون شۆڕشیان له‌پێناو كردووه‌، هه‌ریه‌كه‌ له‌: سید ته‌ها، مه‌لا سه‌لیم،شـیخ عبدالسلام، شێخ سـه‌عیدی پـیران، قـازی محمـد، هـه‌تا مه‌لامسـته‌فا، هـه‌مووی بـه‌پێی تێگه‌یشتنی خۆی خوازیاری ده‌وڵه‌تێكی كوردسـتانی بـووه‌ كـه‌ شـه‌ریعه‌تی ئیسـلامی لێ په‌یڕه‌و بكرێت، بۆیه‌ خه‌ڵكه‌ ئاین په‌روه‌ره‌كه‌ له‌و كوردایه‌تی‌یه‌ بوونـه‌، كه‌موكوڕیـه‌كان تـا ئه‌و ڕاده‌یه‌ نه‌بووه‌ بزووتنه‌وه‌یه‌كی ئیسلامی به‌جیا دروسـت بكـه‌ن تـا دوای 1976 كـه‌

[1] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص72

تێکڕای باڵەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی ڕوویان لە عەلمانیەت کرد، دواییەکەیان (پـدك)یش کەوتە دوای ئـەو شـەپۆلەو لـە وەسـیەتەکەیقازی و بـارزانی لایـداو لـە کـۆنگرەی 9ی 1979 تۆماری کرد (یسیر الحزب في نظامـه السياسـي والأجتماعي والاقتصـادي علـى ضوء النظرية الماركسية اللينينية ويقوم بتثقيف وتسليح كوادره ومنتسـبيه مركزيـا بهـا)، هەروەها بۆ جۆری (حوکمەکەش) هـاتووە: (نناضـل مـن أجـل حكـم ديمقراطـي.. وتحقيـق التحولات وفق الأسس الاشتراكية العلمية في جميع المجالات)[1].

زیاتر لەوەش نەوەستان تەنیا باوەڕی خۆیان بگۆڕن، ئاینیشیان پـێ ڕێگـر و تێکـدەر و ڕەجعی بوو، هاتنە سەر هەمان ڕای وەسیەتەکەی کۆنگرەی (4)ی حزبی بـەعس 1960 کە هاتووە: (يعتبر المؤتمر الرجعيـة الدينيـة أحـدى المخـاطر الأساسـية أمـام التقـدم)، بـەم شێوەیە ویسترا ئایین نەك هەر لە ژیانی سیاسی، بەڵکو لە ژیانی ئیـداری و فەرهـەنگی و هەڵس و کەوت و دادگـایی و تـا (احـوال الشخصـی) زیـاتر لێ بخـرێ ((والـذين آتينـاهم الكتاب يفرحون بما أنزل إليك ومن الأحزاب من يُنكر بعضه..))الرعد/36. وەك (دایکـی بەنان) گۆتەنی: (وعملوا على فصل الاسلام عن الحيـاه وحصـروه فی المسـجد أو زاويـه أو احتفالات دينيه ليس لها سند من شرع)[2]، بۆیە لە کوردستان زەمینەی خـودی و بابـەتی، ناوەکی و دەرەکی، زانستی و میتافیزیکی، فکری و عەمەلی، مێژوویی واقیعی، نەقلی و سیاسی و ئابووری، کۆمەڵایەتی و نیشـتمانی،.. سـاز بـوو بـۆ پەیدابوونیبزوتنەوەیـەکی ئیسلامی.

ئەوە زۆر بەکورتی و خێرایی پاسـاوی بزوتنـەوە ئیسـلامیەکانە شـان بەشـانی لایەنـە عەلمانی و نیشتمانیەکانمان باس کرد، هەڵبەتە بە ڕوانگەی ئیسلامیەکان بوو، بەشـێکیش شیکردنەوەیی ڕای خۆمان بووە، ئەوانە خاڵی هاندەری دروست کردن و تـاودانی رابـوون و بزووتنەوەی ئیسلامیە لە کوردستان، بـەڵام کۆمـەڵێك خـاڵی گرفـت و تەگـەرەش هەیـە لەپێشیان.

[1] المنهاج= المادة (5) والمادة (6). کۆنگرە (9)
[2] المؤامرات الدولية ضد الإسلام.

## 8- 2 ئەو گرفتانەی ڕوبەڕووی ڕابوونی ئیسلامی لە کوردستانن

## گشتیەکان:

مەبەست لەو گشتیە ئەو گرفتانەن کە سەرتاسەری کۆمەڵگەی ئیسلامی لە هەموو جیهان پێی گرفتارن ڕابوونیان پێ هەرس ناکرێ، بە تایبەتی لەلایەن خەڵکە عەوامەکە، بەکورتی بە چەند خاڵێك باسیان دەکەین:

1- دروستبوونی بزوتنەوەو لایەنی ئیسلامی ئەزموونێکی نوێیە لە مێژووی فیقهی ئیسلامیدا، کەمتر ئەو بابەتانە باسکراوە، ڕای گشتی بۆ ئامادەنەکراوە، هەر بەگشتی لە (ڕاڕەوەی سوننە) دەبینین ڕای گشتی بۆ نوێژ و ڕۆژوو و حەج و بەشێك لە حەرام و حەڵاڵ دروست کراوە، بەڵام بۆ بابەتە گرنگەکانی جیهاد، بیروباوەڕی ئیسلامی، فێربوون، حوکم بە ئیسلام، ... دروست نەکراوە، بۆیە لەگەڵ هەر تەقەلایەك بۆیان گرفتێکی زۆر قووت دەبێتەوە بە کۆمەڵێك پرسیار هەروەك ئەو پرسیارانەی لەبارەی ڕابوونی ئیسلامی دروست بووە وەك: ئێوە تازە بەتازە ئیسلامان دەکەن؟ ئەوە بەکارهێنانی ئاینە لەپێناو مەرامی پایەو تەخت، ئایین پیرۆزەو تێکەڵی دونیایی مەکەن، تێکی مەدەن، هەر ئەوەمابوو ئەویشتان تێکدا،...هتد. زۆر پرسیاری تر کە زیاتر لەلایەن دەزگاکانی ناحەزانی ڕابوون دەوروژێ.

2- لەکۆنەوە بەرەبەرە ئاینی ئیسلام و دەسەڵاتی سیاسی لێك جیابووەتەوە، وەك پێشبینی کرابوو ( ..ان الکتاب والسلطانسیفترقان..)[1] بەو شێوەیە بنچینەیەکی قووڵی شەرعی و دەروونی بۆ لێك جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەت بەدی دەکرێ. ئیتر زۆربەی زانایانی ئیسلامی کەمتر بەلای کاری سیاسی و دەسەڵات چوونە، بەتایبەتی لەدوای خۆسەپاندنی (معاویە) و ڕاوەدوونانی زانایان وای لێکردوون کەمیش لەسەر سیاسەت بنووسن، جگە لە هەندێ سەرچاوەی دەگمەنی وەك (سیاسە الشرعیة- ابن تیمیة)،طرق الحکمیة، احکام السلطانیة،...بەشێکی زۆریش لەو جۆرە کتێبە بەدەستنووس ماونەتەوە بە هۆی مقەسی سانسۆر یان لە بەر ترسی خۆی[2] .

---

[1] اخرجه الطبرانی فی الکبیر 20\90 والصغیر 1\264 ...

[2] بۆ زیاتر بڕوانەپاشکۆی کتێبی (ئیسلام وسیاسەت- ئارام قادر)تیایدا ئەو لیستە دوورو درێژەی ئەو کتابە سیاسیانەی لەلایەن زانایانی ئیسلامی نووسراوەتەوەو بڵاو نەکرایتەوە .

لەسەردەمی نویش بەشێکی زۆر نکوڵی لە بـوونی دەوڵـەت و دەسـەڵاتی سیاسـی لـە ئیسلام دەکەن، لەوانە بەشێکی زانایانی ئایینین کە عادەتەن سەر بە دەسـەڵاتی عـەلمانین، ئەو بۆچوونە لە کەمی زانیاری ورد دێت ئەگینا لە بنەچـەدا سیاسـەت بـە مانـاو زاراوەو ووشە بۆ کەلتووری ئیسلام دەگەڕێتـەوە نـەك یۆنـانی، چـونکە سیاسـەت (Polltiqar)ی (ئەرستۆ)[تر*] بە ماناو مەبەستی مەدەنیەتە نـەك سیاسـەت بـووە.. لـەنێو کۆمەڵگـەی ئیسلامیدا دوو هۆی سـەرەکی هەیـە بـۆ ئـەوەی ئـایین لـە سیاسـەت و دەسـەڵات لێـك دووركەوێتەوە:

1/ هەڵسوکەوتی نیگەتیڤی بەشێکی زۆر لە خەلیفەکان.

2/ پەیڕەوکردنی ڕێبازی میکاڤیلی لە ڕێبازی سیاسەتی نوێدا..

کە دیمـەنی سیاسـەتی زۆر ناشـیرین کـردووەو بووەتـە پێشـەیەکی شـەرم، سـەرلەنوێ زانایەکی زۆر فەرمایشتی (اعوذ بالله من الشیطان والسیاسة) دەڵێنەوە، تا ئـەو سـاتەش هێشتا وشەی (سیاسەت) بەناوناتۆرە دەزانـن و بـەخێرایی ڕەتـی دەکەنـەوەو دەڵـێن مـن سیاسی نیم، جا ئەگەر زانایان ئەو ڕایەیان هەبێ هەڵبەتە خەڵکی عەوام زۆر خراتر دەبـێ، تا وای لێ هات سیاسەت ببتە موڵکی خەڵکی فڕوفێڵ بـاز و دوورەئـایین و ئـیتر هەرچـی ئەو پێشەیە بکا ئەو نیشانانەی پێوە دەنووسێ. جا بۆ هـەر تەقەلایـەکی ڕاسـتکردنەوەی ئەو تێگەیشتنە چەوتە پێویستی بە زانیارییەکی مێـژوویی و لێـك جیاکردنـەوەی ڕاڕەوی میکاڤیلی لەگەڵ ڕاڕەوی سیاسەتی ڕەواییە، چونکە واباوە کـە میکـاڤیلی دامەزرێنـەری سیاسەتی سەردەمە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە دامەزرێنەر و مونەزیری ڕاڕەوی سیاسـەتی عەلمانیەنەك هەموو سیاسەت، ئەو تێکەڵیە دیمەنی سیاسەتی بەگشتی ناشـیرین کـردووەو زانایەکی زۆریـش کـە زانیـاری کەمـە بانگێشـەی (ئـایین دوور لـە سیاسـەت) دەکـەن، دەسەڵاتداری عەلمانیش زۆر هاندەری ئەو ڕەوتەیە بـە ترغیـب و ترهیـب، ئـیتر گرفتێکـە

---

[*] لە ڕاستیدا لە نێوان ئەرستۆو ئەفلاتوون تێکەڵێەك هەیە، واباوە گوایە ئەرستۆ لە بـارەی سیاسـەتی نووسیە بە هۆی ئەو کتێبەی سـەرووی، هەرچـی کتێبـی (ڕیپۆپلیـك)ی ئەفلاتوونـە گوایـە بـاس لـە جەمهوریەتەو ئاوا هەریەکەیان تەرجەمە کراوە،بەڵام بـە وورد بوونـەوەو بـە ڕای هەنـدێ چـاودێریش دەردەکەوێ کە پۆلیتیکی ئەرستۆ مەدەنیەت دەگرێتەوە نەك سیاسەت، هەرچی ڕیپۆپلیکی ئەفلاتوونە مانای (پڕۆسەی گشتی )کە دەکاتە سیاسـەت نـەك جمهوری،کەواتـە ئەفلاتوونـە لـەبارەی سیاسـەتی نووسیوەزیاتر،لە وەر گێڕانی کتیبەکانی ئەفلاتون وئەرستۆ کیشە هەیـە، کتیبـی (اثولوجیـا ارسطو) لە ئەسل ئەفلاتونیە بە هەلە کە وەرگێردراوە بۆ عربی بوە بە ناوی ئەرستۆ تیایـدا فارابیشیان لێ بەهەل بردوە – بڕوانة: مقدمة : اراء اهل المدينة الفاضلة ص17 .

لەپێش ڕابوونی ئیسلامی کە تیایدا زانایان و عەوامی ئیسلامی و عەلمانیەتی دەسەڵاتدار هاوبەش دەبن.

3- سەرهەڵدانی فرەتەیار و فرە مەدرەسە و فرە لایەنی ئیسلامی، هەڵبەتە هەر فرەییەك بۆ هێنانەدی یەك ئامانج بێ ئەوا دەبێتە (بدیل) بۆ یەکتریش، ئیتر ئاساییە ناکۆکیش سەرهەڵدەدا، ئاکامە نێگەتیڤەکانی گەلێ زۆرە ناژمێرێ لە دووبەرەکی و سەرقاڵ بوون بە یەکەوەو دەبێتە هۆی وەرگەڕانی ڕاستیەکان و جێگۆڕکێی: لاوەکی بۆ جێی بنچینەیی، ئامراز بۆ جێی ئامانج، گۆڕاو بۆ جێی نەگۆڕ، وەختی بۆ جێی دائیم، تاکتیك بۆ جێی ستراتیژ، ناحەز بۆ جێی دۆست، توندی بۆ جێی نەرمی،...

ئیتر هەریەکە لەوانەش کۆمەڵێك ئاسەواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەقیدەیی و فەرهەنگی و دەروونی و جەماوەری ترسناك پەیدا دەکا.. لە هەمووان گرنگتر (وەك لەخاڵی 2 باسکرا) زۆر بەسانایی بۆچوونە چەوتەکەی (دورخستنەوەی ئاین لە سیاسەت) دەسەلمێنێ و ئەو بەرەیە بەهێز دەکا، بۆیە فرەلایەنی ئیسلامی گرفتێکی هەمیشەییە لەپێش ڕابوون، ڕاستە تەیاری ئیخوان کۆنن بەڵام ئەزمونی ئێرانی 1979 و دروستکردنی جەمسەر و قەڵایەکی واقیعی بۆ ڕابوونی ئیسلامی وای دروستکرد (لەگەڵ کۆمەڵێك سەلبیاتیش) پێویست بوو هەموو لایەك بە دوورو قووڵی و هەمەلایەنی و بە لێکدانەوەیەکی شەرعیانە جەمسەری تریان دروست نەکردبایە مادام حزبایەتی لە ڕابوونی ئیسلامیدا ئامرازە، هەڵبەتە کۆمەڵێك هۆکاری تری بەدەر لە (شەریعەت) لەوانە شۆڤێنیەتی حزبی و ناشیۆنالیزمی (بەتایبەتی ئەو بیرەی گوایە خیلافەت هەر بۆ عەرەبە) وای کردووە تەیاری ئیخوان و تەیاری سەلەفیە جیاجیاکان دژ بەیەکتر لەدژی عەجەم وکورد کاری سیاسی بکەن بە پێشبڕکێی (مزایدە) تا ڕادەی (توندوپەڕەگری)، تا فرە تەیار و فرە جەمسەری ڕابوون دروست بوو.

4- لەگەڵ ئەو هەموو خزمەتەی (کیانی فقهی)[1]، کۆمەڵێك خاڵی لاوازی هاوردووە، لەوانە زۆری و فرەیی مەزهەب، نوێنەبوونەوە، گرنگی نەدان بە زانست و تەکنۆلۆجیا، نەبوونی مەرجەعیەت و مەرجەعیەتی سیاسی،.. ئەو خاڵە لاوازانە بەسانایی پەڕینەوە

---

[1] فقهی ئیسلامی و شەریعەتی ئیسلامی لێك جیایە، شەریعەت بریتیە لە قورئان و سوننە، کاتی فکری مرۆڤ دەکەوێتە سەر شەریعەت ئەوا پێی دەوترێ فقه.

نێو ڕابوون، دیمەنێکی دواکەوتـەیی و کلاسـیکی پێشـان دەدا ناتوانـێ ببێتـە بـەدیل بـۆ ماکینەکانی عەولەمە.

## گرفتە تایبەتیەکان:

مەبەست لەم بەشە ئەوەیە سەرەڕای ئەو گرفتانەی پێشوو ئەو گرفتە تایبەتیانـەش لـە کوردستان هەیە، بەکورتی لەسەری دەدوێین:

1- کوردستان داگیرو دابەشکراوە بە سەر سوریا، عێراق، ئێران، تورکیا.. ناویشـیان دەوڵەتی ئیسلامە، وا دەردەکەوێ کە مافی کـورد لەلایـەن ئیسـلام خورابـێ، بەتایبـەتی کاتێ دەبینرێ لەو هەموو مەینەتیەی بەسـەر کـورد هـاتووە لـەو وولاتـە ئیسـلامیانە و جامیعەی عـەرەبی و کۆنگرەی ئیسلامی و ڕێکخراوێکـی لـەو جۆرانـە بـە هانـای کـورد نەهاتوون، ئیتر دیمەن و ڕای گشتیەك بەسانایی بـیرو ئـەقڵی کـورد دەوروژێنـێ کـە هـەر ئیسلام چەوسێنەری کورد بووە، گەلێ جار باس لەوە دەکراو دەکـرێ کـە تـالان و ئـەنفال یەکەم جار نیە عەرەب لەگەڵ کوردی کـردووە، داگیرکردنـی کوردسـتان بـەناوی (فـتح)ی ئیسلام ئەنفالی یەکەم بووەو ئـەنفالی بەعسـیش دووەمـە، بـۆ ئـەو مەبەسـتە تەقـەلای جۆراوجۆر دراوە، وەك تەقـەلای دروسـت کردنـی ئـەو پێسـتەیەی گوایـە لـە هـەورامان دۆزراوەتەوە کە تیایدا باسی ئەنفالی یەکـەمی سـەردەمی (فـتح) دەکـا- لەمەوسـوعەی جودی —چەمکی کوردستان- درێژەکەی بخوێنەوە، زیاتر لەوانەش پرسیار و فەرمایشتێکی چەوتی وەك گۆتـەی: (خـودی فکـری ئیسـلامی لـە خزمـەت شـۆڤێنی و ناسـیۆنالیزمی عەرەبیدایـەو بەشـێکە لـە فەرهـەنگی داگیرکـاری)، (بـەهۆی ئیسـلام کـورد دەبێتـە خزمەتکاری عەرەب)، پرسیاری تری وەك (ئیسلام کورد دەکاتـە بـەلاگێڕی خـۆی کەچـی میللەتانی تر ئیسلام دەکەنە بەراگێڕی خۆیان) ئەرێ ئیسلامیەکان یەکەم جار کوردن یـان ئیسلام؟هەمووی سودی لەئیسلام بینیوە تەنها کـورد نەبێ...لەگـەڵ زۆر گەلالـەی ترکـە ئیسلامیەکان بە چاکی وەلاّمیان پێ نیە ئەگەر چی وەلاّمیشی ئاسانە.

هەموو ئەو ڕایە چەوتانە پتەوتر دەبێ کاتێ دەبینرێ:

أ/ زانایەکی تێنەگەیشتووی عـەرەبی باسـی بزوتنەوەیـەکی کـورد بـە خراپـە دەکـاو بێدەنگیشە بەرامبەر هەڵسوکەوتی بەعس یاخود شۆڤینیەتی عەرەب .

ب/ لەو ماوە دوورودرێژەی تەمەنی (ئیخوان) کە زیاتر ئەوان لە گۆڕەپان بوون، بە ڕاگەیەنراوێك یا نارەزاییەکیان لێ نەبینراوە کە لەدژی ئەو تاوانانەی دژی کورد کراون،هەرچەندە هەلوێستی شەخسی هەبووە بەلاَم بەناوی ئیخوان نەبووە ،تەنانەت لە (بلاَوکرایەوەکی ئیخوان ژ:3)دروست بوونی دەولَەتێکی کوردی لەلایەن ئیخوانی عێراقیەوە بە (حرامی شەرعی) وەسف کراوە،کەچی لە بلاَوکراوەی 28/ئایار/1964 لەبارەی(میثاق الوحدة العربیة) بەتایبەتی وحدەی عێراقی ومیسری ئەوسا بەتوندی لایەنگیری کراوە،ناشبێ ئەوەش لەبیربکەین لەهەمان کاتدا دژ بەوهەلمەتەی حکومەت بووینە بۆ سەرکورد وبنەمای(هاوولاَتیبوون)یان کردۆتە چارەسەر[1]،جاریش وایە زیاتر لەوە یارمەتی کوردیان داوە بوویتە هۆی توومەت لەلایەن حکومەت[2].

2- ڕاستە لە بنەچەڕا مەینەتی کورد لەسەر دەستی ڕۆژئاوا و بیرەکانی عەلمانی دروست بووە، لە سایکس- پیکۆ 1916، سان ڕیمۆ 1920، قاهیرە 1921..، بەلاَمئەو مێژووە لەچاو خەستی واقیعی ئێستا لەبیرکراوە، وا دەبینرێ داگیرکەر موسولَمانن، پالَپشتە بەرچاوەکانیان موسولَمانن، بێدەنگەکانیش هەر موسولَمانن، زیتر لەوەش کە کوردی بی حکومەت وبێ چەك بزانە جیهانی ئیسلامی چی پێکردوە : لەسالی 1963لە هەلمەتی یەکەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەکانهێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا بەپێی مادەی(2)ی (معاهده الدفاع المشترك بين دول الجامعه العربيه)کە لە 1950/4/13 مۆرکرابوو، لەوێشەوە بۆ هاوپەیمانیەکی سەربازی نێوان سوریا وعێراق کە لە 1963/10/8بەسترا بوو دەقەکەی لەخوارەوەیە[3]،پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفڕۆکەوانانی یەمەن وهێزی هندی وپاکستانیش یارمەتی

---

[1]بڕوانە:الإخوان المسلمین فی العراق(1959-1971)-دکتورە ایمان عبدالحمید دباغ -ص590 ،ص579 ئەو هەلویستەی د قرزاوی و هەندی زانای تری عەرەب لە بارەی حرامی جیابوونەوەی خارووی سودان بەهەمان پاساو بووە، گوایە جیا بوونەوە لە جسمی ئیسلام حەرامە! هەلەکوشندەکە لەوەیە کوا ئەو وولاتانەی عربی جسمی ئیسلامن ئەوانە بەدەستورو ئینتماوە عەلمانین دوور لە ئیسلام.

[2](هـ س ص591)-نوسراوی ژ:م ا ب/5860لە 1962/9/23 ئاسایشی عێراق .

[3]میثاق الوحدة العسکریة بین سوریا والعراق بغداد - دمشق 1963/10/8.... المادة 2: تشکیل مجلس دفاع اعلی مؤلف من القائد العام للقوات المسلحة للجیش الموحد، وثلاثة أعضاء من کل قطر یعینهم المجلس الوطني لقیادة الثورة. دەقی ئەو ڕێکەوتنە لە پاشکۆی ژ:3 لە کۆتایی کتیبی(ڕۆلی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەتی کورد) بخوێنەوە .

عێراقیان دا[1]، له ئەنفالی دووەمی 1988 لەسەرئاستی عەرەبی تەواوی جامیعەی عربی پالپشتی عێراق بوون دژ بەکورد،زیاتر لەوەش هەندی وولاتی عەرەبی دیسان هێزیان نارد بەشداری ئەنفالی کردوە (وەك لە دانپێهێنانی مدیری هەوالگری گشتی بەعس) دەڵێت:یەمەن بە لیوای(عروبە)وئوردەنبەلیوای(یەرموك)وسودان بە(متطوعین)ووولاتانی کەنداویش بە یارمەتی مادی بەشدار بووینە[2].

بینرا لە تەنگانەکانی کورد هەر ڕێکخراوی غەیرە ئیسلامی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە هانایان هاتننەك جیهانی ئیسلامی[3]، واتە ڕایەکی نیمچە گشتی دروست دەکا کە (ئیسلام و موسوڵمانان) دۆست و ڕزگارکەری کورد نین، بۆیە وا دەردەکەوێ ڕابوونی ئیسلامی ناحەز بۆ کورد زیاد دەکا،ئەوەش گرفتێکی سەختە لەپێش ڕابوون.

3-پالپشت بەو ڕوون کردنەوەی خالی 2ئیحراجیەکی زۆر بۆ هەر بزوتنەوەیەکی ئیسلامی لە کوردستان سەر هەلدەدا،ئەویش ئەوەیەئەوان وەك هەموو حزبێکی تری نێو میللەتانی ژێر دەستە لەسەر دوو تەوەر دەڕۆن،بەشێکی ئامانجیان کوردستانیەلە تەوەری رزگاری نیشتمانیەوەکە لە حزبە کوردستانیەکان نزیك دەبنەوە،کەچی کەدیتە سەر تەوەری‌دوەم رزگاری کۆمەلایەتی ئەوا لەلایەنە ئیسلامیەکانی جیهانی ئیسلامی نزیك دەبێ،تا ئەو ساتە هیچ لایەکی ئیسلامی کوردستان نەیتوانیوە هاوسەنگی وهەماهەنگی لە نێوان ئەودووتەوەرەدروست بکا.

4- لەژێر ئەو بارودۆخەدا بە ئیسلامی کردنی کێشەی کورد دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەو تاکە دۆستەی ڕۆژاوا بێ بەدیل.

5- ئەوانەی سەروو لە بارەی پالپشتی بە کردەی وهەلویستی جیهانی ئیسلامیە ، بۆ ئەوەی ماکینەی ئیعلامی ئیسلامی لە کوردستان نەکەوێ بتوانی بلێ ئەوانە نوینەرایەتی ئیسلام ناکەن پێویستی بەوە هەیە چەند بەڵگەیەکی (فقهی رزگاری) بۆ مافی چارەنوس پێش کەش بکا لەوەش زۆر دەست کورتە ،لەکاتێ دەبینین کۆمەلێك مادەو بڕیاڕ هەیە لە

---

[1] ڕۆژانی لە مێژووی شۆرشی ئەیلول - ل168

[2] وفیق سامرائی- حطام بوابة الشرقیة ص130 .

[3] لەو کاتی کە عەرەب و وولاتانی ئیسلامی گەلە کۆییان لە کورد کردیەکێتی سۆڤیەت سکاڵایەکی بەرزکردەوە بۆ نەتەوە یەکگرتوە(رقم E/3809 9تموز 1963 الجلسة 36)تیایدا داوای کرد ئەو پەلامارە عربیەی بۆ سەر کوردستان بە جینۆساید لە قەلەم بدرێ .

نیودەوڵەتی هەیە بۆ مافی چارەنوسی گەلان وەك: مادەی (1) و مادەی (55) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان تۆمار کراوە، هەروەها بریارەکانی: ژمارە 1514 خولی(15)لە14/دیسمبر/1960، بڕیاڕی ژ:2105 خولی (20) لە1965ز، بریاری ژ:2625 خولی 25 لە24/ئۆکتۆبەر/1970، بریاری ژ:3070 خولی28لە 1975، هەروەهابریاری 3314سالی 1974... لەهەمان ئەنجوومەن دەرچووە، ئینجا پێشوو لە 14 خالەکەی ویلسونی ئەمریکی لە ساڵی 1918 ولێدوانە هاوبەشەکەی بریتانی - فەرەنسی لە 1918، بنەماکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری 1917ی رووسی و شۆرشەکانی پێشوی ئەمریکی 1776 و فەرەنسا 1789 هاتووە،زیاتر لەوەش هەر 3 مادەی 62 و63 و64ی سیڤەر و مادەی 16ی ئینتداب بەسەر عێراق و..زۆری تریان هەیە بیکەنە بەڵگەو منەت بەسەر بزوتنەوەی کوردایەتی ودەلین ئیمە بە پالپشتبەوانەو بۆ ئەوانە ئیش دەکەین ئیوە چیتان هەیە لە ئاین بۆ کورد ؟!! تا ئیستا ئیسلامی لەکوردستان وەلامی دەوڵەمەندی بۆ ئەو گرفتە کوشندانە نیەلەسەر هەردوو ئاستی فقهی وسیاسی،هەرچەندە وەڵام هەیەو فقهی رزگاری لە ئاینی ئیسلام ئاوا لاواز نیە ،گرفتەکە لەوەیە مونەزیری ئیسلامی بۆ (فقهی رزگاری) لاوازە..ئەگینا ڕەنگە پێچەوانە بێت ،بۆ ئەو مەبەستەو زیاترزانیاری لەبارەی بەرپرسیاریەتی عەلمانی لەمەینەتی کورد بڕوانە:(ڕۆلی عەلمانیەت لەدروست بوونی مەینەتی کورد)،فقهی رزگاری کوردستان نابێ بۆ فقهی مەزهەبەکان بگەڕێتەوە چونکە ئەو کاتی ئەو کێشە نەبوە،ئینجائەو فقهە کەم وکوڕی هەیە لە (نەسەب) بۆ غەیرە عرب،دەتوانێ ڕاستەوخۆفقهی رزگاری کورد لە سەرچاوەی ئەسلی وەرگرێ، هەرچی لە بارەی سیاسیشەلەو سەردەمە بەڵگەنامەی زانایانی ئایینی وبزوتنەوە ئیسلامیەکان زۆر کەمە کە بتوانی شانازی پێ بکەی، ئەوەی هەشە وەك بەڵگەنامە زیاتر بۆ زانایانی شیعە دەگەڕێتەوە،بۆیەش سەرکردە کوردەکان زیاتر هاوپەیمانیان لەگەڵ ئەوان هەبوە وەك:هاوپەیمانی شیخ محمودو ئایەتواللە شیرازی سەرۆکی شۆرشی بیست،دوای هاوپەیمانی بکرصدقی کورد وئایەتواللە کاشف الغگاو،دوای مەلا مستەفا لەگەڵ محسن الحکیم، تادەگاتە هاوپەیمانی ئیستای بارزانی وتالەبانی لە گەل حزب وسەرکردە شیعەکان،ئەوانە بەڵگەنامەن، زیاتر لەوەش محسن الحکیم لەدوای هەلمەتە ئەنفالیەکانی عبدالسلام عارف بۆ سەر کوردستان لە 1963-1964 کۆنگرەیەکی ئیسلامی رێکخست لە بەغدا

زانایەکی زۆر ئامادە بوون لەوانە (شیخی ئەزهەر) بۆ ئـەوەی بـە فتـوا کـورد بـە یـاخی (مارق) هەژمار بکەن بە پێی ئایەتی:(إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)،لـەوەوە لـە 5ی تـەموزی 1965 فتوا بە ناوبانگەکـەی محسـن الحکـیم دەرچـوو دژ بـەو کـۆنگرەو دژ بـە شـەڕی کورد،هەروەها (علی سیستانی)مەرجەعی شیعەی ئیستایان دووبارە لە بارەی کوردفتـوای فیـدرالی هەیـە[1]،یەکـەم وەسـیقەی(فتوایی) ئاینیـە سـەبارەت بـە دۆزی کورد،بـۆ عێراقلەدەستور بە هێز ترە.

6-ئیسلامی عەرەب وناشیۆنالیزمی عەرەب پێکەوە پێیان وایـە ئـەو سـنورانەی لـە نێوان وولاتانی عەرەبی دەستکردەو زادەی پلانی ئیمپریالیزم وزایۆنیە لە سایکس پیکـۆی 1916 بناغە ڕێژکراوە...،ئەوەیان هەقەو ڕاسـتە بـەڵام کەدێنـە سـەر هـەمان دابـەش وسنور لەنێوانعێراق و دراوسێکانی کە بوویتە هۆی دروست بوونی سـنوری دەسـتکرد لـە نێوان پارچەکانی کوردستان ئەوا بە180پلە گوتاریان دەگۆڕێ و دان بەوە نانێن.

7- زۆربەی پرۆسەکانی داگیرکەران بـەناو زاراوەی کـەلتوری ئیسـلامیە، وەك نـاوی ئەنفال، پەلامارە سەربازیەکانی بەناوی خالد بن ولید، قعقاع، توکلت علـی الله،..کەچـی نـاوی دەسـکەوتە زانسـتیەکان بـە نـاوی ئاشـوری وسـۆمەری وبـابلی بـووە، هـەروەها کاردانەوەی گۆڕینی ناوە کوردیـەکانی شـاخ و شارۆچـکە و دێیـەکان بـەناوی عـەرەبی و ئیسلامی کاریگەرییەکی قـووڵی ڕاسـتەوخۆی فەرهـەنگی و دەروونـی دەبێـت و دیمـەنی ئیسلام و بزوتنـەوەی ئیسـلامی بـەنامۆ و ناشـیرین و ناحـەز دێتـە بەرچـاو، بەتایبـەتی لەماوەی دروست بوونیشیان نەیان توانیوە ئـەو تـەم و مـژە بڕەوێننـەوە، ئیتربـە سـانایی بە(تابور الخامس- قۆڵی پێنجەم) دێنە بەرچاو، دەبێتە گرفتێکی سەخت لەپێش ڕابوون.

8- کۆمەڵێك خاڵی تری گرفت هەیـە بەسـادەیی دەردەکـەوێ، بـەڵام زۆر گـرنگن و گاریکەری سایکۆلۆجی ترسناکی هەیە، لەوانـە: ئـەزموونی لەشـکری ئیسـلامی کـە لـە

[1]دەقی فتواکەی (24ذی الحجة11424)سەبارەت بە فیدرالی کە لە وەسیقە رقم53 دەرچوە ،ئەوە دەقەکەیەتی: ((ان اصل الفدرالیه ونوعهاالمناسب للعراق،.. ومن المؤکد ان ممثلی الشعب الکوردیالعزیزفی مجلس کتابة الدستور سیتوصلون مع سائر اخوانهمالعراقین الی صیغةمثلیتحفظ وحدةالعراق کما تحفظ الحقوق جمیع اعراقة وقومیاته))—النصوص الصادرة عن السید السیستانی فی المسألة العراقیة ص280

سەرەتای جـەنگی ئێرانعێـراق لـە 1980 دەسـتکردانە دروسـتبوو، بـە گـرو فـرێکیش لەناوبران، ئیتر هەر ئەزموونێکی ئیسلامی وا دەهاتەوە بەرچاو کە دەستکرد و نارەسەن و وابەستە و لەرزۆك و بێ چارەنووس بن،دوایش لەئەزموونی براکوژی شکست دووبارە بـۆوە تا ئەو ساتەش ئەندام ولایـەنگرانیان لـەژێر ئابلوقـەی سیاسـی وکۆمەڵایـەتی وئـابووری ویاساییەو ئەوەش دەبێتە ئابلوقەی کۆمەڵایەتیش، هەروەها خـاڵێکی تـریش ئەوەیـە لـە شۆڕشی نوێدا سەرکردایەتی عەلمانی کورد بۆ یەکەم جار بێ پاڵپشت بە سەرکردەی ئـاینی توانی شۆڕش هەڵگیرسێنێتەوە بە سەرکەوتوانە، ئیتر هەرچی بەجیا دروست بێـت بـەناوی جیاو چەتری جیا، ئەوا بە بارگرانی و فیتی دوژمنان دەردەکەوێ، بەتایبەتی ئەگەر ناکۆك بن لەگەڵ ڕابـەری شۆڕشـی نـوێ، زۆر خـاڵی تـر هەیـە، لـە هـەمووان گـرنگتر ئەوەیـە کۆمەڵگەی کوردیش لە بەهاو نەریتە ڕەسەنەکانی خۆی خزیوە، کۆمەڵێك بەهای عـەلمانی مادیو بەرژەوەندی هاتبووە جێی کە کـەمتر ڕاسـتی و دروسـتی و مـەبادیئی وەردەگـرێ زیاتر مەیلی بەلای خواروخێچی و چەواشەیی دەبێ. کە تێکڕا دەبنە گرفـت و گرێکـوێرەی ترسناك لەپێش ڕابوون.

****

هەموو ئەو خاڵانەی سەروو پێشەکیەکی پڕ گرفتن بۆ سست بوونی ڕابـوونی ئیسـلامی لـە کوردسـتان، نـەبوونی کـارلێککردن لـەنێوان بزوتنەوەیـەکی ئیسـلامی و جـەماوەری کرودسـتانی، پێشـەکی پێویسـتی بـە هەڵمـەتێکی ڕەوشـەنبیری و سیاسـی هـەبووە بـۆ ڕەواندنەوەی ئەو هـەموو تـەم و مـژ و گرفتانـە، کـە پێـی هەڵنەسـتاون وەك لـە خاڵـە لاوازەکانیان باسی دەکەین.

## 8- 3 لایەنە ئیسلامیەکانی کوردستان

### بزوتنەوەی ئیسلامی- کۆمەڵی ئیسلامی- یەکگرتووی ئیسلامی

## -8 -

## (کۆمەل+ بزوتنەوە )ی ئیسلامی لە کوردستان

## ڕەگ و ڕیشە:

+ ڕەگ و ڕیشەی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لە کوردستان زۆر کۆن ترە لەئیخوان، سەرەتای تەوەری ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ سالی 1908ز کاتێ شێخ سعیدی نەوڕەسی ڕێکخراوی (یەکێتی محمدی)دروست کرد، سەرەتای تەوەری نیشتمانیشی دەگەڕێتەوە بۆ سالی 1880، بەپێی بەڵگەنامەی بریتانی ژ:23 –FO.60/441 کە لە 1881/10/1 تۆمار کراوە ودەڵێ: یەکەم کەس داوای کوردستانی گەورەی کرد شیخ عبیدالله بوو،کەواتە سەرەتای کوردایەتیش هەرڕەسەنایەتی لە ئاینە،دوای لەبیستەکان جارێکی تر لەناوچەی سلێمانی ودوایش لە ناوچەی شارەزورحزبی ئیسلامی دروست بووینە، واتە هەر بەرهەمی کوردیە نەك هاوردە .

+ ڕێکخستنەکانی ئیخوان مسلمینیش هەر لە پەنجاکانەوە عێراق و کوردستانیشی گرتەوە لەڕێی جم وجوڵی شێخ ئەمجەد زەهاوی، دوایش شێخ محمود الصواف، بەڵامبە ترازی عێراقچیانە.

+ هەول وتەقەلای مەلا مستەفا لە گەل مامۆستای ئاینی و هاندانیان تا لەژێر کاریگەری دەسەڵاتی ئاغەو دەرەبەگ بێنە دەرو وەك مسعود بارزانی دەڵێ((شۆڕش

وبارزانی وەرگەڕانێکیان لە ژیانی ئەو پیاوە ئاینیانەدا هێنایە دی ))[1]، ئەوانــە بناغەیــەك بوو بە تایبەتی دامەزراندنی یەکێتی زانایان .

+ بناغەی کارێکی ڕێکخستنی ئیسلامی جیا لـە ئیخـوان بەرەبـەرە سـەری هەڵـدا لەلایەن چەند زانایەکی تر، بەتایبەتی دوای سـەرکەوتنی شۆڕشـی ئیسـلامی 1979لـە ئێرانلەگەڵ ئەو هەموو کاریگەری و سەرەنجامەی، یەکێك لەوانە ئەو ئەزموونە (ئیخوان)ی خستە بەردەم پرسیاری قورس و تەیاری (لا اخوانی) بەخێرایی و چالاکانەتر سەری هەڵدا.

+ لە 1984 بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسـلامی لـە کوردسـتانی عێـراق دامـەزرا، بـە ڕابەرایەتی شێخ عبداللطیف و شێخ محمد بەرزنجی باڵی سەربازی بەناوی لەشـکری قورئـان بوو بارەگایان لە ناوچە سنوریەکان و دیوی ئێرانبوو.

+ لەساڵی 1987 لە ئەنجامی یەکگرتنی کۆمەڵـە زانایـەکی کوردسـتان بزوتنـەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دروست بوو.

**ئایدیۆلۆژیای:**

بزوتنەوەیەکی سیاسی شەرعیە، جیهـادی و ئاشـتیە، میـانڕەوە بـە تـەیاری فکریـی ئیسـلامی حسـابە، گشـتگیرە، هـەردوو تـەوەری ئیسـلامی و کوردایـەتی بەشـێوازێکی کوردستانیانە کۆکردۆتەوە.

**ئامانجەکانی:**

**لەڕووی ڕزگاری-** نیشتمانی:

لەفکری سیاسیدا هەروەك کەلتووری سیاسی (شێخی نـەهری، نەورەسـی، عبـدالرزاق بـدرخان، شـێخ عبدالسـلام، شـێخ سـەعید، قـازی محمـد، مـەلا مسـتەفا،..) ئامـانجی چەسپاندنی فەرمانڕەوایەتی شەریعەتی ئیسـلام لـە کوردسـتانێکی سـەربەخۆ، بـەلام لـە بەرنامەی سیاسی چارەسەرێکی (ئیسلامی) یان (مرۆڤایەتی)یـە بـۆ کێشـەی کـورد، بـە کۆمەڵێك ئامرازی شەرعی لە پێشەوەی هەمووان بیناکردنەوەی ڕەوشتی تاکی کـورد کـە سەرچاوەی هەموو دیاردە دزێوەکانە، بۆ ئەوەی دیسان سەرکردە ببێتەوە خزمـەتکار نـەك سەرکار، بەرژەوەندی تایبەتی هاوڕێکی بەرژەوەنـدی گشـتی بـێ، بـۆ ئـەوەی سـوپایەکی کوردسـتانی پـەروەردەکراو دروسـت بکـات بتوانـێ بـەرگری داگیرکـەران بکـات، لـەو سەردەمەی کە عەلمانیەکانی کوردستان چیتر توانای ئەو بەرگریەیان نەماوە، هـەروەك لـە

[1]بارزانی وبزوتنەوەیکورد ل226

بەراوردی حزب الله و حماس و جیهاد لەلایەك و ڕێكخراوە عەلمانیەكانی فەلەستین و حكومەتە عەلمانیەكانی عەرەب لەلایەكی تر دەبینین، جیهادی چیچان و كشمیر و مۆرۆ و تاجیكستان و.. چاكترین نمونەن، كە تەنها ئەو بەرگریە بە بەرەیەكی هاوبەشی نیشتمانی وئاینی دەكرێ لەو سەردەمە، هەر لە كوردستانیش هەموو پسپۆڕێكی ئنسرۆپۆلۆژی بە سەرنجێكی سادە دەزانی چ جۆرە بیروباوەڕ و مەدرەسەیەك توانای بەرگری ماوە لەكاتی تەنگانەدا.

لەڕووی ڕزگاری- كۆمەڵایەتی:

بەشێكە لە ئامانجی ڕابوونی گشتی، تێدەكۆشێت لەپێناو گێڕانەوەی ئاینی ئیسلام بۆ بەرنامەی ژیان لەجیاتی بەرنامە عەلمانیەكان بەڕێگای سەردەم و دانایانە و بە پرۆسەی چاكسازی كۆمەڵایەتی لەژیانی تاك و كۆمەڵدا، بۆ هێنانەدی بەختەوەری دادگەری لە هەموو بوارەكانی ژیانی ئابووری، سیاسی، كۆمەڵایەتی، شارستانی، فەرهەنگی، سایكۆلۆجی، چینایەتی، نیشتمانی و ڕەگەزی،...هتد. لە جەوهەردا تێدەكۆشێ هەروەك ئامانجی سیاسی هەموو پێغەمبەرەكان(د خ) ئەوە بووە كە كۆمەڵگە لە بارە ستونیەكان وەرچەرخێنێتە بارە ئاسۆییەكان، واتە كۆمەڵگە لە پارچەپارچەیی ئینتماكانی خێڵەكی و ڕەگەزی و نەژادی و چینایەتی و جوگرافی وەرگێڕێتە یەكێتی ئینتمای فكری و سیاسی (ئاینی)كە هەموو مرۆڤایەتی سەر ئەو زەمینە لێی هاوبەشە.

لەڕووی فیكری:

1- هەوڵدەدات ئەو چەمكە كلاسیكیانەی (زانست و فەلسەفە و فیكر و سیاسەت) بگۆڕێت و چەمكی ڕاست و دروست جێنشین بكا كە بناغەی گەشەی كۆمەڵە.

2- لە قۆناغی بەرگری لە (غزو الفكر) بگوازێتەوە بۆ هێرش و ئینجا تێكگەیشتن، واتە لە دەردەكانی: (تقزم، صدمة الثقافي، انصهار الثقافي) لاسایی‌كردنەوە.. ڕزگاریان بكا، لە تابع و دواكەوتەیی كۆمەڵگە ببێتە پێشڕەو خاوەنی بەرهەمی فیكری خۆی بێ كە بنچینەی گشت ڕزگاریەكانی ترە.

3- هــەوڵ دەدات گوتــار و چــەمکە لێکــدراوەکانی عــەلمانی و ئیســلامی لێــك جیابکاتەوەو کۆتایی بە بەکارهێنانی ئایینی ئیســلام لــەپێناو فیکــری عــەلمانی هــاووردە بێنێت، هەریەکە بە ئاشکرا بیری خۆی گەڵاڵە بکات بە ئازادانە بێ چەواشەیی.

4- بەهۆی گەشەسەندنی تەکنەلۆجیا و (سیستەمی جیهانگیری) کۆتایی بە پرۆســەی (چەواشە) بێنێت کە دەردی مێژوویی هــەژاران و خــەڵکی ســادەیە، لەلایــەن زۆردارانــەوە بۆیان دروست کراوە، ناتوانن ڕێگەی ڕاستەقینەی خۆیــان بدۆزنــەوە، بــا هــەر مەدرەســەو ئاینێك، هەر لایەنێکی سیاسی بتوانێ ئایــدیۆلۆژیای ڕاســتەقینەی خــۆی بــە ســەلامەتی بگەیەنێتە هەموو خەڵك، ڕووداو و نیازەکان بە ڕاستەقینەی بڵاو بکرێتەوە.

5- هەوڵ دەدات گوتارێکی سیاسی خاوەن پرۆژە و پلانــی ســەردەم و هەمەلایەنــەی قوول دابڕێژی تیایدا وەڵامی هەموو پرسیارە ستراتیژیەکانی سەردەمی تیابێــت و بنــەمای (فليكن تهذيبكم بسيرتكم) پەیڕەو بکات. تیایدا بناغەی کەســێتی کوردســتانی دروســت بکا، بتوانێ ناسنامەیەکی دیاری لەو جیهانــە نوێیــەی (عەولەمــە) هــەبێ بــێ توانــەوەو قەرزکردن.

6- هەر فکر بووە شارستانیەکانی لە چەقین بزواندووە، ڕۆژئاوای کردووە بە سەرتیپی جیهان، جیهانی ئیسلامیشی کردۆتە پاشکۆ، تەنها فیکری ئیسلامیە بتوانێ ئەو هــەموو کۆت و زنجیرەی پێش عەقڵی چەقیوی کــورد بکاتــەوە، دەرگــا داخراوەکــان بکاتــەوە، لــە فیقهەکانی (موازنە، اولويات، واقع، مقاصد،...) دەست پــێ دەکــا بــە پــلان و پــرۆژە و نەخشە، تا میللەتێکی عاقڵ دروست بکرێ (نەك عەوام)، دژی ئەو بۆچــوونە ژاراویانــەی گوایە سەردەمی ووشــیاری و فیکــر و ئایــدیۆلۆجیا نــەماوە! ئــەوە دەرد و پــەیڕەوکردنی ستونی پێنجەمیە.

<u>ڕەوتی (سیرەی):</u>

+ هەریەکە لە کاریگــەری کــەلتووری ئیســلامی وجــم وجــۆڵی ڕەوشــەنبیری ئیخــوان بناغەیەکی فکری بۆئیسلامی ناتەقلیدی دروست کرد، بەڵام شۆڕشــی ئێرانــی ڕاســتەوخۆ دەنگی دان .

+ وتاری کۆمەڵە مامۆستایەکی وەك (شێخ عبدالرحمن ئازادی) (شێخ محمد شانەدەری) هەندێ مامۆستای لەخۆبوردووی تر، هەروەها کتێبەکانی هەریەکە لــە (م/شــارەزووری) و (م/ احمد کاکە محمود) و چەند نووسەرێکی تر لەڕووی فیکری، کتێبەکانی (م/علــی بــاپیر)

لەبارەی فیکری سیاسی بووە هۆی زەمینەسازدانێکی فیکری و سیاسی بۆ دروست بوون وتەکاندان بە باسك لەساڵی 1987.

+ زۆر بەخێرایی هێزەکانی دروست بوو لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەناوی لەشکری قورئان.

+ لە چەند داستانێك وەك قەلاتۆکان و چالاکیەکانی دەشتی هەولێر و سلێمانی جۆرە متمانەیەکی سەرەتایی پەیدابوو.

+ لە ئەنفالەکانی 1988 وەك هەموو لایەك زۆربەی هێزەکانیان کەوتە دیوی ئێران، بەڵامهێزی گەشە یان خامۆش نەبۆوە، تەنها ئەو بزوتنەوەو (ینك) چالاکیان مابوو.

+ لە ڕاپەڕینەکانی 1991 بەشداریەکی کاریگەریان هەبوو لە زۆربەی شوێنەکان.

+ لە بەرگری و گەڕانەوەی حکومەتی عێراق دیسان پلەی دووەم و لە هەندێ شوێن پلەی یەکەمی هەبوو.

+ لە داستانەکەی کۆڕێ کە هێرشی حکومەتی پێ ڕاگیراو دانوستانەکەی دروست کرد، دەورێکی پێوانەیی هەبوو لە کۆی (11) شەهید (6)یان بە تۆپ باران و (5)یش لە هێرشەکەی دژی حکومەت بوو (2)ی باسك بوون.

+ دانوستانەکەی 1991 لەگەڵ حکومەتی بەعس بەشدار نەبوون، بەڵام لە بەیانەکەیاندا دژایەتیشیان نەکرد.

+ بارەگای لە هەموو شوێنێك کردەوە، بەخێرایی گەشەی کرد بەتایبەتی لەوکاتی زۆربەی کادیر و سەرانی حزبە سەرەکیەکانی تر خەریکی کۆکردنەوەو ئاودیوکردن بوون.

+ یەکەم کەنالی تەلەفزیۆنی لە ڕانیە بە یەکەم ئەزموونی کوردستان کرایەوە.

+ لە هەڵبژاردنەکانی 1992 سێیەمین دەنگی هێنا بەڕێژەی 5% (49108) لیست و ڕابەرایەتیش (38815)، ئەو ژمارەی دوایی دەنگی ڕاستەقینەی (بزوتنەوە)یە، چونکە لیستی هاوبەش بوو بەناوی لیستی ئیسلامی، لە دەنگدانی ڕابەرایەتی ئیخوانەکان و بێلایەنە ئیسلامیەکان دەنگیان نەدایە شێخ عوسمان.

+ لە مانگی 1993/10 لە چەمچەماڵ و لە مانگی 1993/12 دووچاری شەڕی (ینك) بوون و باسك خۆی سەلماند.

+ لە بۆسەیەکی ڕەسمی لە بازگەی گەرمیان لە 1993/12/8 لە سەیارەیەکی باسك دراو سەرەتای شەڕێکی سەرتاسەری بوو شکستیەکی گەورەی هێنا.

+ دوای ئەوەی رابەری بزوتنەوە دیل کراو ئازادکرایەوە جارِی کۆتایی هاتنی بزوتنەوەی دا بە فەرمانیکی داوای لەبزوتنەوەی بەشی بادینان کرد کە بچنە ناو پارتی دیمکراتی کوردستان .

+ لەلایەن ئێران، مجلس الاعلی، حزب الدعوە، حزب الله ی کورد، حزبی رفاه، حزب الله ی لبنان.. زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکان بەتووندی نارِەزایی دەربرِا، حزبە کوردستانیەکان یان بێدەنگ یان لاریان نەبوو لەو رِووداوە.

+ ئەو شکستە نەبووە داستان بۆ (ینك)، چونکە بە کەمێك (پ.م)بزوتنەوە بەرگرییەکی زۆریان دەکرد، هۆی شکستەکە زیاتر سیاسی و نەشارەزایی سەرکردایەتی باسك بوو نەك عەسکەری، لەسەروو بوو نەك لەخوار.

+ ئەو جۆرە شکستانە لەپێشتر بوو بووە هۆی کزبوونی یان نەمانی یەکجاری هەندێ لایەن (حشع، حسك، پاسۆك، لەشکری ئیسلامی، پدك، ...هتد)، بەلاّم بە حوکمی بنکەیەکی مەبدەئی و گەشی مەدرەسەکە، خێراتر خۆی کۆکردەوە لە چەندین شەرِی زۆر قورس لەگەلّ (ینك) لەدوای مانگی 1994/5 خۆی سەپاندەوە. ترسی (پدك) لە (ینك) شکاند و سەرەتا گۆرِانی هاوسەنگی هێز لە کوردستان لەوێوە دەستی پێکرد، بەجۆرێك (ینك) بەرەو لاوازی و (پدك) بەرەو بەهێزی.

رِەوتی گەشەیان لەکار نەکەوت، هەرچەندە متمانەو تەوژمی (رِابوون) لە بەهاری‌دا پشتەوشکێن بۆوە.

+ لە خولی دووەمی جەنگ بەشدار نەبوون، بەلاّم لە هاوپەیمانیەتی دابوو لەگەلّ (پدك) لە تەنگانەدا.

+ دوای گرتنەوەی هەولێر لەلایەن پارتی بە یارمەتی حکومەتی عێراق لە 31ی ئاب باسك بۆ یەکەم جار لە کابینەی (3) ی حکومەتی هەولێری (پدك) بە دوو وەزیر بەشداری کرد.

+ لە نیسانی 1997 لە دوای شەرِو پێکدادانێکی زۆر دیسان لەگەلّ (ینك) رێکەوتنەوە لە تاران وبەشداری حکومەتی سلێمانییانکرد بە دوو وەزیر، بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندی لەگەلّ (پدك).

+ کۆنفرانسی (7) کۆمەلێك گۆرِانکاری لیّ هاتەدی،لەوانە:

1- کۆتایی هێنان بە جیاوازیە ناوخۆییەکان.

2- گۆڕینی ڕابەر لە (م.عوسمان) بۆ (م.علی عبدالعزیز)،هەڵبەتە ماوەیەکی زۆر بوو باس لەبێ توانایی ئەو رابەرە دەکرا بەڵام هەتا سەخت ترین ئۆپۆزیسۆنی داکۆکی لە دلسۆزیەکەی دەکرد، بۆیە داوای راستەوخۆی لادانیان نەدەکرد، هەتا هەلبژاردنەکەی یەکەمی کوردستان، تاکە رابەرێك بوو کە دەنگی لە لیستەکەی خۆی کەمتر هێنا، دەرکەوت لە هاوپەیمانەتیەکەیان لەگەڵ یەککگرتوو(ئەوکاتی ئاشکرا نەکرابوون)دەنگی داوەتە لیستەکە بەڵام نەیداوەتە رابەر، ئیتر لە دوای ئەو هەنگاوە شەرمیان لە رابەر شکاو راستەوخۆ داوای گۆرانیان دەکرد بە تایبەتی لە دوای دیل کردنەکەی* زیاتر راستی پێش بینی یەککگرتوو سەلمێنرا،واپێدەچوو هەردوو برای (م علی و م صدیق)یش ڕایان لەگەڵ گۆڕینی هەبێ بەو بەڵگەیەی تا ئەو لانەدرا یەککگرتنیان نەکرد، م علیش قایل بوو بچێتە شوێنی .

+ لە هەنگاوێکی گرنگ لە 1999/8/21 لەگەڵ (بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی) یەکیان گرت و (بزوتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی لە کوردستان)ی لێ هاتەدی کە ئاسۆیەکی فراوانتر هاتە پێش و تەوژمێکی عەقڵی و ئیداری و موئەسەساتی زیاتر بەخۆوە بینی.

+ لەدوای ماوەیەکی کەم لەو یەککگرتنە ئەوجارە بە ڕوونتر فرەباڵ و بارستەکانی ناو بزوتنەوە لەناوو ئەدرێس و ئەجندە دەرکەوتن بەو شێوەیە:

1- باڵی مامۆستا مەلا علی عبدالعزیز کە بڕیار بەدەست بوون لەنێو بزووتنەوەدا.

2- باڵی چاکسازی م.علی باپیر کە زیاترین خەڵکی کادیر و ئەندامە وشیارەکانی لەگەڵ بوو.

3- باڵی (ئیسلاح) بە سەرۆکایەتی (م.کرێکار).

4- باڵی مەرکەز کە لەدوایی بوون بە (جند الاسلام) و دواتر (انصار الاسلام) ودوا تر (انسار السنه).

5- باڵی ڕاپەڕین بە سەرۆکایەتی (م.صدیق عبدالعزیز)، لەگەڵ چەند وردە تەیاری تریش.

---

*لەو جەنگەدا دیل کراو لەسەر نەلەفزیۆنیش ناڕاستەوخۆ بەرپرسیارەتی خستە ئەستۆی خۆیان، جەبار فەرمان سەرکردەی یەکێتی بوو لەو شەڕە لەگەڵ دیل کردنی سواری (گوێ دریژیشی) کردبوو بە ئیهانە، لەساڵی 1882 سەرکردەی تورك (حسین پاشا)کە شیخ عبیداللەی دیل کرد ئەویش هەمان هەڵس وکەوتی لەگەڵ کردو سواری گوێدرێژی کرد بەرەو موسل هەروەك لە بەڵگە نامەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیFO letter TO لە7\12\1882باسی دەکا .

+ کێشە کۆنەکانیان بە خەست تر و هەمەلایەن سەری هەڵدا ئەمجارە لەنێوان باڵی ڕاپەڕین و باڵی (م.علی عبدالعزیز).. دوایی پەڕیەوە بۆ دوو بەشی سەرەکی، باڵی ڕاپەڕینی کۆن کەوتنە بەرەی چاکسازی (م.علی باپیر).

+ لەکۆنگرەی(1)ی یەکبوون لەمانگی 8ی/ 2000ئەنجام درا، زۆربەی ئەندامانی چاکسازەکانی (م.علی باپیر) دەرچوون، ئەو سەرەنجامە لەلایەن ڕابەر و باڵی پارێزگاران قەبووڵ نەکرا.

+ لەدوای چەند مانگێك چاوەڕوانی ڕێکەوتن نەبوو.

+ تا لە ڕۆژی 2001/5/31ئەندامانی کۆنگرە درێژەیان بە تەواوکردنی کۆ نگرە داو ناوی بزوتنەوەی یەکبوونیان گۆڕی بۆ (کۆمەڵی ئیسلامی لە کوردستان) بە ئەمیرایەتی (م.علی باپیر).

ئەوانەی دەریشنەچووبن، چەند باڵێك بوون:

1- باڵی توندەکان (تەوحید، مەرکەز، حەماس، هێزی دووی سۆران) کە لەدوایی بوون بە (جند الاسلام) لە سەرەتادا لە هەمووان کاریگەرتر بوون.

2- باڵی (ئیسلاح)ی مامۆستا کرێکار.

3- باڵی بێلایەنەکان (شێخ محمد بەرزنجی).

4- باڵی مامۆستا علی هەڵەبجە.

+ لە کۆتاییدا بزوتنەوەی یەکبوون بووە ئەو بەشانەی خوارەوە:

1- باڵێ بێلایەنەکان لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامی یەکیان گرت، بە پێشەوایەتی م شیخ محمد بەرزنجی.

2- باڵی ئیسلاحی و جند الاسلام یەکیان گرت بەناوی (انصار الاسلام) بە سەرۆکایەتی (م.کرێکار).

3- باڵی (م.علی عبدالعزیز) ناوی بزوتنەوەی یەکبوونی گۆڕی بۆ (بزوتنەوەی ئیسلامی)، دوای ئەوەی (م.صدیق) لە کۆنگرە جیابۆوە هاتەوە ناو بزوتنەوە.

+ بزوتنەوە لەگەڵ (ین ك) ڕێکەوتن کە هێزەکانیان بێتەوە هەڵەبجە، لەگەڵ گەیشتنیان بە هێزەکانی (انصار الاسلام) ڕووبەڕوو بوونەوە.

+ هێزەکانی (ینك) نەیانتوانی بەسەر هێزەکانی (انصار) زاڵ بن، جەنگ درێژەی کێشا و لایەنی (ینك) بەرەو پاشەکشە بوو، بۆیە داوای هێزی ئەمریکی و هاوپەیمانانی کرد.

+ ژوورێکی (عەمەلیات) دروست کرا دژی (انصار) کە پێکهاتبوو لە: (ینك، سۆشیالیست، زەحمەتکێشان، یەکگرتوو، پارێزگاران،...

+ لە2003/3/4لە خاڵی پشکنینی سلێمانی لە م.عبداللە ی قەسرێ درا، بەتەفسیری (ی ن ك) بە هەڵەیی بووە

+ لە شەوی21- 2002/3/22 هێزەکانی ئەمریکی دەستیان بە هێرشی موشەکی و ئاسمانی کرد لە هەموو بارەگاکان درا بە کۆمەڵی ئیسلامیشەوە 43پ م شەهید بوو، دوای (17) ڕۆژ شەڕ هێزەکانی ووشکای ئەمریکیشهاتن و ئەو ناوچەیان لە هەبوونی ئیسلامی ڕزگارکرد.

+ لەدوای ڕووخانی حزبی بەعس و صدام، (انصار) کەوتنە بەرەی چەکدارانی بەرگری لەدژی بوونی ئەمریکا لە عێراق بەناوی (انصار السنه)، کە زۆربەی ئەو( بەرگریە) پێکهاتبوون لە خەڵکانێکی عەرەبی شۆڤێنی، بۆیە رێکخستنەکانی (انصار) لە کوردستان تەسك بۆوە.

+ باڵی (م.علی عبدالعزیز) بەرەو کزی بوو، چەند جارێکی تر لێك ترازانەوە، (م.صدیق عبدالعزیز) بەخۆی و دەستەیەك دیسان لێی جیابوونەوە، لە هەڵبژاردنیپەرلەمانی دووەمی کوردستان لیستیان نەبوو، بۆیە کۆنگرەیەکی نوێیان کرد لە نیسانی 2005 (م.علی عبدالعزیز) دیسان دەرنەچوو(چوارەم بوو)کامل حاجی علی دەنگی یەکەمی هێنا.وچەندین ئینشقاقی تر کرا، لەوانە جیا بوونەوەی شیخ صدیق عبدالعزیز ولایەنگرانی، ملاعبدالغنی ولایەنگرانی، کمال رحیم وئازاد حجرانی وزۆری تر،، ئەو ئینشقاقانەی پاش کۆمەل ودەنگ نەهێنانی ڕابەر زۆر ماناو توێژینەوە هەڵدەگرێ ئەگەر بەووردی زانیاری هەبێ، بەداخەوە نەم بوو، بەڵام لەدوای کۆچی دوایی هەردوو ڕووحانیەت :م احمد کاکە محمود و ڕابەر کابینەی نوێ توانی گەشە بەبزوتنەوە بداتەوە وکێشەکانی لەگەڵ کۆمەڵ ولایەنەکانی تر چا بکا، بەڵام هێشتا گیرو گرفتیان زۆرە وئاسۆی گەشەی ڕوون نیە .

+ لەگەڵ دروست بوونی کۆمەڵی ئیسلامی لە ناوەخۆ توونــدوتۆڵ بوون، زۆربەی دەردەکانی کۆنی نێو بزوتنەوەیان قەڵاچۆکرد، بەڵام دەردی نەبوونی دارشتنی ستراتیژیەکی وورد و فراوانی هەر مابۆوە، کەوتنەوە نێو کۆمەڵێك قەیران و تەنگژەی پێشهاتە نوێکان و نەیان توانی بەووردی بیان قەبڵێنن.

+ لـە2003/7/10لەسـەر بانگهێشـتی(ولیام ئیگلتن)ی ئـەمریکی م علـی بـاپیر وەفدەکەی لەڕێگەی سەردانی دا دەستگیرکرا لەلایـەن ئـەمریکاتا2005/4/28ئینجـا ئازاد کران.

+ لــە هەڵبژاردنــەکانی2005 کوردســتانی و عێراقــی و بــەخۆ بــەو بــارودۆخ و بێ دەسەڵاتیەیان 6کورسیان لە پەرلەمانی کوردستان هێنا و 2 کورسیش لـە پەرلـەمانی عێراقی.

+ لــەدوای ئــەو قۆناغــە بەرەبــەرە لایەنــە ئیســلامیەکان لــە کورتیــاد دا تــا لــە هەلبژاردنەکەی 2009/7/25بە هەرسێ لاتەنها 12 کورسیان ماوە .

<u>پەند وەرگرتن لە:</u>

أ- خاڵە بەهێزەکانی:

1- بەشداری شۆڕی کوردایەتی کـرد و شــەهیدی لــەپێناوداو ســەروەریەکی گــەورەی تۆمارکرد بۆهەموو (ڕابوون) لە کوردستان.

2- بیروباوەڕ و بەرنامەیەکی میانڕەوی هەڵبژارد لەنێوان جیهادی و بەشـداری ژیـانی سیاسی هێمن،بوونی کۆمەلێك لـەزانایانی وەك: م عوسـمـان، شـیخ محمـد بــەرزنجی، شـیخ لەتیف، م احمد کاکە محمود، مەلا علی عبدالعزیز ...رەسەنایەتیەکی پتـەوی دابــووە ئــەو بزوتنەوەیە .

3- لە ماوەی شاخ دا خۆی لە دیاردەکانی توندوتیــژی لەگــەڵ جــەماوەر و کوشــت و بڕی خەڵکی پاراست، لە پەیوەندیە ئیقلیمیەکانیش (باسك) لەو لایەنە دەگمەنانە بوو کـە پاسداریان نەهێنا کوردستان، دوایش هێزی تری عێراقی و تورکییــان نــەهێنا کوردســتان، شەڕی پارچــەکانی تــری کوردســتانیان نــەکردووە و نەشــبۆتە چاوسـاغی هــیچ هێزێکـی داگیرکەر.

4- بەشداری لە موفاوەزاتە بێ ئەنجامەکەی سـاڵی 1991 نــەکرد لەگــەڵ بکــوژ و ببڕی کورد کە لە ڕێسوایی دابوو.

5- دوای ئەوەی حکومـەتی هەرێم وەك یەکەم هەنگاوی شەری دژ بە( پ كك) جارڕدا بەهاوکاری ڕاستەوخۆی سوپای تورکیا، هەولێکی زۆر لەگەڵبزوتنــەوەش درا (ئــەویش لــە

دارگەنەکە بخوا) و شەڕی PKK بکا و لە بەرامبەر دەسکەوتی مادی و پشتیوانی ئیقلیمی و دەولی، بەڵام مەبدەئیانە قایل نەبوون ونەیان کرد.

6- ڕەفتار ورەوشتی سەرکردەو کادیران و (پ.م)ی ئیسلامیانە بوو لەچاو عەلمانیەکان، بۆیە بە هۆیەوە زیاتر چەسپین و گەشەیان کرد.

7- قوتابی و فەقێی بە پەروەردە و پاکیان دروست کرد.

8- ئەو ڕابوونە بەرفراوانەی ئێستای کوردستان لە بەرهەمی ئەوانە، ئەگەر ئەو بزووتنەوە نەبوایە ئێستا لە کوردستانیش زۆر دیاردەی کوشندەی ناڕەوا کە لە هەندێ دیوانی بەرپرسان دەکرێت دەپەڕیەوە سەر جادەو ناو جەماوەریش زیاتر بناغە ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگەی تێك دەڕووخاند.

9- هەروەها پارسەنگێکی گرنگە لەهاوکێشە ستراتیجیەکان، وا چاوەڕوان دەکرێ لە قۆناغی داهاتوو وپێویست بتوانی ئەو دەورەی حزب الله بۆ لبنانی گێڕا ئەوانەش بۆ کورد ببینێ.

10- ئینقلابێکی مەزنی لە نەریتی سیاسی جارانی ڕەوتی ئیسلامی کرد بە جاڕدانی کوردستانیانەی ڕێکخستنی، کە جاران هەر عێراقیانە بووە، کوردستانیانە بە دەمارگیر و ناشیۆنالیزمی ژمێرابوو.

11- لەو بزوتنەوەیە وەك ئاوێر لە حزبە کوردستانیەکانی تر، کە زۆربەیان لەناو خودی حزبەکانیان دەستگۆڕی دەسەڵاتیان نەدەکرد، بۆیە سەرۆکی حزبەکان تا مردن هەر سەرۆك بوون، کەچی لە بزوتنەوەی ئیسلامی بە ماوەیەکی کورت چوار ڕابەریان گۆڕی، لە شێخ محمد بەرزنجی بۆ شێخ عبداللطیف، لەویشەوە بۆ شێخ عوسمان عبدالعزیز، دوای بۆ شێخ علی عبدالعزیز،.. لەوێ هەڵوەستە هەیە (بۆ خاڵە لاوازەکان).

12- ئەوانە بە پێچەوانە زۆربەی حزبە کوردستانیەکان زیاتر پابەندی بیروبڕواو بنەماکان بوون، خۆیان و ئەندامانیان کەمتر بە پاڵنەری مادی و سوود لە کاردابوون، بۆیە کەمتر لە ڕیزەکانی ئەوان دیاردەی دزێوی دزی و ڕاوڕووت و خیانەت و دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ دوژمن و خۆویستی و... تیابووە.

<u>خاڵە لاوازەکانی</u>(لە دوای خاڵە لاوازەکانی رابوونی کوردستان باس دەکرێ)

- 9 -

## یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان

بزووتنەوەیەکی ئیسلامی چاکسازیە، لـە 1994/2/6 ڕاگەیـەنرا، بـەپێی تـەقویمی خۆی بزوتنەوەیەکی کۆنەو لەسەر ڕاڕەوی (برایانی موسڵمان)ی جیهانیەو لە کوردستانیش لە کـاری سیاسـی و خێرخـوازی بـەردەوام بـووە، ئـەو بـەروارەی سـەروو ئاشـکراکردنی یەکگرتووە نەك دروستبوونی.

هەیکەلی ڕێکخستنی: (سەرکردایەتی- م.ڕ- مەڵبەند- لـق- ناوچـە- ڕێکخـراو- پۆل- شانە) پرۆژەیەکی ڕێکخستنی نەك (پەیکەری ریکخستن) لـە شـێوەی سـتراتیژیەتی بـزواوە داڕشـتووە بـەپێی واقعـی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی دەڤەرەکـە، هەڵبەتـە وەك ڕێکخستنەکانی تـر هەڕەمیـە، سیسـتەمی سـکرتاریەت (سـەرکردایەتی- شـورا) ئـەو زاراوانەی (نەصیر، نصير متقدم، قيادة قطـري).. هەمووی لە داهێنـانی ئـەو ڕێکخسـتنە ڕەسەنەیە.

ئایـدیۆلۆژیای: سـنووری ئێسـتای کوردسـتانیە، ئـاواتی کیـانێکی کوردیـە تیایـدا شەریعەتی ئیسلامی پەیڕەو بکرێت، بەڵام لە بەرنامەی سیاسیدا ئامانجی دیموکراسـیيە و ئامرازەکانی ئاشتی و گفتوگـۆ و وەك سـەلامەت تـرین ڕێگەیـە بـۆ ئامـانج، دروشمیـان (ئازادی- برایەتی- دادپەروەری).

ڕەوتی (سیرە):

ناکرێت پێش جارڕانی باس لە مێژووەکەی بکەین (چونکە سیاسەتی بابەتەکەمان وایە کە ڕووداو و هەڵوێستەکانی بەپێی ئاشکراکردنی خۆیان تۆمـار بکـەین، ..تـەنها کورتـە باسێکی گشتی دەکەین لە بارەی ڕیشەیئەوبزوتنەوە:

ئەو جموجۆلەی"کۆمـەڵ و بزوتنـەوەی سیاسـی ئیسـلامی" دەگەڕێتـەوە بـۆ هـەوڵ و تەقەلاکانی زانکۆی(جامعە) ئیسلامی کە لەلایـەن شـێخ سـەعیدی نەوڕەسـی و سـوڵتان عەبدولحەمید و جمال الدین أفغاني و محمد رشـيد رەزا.. کـرا، بەتایبـەتی لـەدوای ئـەوەی (ئیتتحادییـەکان- بـەو ڕووکـارە عـەلمانی نەتەوەگەریـەیان) بەیـەکجاری لـە 1908-1909ز دەسەڵاتی عوسمانیان کۆنترۆڵ کرد، ئیتر تەقـەلای دروسـت کردنـی ئـەو جـۆرە

بزوتنەوانە دەست پێکرا، ڕەنگە (یەکێتی محمدی) کە لەساڵی 1908 لەلایەن شێخ سەعیدی نورسی یەکەم بزوتنەوەی ئیسلامی زەق بووبێ لەو بارەیەوە، لەدوای داڕووخانی خیلافەتی عوسمانی لە 1924/3/3 بەیەکجاری لەلایەن ئەتاتۆرکەوە، کە بووە هۆی دروست بوونی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی لەسەر بنچینەی عەلمانی.. ئەوا بەرەبەرە بیرۆکەی دروست بوونی بزوتنەوەیەکی فراوانی ئیسلامی چەکەرە بوو، تا لەساڵی 1928 لەسەر دەستی (حەسەن البنا) برایانی موسوڵمان ڕاگەیەنرا، لەدوای ئەزموونێکی دوورودرێژ کەمتر ئەو پرۆژەیەی توانی ئەزموونێك بسەلمێنێ بۆیە بزوتنەوەی تریش پەیدا بوون لەدوای چلەکان، لەوانە (جماعە الإسلامیە) لە پاکستان بە سەرۆکایەتی (ابو الاعلی المودودی) و (حزب التحریر الإسلامی) بە سەرۆکایەتی تقی الدین النبهانی، بەڵام هەر نەتوانرا ببێتە ئەزموونێکی واقیعی، بۆیە حسابێکی وای بۆ نەکرا لە ڕەوتی جیهانی، تا شۆڕشی ئیسلامی لەئێران لەساڵی 1979 بە سەرۆکایەتی خومەینی سەرکەوتوو بوو ئەو ڕابوونە تەقیەوە، ئیتر لەوکاتەوە حساب بۆ ڕەوتی ئیسلامی دەکرێ لە هەموو ئاستەکان.

هەرچی یەکگرتووی ئیسلامیشە ماوەیەکی دوورودرێژ بەشێکی نەپچڕاو بوو لە ئیخوانی عێراقی، هەڵبەتە ئەو هەنگاوەی دروستکردنی بەشی کوردستانی سەربەخۆ هەنگاوێکی گرنگەو جێگەی دەستخۆشیە کە هەر یەکە لە یەکگرتووی ئیسلامی و حزبی شیوعی پێی هەڵسان و بەناوی کوردستانی جیا لەعێراقیانە بزوتنەوەیەکیان دروست کردووە، ئەگەرچی درەنگیش بووە. ئیتر باسەکەی ئێمە لەدوای جاڕدانیەتی.

بۆیە لەو ماوە کورتە گۆڕانێکی وانەبووە شایەنی باس بێ بەو شێوەیە:

+ لە دوای ڕاپەڕینی 1991 سەرپەرشتی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردی خێرخوازی)یان کرد، سەرپشکی کارە مرۆییەکانیشیان ڕزگارکردنی (هەتیوانی کوردستان) بوو لە مردنێکی ڕاستەقینە (بێهاوێر) بەتایبەتی منداڵە شەهیدەکانی کوردستان.

+ لە هەڵبژاردنەکە لیستی هاوبەش بوون لەگەڵ (باسك)، ڕێژەی دەنگەکانی یەکگرتوو بە حسابێکی سادە یەکسانە بە(10293) دەنگ، چونکە ئەوان لەگەڵ هەڵبژاردنی ڕابەری نەبوون، کەواتە دەنگی لیست (49108) –دەنگی ڕابەر (38815) = 10293.

+ هەر لـەدوای ئاشـكراكردن ڕادیـۆ و تەلـەفزیۆنیان لـە زۆربـەی شـارەكان كـردەوەو ڕۆژنامەیەكیان بەناوی (یەكگرتوو) هەیە.

+ لە یەكەم كۆنگرەیەندا دووبارە پابەند بوونەوە بە ئەنتی میلیشیایی.

+ زۆر بـەخێرایی گەشـەیان كـرد ومەڵبەنـد و لقیـان لـە زۆربـەی شـارەكان كرایـەوە بەتایبەتی لە ناوچەكانی بادینـان، ڕاگەیانـدنێكی بـە هاوسـەنگیان دارشـت، ڕێكخـراوی پێشەییان بە نەخشەیەكی تێروتەسەل دامەزراند.

+ لـەدوای 1996/8/31 كـە هاوسـەنگی هێـز بـە قـازانجی (پـدك) گـۆڕا، ئـەوا یەكگرتوو بەشداری حكومەتی هەولێری كرد، بەوەزیرێك.

+ لە شەڕ و پێكدادانەكانی نێـوان (ینـك) و (انصـار الاسـلام)دایەكگرتوو لایـەنگیری (ینك)ی كرد و ئەندام بوو لە ژووری عەمەلیات.

+ لە هەڵبژاردنی سەرانسەری عێراق بە لیستێكی هاوبەش لەگەڵ حزبـە عەلمانیـەكانی كوردستان دابەزی و (9) كورسی پەرلەمانی پێدرا لەگەڵ هەندێ ئیمتیـازی سیاسـی لـە (بەغدا) بەڵام لێی پێشیمان بوونەوە.

+ پەیوەندی لەگەڵ (مركزی ئیخوان) و حزبی ئیسلامی(تەك ولۆ) بوو لـەبارەی عێـراق و كوردستان و هاتنی ئەمریكا.

+ دوای ئەوەی لەهەلبژاردنی دووەما لەگەڵ عەلمانیەكان تەواو ڕێك نەكـەوتن ولەگـەڵ كۆمـەڵیش ئامادە نەبوو لیستی هاوبەش پێك بهێنن بڕیاردا بەلیستی تـەنهایی داببـەزێ، بووە هۆی ئەوەی لـە 2006/12/6 هێزەكـانی پـارتی لـە چـەندین ناوچـەی بادینـان بارەگاكانیان بگرن و ئەندامێكی سەركدایەتی یـەكگرتووش تیـادا شـەهید بـوو،دوای بـە 2ملیۆن مەسلەتیان كـرد بـەڵام كاریگەریـەكی قـوولی كـردە سـەر سـتراتیج و تێكـرای ئەزموونی یەكگرتوو.

+ لە هەلبژاردنی 2009/7/25 شكستیان هێنا لەگەڵ باقی لایەنـە ئیسـلامیەكان وتەنها 6 كورسیان بۆ ماوە .

پەند لە خاڵە بەهێزەكانی:

1- بزوتنەوەیەكی بە نەخشەو پلان و ستراتیژیەتن، لە ئەرك و توانا و باری نـاوەخۆ و ئیقلیمی و دەولی چاكتر شارەزان.

2- جم و جۆڵ و كارە سیاسی و ئیداریەكان و هەنگاوەكانیان موئەسەساتیە، بەدەر لە دەسەڵاتی شەخسی و بنەماڵەیی، خاوەن پرۆژەیەكی فیكر و سیاسەت و بوودجە و ڕێكخستنن.

3- چاكتر لە دیوی ناوەوەو نهێنیەكانی ستراتیژیە جیهانی و ئیقلیمی و ناوەكیەكان گەیشتوون، بۆیە لە زۆربەی شەپۆل و گەردەلولەكان بێزیان بوونەو دانایانە دەرباز بوونە.

4- یەكیەتیەكی فیكر و بیروبۆچوونیان هەیەو لە دەردی فرەتەیاری و فرەبۆچوونی جیا بەدەرن، ناوەندێتی بڕیار و پەیڕەویان هەیە.

5- بزوتنەوەیەكی فكریەو سەركردەو پێشەوایەكی موفەكیر و پاكیان هەیە، لە بواری كارەكەی خۆیان پسپۆڕن.

6- وەك كادیری دانا هەوڵیان داوە ئەو دوو ستونەی كادیرایەتی ئیسلامی پەیڕەو بكەن:

أ/ دەروونناسی خەڵكی جیاجیا و.. (كلم الناس على قدر عقولهم).

ب/ خەڵكی ئێستا لە گۆتە و بەڵێن تێرن، كردەوەیان گەرەكە، كردەی ئیسلامی نوێ كە دەسەڵاتی سیاسی نیە ئەوەیە بە دانایی و زانایی و ئاساییانە هەڵسوكەوت بكەیت (فلیكن تهذیبكم بسیرتكم).

7- ئەو ئەندام و لایەنگیر و مونتەسیبی یەكگرتوو بە پێچەوانەی حزبە دەسەڵاتدارەكان خەڵكێكی بەگەری موچە و ئیمتیاز نینە.

8- كەم ترین شت بووترێ ئەوائەگەر بوار بڕەخسێندرێ بۆ یەكگرتووو دەسەڵاتی بدرێتە دەست بەماوەیەكی پێوانەیی ئەو قەیران وگەندەڵی و بێسەرو بەریەی كوردستان چارەسەر دەبێ.

9- ئەو كەمە جیاوازیەیلەگەڵ بزوتنەوەو دوایش كۆمەل بەرهەمی پرۆسەیەكی مێژوویی فقهی و كۆمەڵایەتی و سیاسی و هەتا دەروونیشە، ئەوان لە (اصول)، (بنچینەكان)،( عەقیدە)، (ئامانج)، وەك لۆژیكی هەمووی یەكن، تەنیا لە ڕێگە و ئامرازەكانی گەیشتن بەو ئامانجە كەمێك جیاوازیان هەیە، بەهۆی دەوڵەمەندی ئەزموون و دەركەوتنی زیاتری ڕاستیەكان و بچووك بوونەوەی جیهان وا خەریكە ئەو جیاوازیە ئەوەندە بچووك بێتەوە كە جار وایە لەنێوان دوو ئەندامی یەك لایەنیش هەبێت،ئەوەیە (یەكگرتوو) سەر بە تەیاری یەكەمی جیهانیە، كۆمەڵ و بزوتنەوەش سەر بە تەیاری

سێیەمن، واتە لەڕووی سیاسیەوە بەگشتی لایەنە ئیسلامیە جیهادیەکان لەیەکتر نزیک ترن، ئەگەر تێبینی بکرێت لەو لیستە جیاوازیەی نێوانیان دەبینرێ حزبێکی سیاسی جیهادی سوننە نزیك ترە لە حزبێکی جیهادی شیعە، نەك لە حزبێکی مەدرەسەی ئیخوانی.

## لیستێکی جیاوازیە گشتیەکان

## یەکگرتووکۆمەڵ و بزوتنەوە

1. چاکسازی:( لە تاك بۆ کۆمەل) 1. لە(تاك بۆ کۆمەڵ)وە بە پێچەوانەوەش.

2. ڕێگەی ئاشتی تاکە ڕێگە و ئامرازە بۆ ئامانج2. ڕێگەی ئاشتی یەکێکەلە ڕێگەکان نەك تەنیا.

3. (امر بالمعروف..... ) بەتەنهایی. 3. (امر بالمعروف والنهی عن المنکر).

4. لە(کل)بۆ(جزء)،کل:دادگەری جیهانیە(ئیسلام) 4. لە (جزء)بۆ (کل) جزء: کێشەی کورد.

5. خۆ گونجاندن. 5. ڕووبەڕووبوونەوە لە کاتی پێویست .

6. درێژکراوەی فکری ئیسلامی وولاتانی 6. هەڵقولاّوی ناو کوردستانە، سەربەخۆن.
عەرەبە، زیاتر لە ژێر کارگەریی زانا ئیسلامیە عەرەبەکانن.

7. فکرو دانایی و سیاسەت و موئەسەساتی و 7. زەمینەو مێژو و سەروەریو بنەمای جهادی و
ئەزموونی یەکگرتوو دەولەمەندترە. کەرەسە کوردستانیەکەی دەولەمەندترە.

8. بەشداری شۆرشی بەرگری کوردستانی نەکردووە. 8. بەشداری کردووە.

9. سەر بە تەیاری یەکەمی جیهانین. 9. سەربەتەیاری سێیەمن[1] .

10. شارەزایی و دانایی لە هەنگاوەکان بە 10. کەمتر.
موئەسەساتی کردنی دام ودەزگاکانیان.

**تیبینی:** ئەو بەراوردە تا ئەو کاتە ڕاستە کە بزوتنەوەو کۆمەل هێزیان هەبوو ،بەڵام ئێستا هەلوێستیان زۆر لێك نزیك بوویتەوەبە ئاڕستەی بۆچوونەکانی یەکگرتوو،بۆیەئەوبەراوردەئیستاتەواونیە.

---

[1] بۆ شارەزابوون لەو تەیارەانە بڕوانە کتێبی –هەڵبژاردن لە نێوان عەلمانی و ئیسلامی- دانەر

## پەند و ئەزموون لە خاڵە لاوازەکان

لەبەر ئەوەی بەشێك لەخالە لاوازەکانی یەکگرتوو وکۆمەل دەگەڕێتەوە بۆ خالە لاوازەکانی رابوونی جیهانیش،بۆیەلەوێ دەست پێ دەکەین :

أ- رابوونی جیهان:ئەوەش پەیوەستە بە هەموو لایەنە ئیسلامیەکانی جیهان بە کوردستانیشەوە .

1. ئەو رابوونەفراوان ترە لە بزووتنەوە ئیسلامیەکان کەچی لە زۆربەی شوێنەکان زیاتر تەنها بەلای سیاسی شکاوە.

2. سەرەڕای پیرۆزی فقهی ئیسلام کۆمەلێك خالّی لاوازی هەیە وەك (نوێ نەکردنەوەی، زۆری مەزهەب، گرنگی نەدان بە زانست و تەکنۆلۆژیا)زۆربەی ئەو بزوتنەوە ئیسلامیانەش ئەو خالّە لاوازانەیان گواستەوە ناو ئەو بزوتنەوانە، لە ئەنجامدا کۆمەلێك تەیارو فرە ڕاو بۆچون و ڕێبازی پێچەوانەی لێ دروست بوو ئاسەوارێکی زۆر خراپی هەبووە و هەیە.

3. بزوتنەوەکان سیاسین،کەواتە(اولويات) سیاسەتی شەرعیە، ئینجا فیقهو، تەفسیر و فەرموودەو.... هتد. کەچی زۆر دەولّەمەند و دانا و پسپۆر نینە تەواو لە زانستە سیاسیەکان شارەزا نین هەرچەندە خۆشیان ئەو ڕێبازەیان هەلّبژاردووە.

4. لە زۆر شوێن ئەو فرە لایەنی سیاسیە بووە مل ملانێ و کێشەو لێکدان کە زیانەکانی لەبن نایەت.

5. لە ڕاستیدا تەکانی ڕابوون لە شۆرشی ئێران هات کەچی زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکان بە (شیعەو سونەوە)بابەتی(شیعە و سوننە) یان زیندوو کردەوە.. بەو شێوەیە پلانە ستراتیژیەکەی ناحەزانی خۆیان سەرکەوت و لقەکانی ڕابوون لە ساوایی لەباوەشی دایکی جیاکرایەوە، فرە ناوەند و بێ کۆنترۆلی سەری هەلّدا .

6- هەر سەبارەت بە خال(5)..لەکاتێکا مەسیحی ویەهودی زۆر لیك دوورن کەچی سیستەمیکی ئاینی یەکگگرتویان پێك هێناوە،کتاب المقدسيان کردۆتە دوو بەش: تەوراتیان ناو لیناوە عهد القديم وئینجیلیشیان ناو لیناوە عهد الجديد لە یەك کتیب کۆیان کردۆتەوە..کەچی شیعەو سونە دژ بەیەك وەستاون بی ئەوەی بیربکەنەوە ئاوا شیوازیکی هاوبەش بدۆزنەوە کە زۆر ئاسان تریشە، وای لیهاتوە جاریکی تر عەلمانیەت ببیتە چارەسەری نێوانیان نەك ئاین.

6. ڕابوونەکە لە زەمانێکی یەکسان بەرپابوو بەڵام زەمینەکانی کۆمەلآیەتی جیاجیایە، بۆیە هەریەکە پێویستی بە دۆزینەوە(فترە السیرە) هەیە هەم لە ئایەتەکان و هەم لە پەیرەوکردنی سوننە، کەچی نەکراوە.

7. لە زۆربەی شوێنەکان بەچاکی نەتوانرا سوود لە یاساو نەریت و خاڵە هاوبەشەکانی وولآتان و دەعوە وەرگێرێ.

8. زۆر گرنگی (بەڕابردوو) دراوە لە کاتێکدا واقع و داهاتوو مەبەستەکانن.

9. نەتوانرا بەلایەنی کەمەوە لە قۆناغی یەکەم لەگەڵ لایەنە عەلمانیەکان و دیموکراتخوازەکان بگونجێن و (فقە الموازنە) بەکاربێنن.

10. هەندێ هەلوێست وفەتوای سیاسی توند بوونە دەردێکی پێچەوانەلەوانە:دژایەتی کردنی دیموکراسی، فرەلایەنی، هەڵبژاردن، ئاشتی، گفت و گۆ.. لەلایەکی ترلایەنگیری بەنەزانی: چەك، هێز. تۆقاندن،... هەمووی بووە چەکێکی لەبن نەهاتوولە دژی ئیسلامیەکان زیاترین قوربانی نادیموکراسیو بەکارهێنانی هێزن لە دژیان.

11. ئەو رابوونە و (دەعوەکەش) هێشتا وەلآمی ڕوونی زۆر پرسیاری پێنیە، ئاخۆ چی پێیە بۆ کێشەکانی جیهان؟ بۆ سەرمایەداری؟ بۆ کێشەی نەتەوایەتی ؟ بۆ ئافرەت؟ بۆ ئاینەکانی تر؟ بۆ ئادەمیزادێکی بێ ئاین؟..ئاخۆ دەتوانرێ مەسیحیەك یان یەهودیەك ببتە ئەندام لەو بزوتنەوە ئیسلامیانە ؟ نموونەی ئەو دادگەریەکەی دێت بۆ دەوامی نەکردووە لە مێژوو؟

12. قوربانی دانی وورد لە پێناو درشت کە کورد لەو هاوکێشە زەرەریەتی.

13. لە کۆتاییدا نەیان توانی تا ئێستاش ڕێکەون لەسەر نمونەیەکی زیندووی ئەزموونی ئیسلامی لەسەر ئەو زەمینە وەك نمونە پێشانی بدەن؟ پرسیارێکە هەموو کەس دەیکا بەتایبەتی لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاواکە ئەوەندە گوێ بە(تیۆر وەعز) نادەن، نموونەی زیندوویان دەوێ.

14. کەواتە بۆ خۆلادان لە هەمووئەو سلبیاتانە واباش بوو بزووتنەوە سیاسیەکانی هەناوی ڕابوون یەکسەر ناوی ئیسلامی هەڵنەگرتبایە ناحەزانیخۆشی بەخەبەر هێناوە، دەتوانرا ناوی نیشتمانی و چینایەتی و کۆمەلآیەتی تری ئاسایی هەڵگرتبایە بەڵام لە نیوەڕۆك ئیسلامی بوایە، یان هەر(توجە الاسلامی- بەرەو ئیسلامی)بوونایە، بۆ ئەوەی شکستی ئەزموونەکە نەبتە شکستی ئیسلام لە پێش چاوی عەوام، وەئەگەر هەرناوی

ئیسلامیش هەڵگرێ دەبوایە لە قۆناغی یەکەم لەڕێی سەندیکاکان و مؤسسة مەدەنیەکان وجم و جۆڵە میللیەکان بهاتبایە مەیدان.

15. نەیان توانی تەفسیرێکی لۆژیکی پێش کەش بکەن ئاخۆ بۆ لە مێژووی ئیسلامی و ئەوساتەش زۆربەی پانتاییەکی دیکتاتۆری و خۆویستی لە سولتان وخەلیفەکان بە دی کراوە؟ هەروەك ئێستاش لە سەرۆکانی وولاتە ئیسلامیەکان دەبینرێ، زەحمەتیەکی زۆری دەوێ تا ئەو نەریتە سیاسیەو دیکتاتۆریانەی ئێستایانلەکەلتوری سیاسی ئیسلامی دوور خەیەوە بەکەلتووری عەلمانی وەنووسێنی.

16. ڕابوونی ئیسلامی نوێ و لایەنە ئیسلامیەکان تاڕادەیەکی زۆر کەوتنەوە ژێر کاریگەری نەتەوایەتی و مەزهەبی و دەمارگیری سیاسی وحزبی،بەتایبەتی لە ناوەندی عەرەبی.

## خاڵە لاوازەکانی ڕابوون لە کوردستان:

واقعی سیاسی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی کوردستانیش وەك جیهان سێ بەشە: بەشی یەکەم، ڕێگەی ئاشتی تاقانە (یەکگرتوو) بەشی سێیەم ڕێگەی جیهادی تاقانە(انصار الاسلام)، بەشی دووەم (لەو دەمە کۆمەڵی ئیسلامیە) .

بۆ زیاتر دەرکەوتنی ناسنامەی هەر لایەی کەمێك لەسەر سروشتی ئەو سێ تەیارە دەوەستین، ڕاستە ئەوانە لە پانتاییەکی فراوانی ئیسلامی هاوبەشن، زیاتر لە ڕێگە و ئامرازی گەیشتن بەو ئامانجانە جیان، بەڵام لە کۆتاییدا لەسێ تەیاری جیهانی سەرەکی خەملیون، ئەو دەردە بەسانای دیوارە لاوازەکانی فیکری و سیاسی ڕابوونی کوردستانیشی بڕی و لێی خەمڵی، هەریەکە کۆمەڵێك ڕێنمایی و ئەدەبیات و زانا و فەرهەنگی جیایان هەیە، کێشەکە ڕووچووە بۆ قۆلایی مێژوو بۆ تەفسیری قورئان، بۆ لێکدانەوە ڕووداوە مێژووییەکان... هەتا لە خودی قورئان و فەرموودەش، زۆرلە ئایەت و فەرموودە هەیە زیاتر تەیاری یەکەم بەکاری دەهێنن بێ ئەوەی بەلای ئایەتەکانی تر بچن، بەهەمان شێوە تەیاری دووەمیش زیاتر کۆمەڵە ئایەتەك بە کاردەهێنن، ئەوەش کۆمەڵە هۆیەکی خۆیی هەیە سەرەکیەکەی سێیانن:

1- جیاوازی مەزهەبی2- فشاری دەسەڵاتداران لەسەر بزوتنەوە ئیسلامیەکان وای لێ کردوون لەسەر سکەی سروشتی خۆی لایان دەن 3- پیلان و نەخشەی ناحەزانی (ڕابوون)

له جیهان و وولاتانی عەرەبی... لەگەڵ زۆر وورده هۆکاری تر، ئەگینا له بنەچەدا وەك (ئەسل) ئیسلام چاکسازی و ئاشتیه، مانای (سیاسەت)یش چاکسازی گشتیه، هەرواش ئیسلامیەکان هاتنه گۆڕەپان، چونکه نەنەرمی بەتەنها نەتووندیش بەتەنها ئەسلی ئیسلام و یاساکانی گەردوونیش نیه، چۆن لەگەڵ رژێمێکی دیکتاتۆری وەك بەعس عێراق، یان داگیرکەرێك بەنەرمی و ئاشتیانەدەگوزەرێ، واته بەرگریش ئەسلێکه له دۆخی تایبەتی خۆی،بۆیه لەسەرەتادا (مدرسەی ئیخوان) بەو شێوەیه بوو، کاری چاکسازی و ئاشتیانه بوو بەڵام ڕووبەڕووی داگیرکاری ئیمپریالیزمی ببۆوه له فەلەستین و سینا و سوێس، لەسەرەتادا دروشمیان (هێز، ڕاستی، برایەتی) بوو، شمشێر وئایەتی وأعدوا لهم...ئاڕمیان بووه،بەڵام دوای فشاری دەسەڵاتی دیکتاتۆری لەسەر سکه و میان ڕەوی لای دان بەشێکی چوونه ئەوپەری توندی، بەشەکەی تریش ئەوپەری نەرمی، ئیتر هەریەکه بەڵگەی عەقلیو ناعەقلی بەکار هێناووەك تەیار خەملین زۆربەکورتیبەوشێوە:

تەیاری یەکەم: ئێستا له جیهان زیاتر تەیاری چاکسازیشی پێ دەوترێ که زیاتر مدرسەی(ئیخوان)ە، ئەوانە بەکورتی پێیان وایه بانگی ئیسلامی وگۆڕانی کۆمەڵگه تەنها به ڕێگەی ئاشتی و دیموکراسی و هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێ، ئەو بیرە له بنەچەدا له هاوکێشەی (ابو الحسن الندوی) یش بەدی دەکرێکەپێی وایه چاکسازی له کۆمەڵگه له (تاکەوە) دەست پێ دەکا ئینجا بۆ کۆمەڵگه و دەسەڵات، کەمتر نموونەیەکی موورتاحی هەیه بۆ سەرەنجامی کاری سیاسی و ئاینیان، هەرچەنده خزمەتێکی زۆری ڕابوونیان کردووە،له بۆشایی وکاردانەوەی ئەو تەیارە تەیارێکی توندیش سەری هەڵدا .

تەیاری دووەم: ئەو تەیارە تەواو پێچەوانەی یەکەمە، پێیان وایه تاکه ڕێگەی گەیشتن به ئامانج و دادگەری و پەیرەوکردنی شەریعەتی ئیسلامی له جهادە وە دێت، جهاد به مانای شۆرشگێرانیەکەی، کەمتر باوەریان به چاکسازی هەیەزیاتر پا بەندن به هاوکێشەی (ابو الاعلی المودودی) که چاکسازی له کۆمەڵەوە دێت بۆ تاك، واته یەکەم جار دەبێ(حوکم)و گۆمەلگه چاکسازبکرێ ئینجا تاك، ئەگەر (حوکم) چاکساز نەبێ ئەوا له ڕێی تاك تاك کۆمەڵگه چاکسازی نابێ مادام(حوکم) لەلایەکی تر(تاك) ت لێ تێك بدا،

زیاتر ئەوانە مدرسەکانی سەلەفی و تەکفیریەکان و بەشێکی وەهابی و ئێستا زیاتر خۆی لە تەیاری (ئەلقاعیدە) دەنوێنێ...جارێ نموونەی سەرکەوتووی نیە.

تەیاری سێیەم:

ئەو تەیارە لە بێ ئەنجامیوبێ ئومێدی و خلتەی هەردوو تەیاری سەروو پەیدابوو. لەسەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری ئەقلی و زانستی و سیاسی و فەلسەفی و واقعی سەری هەڵدا، هەردوو شۆڕشی ئێران 1979، ئەفغانستان 1980 تەکانی مەزنی بەو تەیارەدا، ئەوانە پێیان وایە هەریەکە لە(توندی و جیهادی شۆڕشگێرانە) و(نەرم و نیانی و ئاشتیانە) لە بارودۆخ و قۆناغی خۆی ڕاستە، لەهەندێ وولات ڕاستە، کەواتە ئەو تەیارە هەم توندە و هەم نەرمە، هەم ئیسلاحیە هەم شۆڕشگێرانەیە، ئەو تەیارە زیاتر بە میان ڕەو حسابە لە جیهان، نموونەیان دروست کردووە زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیە بەئەزموونەکانی وەك:(ئێران، ئەفغانستانی پێشوو، چیچان، سوودان)، لەسەر ئەو ئەزموونە حسابن ئەگەر تەواویش سەرکەوتوو نەبوینە، هەریەکە لە بەرەی ئنقازی جەزائیر و حماس و حزب الله و بەرەکانی کشمیر و مۆرۆ...ئەوانەش لەسەر ئەو تەیارەن، زیاتر واقعی ترن و حسابیان بۆ دەکرێ لە هەموو لایەك، ئەوانە زیاتر خاوەنی ئەو ڕابوونەی ئێستان .

## بۆ زیاتر بروانە ئەو لیستە جیاوازیە بنچینەییەکانی هەرسێ تەیار:

تەیاری یەکەمتەیاری دووەمتەیاری سێیەم

1- زۆر نەرم و نیان لە هەموو بارێککدا 1- زۆر توندو ڕەقن لەهەمووی1- هەردوولالە قۆناغی خۆیدا

2- ئاشتی و دیموکراتی تاکە ئامرازی2- جهادی شۆڕشگێرانە تاکە2 - هەردوولا.. زیاتر ئاشتی ئەسلە

گەیشتن بەئامانج ئامرازی گەیشتن بە ئامانج بەڵام تاکە ڕیگاو ئامراز نیە

3- چاکسازی کۆمەڵگە لە تاکەوە بۆ3- چاکسازی لە دەسەڵاتەوە بۆ3- بە هەردو ئاراستە دەبێ

کۆمەڵگە دەبێ(نەدەویانە) کومەڵگەوە بۆ تاك دێتەوە(مودیدیانە)

4- (امر بالمعروف...) بە تەنهایی4- (...نهی عن المنكر) بەتەنهایی4- (امر بالمعروف)+ (نهی عن المنكر)

5- فکرو دانایی پسپۆری5- کەمتر 5- دانایی مانای بەپێی پێویست و

دانایچارەسەری شایستە بۆ بابەتی شایستە

6- کۆمەڵگە لایان نەخۆشە 6- کۆمەڵگە لایان تاوان بارە6- هەروەك تەیاری یەکەم

7- فتوای لەگەڵ ڕۆیشتن 7- ڕووبەڕوبوونەوە 7- بەپێی قۆناغ و باری کات.

8- لە ژێر کاریگەری ناوەندی بڕیارن 8- بەهەمان شێوە و بە8- هەریەکەسەربەخۆن لە
جەوهەرێکی ترهەڵویست

9- ئەو کۆمەڵە ئایەتانەی مەکی بە9- ئەو کۆمەڵە ئایەتانەی مدینە9- هەردوو کۆمەڵ و بەشەکانی تر
کاردەهێننگۆرەپانی جەنگی بەکاردەهێنن
هەریەك لە قۆناغی خۆی

## کامیان میان ڕەون؟

ئەگەر زۆر بە کورتی وەڵاّم بدەینــەوە بــەپێی پێناســی میــان ڕەوی کــە بریتیــە نێــوان دوو(تطرفـی)نــەرمی و ڕەقــی، ئاشــتی و شۆرشــگێری، خێــرا و وەســتان، مــل کەچــی و شەرانگێری، زۆر بڵێ و بێ دەنگ،.. ئەوا هیچ گومانی نیە نێوانی ئەوانە میان رەوی یــە، لەوسێ تەیارەش زۆر ڕوونە تەیاری سێیەم میــان ڕەون نــەك دوو تەیارەکــەی تــر، ئەگــەر بــەووردی ســنووری ڕابــوون بکێشــین و لــەو ســەرە مدرســەکانی ســۆفی و دەروێشــی و و لەجەمسەرە کەی تــریش هەنــدێ مدرســەی تــەکفیری و لاجمــاعی دەربکێشــین کەلەســەر ئیسلامی سیاسی حساب نین، ئەوا بەزەقی و بەڵگە نەویست دەردەکەوێ کــە لــە ڕابــوونی ئیسلامی سیاسی تەیاری سێیەم میان ڕەون. ئەگەر میــان ڕەوی زیــاتر مانــای عــەقلانی ومەدەنی وئاشتی خوازی بێت ئەواتەیاری یەکەم میان ڕەون.

## خاڵە لاوازەکانی (یەکگرتوو) :

ا- ڕوژژی1994/2/6 جاڕدانی یەکگرتوو بوو، ئــەو کاتــە کــە جــەنگی (ی. ن. ك) و(بزوتنەوە) بوو، وەرزێکی ناپەســند بــوو، ئیســلامیەکان دەتــۆقێنران ڕاو دەنــران بــەپێی (مثل المؤمنين فی توادهم و تراحمهم کمثل الجسد الواحد اذا اشتکی عضو منه تـداعی لـه سـائر الجسـد بالسـهر والحمـی)کەچــی ئــەوان لــەو ســات و کاتــەدا وەك دەرفــەت قۆزتنەوە(وادەرکەوت) و خۆیان بخەنە جێگەی بزوتنەوە، ئەگەر ئەوەشــیان نەویســتبێ وای لێ دەفامرێتەوە بەپێی بنەمای (مصائب قوم عند قوم فوائد)ئیشیان کرد.

2. واپێشان درا کەئەوان بەشێکن لە(برایانی جیهان) و بــەو شــێوەیە ســەلبیاتی ئــەو تەمەنە(68) ساڵیە ڕووبەڕوویان دەبتەوە، بەتایبەتی بەرامبــەر دۆزی کــورد، پرســیارەکە ئەوەیە: بۆچی بەشداری مەینەتی کورد نــەکراو بەشــداری شۆرشــی کــورد نەبووینــە؟ یــان هەڵوێستێك بەیانێك؟ .

3. رابوونی ئیسلامی له کاتێکدا تەقیەوه هەر وولآت و میللەتێك له ئاستێك و دۆخێکی تایبەتی جیا له میللەتێکی تر، ئەگەر بەیەك(بڕی تەوژم) پاڵی دەی ئەوا هەندێ ماف بەخۆرایی دەمێنیتەوه یاخود ئەوەنده (درشت) بیت (ووردەکان) لەبیر بچن، لەکاتێکا(ح ابوبکر ) دەفەرموێ(بچووکتان لام گەورەترینە تامافی بۆ وەردەگرم گەورەشتان لام بچوکترینه تا مافی لێ دەسێنمەوه) کەچی لەنێوان ئەو درشت ووردیەدا مەینەتی کورد بە(وورده)حساب کرا.

4. دوای زیاتر له 70 ساڵی ئەزمونێکی دەوڵەمەند دەرکەوت بەو ئاشە تەنها هارە هارە بێ ئارد.

5. ئەگەر له جیهان نمونەیەکی سەرمەشقی نەبێت ئەوا نموونەی پێچەوانە زۆرە، له ساڵی 1952 له حکومەتی (محمد نجیب)یمصر بە(2) وەزیر بەشداری حوکم بووینە، ئەو ئەزموونە نوێ نیه سەرەنجامێکی وای نیە، خەریکە لەسەر چاوەی ڕا بگۆڕێت، سەرنج بده: لەکاتێکدا دەبینین(زیاد ابو غنیمه) پەرلەمانتارو سەرکردەیەکی (برایانه) لەئوردن دەڵێ(من قەیتانی پێلاوی جیهادی فلستینی و حەماسم، بۆ منشەرەفه[1])، دکتۆر (یوسف القرضاوی) یش لەبارەی چیچان وتی(گەلی چیچان، ئیقامە حوجەیان لەسەرمان کرد، کە جیهاد تاکەچەکی میللەتانی ژێر دەستەیه )[2]کەچی له کوردستان لەبڕیاری کۆنگرە کەی یەکگرتوو واهاتووه لایەنگیری (مکتب عسکری) و میلیشیا نین و نابێت، ئەوا بەسانای تسلیم بوونی گۆتەی عەلمانیه نەتەوەییەکانه که دەڵێن ئیسلامی باوەڕی بە کێشەی کورد نەبووه ئێستاش نیەتی، ئەگینا بۆچی ئێستا خۆی بۆ بەرگری له کورد ئاماده ناکا بۆ هەر ئەگەرێك؟ ئینجا نابێت لەبەر نەریتێکی دووەلی وەختی (اصل) ببەزێنرێ، لە کاتێکدا خۆت جاڕ دەدەی که دژی توندوو تیژی، گوایە ئەوەیان میان ڕەویە.. نەخێر ئیسلام خۆی(تووندەو نەرمه) (چەکەو خیتابه) (ئاشتی یەو جەنگە) (سزایەو پاداشته) (عەقلەو فەلسەفەیه) ( چاکردن و شکاندنه).. ئەوە هەمووی هەم شریعەته و هەم سروشتیه و هەم سروشتی ئادەمیزادیشه.. جا(حیکمەت) مانای یەك لایەنی نیه تەنیا تۆ(توند+ چەك+ جەنگ+ سزا+ شکاندن+ ... ) بێت یان پێچەوانەکانی، بەڵکو(حیکمەت و میان ڕەوی و ئەسلی ئیسلام) ئەوەیه بەووردی بەپێی پێویستی هەر دۆخێکبقەبلێنی و پیادەی بکەی.

---

[1]لەقەناتی جەزیرە . الشريعة و الحياة

[2]هەمان سەرچاوه

نموونەی (محفوظ نحناح) لە جزائیر گەلێ زیندوە لایەنگری ئنقلابە عسکریەکەی کرد لەدژی دیموکراسی و ئیسلامیەکان لە 1991، چەندین هەڵوێستیانپێ گۆری و بەیانیان پێ دەرکرد، دژایەتی بزوتنەوەی ئیسلامی جەزائیریان پێ کرد، زۆر شانازی دەکرد گوایە ئەو خاوەنی مێژووی چەکداری و میلیشیایی نیە، هەردەم سەرزەنشتی جهاد و بەرگری نیشتمانی و میلیشیایی و پێشمەرگایەتی دەکرد هەر بۆ ئەوەی بتوانێ بەشداری هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی جەزائیرلە1999/4/15بکات، کەچی لە بڕیارێکی(مجلس الامناء الدستور)دا محفوظ نحناح مافی خۆ هەڵبژاردنی لێ سەندرایەوە چونکە(شەرەفی بەرگری جەزائیری) نەبوو! ! ئەو کاتی پێش مەرگە نەبووەو بەو شێوەیە ووتارەکانی خۆی لە دژی جهاد و شۆرش بووە ئەو گۆڕەی هیوای تیاناشت..، لە کوردستانیش ئەگەر ئیسلامیەکانی جیهادی بەشداری شۆرشیان نەکردبایە ئەوا ئەو دەردەش بۆ یەکگرتوو ئامادەبوو، هێشتاش ئەگەریش ماوە بڵێین یەکگرتوو بەشداری شۆرشی نەکردووە.

6. لە کاتێکدا دەبینین لەسەرزاری(د. توفیق شناوی- عضو هیئة المؤسسة) ئیخوانددەلێت: ئێمە لە پێناو فەلەستین دروست بوینە[1] و دۆست و دوژمنمان لە جەمسەرەکانی جیهانی لەسەر بنچینەی دۆست و دوژمنایەتی عەرەبە، کە زۆر جار بەو ڕوانگەیە نەك وەك میللەتی کورد تێك ناکەینەوە هەر دژیشین، مادام تەرازوو ببتە نەتەوەگەری ئەوا یەکێتی نامێنێ یەکسەر لە(مثل المؤمنین فی توادهم..... ) وەردەکەرێ بۆ یاسای(مصائب قوم عند قوم فوائد)... هەر لەسەرئەو بنچینە چەوتە بوو ئەو هەموو مەینەتە بەسەر کورد هات ویژدانیان نەبزواند بەیانێك دژی ناشیونالیزم و شۆڤینیەتی عەرەب و بەعس دەرکەن، هەرچەندە ئەوان بەشدار نەبووینە بە پێچەوانەی باقی عەلمانیە عەرەب و نەتەوەگەریەکان بەڵام گلەییەکە بەپێی مەزنی تەرازووی ئیسلامە.

جا پرسیاری گرنگ ئەوەیە ئەگەر ئەوانە لە پێناو فەلەستین دروست بوینە ئەی لە کوردستان دەبێت لە پێناوی چی دروست بن؟ و کوا بەرهەمی 70 ساڵ؟ کواوکوا...، پرسیارە سادەکە ئەوەیە ئەگەر بەرژەوەندیەکی نەتەوەیی کوردی و عەرەبی تێك گیرا (وەتێکیش گیراوە)ئایا(یەکگرتوو) بەپێی(توجیە مرکزی) نابتە بەشێك لە دژە بەرژەوەندی ؟ بەلایەنی کەمەوە نابتە بێ لایەن.

[1] برنامج الاتجاه المعاکس- شەوی 14- 1998/7/15 الجزیره

بۆ ئـەوەی کـورد بەگشـتی وئیسـلامیەکانیش بـە تایبـەتی چـیتر مزایـدەی کیشـەی فلستینیان بەسەر نەکرێ ئەوا بەراوردیکی خێرای هەردووکیشەی فلسـتین وکـورد دەکـەین دەبینین هەردوولا ڕەوان بەڵام هیشتا کیشەی کورد ڕەواترەو شایستەی زیـاتری بەدەوڵـەت بوونی هەیە،زۆر بەکورتی لایەنە لەیەکچووەکانیپێشاندەدەین :

1- هەردوولایان لەدوای جەنگی جیهـانی یەکـەم(1914-1918) ولـە کـۆنگرەی (سایکس پیکۆ) نەخشەی دابەشی ومەینەتیان بۆ دانرا.
2- مەینەتی هەردوولا لەوە هات ناوچەکەیان دابەش کـردو دەوڵـەتیان بـۆ دروسـت کردن کەچی کوردو فلستینیان بێ بەش کرد.
3- مەینەتی هەردوولا لەیەك کارخانە دروست بـووە، داگیرکـەری هـەردوولا بەیـەك (بەشی 7ی سیڤەر)دروست بون، عێراقی داگیرکەری کوردستان بە پێی مادەی 94 دروست بوو ئیسرائیلی داگیرکەری فلستینیش بە مادەی 95.
4- کوردستان بە پێی بڕیارەکانی سایکس پیکۆو سان ریمۆو لـۆزان بـۆ چـوار بەشـی سەرەکی دابەشکرا فلستینیش بە هـەمان بڕیـارو لەکۆتاییەکـەی بـە بڕیـارِی 181 بۆ چوار پارچە دابەشکرا، بەو شێوەیە:
   أـ 55٪ی فلستین بۆ دەوڵـەتی ئیسـرائیل تـا ئێسـتاش عـەرەبی ئـەو ناوچەیە بە عەرەبی 1948 ناودەبرێن.
   ب ـ غەزە بۆ میسر.
   ج ـ زیفە بۆ ئوردەن.
   د ـ ناوچەی قودس بۆ نێودەوڵەتی .
5- هـــەردوولا بــــە پێـــی (مـــادەی 22ی بەشـــی یەکـــەمی عەهـــدی عوسبەتولئومەم)کەوتنە ژێـر سیسـتەمی ئینتـدابی دەوڵەتـە داگیرکەرەکـەو لەوێش بۆ ژێر ئینتدابی بەریتانی.
6- بە هۆی رێکەوتنی مەلیك فەیسەل وحایم وایزمان عێراق وفلستین دروست کـران، تیایدا هەردوولا کەوتنە مەینەتی .
7- هەردوولا ئەو ڕێسایەیان بەسەر پیادەدەبێ کە جمال عبدالناسر بۆ (جۆن کەنەدی) نوسیویەتی لەوەڵامی ئەودروشمـەی (هرتـزل ـ نیشـتمانێکی بـێ خـاوەن بـۆ میللەتێکی بێ نیشتمان)دەڵێ: فلستین نیشتمانی بێ خاوەن نیە تا پێشکەشی

میللەتێکی بێ نیشتمان بکرێت، کوردستانیش ئاوا نیشتمانێکی بێ خاوەن نیە...، لەلایەکی تر دەڵێ:(لقد اعگی من لایملك، وعدا لمن لایستحق، پم إستکاع اپنان (من لایملك ومن لایستحق)بالقوه والخدیعه ان یسلباصاحب الحق الشرعی حقه فیما یملکه وفیما یستحقه)تر، ئەوە کت ومت کوردستانیشە .

8- هەردوولا دووچاری داگیرکاریەکی دەوڵەتی تازە دروستکراوو نامۆ بون ،وەك نمونە دەوڵەتی عێراق وەك دەوڵەتی ئیسرائیل دروست کراوە تا ئەو ساتەش نە دامەزرینەرەکەی دیاری کراوە نە رۆژی نیشتمانیشی.

9- هەردوولا دووچاری چەوساندنەوە وپاکتاوی ڕەگەزی بوینە، لە فلستین (مستەوتنی یەهودی) لەکوردستانیش(مستەوتنی تەعریب) .

10- شۆرشی هەردوولا بەتیرۆروتێکدەرو ناوناوتۆرەی تر وەسف دەکرێت، لە پرۆتۆکۆلی(ژ:19) شۆرش بە (سەگ بە فیل ڕەوین ) وەسف دەکات ....لەگەڵ زۆر لای تری وێك چوو.

## جیاوازیەکانی: هەندێ جیاوازیشی هەیە

1- کوردستان هەر دەسەڵاتی کوردی تیا بوە لە فەڵستین دەسەڵاتی تایبەتی عەرەبی تیا هەلنەکەوتوە تەنها لە چوارچێوەی خیلافەتی ئیسلامی بوە .

2- لەسەردەمی عوسمانی قودس سنجاق بوو کەچی کوردستان لەسەرووی ویلایەت ولە ئاستی ئیالەت بوو.

3- ناوەکەشی گوزارش لە پەیوەندیەکی مێژوویی وجوگرافی وکۆمەلایەتی و سیاسی ویاسایی خاکی کوردان دەکا، بەلام فلستین ناوێکە گوزارش لەو پەیوەندیە لەگەڵ عەرەب ناکا، لە بنەچەشدا ناوەکە یۆنانیە ودەگوترێ یەکەم جار هیرۆدۆتس بەکاری هێناوە.

4- شان بەشانی عەرەب گەلی یەهودیشی لێبوە ناویان (سابرا) بوە، لە کوردستان عەرەبی لێنەبوەبەکۆمەل.

---

[1] دەقی نامەی جمال عبدالناصرلەوەلامی نامەکەی11/مایۆ/1961ی (ج کەنەدی) سەرۆکی ئەمریکالەکتێبی((فلسطین في رسائل عبدالناصر وکندیص22-) .

5- 4ـ ئەوان ئێستا وڵاتانی عەرەبیان لە پشتە بەڵام  کورد بێ پشتیوانە.
5ـ دەوڵەتی داگیرکەری فلستین لە چاو داگیرکەری کوردستان بە ویژدان ترو دیموکراسی ترە.
6ـ داگیرکەری فلستین هەردوولا یەك ڕەگـەزن هـەروەك لـە دیباجـەی ڕێکەوتنامـەی فیصل وایزمان هاتوەو لە ئەدەبیاتی نەوەی یەکـەمی تـەیاری عروبـی وادەهـات، کەچـی داگیرکەری کورد (جگە لەفارس) ئەوانی تر لەگەڵ کورد یـەك ڕەگـەز نـین. ...لەگـەڵ زۆر ووردە خالی تر.
لەهەموو ئەوانەی سەروو دەردەکەوێ کە هەردوولای گەلی فلستین وکورد چەوسایینەوەو زولمیان لێکراوە ،هەردوولا شایستەی دەوڵەتن ،بەڵام بە پێی یاسای نیودەوڵەتی وشـریعەت ومێژووشەوە کورد زیاتر هەقی دەوڵەت بوونی هەیە،بۆیە چیتر ئیسـلامیەکانی کوردسـتان نابێ ڕازی وبێ دەنگ بن بەمزایدەی عەرەب بەسەریان.
7. ئەزموونی(ڕەوتی مرکزی) گرفتی زۆرە وەك(ئەزموونی شیوعیەت) سـەرەڕای ئـەو تواناو تکنەلۆجیایـە بەهێزەیسـۆڤیەتی بـۆ پشـتیوانی کەچـی شکسـتی هێنـا، دیسـان دەبێتەوە(تضحیة الجزء من اجل الکل)، ئینجا ئەو ناوەندەی بڕیار لەهـەر شـوێنێك بێـت ئەوا بەپێی ئاسەوارو ڕەوتی کۆمەلآیـەتی و سیاسـی دەروونـی ئـەو شـوێنە دەروازەکـانی عەقل و بڕیار و هەڵوێستی لێ دروست دەبێت جیاوازە لەگەڵ ئێرە، دەبتە هۆی بوونی لـق بە پاشکۆی ئەسل و کۆمەلێکسەرەنجامی ترسناکی لێ دێتەدی و دووچاری دوگماتیزمی و بێ هەڵوێستی و بڕیاری نالۆژیکی دەبێ.
8. ئەو جۆرە(پاشکۆییە) لەژێر ڕۆشـنایی (عولەمـە) پینـە ناکرێـت، چـونکە جـاران ئەندامانی هەر حزبێکی سیاسی دەینواڕیە جیهان لە ڕێگەی عـەقلی چـەند مونـەزیرێکی ئەو حیزبە، دەیان توانی هەندێ کەم وزیاد بۆ رووداوەکان بکەن پێشـانی ئەنـدامانی بـدەن بەڵام ئەمرۆ هەر ئەندامێك ڕاستەوخۆ لەگەڵهـەموو جیهـان تـەفاعول دەکـات و کـونترۆل ناکرێت بە چەواشەیی.
9. بەخەست تر بلێین(ئاشتی) و(گفت و گۆ) و(گەلالەی شارستانی)... ئاواتێکە لـەو جیهانەی ئێستا تەنیا پەخشانێکە لە دورگە جوانەکەی یۆتوپیا، ئاشتی (بـڕی پـۆزەتیڤی) نیە بۆیە هەروەك بەهەموو تاریکی جیهان تروسکە ئـاگرێکی بـەزەڕیان پـێ ناکوژێتـەوە، هەموو بێ دەنگیجیهان چـرپەیەکیان پـێ کـپ ناکرێتـەوە بەهـەموو ئاشـتی جیهـانیش شەڕانگێزێکیان پێ عاقل ناکرێتەوە، کەی نێچیرێك توانیویـەتیبێ هـەلاتن بـە ئاشـتیانە

لەدەست دڕندەیەك ڕزگار بێت، کـەی نرکـەی شـێرو هـاواری کارمامزێـك(گفتو گۆیـە! )
ڕەنگە(گفتو گۆو دیالۆگ) بێت لـەبارەی ئـەوەی ئایـا کارمامزەکـە بەخۆشـی خـۆی دەدا
بەدەست بۆ خواردن یان بەڕاوە ڕاو،یان دیالۆگ کردن لەسەر ئەوەی ئاخۆ بەهێز دەڵێتە بـێ
هێزەکە وەرە بە دیموکراسیانە ڕێیەك هەڵبژێرە : ئاخۆ بەبرژاوی بتخۆم یان بـەکولاّوی، لـە
پێش ڕا سەرتببڕم یان لە پشت ڕا. بەچ ئامرازێك پێت خۆشە بە پارچە پارچەت بکـەم....
(دیگۆل) بەئاشکراتر ووتویەتی دەرگای ئاشتی بە کلیلی هێزدەکرێتەوە، بۆیە هەریەکە لـە
نمونەی (لاڕوومەتەکەی –ئینجیل)وبەری درەختەکەی (حسـن بـەننا)و هاوکێشـەکەی(ابـو
حسن الندوی- چاکردنی کۆمەڵ لە(تاك) ڕا یەك مانـا دەبەخشـێ، بـە کـوورتی زۆربـەی
خاڵە لاوازەکانی تەیاری یەکەم دەبتە خاڵی لاوازی یەکگرتووش

10. لە کوردستانیش دروست بوونی فرە لایەنی ئیسلامی زیـانێکی زۆری لـە ڕابـوون
داوە لەوانە: چەواشەکردن، بێ متمانەیی، گومان لە تەقوا، دەرکەوتنی مەبەستەکە بەلای
خەلکەوە بۆ کورسی و سیاسەتە.. ئی دی.. زیانەکانی لە زۆریـان ناژمێررێـت، جگـە لـە
(حوکمە) شەرعیەکان لەبارەی دوو (دەعوە)وسەرەنجامەکانی،..

11. لەئەزموونی سوودانی ئێستا دیاردەیەکی کوشـندە تـر دەرکـەوت، لـە خیتـابی
سیاسی(برایان) دا هاتووە کە بوونیان ئامرازە وئامانج نیە، ئامانج (شەریعەتی ئیسـلامە
و حکومەتێکی ئیسلامیە جا هەر یەکێك بێت) کەچی لە سودان حکومەتەکـەی (الجبهـە
القومیە الاسلامیە)ی ترابی ئیسلامی بوو،ئیخوان وەك حزب خۆیـان حـەل نـەکرد و هـەر
بەجیا کاری سیاسیان دەکرد... ئەوەی لێلـە ئـاخۆ خۆیـان حزبێکـی ئیسـلامی لـە دوای
حوکمی ئیسلاما چی دەوێت؟ لە کێشەکەی نێوان د. ترابی و بەشـیر نەبوونـە(نێوان کـەر)
بەڵکو لایەنگری (غـالب)بوون ؟ لە کوردستانیش لە کێشەی نێو بزوتنـەوە بـە ڕۆڵێکـی وا
هاوتایان بینی.

12. نابێت لە یاد بکەین هەتا بە(امر بالمعروف) (2)کەس چاك دەکەی دەسەڵاتدارێك
بە(امر بالمنکر) (5)کەس تێك دەدا، راست و دروستی ئەو(متراجحە- ناکێشـە) بـەژمارە
بۆمان دەسەلمێنێ لەو (70) ساڵە ئەزموونی برایان،سەرەڕای ئەوەی مرۆڤی عەوام لایەنـە
خراپەکەی بەسانایی تر دەوروژێنێ لە لایەنە چاکەکەی کە زیاتر یارمەتی دەری تێکدانە.

13. ئەو چەمکانە سنوریان لەسەریەکە هـەر زیـادە ڕەو یـەك کـەمێکیش بێـت لـە
ئاقـاری دووەم دەدوۆزرێیتـەوە، وەك(نفـس واهـواء)، (المعاشـرة والارضـاء)، (عـەقلی و

عەلمانی)، (سمع وطاعة وخذلان)، (سلام و الاستسلام)، (ووریایی وترس)، (حیاة وحب الدنیا)(بەرژەوەندی گشتی وحزبی) وە هەریەکە لە (حکمەت و تنازول)، (حکمەت و تەسلیم بوون)، (حکمەتو وةلاء)، (حکمەت و هەلاتن)، (حکمەت و دعوە الجاهلیە)، (حکمەتتأیید الظلم)، (توکل العفوی)، (توکل و بێ ئەسبابی) (صبر و الضلالة)، (صبر و تەمبەڵی)، (صبر و ترك الجهاد).. هتد لەلایەکی تریش(جرأە والجدال)، (حق و غیبەت)، (حق و سوء المعامله)... هتد. لەوانە تێکەڵی هەیەو زۆربەی سنورەکان بەزێنراون بە ویستی حزبیانە و خۆپاراستن نەك ویستی ئیسلامیانە.

14. لە جیاتی هەڵوەستە لەسەر ڕابوونی سیاسی و پرۆگرام با تێچاوەك بدەینە دروشمەکەی (ئازادی- برایەتی- دادپەروەری) بەورردی (دانایانە) گونجاوە لەگەڵ بەرنامەی سیاسی کەلە فکری سیاسی جیایە، دروشمی هەر لایەنێك بریتیە لە بەڵگە نەویستەکانی(بدیهیاتAxioms) فکری ئەو لایەنەیە،بۆیەچەند(قل مادل)بێت زانستی ترە،بەڵام بەسەرنجێکی سەرەتاییدەبینینسیفەتی(بەدیهیات) ی نیە، ئازادی لە برایەتی دا هەیە و هەردووکیشیان لە دادپەروەری هەیە بۆیە وەك زانستی(دروشم) دەبوایە (دادپەروەری)بەتەنها دروشم بوایە. ئینجا ئەو دروشمە(سێ کوچکان)ە دەگەڕێتەوە بۆ کەلتوری نا ئیسلامی، یەکەم جار لە ئەدەبیاتی یۆنانی (ئازادیویەکسانی) لە(جمهوریە افلاتون- ل255)بەدی دەکری، دوای لە بزوتنەوەی ماسۆنی*ئینجا شۆرشی فەرەنسی(ئازادی - برایەتی - یەکسانی)[1]، دوای لە( بروتوکولات حکماء الصهیون)یش هاتووە،ئینجا(اتحادالترقی)دروشمی سێکوچکە(ئازادی،یەکێتی،یەکسانی)بەرزکردەوە،هەروەها حیزبی بەعسیش(یەکێتی—

*لەپرۆتۆکۆلی زایۆنی ژمارە (1)دروشمی : (برایەتی —ئازادی —یەکسانی )هەلگرتووە .

[1] لە ئیستاوەش لەمادەی (2)ی دەستوری فرنسا هەمان دروشم هەیە، ئەوە دەقەکەیەتی:

مادة( 2): فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصل أو أو الدين وهي تحترم كل المعتقدات . .

النشيد الوطني : "المارسلييز".

شعار الجمهورية : "الحرية والمساواة والإخاء.

ومبدؤها : حكومة الشعب بالشعب وللشعب .

ئازادی- سۆسیالیستی)[1]،دەشکرێ سوود لە (ژ ك)ودوایش (ح د ك أ)ی وەرگرتبێت کە ئەوانیش دروشمی (ئیسلامەتی، کوردایەتی، تەمەدون، دادگەری) یان هەلگرتبوو.

15- نەیتوانی ئەو گرفتانەی کەلەسەرەتای ڕابوونی ئیسلامی تۆمارمان کرد بە گوتاری سیاسی (گۆتەو کردە) ئەوتەم و مژانە بڕوێنینەوە، ئەوەی ڕاستەقینەش بوو بوێرانە لە کۆنگرەکانیان دانیان پیاهێنابوایە و ڕاستیان بکردبایەوە، لەوانە بەشداری نەکردنی یەکگرتوو لە شۆرشی شاخی بزوتنەوەی کوردایەتی، بێ هەلۆیستیبەشێك لە ئیسلامیەکانی جیهان بەرامبەر بە کێشەی کورد،سنوری نێوان فکری ئیسلامی و فکری ناشیونالیزمی شۆڤینی عەرەبی، ئەنفال، ڕەگ و ڕیشەی مەینەتی کورد.... هتد.

16- لە هاوپەیمانیەتی دا زیاتر لەگەڵ عەلمانیەکان نزیك دەبنەوە ستراتیجیانە (یاخود ڕاشکاوانە تر لە دەسەلاتدارانی عەلمانی)، کەچی لەگەڵئیسلامیەکان هەنگاو و هاوپەیمانیان زیاتر تاکتیکیە، بە دەگمەن لە کێشەکان لەبەرەی ئیسلامی بووینە،بەلام لە(ژووری عەمەلیات) بووە لەگەڵ(ی. ن. ك) و(حزبی زەحمەت کێشان) و(سۆشیالیست) و..لە دژی (أنصار السلام) ئەگەر چی بەردەوامیش بانگێشەی ئەنتی میلیشایی دەکا.

لەسەرهەمان مەبەست پرۆژەکانی یەکگرتوو بۆ ئاشت بوونەوە لە خولی یەکەمی براکوژی1993 تەنها بۆ (پ. د. ك) و(ی. ن. ك)بوو، کەچی بزوتنەوەی ئیسلامیشی لایەنێکی شەڕەکە بووە، وەیەکەم لیستیشیان لەهەلبژاردن هاوبەش بووە،هەر بەو بۆنەیەوە دیسان پەیوەندی یەکگرتوو لەگەڵ بزوتنەوەو دوایشکۆمەلەگەلێ جار تاکتیکی بووە، تا بزوتنەوە بە هێز بوو بە لیستی هاوبەش دابەزین لە یەکەم هەلبژاردن*، دوای لاواز بوونیان ئامادە نەبوو بەرەشیان لەگەڵ دروست بکا، بەبیانوٚی ئەوەی گوایەسەردەمی بەرە نەماوە! کەچیلەگەڵ لایەنە عەلمانیەکانی کرد،لەسالانی 1995 زنجیرەیەك لێکۆلینەوەی زۆر شەرعیانەشیان لە ڕۆژنامەی یەکگرتوو بلاو کردەوە تیایدا سەلماندیان کە بەرە شەرعیە، ئیتر لە 2005 سەلماندیانەوە کە ناشەرعیە ئەوەش هەمان سیاسەتە کە لەبابەتی (ی ن ك)باسمان کرد کە مام جلال لە ماوەی سالێك سەلماندی 3 بال لە نیو یەکێتی دروستە، کەچی دوای یەکگرتنەوەی خەتی گشتی و بزوتنەوەی سوشیالیستی

---

[1] یەکەم جار لە دەستوری (تەئسیسی) حزبی بەعس (کە لە4-1947/4/6 دەرچوە) لەدیباجەکەی ئەو دروشمە واتۆمارکرا:البعث العربي الاشتراكي حركة قومية شعبية انقلابيةتناضل في سبيل الوحدة العربية والحرية الاشتراكية

*ئەوکاتی یەکگرتوو جارِ نەدرابوو بە ناوی خێر خوازی ئیشیان دەکرد .

سەلماندیوە کە 2 بال دروستە و هەروەها سەرنج بدەوە مەسەلەی بەفری برژاوەکە، ئیتر ناهەقی ڕەخنەگران نیە کە دەڵێن یەکگرتووسیاسەت دەکا واتە سیاسەتی میکاڤیلی نەك ئاینی، کەواتە بەلای کەمەوە حزبایەتیەکەی خەست ترە لە ئاینداریەکەی، هەرچەندە زیاتر پاساوی یەکگرتوو ئەوەیە کە بزوتنەوە بێ سەرو بەرە، بەڵام دوای لەگەڵ کۆمەلیش هەروابوون .

17- لەبارەی کێشەی کورد، ئەگەرچی بەشداری شۆرشەکانی کوردی نەکردووە کەمتریش بە ڕاگەیاندن و جم جۆڵی سیاسیش نەبینراوە پاڵپشتی ئەو کێشە ڕەوایەبکا... لە کاتێکدا پێویست بوو خۆی بکاتە خاوەنی ئەو کێشەیە،..ئەو کێشەیەی بەناوەڕۆکەوە بکردبایە بەشێك لە کێشەی ئیسلامی، هەروەك کێشەی فەلەستین و کشمیر و خوارووی لبنان و چیچان و بۆسنە و کۆسۆفا....

18- بەهۆی هەندێ تێروانینی تایبەت کە لە ڕوانگەی شۆڤینیەتی عروبە هەڵدەقولاوای لە(یەکگرتوو) کردبوو:

ا. خۆی لە مێژووی کوردستان و سەرکردە ئاینیەکانی ئاوێر بکا.

ب. لەبەر هەمان هۆ وای لێ کردووە ئەزموونەکانی ئیسلامی ئێران و عێراقی نوێو بزوتنەوە جیهادیەکان و سەروەری بزوتنەوەی ئیسلامی لە نێو جولانەوەی کوردایەتی بە مولکی خۆی نەزانی، ئیتر لەلایەن فکرو دام و دەزگاکانی عەلمانی بەسانایی یەکگرتوو بە قەوارەیەکی نامۆ و بێ کەس و ناڕەسەنی لە قەلەم بدەن، مادام لە مێژوو و واقع بەو شێوەیە خۆی دابڕنی.

19- لەبەر هەمان هۆی سەروو یەکگرتوو بوێری نەکردووە جاڕبدا کە عێراق دروست کراوی ئیمپریالیزمە لەدژی گەلانی ناوچەکە، هیچ ڕەسەنایەتیەکی جوگرافی و مێژوویی و نیشتمانی و کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و کەلتووری و ئاینی نیە، تاکە دەوڵەتێکی دەگمەنە کە ڕۆژی ئازادی وجەژنی رزگاری نیە، کوردستان ڕەسەن ترە لە عێراق کەچی تا پێش ڕاپەرین هەر عێراقی بوو، کوردستانی نەبووە، تا ئەوساتەش زیاتر چارەسەریەکانی بۆ کێشەی کورد لە ژێر کاریگەری نەتەوە گەری عەرەب و سایکس پیکۆیە نەك ئیسلامی.

20- ئەو ڕیسا (سیاسی و فیقهیەی) کە دەڵێ (اینما وجدت المصلحه فهو الشرع)... هەڵبەتە ئەوە بە پێوانەو تەرازووی(ئومە)—واتە مەبەستی مصلحەتی ئومە- ئیتر

لێرەبوار هەیە خوار بکرێتەوە،ئەو بەرژەوەندیە بە تەرازوو و پێوانەی حزبی هەڵسەنگێنرێ و چۆن(بەرژەوەندی) حزبەکە بخوازێ ئاوا بە(شرع) ی بزانن نەك بەرژەوەندی (ئوممەت) یان(مقاصدی ئیسلام)... ئەوەیان زۆر بەزەقی لە بەشێکی زۆری هەڵوێستەکانی (یەکگرتوو) بەدی دەکرێ و لێی بویتە خالی لاواز.

21- ئەورووبەرووبوونەی لەگەڵ پارتی لە ناوچەکانی بادینان لە6/12/2006 زۆر کاریگەر بوو، نەك لەبەر زەرەرزیان، بەڵکو کاریگەریەکە لە خودی پرۆژە ستراتیجیەکەی یەکگرتوو بوو، چونکە زۆر بە زەحمەت لەو کوردستانە جەنگلاویە متمانەیەکی دروست کردبوو، گوایە بێ میلیشیای وچەك زامنی بەتەنهای خۆ لادانە لە برا کوژی و ئەزیەتی ئیسلامیەکان، تائەو رادەیە بە گاڵتە جارێ گەلێ جار وەسفی شەری براکوژی کەلاری نێوانیەکێتی وبزوتنەوە یان دەکرد گوایە لەسەر "قازێك" بووە، مەبەست لەوەیە چەك هەلگرتن وا نزیکە بەلآیە،..ئیترلە پاش ئەو رووداوە پرسیاری قورس دروست بوو ئەگەر شەری نێوان بزوتنەوەو یەکێتی لەسەر قازێك بووە ئەدی یەکگرتوو وپارتی لەسەر چی بوو؟!

زۆر خاڵی تریش هەیە لە رەوتی بابەتی خۆی باسی دەکەین .

تیبینی: دووبارە دەبێ نوێی بکەینەوە ئەو هەلسەنگاندنە تا 2007و 2009 پیداچوونەوەیەکی بۆ کراوە ئیستا یەکگرتوو گۆرانکاری بە ئیجابی بەرەو کوردایەتی ودیموکراسی ودەست گۆرێ دەسەڵات هەنگاوی ناوە.

خاڵە لاوازەکانی بزوتنەوەو کۆمەڵ:

ئەو لایەن و مەدرەسانەی درەختیان سەوزە خاوەن مەبادیئن، حسابی ناوەخۆو دەرەکیان بۆ دەکرێ.. زیاتر لە پەند و رەوتدا دەولەمەندترن بۆیە زیاتر ئەکەوێتە ژێر توێژینەوە و تێبینی و هەڵوەستە، لە گشتی دەست پێ دەکەین لە کوردستان ساغی دەکەینەوە کە لەو ساتەدا زیاتر کۆمەڵی ئیسلامی دەگرێتەوە.

1. ئەو بەشە بە رێکی قۆناغەکانی گەشەکردنی (زەمینەی فکریئیسلامی- فکری سیاسی- بەرنامەی سیاسی- رێکخستن- دۆخی شۆرشگێری –شۆرش- موئەسەساتیمەدەنی و ئیداری- پرۆژەی تێرو تەسەل- .... )تێنەپەریوە، نەشیتوانیوە قەرەبۆی ئەو بازدانە بکاتەوە، بۆیە لەسەرە تای دروست بوونیەوە لە 1987وە بە

ناتەواوی سیاسی و ئیستراتیژی ودبلۆماسی و ڕێکخستنی هاتووە، مێژوویزیاتر دوو بەرەکی بووە، ئەوەش دەبتە سەرچاوەی کۆمەڵێك سەلبیاتی تر لەکۆتاییی تۆماری دەکەین .

2. هەر لەسەرەتا تا ئەو نووسینەش قەیرانی نەبوونی ووردی پلان و نەخشەو ستراتیژیەتی هەیە لەبارەی: ڕیکخستن، دپلۆماسیەت، دەعوە، ڕاگەیاندن، ئیدارە، دەسەلاّتەکان، فقهەکانی(ممکن، موازنە، واقع، اولویات،.... )ئەگینا لە ڕاپەڕینەوەش تا ئەو دواییەش ئەوان پالێوراتر بوون بۆ سەرکردایەتی کورد لەچاو حزبە عەلمانیەکان کە دەست کورت ببون لە بنەمای ئایدۆلۆژی و ئامانج و راستیو دروستی،تەنانەت ئەمریکاش ئەو حیسابە مەزنەی بۆ کردبوون لە بەڵگەنامەی ئەمریکیبڕیاڕی ژ:13 ـ 99ی سەرۆك کۆماری ئەمریکی لە1999/2/4بزوتنەوەی ئیسلامی لە سێیەمین حزبەکاریگەریەکانی(7حزبە کاریگەریانەی عێراق)ە: ویفاق ـ موئتەمەر ـ بزوتنەوە ـ پارتی ـ ملکی ـ یەکێتی ـ مجلس ئەعلا) نێو عێراق پۆلین کرابوو.

3."فکری سیاسی" کۆمەڵێك ئامانجی دوورترن و جیاشە لەبەرنامەی سیاسی، بۆیە بەرنامەی سیاسی ئەو لایەنەیە بۆ گۆڕینی قۆناغێك لەو واقعە یان لایەنێك لێی، نابێت تێکەڵ یەك بکرێن، ئەگینا دەبتە هۆی تێکەڵ بوونی (ئامانجە دوورەکان و نزیکەکان) (گرنگ و لاوەکیەکان) (أصول و فروع) (واقع و داهاتوو) (رەمەکی و پرۆژە) (خلط الاوراق و ڕێزکردن)..، بۆیەش دەبینین زۆر سەرئێشەی بۆ دروست بووە لەسەر ووروژانی بابەتێك کەلەبەرنامەی سیاسیدا نیە، ئەو زاراوە ئیسلامیانە: دار الحرب، دار الکفر، جهاد، دار الاسلام،.. ئەوانە لە بەرنامەی سیاسی نین، بەڵکو لەفکری سیاسین، پێغەمبەر (د. خ) موتەبیقێکی بیَ هاوتا بووە لەلێك جیاکردنەوەی (فیکری سیاسی ) لە(بەرنامەی سیاسی)، هەر بۆیەش دەبوایە جاریَ بزوتنەوە ئیسلامیەکان بزوتنەوەی "بەرەو ئیسلامی" بوونایە نەك ئیسلامی تەواو هەم لەهەلس کەوت هەم لە پەیرەو و ئامانج خوازیدا، بەپێچەوانەوە زۆربەی جار فکری سیلسی وبەرنامەی سیاسی تێکەڵ کراوە،هەر بە نموونە لە بنەچەدا (بەیعەت )بۆ دروست کردنی دەوڵەتە و(عەقدی فکریش) بوَ حزبە، کەچی لیرە بەیعەت وەردەگیرا بۆ ریکخستن، پەیرەو کردنی شەریعەتیش نەبوو، لە بۆ شورشیش دەشی بەیعەت وەرگیری، لەراستیدا بازدان بوو گەلی جاری تریش کونتاکت کردن بوو بیَ محاویلە لەگەڵ (زەخت العالی)و دەسوتان .

4. تا ئێستا گوتارێکی سیاسی ئیسلامی ڕوونی نیە لەبارەی هەڵوێستە بنچینەکانی: چۆنیەتی ڕزگاربوونی کوردستان، دەسەڵاتی ناوەندی، ژیانی سیاسی، بەرە، دیموکراسی، فرەلایەنی، هەڵبژاردن، دانوستان، پارچەکانی تری کوردستان، تکنۆلۆژجیا، پەیوەندی فقهو سیاسەت، ئافرەت، دادگەری،کەمایەتیە ئاینی ومەزهەبی کوردستان... هتد.

5. بۆئەوەی هەر لایەنێکی سیاسی خۆی هەڵسەنگێنی،نابێ نەعامەییانە بێت، دیارە ئەوەی بەنەخشە و عەقل هەڵەیەك دەست نیشان دەکرێشیرنە، ئەوەی ڕووداویش پێی دەسەلمێنی تاڵە، بۆیە(ڕەخنە لە خۆ) دینەمۆی چاکسازی ئەو لایەنەیە کەبەشی هەرە زۆری خۆی لە(ڕاپۆرتی سیاسی) ئەو لایەنە دەدۆزێتەوە، کەچی تا ئێستا نە بزوتنەوەی کۆن نەکۆمەلیش (ڕاپۆرتی سیاسی) نیە،گوزارش لە بێ سەرو بەری مەنهەجی وفکری و ستراتیجیوهەڵویستەکانیان دەکا، بۆیە دەبینین فرە تەیارو فرە ڕاو بۆچونێکی زۆر جار دژ بەیەکیشی تیایە کە دەردێکی کوشندەی هەر لایەنێکی ڕادیکالیە.

6. نەبوونی پرۆژەیەکی سیاسی و فکری و نیشتمانی و ئابووری بوویتە هۆی.

أ- نا هەماهەنگی نێوان(بەرنامەو واقعی)، (دیدو پەیرەوی)، (تاکتیك و ستراتیژی) (سەرکردایەتی و بنکەی) (سیاسی و عەسکەری)....

ب- بوونی قەیرانی ماددی.

ج- لاسایی کەرەوە بێت نەك پێشرەو.

د- لەئەزموونی سەرکردە و بنکە چ وەك وولاَت چوەك حزب، ئەو سەرکردانەی هەردەم نامەرکەزیانە بڕیارو فەرمانەکانیان لەخوارەوەو گۆڕەپان ڕا دروست بووە سەرکەوتوو بوینە، ئەوەی لەپشت مەکتەب و مرکزیانە دروست بووە، تێکەوتوون، بۆیە وەزعی ئەندامێکی هەر لایەنێك پێوەرەکەیەتی، هەر بەنموونە حزبایەتی لە جیهانی سێیەم(بە تایبەتی تەیاری عەلمانی )وایە حزبی دەسەڵاتدار ئیمتیاز دەداتە ئەندامی خۆی و ئابلۆقەی یاسایی و ئابووری و ئیداری و زانستی و کۆمەلایەتیش دەخاتە سەر ئەندامانی لایەنە بەدیلەکە لە چوارچێوی(تقریب القیادة و الضغط علی القواعد)، جا یان دەبێ نهێنیانە کاری سیاسی بکەن یان دەبێت هەردەم سەرکردە ئاگاداری خوارووبێت، بەردەوام ڕێنمایی بدا ئەگینا سەرباری ئەو ئابلۆقانەی دەسەڵاتئەوا ئەندام و لایەنگرانیش دەبتە بارگرانی لەسەر ماڵو خێزانی خۆی، لە کۆتاییدا ئەو سەرکردەیەی خۆشی لێ دەبێتە بەشێك لە ئابلۆقەکەو بەرەبەرە تەفاعولی ئەو حزبە لەگەڵ میللەت لە کار دەکەوێ.

7. لەسەرەتا تا کۆتایی بزوتنەوە و دوای کۆمەلی ئیسلامیش نەهاتووە ئەو گرفتانەی لەسەرەتا تۆمارمان کرد لەگەلّ خالّە لاواز و سەرەنجامەکانی بتوێژنەوە چارەسەری فکری و گرفتە کردە ییەکانی بۆ بدۆزنەوە، بۆیە بەشی هەرەزۆری لای خەلّکی بووەتە پرسیاری نەمر و ڕێگر لە تەفاعول کردن .

8. ئەو جۆرەبزوتنەوانە مادام پەیامی بۆ کۆمەلّ پیّ یە ئەوا یەکەم جار پێویستی بە خۆناسین هەیە، هەر بۆیەش پێویستە هەمووئامرازو دەروازەیەکی ڕەوای بگرتایە بەر بۆ تێکەلّ بوون لەگەلّ چین و توێژە جیا جیاکانی کۆمەلّگەی کوردستانی، وەك:

ا- لە ئامرازەکان: بەرە، حکومەت، بەرگری نیشتمانی، سانديکاکان، هەلّبژاردن،....

ب- خۆی بپارستبایە لە هەموو جۆرە خۆجیاکردنەوەیەکی سادەی وەك:پەنجە جولاندن، سونەتنەکردنی جومعە، سەلەوات لیّ نەدان- بەتایبەتی لەوسەردەمەی (خەلکی عەوام) هەموو ئاینەکەیان لابچوك بۆتەوە بۆ نوێژ و جومعە و ئەحوال شەخصی جا هەر دەسکاریەك لەچەوتەکانیش دەبتە گۆتەی ئەوە ئاینەکی نویّیە... بۆیە لە جیاتی تەرکیز لەسەر ئەو کێشە لاوەکیانە تەرکیز لەسەر سەرچاوەی کێشەکان بکرابایە- ، شێوازی(چاکسازی) وەك بنەماکانی ح. ابراهیم راست و دروستە کە بەهەلّەی خەلّکی دەستی پیّ کردوو(ووتی ئەستێرە، دوای مانگ، ڕۆژ،... ) خودایە ! .. بۆ ئەوەی بیرو فکریان لە دوگماوە بجولێنیّ ئینجا پێی وتن نەخێر خودا ئەوەیە کە ئەوانەی دروست کردووە، واتە لە هەلّەو شەرعی نائیسلامی دەستی پیّ کرد بەڕاست و شەرعی و ئیسلامیانە کۆتایی پیّ هێنان.

ج- بوویتە هۆی بەرپابوونی کێشەی نوێژ کەران لەگەلّ ئیسلامیەکان نەك عەلمانیەکان کە هەر نوێژ ناکەن، ئەوانە بە سادە دەردەکەویّ بەلاّم ڕۆلّێکی گرنگی بینی.

8. چاکترین نموونەی نیگەتیڤ لە(فقهەوە بۆ سیاسەت) لێرەوەیە،زۆربەی سەرچاوەکانی جیاوازی فکریەکانیان جیاوازیە فقهیەکانە، هەموو ئەو جیاوازیە فقهیانەی کۆن و نویّ هێنراوە لە ناو بزووتنەوەیەکی سیاسی تاقی بکەنەوە بەڕاستی باری قورس دەبێت،ئارامی بە خۆوە نابێنیّ.

9. دەردی(زیندی کوژی، مردی پەرست) لەناو میللەتی ئێمە وئیسلامیەکانیشهەیە، لە کاتێکدا واقع و داهاتوو گرنگکەیە، هەلّبەتە زانایانی سەردەمیش لە کێشەکانی

سەردەم شارەزا ترن نەك زانایـانی کـۆن، بەتایبـەتی لـەبارەی (سیاسـەت) زۆر کەمیشـی لەسەر نووسراوەتەوە،بۆیە بۆ ئەو مەسەلانە زۆر نەگەڕێنەوە سەر سەرچاوە کۆنەکان.

10. خۆی بزووتنەوەیەکی سیاسیە کەچی بابەتی(فقه السیاسه) و(فکـر الاسـلامی) و فقهەکانی (حوکم)و(جماعه)و(قیاده و الامامه) و(اقتصاد) (معاملات وعلاقات)... هتـد بابەتی ناوەندی نەبووینە، زیاترگرنگی و شارەزای لە(فقهی احوال شخصی) بـەس نیـە بـۆ سـەرکردایەتی کردنـی کۆمـەڵێکی ئیسـلامی لـەو سـەردەمەی عەولەمـە، دوای وەك بەسەرهاتی ناو کەشتیەکەت لیٚ دێت کاتیٚ مامۆستایەك بە کەشـتیەوانی ووت تـۆ(علمی اصول )دەزانـی؟ گـۆتی نـەخێر، مامۆسـتا گـوتی چـارەگی عـومرت بـەلاش ڕۆیشـتوە، مامۆستا گووتی ئەدی(علمی الکلام) ؟ گـۆتی نـازانم، مامۆسـتا گـوتی بەشـەکی تـری عومرت ڕۆیشتووە.... لەو کاتە شەپۆڵ هات کەشتیەوان بە مامۆستای ووت تـۆ (علمـی مەلەوانی) دەزانی؟ گوتی ناوەڵا... کەشتیەوان گوتی دەنـا هـەموو عـومرت وا ڕۆیـی و خنکا! واتە بەپێی (فقه الاولویـات) فقهی مەلەوانی پێویست تربوو لە فقهی کەلام! . خـۆ ئەو بابەتانە هەمووی لە(سیاسه الشرعیه) هاتووە کە بریتیە لە(اولویات، موازنـه، تغیـر، تدرج، واقع، حرکه، مقاصد..).

11. سسـتەمی (ڕابـەری- یـاخود ئـەمیری ) لـە جیهـان وەك سیسـتەمی (ملکـی ددەستوریە) یان(سەرۆکی دەستووری) یە، بەڵام لێرە لە دەسەڵاتی تنفیذی دایەوسـەرۆکی( مەکتەب سیاسی)یە، بۆیە هەموو ساتێك شایەنی بەرپابوونی کێشە هەیـە لەگـەڵی، جـا ئەو کات کێشەی نێوان رابەرو دەزگایەك بەچ(مەرجەعیەتێکی) بالاتر یەك لا دەکرێتـەوە؟ لە کۆتاییدا دەبێتە لێك ترازان هەروەك ڕوویدا لە ئەزموونی بزوتنەوە.

بەئەزموونیش دەرکەوتووە بەو شێوازە ناتوانێـت تاسـەر بێتـە سـەۆکی روحـی، بۆیـە دەبێت(ڕابەر) لەدەزگای تنفیذی نەبێت، و پیرۆزیەکەی بپارێزرێت خۆی دوا(مەرجەعیەتی) یەك لاکردنەوەکانی کێشە هەرە بالاکانی نـاو ئـەو بزوتنەوەیـە بێـت، ئەزموونـەکانی (ا. خمینـــی، نهـــرۆ و غانـــدی، علـــی عـــزت بیگـــۆفیج، ســـیهانۆك،ملا مســـتەفا...) بەسەرکەوتوویی‌دروسـتیەکەی دەسـەلمێنن، ئەزموونـەکانی سـەرکردەکانی ئەفغانسـتان، جزائیر، وولاتانی عەرەب، کوردستانی ئێسـتا، صـۆمال، چـاد، یۆگسـلافیا..... نمونـەی پێچەوانەیەتی. دەردەکەی کوشندەتر دەبێت ئەگەر ئەو سەرکردە یە باوەشی فراوان نـەبێت ئەوا هەر زوو تاقم تاقم و خەت و تەوەری جیا دروست دەبێت.

12. لەســـەرووبەری ڕووخـــانی فكـــری شـــیوعیەت هـــەموو حیزبـــە ئیســـلامیەكان بەدەوڵەمەنـدی فكـری مابوونـەوە كەچـی ئـەو عـەمبارە فكریـە مەزنانـە بەكارنـەهاتن تائێستاش، لایەنی تر لەسەر (باطـل)توانیـوەتی كۆمـەڵێك مـەفاهیم و تێڕوانینـی بینـا كردوە و (.. و جادلوا بالباطل لیدحضوا به الحق... )

13- لەسەر هەمان تـراز سـەرەرای دەڵەمەنـدی لـە فكـرو جـەماوەر (چـەندایەتی و چۆتایەتی) و پاكی ڕێبازی ئاینی، لەسەرو بەری ڕاپەڕین لە ڕێز ی حزبە سەرەكیەكان بـوو كەچی ئێستا بەجێ ماوە؟ ئەو برە ئازادیەی كوردستان لە شوێنی تر دەبووە هۆی هێنـانی دەنگـی یەكـەم لەلایـەن ئیسـلامیەكان هـەروەك لـە(جزائر، توركیـا، ئـوردەن، چیچـان، ئێران،فلستین، ئیراق... هتد) كەواتە خەلەل لەسەركردەو ستراتیژ هەیە.

14. هەندێ مەجال درووست بوو لەكەم و كوڕی وەك (جوانی سەیارە) (خانووی بەرز) (مل ملانێ ی پایە)بەتایبەتی لە سەردەمی بزوتنـەوە..یـان بەگشـتی تـر لـە سـەردەمی كۆمـەلیش ئەوانەی بەشداری پەرلەمان و وەزارەت وشـارەوانیان كـرد بـە كـەمێكیش بـێ پریشكی تەوژمی گەندەلی ئەوانیشی دەگرتەوە و تا رادەیەك ژیان و گوزەرانیان خـۆش تـر دەكرد یان بەشێكیان ئەو مووەیەی نەدەگێڕایەوە بۆ كۆمەڵەكەی، هەرچـەندە لـە هـەموو لایەنەكانی تر چاكتر بوون بەڵام بەپێی بنەماكانی ئیسلام خالی لاوازە لێیان، ئەوەش بـووە سوتەمەنی ماكینەی ڕاگەیاندنی چەواشەكاران وناحەزانیان گوایە (هـەمووی یـەك لەیـەك خراپترن) و دیسان ڕاستیو ناڕاستی تێكەڵ بوونەوە و تەمەنی هەموو مدرسەیەكی ناڕاست درێژ بوویەوە، گۆتەی وەك هەرچی بێت لەوی تر خراپترە، هەركەسـە بـۆ خـوێتی، ئەوانـە دەسەڵاتیان هەبێ خراپ ترن،ئیتر ئامانجەكانیان بە دوورخستەوە.

+ ئەو پرسیارە لێرە گرنگە: بۆچی لەدەنگی ڕابەرایەتی(م عوسمان عبد العزیز)* ڕێـژەی دەنگەكانی كەمتر بوو لە ڕێـژەی لیسـتی بـە 10293 دەنگ،كەچـی دەنگـی رابـەرانی تر(مسعود بارزانی، جلال تالەبانی ) لە لیستەكەی خۆیان زیاتر بوو، كەواتە بەڕوونی و بە ژمارە دەدەكەوێ كەم و كوڕیەكان لە سەرووە نەك لە بنكەو خوارووی بزوتنەوە.

---

*هەرچەندە ئەو ڕێژە دەنگە بەشی زۆری دەگەڕێتەوە بۆئەوەی‌لەلیستی هاوبەشی بزوتنـەوە ویـەكگرتوو دا یەكگرتوو دەنگی بە(م عوسمان) نەداو پێی وابوو ناتوانی ئەو ئەركەقورسە بەڕێوە ببا، بـەو شـێوەیە یەكەم جار یەكگرتوو بە ڕاشكاوانە هەلوێستی بەرامبەر سەركردایەتی بزوتنەوە دەست نیشان كرد وبە لاوازی لە قەلەمی دان و دوایش دەركەوت بۆچوونەكەی ئەوان ڕاست دەرچوو .

15. واقعـی سیاسـی و کۆمەلاّیـەتی ئـالّۆزی ئێسـتا هەریەکـە سەرچـاوەی هەیـە، سەرکردە دووربینەکان بەسـانای دەتـوانیٚ سەرچـاوە تەسـکە سیاسـیەکان بگێڕێتـەوە بـۆ سەرچاوە فکریەکان و لە وێش بۆ سەرچاوەی فراوان تر، ئەو کاتی دەتوانی لە ژێـر سـایەی دیکتاتۆریـەکانیش یـان بارەتەنگـەکانی سیاسـیش هـەر ئـیش و دەعـوە بکـەن بـیٚ ڕوو بەڕووبوونەوە،بیٚ ئەوەی ڕوخساری سیاسی لیٚ دەرکەویٚ کە قەدەغەیە لە لایەن دیکتاتۆر و دەسەلاّتخوازەکان، راستە دنیای ئێستا دنیای سەرکردەی دووربینە، ئەو دەزانی ئـەو واقعـە سەرچاوەی لەکوێیە دوا مەنزلگەشی لـە کوێیـە، بۆیـە لـە کوردسـتان سـەرکردایەتی وەك (حسك) کورت بین بوو شکستی هێنـا و یـەکێتیش دروسـت بـوو، ئـاواش کـورت بینـی بزوتنەوە تێن و ووزەی ئەو جەماوەرە بەهێزەی دەدۆڕاند، بۆیە گۆڕینی سـەرکردە ناچـاری بوو بۆ دەرچوون لەو بازنە داخراوە، بەلاّم تا ئیستاش بەشێك لە دەردەکانی نێـو بزوتنـەوە هەروا زەق بوویتەوە لە نێو کۆمەلیش .

16. هەر لێرەوەش دەوری موئەسەسەی مدنی و سـاندیکاکان چـەند گرنگـە بـۆ ئـەو مەبەستە لەلایەك و لە لایەکی تر دەبتە ناوەڕۆك کە بـە سـاناتر بتـوانی ئایدۆلۆژیایـەکی سیاسی ڕادیکالّی خوردکاتەوە... ڕەنگە ڕاستەوخۆ هـەرس نـەکرێت ببتـە هـۆی سسـتی تەفاعول کردنی، هەروەك ئەزموونی (کۆمەلّە لە نێو یەکێتیدا) و پەیرەو کردنـی کێشـەی نیشتمانی و دروست کردنی سەندیکاو ئەنجومەن و لق —بۆ تەفاعول کردن.

17. کەمتر توانیویەتی بچـێتە نـاو ڕۆشـنبیرەکانی وەك ئەنـدازیاران، مـاف ناسـان، پزیشکان، ئافرەتان، هونەرمەندان... هەرچەندە بەهۆی بەشداری لەحکومەت ویسـتویەتی ئەو خالە لاوازە چارە بکا، بەلاّم ئەزمونی بەشداری ئیجابی وسـەلبی هەیـە لـە هـەمووی گرنگ تر جارانئەو بەشداریەیان پیٚ ناشەرعی بوو، ئینجا کە چووشن مەترسی گەندەلی لە بەشداربوانیان دەکری .

18. — ڕێبازمان قورئان و سوننەیە —ئەوە وەلامێکی خێرایتیان، دەلێن ئێمـە ئـیش بەئایەت فەرموودە دەکەین لە هەلّویٚست و کاری سیاسی ! ئەوە لە لایەك تێکـەلّ کردنـی فکری سیاسی و بەرنامەی سیاسیە، لەلایەکی تـر قورئـان و سـوننە دەریایـە یـان وەك تەزووی (ظغط العالیة) بیٚ محاویلە دەتسوتێنیٚ ئاواش یەکسەر بیٚ فقهو ئەزموونی ڕابردوو ناشێت یەکسەر بگەڕێتەوە سەر قورئان و سوننە، بۆ ئەو واقعەت بۆ ئەو کات و شـوێنەت دەبیٚ بەرنامەیەکی سیاسیت هەلێنجی بنەماکانی لەسەر شەریعەت بێت.....

ئەوە پرۆژەی سیاسی شرعیە،بەڵام قورئان و سوننە پرۆژە نیە مەبادیئی چەسپاوەو ئامادەن بۆ هەموو کۆمەڵ. سەرنج بدە، ابن قیم لە کتێبی (طرق الحكمية... ) راكانی خەست کردۆتەوە و دەڵێ (السياسة ماوافق الشرع، ولاسياسة ما نطق به الشرع)، (اينما وجدت العلم فهى الشرع ان لم ينطق بها القران و السنة) او (سياسة عادلة تخرج الحق من الظالم الفاجر فهى من الشريعة).

+ دەتوانین کۆمەڵێك خال لە خالێکی لاوازی کۆکەینەوە، بە حوکمی سروشتی پەیوەندی ئیسلامیەکان ورۆژئاوا لەلایەك وناسکی ئەو قۆناغەی کورد وای خواستوە بزوتنەوە لە ڕیزی پێشەوە نەبی واتە ئامانجەکانی دەبێ وا دارژرابێ نەخشەییانە (ماقبل الأخيرة )کەچی ڕەفتاری سیاسی وچالاکی وهەلس وکەوتی بۆ (ئەخیرە) بوو لەوەش تووشی دەردەسەریەکانی هات .

## سەلبیاتی کاریگەری ئیسلامی عروبی بەسەر ئیسلامی کوردستان

1. ئەوەی زۆر زەقە ئەوەیە وەك پێویست ئەو لایەنانە بەهانای میللەتی کورد نەهاتوون، هەر چەندە خۆیان بەشدار نەبووینە لەوتاوانانە، زیاتر حزبێکی عەلمانی وەك بەعس و دامو دەزگای سیاسی تری عەرەبی شۆڤێنی پالپشتیان کردوون، بەڵام لەچاو دادگەری ئیسلام هەڵوێستی بزوتنەوە ئیسلامی وزانایانی ئاینی (بەتایبەتی عەرەب) لاواز بوو.

2. بەشی هەرەزۆری زانایان و بانگخواز و کەسایەتیە ئیسلامیەکانی عەرەب بەهۆی ئینتمای عروبیان لایەنگری کێشەی فلستینن، لایەنگری کێشە عەرەبیەکانن، شەرعیەتی هەبێ یان نەبێ، لایەنگری دروست بون وپاراستنی دەوڵەتی عەرەبین، بەناوی پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق... کەچی ئەو سنورانەش ئیمپریالیزم دروستی کردووە، ئەوانە بەدوو تەرازوو (بانێك دووهەوا) لەبارەی دۆزی کورد دەدوێن، کاتێ دێنە سەر پارچەپارچەبونی وولاتی عەرەبی دەڵێن ئەو سنورانە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم دروستی کردووە دەبێ لابەرێ، کاتێ دێنە سەر کێشەی کورد دەڵێن نابێ یەکێتی خاکی عێراق تێك بدرێ، واتە سنورەکە بپارێزرێ...! لەلایەکی تر ئەو بەشە ئیسلامیە باوەڕیان بەو مافە چارەنوسە نیە کەلە ئاین ویاسا نێو دەوڵەتی وبڕیارەکان ورێکەوتنەکان هاتوە(بە تایبەتی مادەی(1)ی

میساقی نەتەوەیەکگرتوەکانبە بیانۆی ئەوەی با چیتر وولاتی ئیسلامی پارچە پارچە نەبیٚ،لەکاتێکا کوردستانیش وولاتێکی ئیسلامیەو پارچە پارچەو ژێر دەستەش بوە .

3. دەبوایە هەڵوێستی بزوتنەوەی ئیسلامیەکان ئەوەندە بەهێز بوایە کورد پێویستی بەوە نەبوایە ڕوو لە ئەوروپا و جیهانی تر بکات...چ لەوە تاڵ تر هەیە کە لە بەڵگەنامەی ئەمریکی (دۆسیەی پەیوەندی دەرەوە ج 1969E4 ـ 1972/7/5دەڵیٚ یەکەم جار کریسمیس دانی بە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد هێنا کەچی نمونەیەکی وا لە نێو دەزگایەکی ئیسلامی سەردەم نادۆزیەوە)، تاو ئەوساتەش لەنێو ئەدەبیاتی بزوتنەوەی ئیسلامیە عەرەبەکان کەمتر باس لە شێخ سعید وشێخ محمود و قازی و ملامستەفا دەکریٚ، کەمتر باس لەوچاکەیەی بارزانی دەکریٚ کە لە گەرمەی جەنگی حوزیرانی1967 شەری نێوان عەرەب و ئیسرائیل... شەڕی یەك لایەنە راگرت بۆ ئەوەی سوپای عێراق بچێت رۆڵی خۆی لەو جەنگە ببینی، یان وەکو زاناو سەرکردەیەکی ئاینی یەکەم سەرکردەی شۆرش بوو بانگیشە پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامی بکات.

4. لە پڕۆژەکانی چاکسازی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست وراپۆرتە سیاسی وپەیرەو پرۆگرامیان بە ڕوونی باس لە مافی کورد ناکرێت لەگەڵ ئەو زولمە گەورەیەی لێیکراوە، هەروا بە چاوی موالی وکەمایەتیەکی پەککەوتە تەماشای کورد دەکەن ولەکاتی لێقەومان دەڵێن (خطیة کورد..)

5. زۆر بە زەحمەت ناوی کوردستان دەبەن، هەندێکیشیان لەوانە(هیئة العلماء السنة ـ بەسەرکردایەتی حارس زاڕی) دەڵێن ما یسمی اقلیم کوردستان .

6. تا ئەمریکا کوردی بە یەتیمی نێو دەوڵەتی وەسف کرد لە 1979ەوە، لەڕاپۆرتێك بۆ کۆنگرێسی ئەمریکی لە 1979/11/29 لە ژێر سەردێری (کوردی هەتیوی نێو دەوڵەتی)، ئینجا ئیسلامیەکانیش لە 1991هاتنە سەر ئەو وەسفەوئەو کتێبەی دفهمی شناوی کە لە 1991 دەرچوە بەناوی (الاکراد یتامی المسلمین) .

7. لەناو کوردستانیش بزوتنەوە ئیسلامیەکان بەدرەنگەوە ڕوویان لە ئەرکی نیشتمانی وکوردستانیان کرد، دوایش هەلوێستیان لێڵە بەرامبەر چارەنوسی کوردستان وتا ڕادەیەکی زۆر هێشتاهەلوێستەکانیان لە ژێر کاریگەری ئیسلامیە

عروبیەکان دادەڕێژرێ، بۆیە ئەمریکاش ئەو حیسابە مەزنەی بۆ کردبوون لە بەڵگەنامەی ئەمریکیب ڕیاڕی ژ:13 ـ 99ی سەرۆك کۆماری ئەمریکی لە1999/2/4بزوتنەوەی ئیسلامی لە سێیەمین حزبەکاریگەریەکانی(7حزبە کاریگەریانەی عێراق)ە: ویفاق ـ موئتەمەر ـ بزوتنەوە ـ پارتی ـ ملکی ـ یەکێتی ـ مجلس ئەعلا) نێو عێراق پۆلین کرابوو.عەقلی عربی لەو کاتە توشی قەیران بوە کە ویستویەتی عروبی وئیسلامی تێکەڵ بکا،ناشکرێ، چونکە عروبی لە کۆمەڵە فاکتەرەکانی ستونیەو ئاینیش لە کۆمەڵە فاکتەرەکانی ئاسۆییە،ناچار دەستکاری دەقی دەوێ ،لە ئاینیکی مرۆڤایەتیەوە وەری چەرخینە ئاینێکی ڕەگەزپەرستی،تا فەزلی عرب بەسەر میللەتانی تر بکەوێ،ناچار دەستکاری مێژووشی دەوێ وکردویانە،تەعریبی مێژووی دەوێ وکردویانە،ئیترلەو تەقەلایەوە قەیرانی عەقلی عربی دروست بوەو لەگەڵ نەمانی دەسەلات لەدەست عرب خەست تر بۆوە،ئەو قەیرانە نەیتوانیە بگاتە دەقی ئاینی بەڵام بە توندی گەیشتۆتە فقە ومێژوو وڕوانگەی سیاسی،وای کردوە میللەتی عرب لە جیهان دوا کەوێ،بەو قەیرانەش هاتونە دنیای نوێ، بەو ناسنامەش هاتنە نێو عەولەمە،سایکس پیکۆو بەلینی بلفۆرودەسەلاتی عربی دیکتاتۆریەکجاری قەیرانی بۆ دروست کردن،تیکڕای بیریارەگەورەکانیان کۆدەنگن لەسەر ئەو شەبەنگە قەیراناویەی عەقلی عربی،زۆربەی مونەزیرو زاناوبیریاری عربی ئاینی لەو زەمینەوە (تصدیر)ی بۆچوونەقەیراناویەکانی دەکا،بەشێکیشی هەیە لەو قەیرانانە رزگاربوە،بەڵام کەمایەتین وهەولی نامۆکردنیان دراوە بە زیندانی کردن و دوورخستنەوەو سزای تر، کەچی ئیسلامی کورد وەك چۆن عەلمانی کورد لاسایی باڵە سەلبیەکانی مەدرەسە عەلمانیەکانی جیهان دەکاو توشی قەیرانی عەقلی سەخت بوە ئاواش بەشی هەرە زۆری ئیسلامی کورد کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو جۆرە عەقلە پڕلە قەیرانەی عەرەبی،ئیسلامی کورد ڕازی بوە کە لەدوای ئەو عەقلەی عربی جێی خۆی بکاتەوە،عەرەبی ئیسلامی بە پلە دووی موالی کۆن سەیری ئیسلامی کورد دەکا، تەنانەت بە خۆی ئەو هەموو قەیراناویەی بەکورد دەلێ تۆ بیرمەکەوە عەقلی عربی بەهێزترە من لە جیاتی تۆ

بیردەکەمەوە تۆ تەنها لە خزمەتدابە،من چیم پێ باش بوو ئەو بۆ تۆش باشە،ئەگەر هەڵەشم کرد ئەوا هەڵەی من لە راستی تۆ دروست ترە ، بەو ڕوانگەسەقەتە ئیسلامی کورد سەیری جیهان دەکا تووشی کاردانەوەی تایفی وتوندی ودەمارگیری ودابڕان وبێ ئینتمابی بوە بێ ئەوەی پیویستی پیبیێت،جاروایە هەموو دنیای لێ دەبیتە دوژمن تاجل و بەرگی خۆشی بێ ئەوەی هۆیەکەی مەعقول بێت،کە شایستەی نیە،بە دلپاکی وفەقیرحالی تووش دەبێ ،ئەوەی دلخۆشکەرە خەریکە بە ڕوونی هەست بکرێ کە ئەو قەیرانە (ئیسترادە) ولە ناخی ئیسلامی کورد ولە ناخی ئاینیش هەڵنەقولاوە ،بۆیە ئومیدی چاکسازی وپەڕینەوە لەو قەیرانە مەحال نیە.

کەواتە دەتوانین بڵێین ئیسلامیەکان لە کوردستان شکستیان هێنا (فاشیلن)؟

ڕەنگە وەڵامی ئاسان نەبێت چونکە لەو سەردەمە تاکە مەدرەسەیەکن بێ فاکتەری دەرەکی لە هەناوی جەماوەر بخولقێن،خۆی دەتوانی خۆی ئۆتۆماتیکیانە چاکساز بکات، بەڵام بە پێی ئەو بارو دۆخەی تێیدایە زۆر زەحمەتە نەفی کردنی ئەو پرسیارەش، چونکە هەر دام ودەزگاو کۆمپانیاو بزوتنەوەیەك ئەگەر لەو دۆخانەی خوارەوە بوو بە (فاشیل)پۆلین دەکرێ:

1- دوێنێو ئەوڕۆی وەك یەك بێت یان خراتر، ئەگەر ئەوە بەراوورد بکەین دەبینینتا سالآنی 1999بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان لەلایەن ئەمریکاوە بە یەکێ لە 7لایەنە کاریگەریەکانی عێراق پۆلین کرابوو ئیستاش هەروا لەکورتی دەدەن،بەتایبەتی لە دوا هەلبژاردنی 2009/7/25.

2- لە هیچ معادەلەیەکی کارای ناوەکی وهەرێمایەتی جیهانی نەبێ بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ .

3- لە دۆخە جیاجیاکاندا گۆڕانت پێ نەکرێ.

4- هـەموو دۆخ وئەزموونـەكانت شكسـتی هێنـابێ، واتـە بـە ئـەزموونی جیهـادی ئاسایی(بزوتنەوە)، ئەزموونی جیهادی توندی ( ئەنساروئیسلام)،بەنەرمی ونیمچە نەرمی (كۆمەل ویەككگرتوو)لەهەموو بارێك هەر لە شكست دابێ .

5- ئەگەری دەربازت لەئاسۆ دیارنەبێ، ئیمكانیەتی گەشەو گۆڕانی پەكی كەوتبێت .

6- بـەدیل نـەبێ بـۆ دۆخـە خراپـەكانی بەرامبەریشـت، ..بـە لای كـەمی هەنـدێك لەبیرمەندانیان گەیشتبنە ئەو قەناعەتەی كە نەبوون وبوونی وەك یەكە .

7- زۆربەی ئەوانەی دەچنە نێو حكومەت بە نوێنەرایەتی لایەنـە ئیسـلامیەكان لـەو تاقی كردنەوەیە دەرنەچووینە ،وەك گەندەلچیەكانی تری حزبە عەلمانیەكان كەوتونەتە ژێـر كاریگەری پارەو كۆشك وتەلار وژن هێنانی تر ومۆنیكاو..

8-ڕیسـایەك هەیـە لـەكارگێڕی بـالاّ ئـەویش ئەوەیـە ئەگـەر دەزگایـەك لادەی وكاریگەریەكی وای نەبێ لەدوای لادانی ئـەوا مانـای بـێ سـوودە،لەو كاتـە 2009ئـەو لایەنە ئیسـلامیانە لـە گۆڕەپـان لابـدەی دەبیـنین كاریگەریـەكی وای لـەدوای خـۆی بـە جیناهیلی.

8- لە دوای هەموو ئەوانە ئەگەر گەیشـتنت بـەو دۆخـە هۆیـەكانی نـاوەكی بێـت، بۆڕوون كرنەوەی ئەو بەندە شێكردنەوەیەكی بۆ دەكەین بزانین بۆچی لایەنـە ئیسـلامیەكان ئاوا چەقیون، ئەوە لەكاتێكایە كە دەوروبەری كوردستان لە ئێران، توركیا، نـاو عێـراقیش هەمووی وا بە ئیسلامی دەتەنێتەوە،خۆ ئەگەر گۆڕانەكیش لە سوریا بێت ئـەوا مسـۆگەر بەدیل ئیسلامیە، لەلای ئەوروپاو ئەمریكاش دەركەوت ئەو بـە دوای بەرژەوەنـدە لەگـەڵ كەس تاسەر نەدۆستە نەدوژمنە،لەكاتێكا لەزۆر هەلویستا دژ بە ئیسلامی دەبینین كەچـی لە كیشەی بۆسنەو كۆسۆڤا لایەنگیری ئیسلامی گـرت دژبـە سـربیای مسیحی،لەسـاحل العاجیش لای حسن وەترای ئیسلامی گـرت دژ بـەلۆگبابۆی مسـیحی، لـەوەش زیـاتر وا لایەنگیری بوهاری عەرەبی دەگرێت كـە شۆرشـە لەسـەر عەلمانیـەت[1]، كەواتـە فاكتـەری دەرەكی زیاتر لە قازانجی ئیسلامیەكانە نەك عەلمانی دەسەلاّتدار، لەناوەخۆش ئەوەچەندین ئامار بكرێدواییەكەیان ڕادیۆی نەوا پێی هەڵساو دەركەوت لە زیاتر لـە80%ی میللـەتی كـــورد داوای دەســـتوری ئیســـلامی دەكـــەن بێئـــەوەی كـــەس ئیشیشـــی

[1]ئەو هەلویستەی زۆربەی ئیسلامیەكانی كوردستان بەرامبەر ڕۆژئاواو پۆلین نەكردنی وەك خۆی وتیایدا بەهەلەداچـوون دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كاریگەریەعروبیەی كەوتۆتە سەر ئیسلامیەكانی عەرەب ولەوێشەوە بۆسەر ئیسلامی كوردستان.

لەسەرکردبێ...کەواتەچۆن عەلمانیەکان توانیان ئەومیللەتە لـە باوەشـی خـۆ بگـرن وئـاوا ئیسلامیەکان ناشرین بکەن لە کاتێکا تەواو پێچەوانەیە ئیسلامیەکان لە عەلمانیەکان پاك ترن، نیشتمان پەروەر ترن هەتا دیموکراسی تریشن ...کەواتە هیچ وەلاٚمێك نیـە جگـە لـە هۆکاری ناوەکی پەتی کە خۆی لە قەرەی (فاشیل)ی دەدا .

تێبینی: لەدوای سەرهەلّدانی (بزوتنەوەی گۆڕان) دروست بوونی هەر 3 لای معارەزەی کوردستان ئێستا ئیسلامیەکان کەوتنەوە قۆناغی بوژاندنەوە، ئەزمونی شۆرشی سپی لـە وولاٚتانی عەرەب بە هەموو لایەکی سەلّاند کەحزبی (گوتارو **خطاب**) ی پەتی چارەسـەری کێشە نوێیەکانی تاك وکۆمەلّی پێ ناکرێ،بۆیە ئێستا لە قۆناغی (پۆست ڕابوونن) هێشتا ئاسۆکانی بە ڕوونی دیارنیە شـێوەو فـۆرمی ئیسـلامی داهـاتوو چـۆنە،لەوەوەش ڕەنگـە ئیسـلامی کوردسـتان پێشـڕەو نەبن،چـاوەڕوانی ئـەزمونی ئیسـلامی جیهـانی عـەرەبی بکەنەوە..ئەوەش ئیجابی نیە.

## 8- 3 وەلاٚمی ئیسلامیەکان بۆ چەند پرسیارێکی گشتی

لەبەرئەوەی لایەنی ئیسلامیەکان لەو سەردەمە خاوەنی ئایدیۆلۆژیاو بەرنامەی سیاسین سروشـتیە ئـەو پرسـیارانە زیـاتر ڕووبـە ڕووی ئـەوان بێتـەوە نـەك لایەنـە عەلمانیـەکان کەشتێکیان نەماوە ناوی بیرو باوەڕومەبادیئو بنـەمای ئـەخلاقی سیاسـی بـێ، ئـەوە لـە لایەك لەلایەکی تریش لە دوای شکستی یەکجاریخیلافەت لە 1924 و دابەشی جیهانی موسولمان نشین بە پێـی سـایکس پیکـۆ1916وسـیڤەری 1920 ودامەزراندنـەوەی دام دەزگـای دەولّـەت لـە سەربنچـینەی عەلمانیـەت ئـەوا ئیسـلامیەکان کەوتنـە دۆخـی نامۆوتوقیە، ئیتر ئەوان لەژێر پرسیار بووینە نـەك عەلمانیـەت، تاشۆرشـی ئێـران 1979 ئەوشەرم و نامۆییەی شکاند یەکەیەکە، بەلاٚم لە کوردستان هیشتا لەو دۆخە ماوون، بۆیە هێرشی پرسیار لەلای عەلمانیەتە .

لەڕاستیدا ئەو پرسیارانە نوێ نین، لە ئەوروپا بەپێی تایبەتیخۆیان لەسەدەکانی (18-19) بەخەستی بەرۆکی کلیسەی گرت و خـۆی لەبـەر ڕانـەگرت و بچـوکیان کـردەوە بـۆ ڤاتیکانێك، لەناو ولاتانی عەرەبیش لەپەنجاکانی سەدەی بیسـتەم دەسـتی پـێ کـردو، وا ئێستاش لەکوردستان گەرمەیەتی کە بەداخەوە داهێنانی تیـا نیـە، لاسـایی کردنەوەیـە، هەموو ئەو پرسیارانە لە کتێبی (العلمانیە و الدولە الدینیە- شبلی عیسمی)و ئـەدەبیاتی

تری حزبی بەعس هەیە و هەندێکیش لـە کتێبی(العقـل السیاسـی العربـی- محمـد عابـد الجابری) وەرگیراوە،لەگەڵ هەندێ سەرچاوەی(ئیستشراقی و چەپی و کلاسـیکی) تر،واچـاك بوو عەقلی کوردی خۆی هەندێك پرسیاری‌نوێی داهێنابوایە.

وەلاّمەکانی زۆر بەکورتیی ئەگینا هەریەکە نامیلکەیـەی پێویسـتە، لـەناوەڕۆکی ئـەو کتێبەش زۆر لە وەلاّمەکانی تیایە.

## پرسیاری عەلمانیەکان و وەلامی ئیسلامی

پ/ئیسلام ئاینی هەموو کوردە بۆ تەنها لایەنێك بیکاتە مولکی خۆی ؟

**و**/ئیسلامیەکان

1- نەتەوایەتیش مولکی هەمووانە بۆچی حزبـی نەتـەوەیی لەسـەر دروسـت دەبێـت ودەیکاتە مولکی خۆی؟

2- ئیسلام نەك بۆ کورد بۆ هەموو ئادەمیزادە، کێ خزمەتی بکات بـە دڵسـۆزی ئـی ئـەوە، جـا ئەگـەر چـاکە ئێـوەی عـەلمانی پـەیرەوی بکـەن و ببنـە خـاوەنی و لایەنـە ئیسلامیەکانیش پاساوی بوونی نامێنێت، ئەگەر خراپێشـە ئـەوا ئاشـکرای کـەن و لێـی گەڕێن بۆ ئیسلامیەکان.

3- ئەگەر هیچ لایەنێك خۆی لە ئیسلام نەکردە خاوەن هەردەبێ لایەنێًك دروسـت بـێ کە ئیسلام یکاتە بەرنامە... و نابێ بێ خاوەن بمێنێتەوە..

پ/ئایا پرۆسەی(ئیسلامی سیاسی) تەسك کردنەوەی ئەو ئیسـلامە گەورەیـە نیـە لـە حزبێکی بچووك؟

**و**/

1- ئەگەر ئیسلامی سیاسی توومەت بیت ئـەوا ئیسـلامی ناسیاسـیش بـە (افیـون الشعوب )توومەتبارە .. این المفر؟؟ کەواتەزاراوەکە هەلەیە

2- ئەگەر ئەو پرۆسە هەڵە بێت ئەوا حزبی نەتەوەیشـی مـادام هـەمووی کـوردی لـە حزبێکی بچووك تەسك کردۆتەوە و حزبی شیوعیش هەموو کرێکاران و... ئینجـا هـەمان پرسیار رووبە حزبە مەسیحیەکانی کوردستان و جیهانیش دەبێتەوە .

3. هەر خۆی ئیسلامیش لەلایەن عەلمانی بچووك کراوەتـەوە لـە(2) دەقیقـە قورئـان خوێندن دەرسی پێنجەمی‌ئایین و چاریەکەوەزارەتێك بەناوی ئەوقافو یەکێتی زانایان.. ئەی کوا: شەریعەتی ئیسلامی، ئـابووری ئیسـلام، جهـاد، حکـم. شـورا،اهل الحـل و العقـد،

امام،......؟ بۆیە مەبەست لە دروست بوونی ئیسلامیەکان ئیسلام کردنی تازە بەتازەی ئەو خەڵکە نیە بەڵکو گەلاڵەیەکی شارستانی و سیاسی یە بەدیلی شۆسیالسیتی و شیوعی و لیبرالّی و دیموکراسیە بە هێمنی.

پ/بۆ ئاینی تێکەڵبە سیاسەت دەکەن؟ ئاین بەڕێی خۆی و سیاسەتیش بەڕێی خۆی.

و/

1- زیاتر لە 600 ئایەت باسی حوکم و پەیوەندی و شۆڕش و جماعە و شورا و داگەری و... هتد دەکات خۆ سیاسەتیش هەر ئەو بابەتانەن، ئەگەر سیاسەتیش خراپە ئێوە بۆ دەیکەین؟

2- محمد کوڕی عبداللە(د. خ) خۆی هەم پێغەمبەربووە هەم سەرۆکی سیاسی دەوڵەتی مەدینە بووە .

3- وورد ترراستە ئیسلام تێکەڵ نابێت لەگەڵ(مەزهەبی سیاسی میکاڤیلی) کە ئێستا باوی هەیە لە ناو عەلمانیەکان و (هەڵخەلەتان و بادانەوە وبەرژەوەندی و گەیشتن بەمەبەست بەهەر ئامراز و ڕێگەیەك بێت).. ئەوانە مەبادیئی سیاسی میکاڤیلیە، سیاسەتی شەرعی جیایە لەسەر شەریعەت و ئەخلاق دروست دەبێت و بریتیە لە(چەسپاوی ئەمەك و ڕاستگۆیی و بەرژەوندی گشتی و بەڵێنو هاریکاری و چاکسازی)..، ئەوە سیاسەتی شەرعیە سەری ئیسلامە بەڵێك جیاکردنەوەی وەك سەر لەلەش جیا کەیتەوە، هیچ گوتەیەك نیە لەوە ترسناك تر چونکە مەبەست تێکدان و دەرپەڕاندنی ئیسلامە لە گوڕەپان و لەقازانجی عەلمانیەتە، ئەوەتا(شبلی عیسمی) دەڵێ (.. رجال الدين العادين غير متطلعين لاهداف السياسية،لايحبذون زج الدين فى القظايا سياسية، الامر الذى يلتقى من حيث النتيجة بصورة غير مباشرة مع ماترمى اليه العلمانية) [1]

4- وەلامی پرسیارەکە بە پرسیاریش دەدرێتەوە بۆچی سیاسەت لە ئیسلام جیا دەکەنەوە؟ ئەی پێناسی (سیاسەت) مانای (چاکسازی گشتی نیە)، ئەی مەبەست لە سیاسەت(هێنانەدی زیاترین بەختەوەری بۆ زۆرترین خەڵك) نیە... ئەی ئەوەش هەمان پێناسی و مەبەستی ئاین نیە .

5- ئەوە تەنها لە مەسیحیەت هەیە(ما لقيصر لقيصر و ما للە للە) لە ئیسلام دا(ولله الامر جميعا).

---

[1] العلمانية .... ل77

پ/ئیسلامیەکان ئاین بەکار دێنن لە پێناو سیاسەت؟ و لە پێناو گەیشتنە حوکم؟

و/

1- ئەدی نەتەوە ییەکانیش کوردایەتی بە کارناهێنن لە پێناو سیاسەت و گەیشتن بەدەسەڵات؟

2- بە پێچەوانەوە عەلمانیەکان ئایینیان بەکار هێناوە لە پێناو ئامانجی عەلمانی(مەکسیم رۆدنسۆن) [1]دەڵێ : لە ڕۆژهەڵات نەك عەلمانیەکان شیوعیەکانیش سەروەری ئاینیان لە پێناو چەسپاندنی مارکسیەت بەکارهێناوە.

3- بە پێوانەیەکی ئەلکترۆنی ئێستا(دزەکە) دەگێرێت بەسانای : ئەگەر هەریەکە لە شیوعی و لیبرالی و ئیسلامیەکانمەبادیئی خۆیان بە کار هێنا ئەوە بەزاندنی تیانیە، بەڵام ئەگەر شیوعی ئیسلامی بەکارهێناو، ئیسلامیەکان مەبادیئی لیبرالیان بە کارهێناو،..ئەوا بەکارهێنانە، بەزۆری لە جیهانی ئیسلامی دەبینرێ عەلمانیەتە ئاین بەکار دەهێنێ،بە دەگمەن نموونەیەك نیە ئیسلامی بنەماو سەروەری عەلمانیەتی بەکارهێنابێ .

پ/ئایا ئیسلام دەکەنە قوربانی کوردیان پێچەوانە؟

و/وەلامی ئەو پرسیارە بەو پرسیارەیە: ئایە ئیسلام و کورد هیچ ناکۆکیان هەیە تا یەکێکیان ببتە قوربانی ئەوی تر؟ ئەو پرسیارە بۆ جۆرە (مەبادیئێك) ڕاستە کە نامۆ بێت بە کورد، ئێستا پرسیارە ڕاستە قینەکە ئەوەیە ئاخۆ کورد دەکەنە قوربانی عەلمانی یان پێچەوانە؟ کەواتە بە ئیسلام خزمەتی کورد دەکرێ و بە کوردیش خزمەتی ئیسلام... لە پەیوەندی ئۆرگانیکی دایە.

ئەوەشپێچەوانەی پرسیارێکی تری نوێیە کە دەڵێنهەموو لایەك سودیان لە ئیسلام وەرگرتووە تەنها کورد نەبێ!!

پ/ئایا سەرچاوەی تیرۆر تەنیا ئیسلامیەکان نین؟

و/

1- ئەسلی تیرۆر لە دادگایەکی شۆرشی فەرەنسا هاتووە لە دژی دەسەڵاتدار و قازیە زۆر دارەکان واتە تۆقاندنی هاولاتیان لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە وەکو ئێستاش

[1](الماركسية و الاسلام)مكسيم رۆدنسۆن- ئە ندامی(م. س)حزبی شیوعی فرنسا.

دەسەڵاتداران بەردەوامن، کوردلەلایەن حکومەتە داگیرکراوەکانەوە تۆقێندراوەو تیرور کراوە.

2- تیرۆری ڕەسمی لەلایەن سەرمایەدارانی جیهان کراوە هەر لە تیرۆری (پاتریس لوموميا)…. تا دەگاتە (د فتحی شقاقی، رفاندنی عبدالله ئۆجەلان.. سیّ سەرۆکی چیچان تیرۆرکراوە لەلایەن روسیا) لە کوردستانیش چەندین سەرکردە بەدەستی ڕژێم تیرۆر کراوە، لەلایەن مارکسیەکانیش مەبادێئێکەو و لینین دەڵیّ(… ناشیّ و نابیّ مەبدەئی تیرۆر رەت بکەینەوە… ) [1]بۆیە تیرۆر تەمەن و ناسنامەی نیە لە پێش (رابوون) هەموو جیهانیشی گرتۆتەوە- ئێرلەندا، ئیسپانیا، ئەمریکای لاتینی…. خۆ ئیسلامی نین… ئینجا ئەو توومەتە دژیبزووتنەوەی رزگاری خوازی جیهان و کوردیش بە کاردێت، بۆیە نابێت بەو پیّ ناسەیە قایل بین، لە ئیسلام دا(جهاد) هەیە بەلاّم (تیرۆر) بەو مانایەی کوشتنی فکر بیّ تاوان بوونی نیە، ئەو ئایەتەش (واعدوا لهم ما استطعتم… لترهبوا به عدو…) ئەوە لە چوار چێوەی وەزارەتی جەنگە لەکاتی جەنگ و ئەگەر تەواو لە مانای ئایەتە تێبگەین دادگەری جەنگیە، ئیرهاب و تیرۆریش لێك جیان —بڕوانە مەوسوعەی جودی

3- ئیسلامی یەکان زیاتر قوربانی تیرۆرن.

پ/ئیسلامیەکان باوەڕیان بە دیموکراسی و (دەست گۆڕی دەسەڵات)نیە؟

**و/**

1- ئیسلامیەکان و نیشتمان پەروەرە ڕاستەقینەکان قوربانی یەکەمی نەبونی دیموکراسین نەك پێچەوانە .

2- زیاتر ئیسلامیەکان باوەڕیان بەدەست گۆڕی دەسەڵات هەیە لەبەر هۆیەکی سادە چونکە ئەوان مەبەستیان گەیاندنحزبێك یان سەرکردەیەك بە دەسەڵاتنیە، مەبەستیان گەیاندنی دادگەریە کەلە شەریعەتی ئیسلامی دایە، جا هەر حزب و سەرکردەیەك بێت، بەلاّم لەناو جەرگەی دیموکراسی ئەوەتا بەئەزموونی زیندوو نایەڵن دیموکراسیەك ئیسلامی لیّ چەکەرە بکات، گوایە دەبێت(الدیموقراطیة للدیموقراطیین) جا پرسیاری گرنگ تر ئەوەیە ئاخۆ کامیان دیموکراسی ترن عەلمانیەکان یان ئیسلامیەکان ؟ ئیسلامیەکان هەر لە چواچێوە پەیرەوی شریعەت ئەوەتا لە چیچانی پێشوو،لە ئێران،… کە دەوڵەتن تاکە

[1]لینین- (من این نبدا؟ ).

دەزگایەکیان نەبوو شەرعیەتی میللی نەبێت هەر لە (سەرەك کۆمار، مرشد، شوراو پەرلەمان، حکومەت، ئەنجومەنی شارەوانی.. ).

ئەی کوا لە وولاتە عەلمانیەکان مەگەر دەنگ هێنانەکان لە 99، 99٪ یەکان،لە کوردستانیش چاترین بەڵگەی دیموکراسی لە ناو حزبەکەی خۆی(دەست گوڕی دەسەڵات) بکات ئەوەتا ئیسلامیەکانی کوردستان تائێستا(4) ڕابەریان گۆڕی کەچی ئەوە نیو سەدەیە هەرسەرۆکی حزبە عەلمانیەکان سەرۆکن...

پ/کامیان نیشتمان پەروەرترن؟ ئیسلامیەکان یان عەلمانیەکان.

و/بەشێك لە عەلمانیەکان بەرگری نیشتمانی کردووە بەڵامبەگشتی ڕێسا هەیە، زۆربەی جار عەلمانی دەست کێشی بۆداگیرکەر کردووەلە مەغریب، جزائر،لیبیا*،سودان، ئێراق کەچی ئیسلامیەکان بەرگریان کردیە لە وانە :شورشەکانی خەتابی لە مغریب،بادیسی و شیخ عبدالقادر لە جزائر،عمر المختار لە لیبیا، شورشی مەهدی لە سودان، شورشی 20بە سەروکایەتی ئایەتوللە شیرازی لە ئیراق.. سەردەمی ئێستاش لە توانای ئەوان دەرچوو تەنیا بە ئیسلامیەکان دەکرێت، ئەوەتا بزوتنەوەی بەرگری نیشتمانی جیهانی ئێستا زۆربەی ئیسلامین(خوارووی لبنان، فەلەستین، چیچان، کشمیر، مۆرۆ،...) کەچی عەلمانیەکان بەرەو تەسلیمن، هەر بە نموونە خۆ لبنان تەنیا هی ئسلامیەکان نیە ئەدی لبنانی شیوعی، دیموکراسی، تقدمی و قوومی هەموو عەلمانیەکانیش نیە؟ بۆ تەنیا (حزب الله) ئەو ئەرکە نیشتمانیەی بە ئەستۆ بێت، ئەی دەوڵەتە عەرەبیە نەتەوەییەکان عەلمانیەکان بەچ شەرمەزاریەك دەنگ و باس خوارووی لبنان دەخوێننەوە، ئەدی ئەرکی جەیشی نیزامی لبنان چی یە؟ تێکڕا عەرەب نزیکەی 10 ملیۆن سەربازیان هەیە ئەوە بۆچیە ؟

ئیسلامیەکان خزمەتی گەل و وولاتیان بەئەرکی شەرعی دەزانن بۆیە خیانەت ناکەن نای فرۆشن، دوژمنی ڕاناکێشن..

پ/ئایا پەیرەو کردنی شە ریعەتی ئیسلامی گەرانەوە نیە بۆ دواوە؟

و/

1. ئەدی پەیرە و کردنی سۆشیالیستی و دیموکراسی و لیبرالی خۆ هەمووی ئی پێش ئیسلامن بۆ ئەوان گەڕانەوە نیە بۆ دواوە؟

* تەنانەت ئتحادیەکان لیبیایان مەزاد کردبوو بفرۆشنە ئیتالیا بە دوو بەلەمی جەنگی .

2. ئینجا یاسا کۆن نابێت دەکرێت بلێین(یاسای کێش کردن، یاسایەکی رەجعیە چونکە کۆنە... شەریعەتی ئیسلامیش هەمووی یاسای کۆمەلآیەتین کۆن نابن.

پ/خۆ نوێژ و رۆژوومان لێ مەنع نەکراوە وولآتمان داگیرکراوە شۆرشی ئیسلامی بۆچیە؟بۆ تەنیا نەتەوەیی نەبین؟

و/1. باشە خۆ سۆشیالیستی و لیبرالی و شیوعیەتمان لێ منع نەکرابوو ونەکراوە بۆ حزبەکان شیوعی و سۆشیالیستی و دیموکراسی دروست بوینە؟

2. جا ئەگەر نەتەوەیی بین ئەی چی لەو هەموو چاش و خائینانە بکەین ژمارەیان لە نیشتمان پەروەرەکان زیاتر بوو ئایا دەشێت کوردێکی خائنمان پێ لە(نلسۆن ماندێلا) چاکتر بێت بەو ڕوانگە نەتەوایەتیە؟

3. مەگەر داگیر کردنی وولآتێك بێ شەرعی نیە ؟ نابتە کێشەیەکی ئیسلامی؟

مەگەر ئەوە ڕێ گرتن نیە لەوەی ئێمەی کوردیش ئیسلام لە پێناو خۆمان بەکار بهێنین؟

پ/عەلمانیەتی کورد چۆن لە ئیسلام گەیشتووە؟

و/کۆمەلێك فکرو تیۆری جیا جیا بۆ ڕەوشەنبیری کورد هێنراوە هەر لە هەلۆیستەکانی مارکسیەت بەرامبەر ئیسلامتادەگاتە (نظریات ضعف الانسان، سحر، نظریة الخوف، نظریة تعدد الالهة، نظریة الکوارث، نظریة الوجودیة،... ) لەگەل نیشتوەکانی زانستی کلاسیکی بە لێکدرۆاویلە بیرو دەروونی عەلمانیەت یەکتریان بڕیوەو بێ ئاگاشن لە

1- زانستی نوێ

2- ئیسلامی ڕاستەقینە.. و هەلۆیستێکی نا دروستی بۆ دروست کردن.

درێژەی پرسیاری وەلآم

پ: خودی فکری ئیسلامی لە خزمەتی فکری عروبە یە؟ وەئایا ئیسلامیەکانی کوردستان یەکەم جار کوردن ئینجا ئیسلام، یان پێچەوانە؟

وەلآم: فکری ئیسلامی لە ئینتمایە ئاسۆییەکانە کەچی فکری عروبە لە ئینتما شاقولیە کۆمەلآیەتیەکانە، هیچپەیوەندیەکی تایبەتیان پێکەوەنیە، هەر بەووردی سەرنج بدە ئەو ئایەتە(جعلناکم شعوبا و قبائلا لتعارفو، ان اکرمکم عند الله اتقاکم)

بەڵام فکری عروبـەی قـەڵۆش هـەردەم ویسـتویەتی ئـاینی دەولەمەنـدی ئیسـلام بـۆ مەرامی سیاسی عروبی هەژار بە کـاربهێنێ و بەکاریشـی هێنـاوە، لێـرەوە پرسـیارێکی تریش قووت دەبێتەوە لەلایەن عەلمانیەکانی کوردسـتان و دەڵـێن میللـەتانی تـر ئـاینی ئیسلامیان بە قازانجی خۆیان بەکارهێناوە تەنیا کورد نەبێت! ! جا لێرە دزەکە دەگیرێ بـۆ کوردیش بەکاری ناهێنێ؟ کێ ڕێی لێ گرتووە؟ خۆ ئیسلام رووبارێك نیە تـورك عەجـەم و عەرەب بەنداوێکیان لە پێش کردبێ تانەگاتە کورد. بەڵکو حزبـە کوردسـتانیەکان خۆیـان (بەتایبەتی لە قۆناغی نوێ) پشتیان لە ئیسلام کردووە ڕوویان لە مارکسیەت و لیبرالیەت و وجودی و عەلمانی کردووە، ژێرخانی ئەو پرسیارە هەڵەیە، چونکە ئیسلام لە سەرتەوەری ئاسۆییە ونەتەوەییش لە سـەرتەوەری سـتونیە بۆیەپاشـوپێش مانـای نادا،ماناشـی وایـە خاوەن پرسیار لەخودی پرسیارەکەی خۆی نەگەیشتووە .

ئینجا سەرنج بدە لە هەموو وولاٌتانی عەرەبیئێستا قەدەغەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانە و لە زیندانن، مێژووش گەواهی ئەوە دەدات، ئەگەر ئیسلام شاقوولی و ڕەچـەلەکی بوایـە وەك ئیمپراتۆریەکانی ئەو سەردەم ئەوا دەسەڵات هەر بۆ عـەرەب قـەتیس دەمـا، کەچـی دەبینین کورد و تورك و عەجەم و فارس و تەتـەر و چـەرکەس و........ هـەمووی نـۆرەی دەسەڵاتیان هەبووە، بە پێچەوانەوە لـە دوای عەباسـی عـەرەب کـەم دەسـەڵات بووینـە، هەموو لایەك بە هۆی ئەو ئیسلامە گەشاینەوە، سەرنجبدە باری سیاسـی کـورد لـە پـێش هاتنی ئەزموونی عەلمانی و لەسەردەمی خیلافەتچەند گەشاوە بووە .

**تێبینی:**

دووبارە بۆ یاد خستنەوەی ئـەو پرسـیارو وەڵامانـە تونـدترین پرسـیاری عـەلمانین بـۆ ڕووخانی ژێرخانی ئیسلامی سیاسی، وەڵامـەکانیش بـریتین لـەوەڵامی ئیسـلامیەکان بـۆ دروستکردنی پاساوی مانەوەی سیاسیان، (نەك وەڵامی نووسەر)..

# بەشی نۆیەم

## پرۆژەکانی رزگارکردنی کوردستان

پرۆسەی وەرچەرخانی سیستەمی ئیمپراتۆری بەرەو دەوڵەتی نەتەوەیی زیاتر لە دووسەدەی خایاندووە، بۆیە مێژووی دەوڵەتی مۆدێرن لە هەر ناوچەیەك جیایە، هەرچەندە هەمووی بۆ سەرەتا رێکەوتنی (ویستڤالیا- 1648) دەگێرنەوە، لەسەرەتای سەدەی بیستەمخیلافەتی عوسمانلی ڕووخا ومیراتەکەی بەپێی رێکەوتنامەکانی: سایکس بیکۆ 1916، سان ریمۆ 1920، سیڤەر1920، لۆزان 1923.... دابەش کران و کوردستانیش لەگەڵیان دابەشکرا، لە هەمووجیهان وەها کێشەیەك دروست بوو لە ئەنجامی دارِشتنی ئەوسنوورە نوێیەی نەتەوەیی و جوگرافی، گەلێ نەتەوە و نیشتمان پارچە پارچە بوون و گەلی بن دەست و سەردەست پەیدابوون، زۆربەی ئەو گەلانەی ژێر دەست کرانڕەسەن تریش بوونە، بە نموونە :

+ هەزاران ساڵە گەلی ئێرلەندا لە خاك و وولاتی خۆیان بووینە، لە ساڵی 1641 ز (کرۆمۆل) ی بریتانی گورزێکی کوشندەی لێ وەشاندن ئینجا دەستیش بە پاکتاوی ڕەگەزی کرد و ئینگلیزی بردە ئیرلەندا...

+ گەلی فلستین ڕەسەن ترن لە یەهوودەکان- جگە لە یەهودیەکانی سابرا، ئیسرائیل لە ساڵی 1948 دروست بوو بەپێ ی بەلێنی بەلفۆر 1917 لە کۆکردنەوەی یەهودەکان لە جیهان.

+ گەلی کۆرسیکا کە لەبن دەستی فرنسایە گەلێ کونن لە ساڵی 1796 ناپلیون داگیرکرد.

+ گەلی باسك کە ئێستا ژێر دەستی ئیسپانیاییە بەشێکیش لە فرنسی* کۆن ترین میللەتی ئەوروپین.

---

*4هەریمی وەبەر ئیسپانیا کەوتووە و 3 شی وەبەر فرنسا، بۆیە دروشمیریکخراوی( ئیتا)ی باسك بریتیە لە :3+ 4=1

+ گەلی بەربەریش کەلەژێر دەستی جەزائیر و مەغریب و مۆریتانیا.... ئەوا کۆن ترین میللەتن نەك هەر لەناوچەکە لەسەرانسەری ئەفریقا.... بەهەمان شێوە گەلانی کشمیر، تبت، چاچان، تامیلیەکان، مۆرۆلە خوارووی فلیپین، کورد،....

کەچی ژێر دەست کراوون،هەرچەندەمافی چارەنووس لە رێکەوتنەکانی ڤستیڤالیای 1648 هەتا(عصبە الامم) و(امم المتحدە)بنەماکاانی (ویلسون)، لویدجۆرج، بنەماکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری ڕوسیا 1917،بریارەکانی دەوڵەتی عوسمانلی لە دوای 1900، بە یاساییانەش لە مادەی(1)پەرەگرافی(3) (مقاصد الامم المتحدە) هاتووە[1]، کەچی هێشتا ئەو کێشانە لە جیهان بەگەرمی بەردەوامە، لەبەرامبەر ئەو بڕیاڕانە بنەمای(پیرۆزی سنور)و (دەست تێوەرنەدانی ئیش و کاری وولاتێکی تر)، (عدم تجزئە) و(انفصالی)، لەژێر یاسای (سیادە)کە پەڵەیەکلەسەر زەوی نەماوە بێ(سیادە)،ئیتر کیشەی ئەو گەلانە سەری هەڵدا کاتێ نەتەوەکانی تردەوڵەتیان دروست کردوو سەربەخۆ بوون، بەو ناسنامەنوێ یەلەو دەوڵەتەدا ئاسایش وناسنامەی نەتەوەیی ژێر دەستە دەکوژێتەوە و دەکەوێتە سەر ناسنامەی گەلی سەردەست، وەك مێوان و نامۆ و بیگانە دێنە بەرچاو بەتایبەتی لەو وولاتانەی کە هێشتا کۆمەڵگە و سیتسەمی سیاسیان نامەدەنی و کلاسیکی و ئنتما ستونیەکانن،...ئەوە بنەچەی کێشەکەیە،بە پێی کتێبی (أقلیات فی خطر- تید رۆبەرت جار )نزیکەی 300 کیشەی ئاوا لە ئارادایە، بۆیە چارەسەر لەو واقعە و مافی چارەنووس ڕاستەقینەش (لامەرکەزی) و(ئۆتۆنۆمی) و(فدرالی) نین،بەڵکو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەسەر پانتایی خاکی خۆیان .

کێشەی نەتەوەییکوردیش دروست بووە لە دوای:

1- وەرچەرخانی ئیمپراتۆری بەرەو دەوڵەتی نەتەوەیی.

2- هەلوەشانەوەی خیلافەتی عوسمانلی سەرکەوتنی هاوپەیمانان .

3- سەرهەلدانی فکری عەلمانی و نەتەوەگەری .

4- هاتنی ئیمپریالیزم بۆ ناوچەکە و دابەش کردنی میراتی عوسمانلی لە سایکس پیکۆسیڤەر و لۆزان....

5- دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیا، عێراق، سوریا، ئێران،دابەش بوونی کوردستان بەسەریاندابێ راپرسیان..... بۆیە کێشەی کورد سەرەڕای رەواییی سیاسی و

[1]بڕوانە :**الفصل الأول –المقاصد** (میثاق امم المتحدة)کەپێك هاتووە لە 19 بەش (111)مادە .

کۆمەلایەتی و فەرهەنگیمێژووی و جوگرافیو.... ئەوا رەواییپاسایش هەیە، لەسەر ئـەو بنچینەیە لەسەرەتای سەدەی بیستەمە وە بزوتنەوەی رزگاری کوردستان لـە هـەول و تـیٚ کۆشان دایە بۆ بە دەست هێنانیمافی چارەنوسی، گوزارش کراوە لە چوارچـێوەی حـزب و لایەن و بزوتنەوە و شۆرش و خەباتی دبلۆماسـی ئاشـتی.... بـەپرۆژەی جیاجیا،کێشـەی بنچینەیی ئەوەیە بۆ بە گەیشتنی کورد بەو چارەنووسـە پێویسـت دەکـات سـنوری چـوار وولات تێك بدەی، ئەوەش قورسەو پێویستی بە نەخشەو پلانی ستراتیژی هەیە .

حزب و لایەنەکانی چوارچێوەی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان بەسەر مدرسەکان دابەش بووینە، بۆیە هەریەکە ئێستا دەیانەویٚ (مافی چارەی خۆنوس) بۆ کـورد بهێنێتـە دی بە پرۆژەیجیاجیا، زۆر بەکورتی لەسەر هەریەکەیان دەدوێن:

9- 1 پرۆژەکان:لەراستیدا ئەوە هەر پرۆژەی رزگاری کورد نیە بەڵکو پۆرژەی رزگـاری هەموو گەلانە، بەلاّم خەسلەتی تایبەتی هەیە بۆ کورد ماناشی وایە بەپیٚ ی ئایـدۆلۆژیای ئەو مدرسە رِیٚت پیٚ دەدا کێشەی کورد بکەوێتە بەرنامە و خەباتی ئاشتی و تونـد بکـەی لە پێناویا، بە دارشتنی بەرنامەیەکی تیروتەسەلی نزیك و دوور.

پێش ئەوەی راستەوخۆ بێینە سەر پرۆژەکان پێویسـتە تەرازوویـەکمان هـەبیٚ بـزانین چ هەنگاوێك لە بەرژەوەندی بالاٚی کوردستانە وچـیش دژە، ئـەوەش مانـای دیـاری کردنـی بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسـی کـوردە، لـەو قۆناغـەدا یەکسانیشـە بـە بنـەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی،کەبە کورتی ئەوانەن :

1- سەرنەکەوتنی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان دابەش کردووە ولە کۆتایـدا لـە رِووی یاسایی بە (دول الفاشلە )پۆلین بکرێن چاکە، جا ئەوەش زۆر لا دەگرێتـەوە وەك نائـارامی وولات و پێك نەهاتنی پێکهاتەکان و گیرو گرفتی لە گەل دەوروبەر و نـەبوونی مەرکـەزی ...

2- بەرپا نەبوونی هاوپەیمانی وهاریکاری ئیقلیمی .

3- بەرپا نەبوونی گونجان لەنێوان ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان و کۆمەلگـەی نێو دەوڵەتی.

4- هەرچی گۆرِانەك کە ئەو نەخشە سیاسیە تێك بدا کە لە سـایکس بیکـۆ دروسـت بووە، یاخود زیاتر میکافیلیانە هەرگۆرانێك لە دژی مەییین(جمود) خێرە.

5- گۆرانکاری لە شێوەی جەنگی جیهانی یا خود هەر گۆرانێك تیایدا سەروەری سنور وئارامی نێو دەوڵەتی لەسەر بنچینەی ئەو نەخشەیە هەلوەشێنیتەوە، یاخود هەرگۆرانێك لەو یاسای نێو دەوڵەتی بەو ئاڕستەیە .

6- زال بوونی ئایدیۆلۆژیا بە سەر بەرژەوەندی .

7- دروست نەبوونی کۆمەلگەی مەدەنی لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی مادی .

8- بۆ ناوەخۆش ئەو مدرەسەیەی بتوانی یەکێتی ڕێزی میللەتی کوردستان بپارێزی یان زۆرایە تیەکەی .

بە کورتی چی لە بەرژەوەندی یەکێتی و ئاسایشی نەتەوەیی ئەو وولآتانە بێ پێچەوانەی بنەماکانی مافی چارەی خۆووسی کوردە کە بیەوێ وتەواو خۆی ساغ کردبێتەوە بۆ گەیشتن بە دەوڵەت .

ئیستا بە خۆ بەو تەرازوانە دەتوانین بێینە سەر ئەو پڕۆژانەبەو شێوەی خوارەوە بەکورتی :

## **یەکەم- پرۆژەی چە پیەکان:**

لەسەرەتای شۆرشی ئۆکتۆبەری 1917 لینین کۆمەلێك بنەمای جاڕدا بۆ مافی چارەی خۆنووس و وولاتانی وەك فنلندا و پۆلۆندا.. سەربەخۆییان پێ وەرگرت، بەلآملەگەڵ خەفە بوونەوەی ئەو هەلچوونە هاتنەوەسەربنەمای مارکسیزم لەو بارەیەوەو دەستیان بەسەر چارەنووسی میللەتانی تریش گرتو یەکێتی سۆڤیەتیانلەو 15کۆمارە بە تۆبزی پێك هێنا: (روسیا،ئوکرانیا،کازاخستان، ئوزپەکستان، روسیای سپی،جورجیا، لیتوانیە،ئازەربیجان، مالدیڤیا، تاجیکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستوانیە، قیرغیستان))، بۆیە پرۆژەی چەپی کوردیش هەروا ڕوون نەبووە ئاخۆ مافی چارەنووسی کورد مانای چیە، لەو بارودۆخانەی کەلەنێو شۆرشی کورد بوونایە ئەوا ئەو ئەدەبیاتەی مارکس و ئەنجلسی سەبارەت بە ئیرلەندا و جارنامەکەی لینین لە سەرەتای شۆرشی ئۆکتۆبەر بەکاردەهات، ئەگەر لەگەڵ حکۆمەتەکانی ناوەندی بوونایە ئەوا جۆرە گوتارە سیاسیەکانی کرێکاری دەهات کە ئەو پرۆژەی رەسەنی چەپی بووە بۆ مافی چارەی خۆنووسی.

لە بیری چەپی راستەقینەدا توخمی نەتەوەیی و نەژادی تیانیە، بەڵکوئینتیما چینایەتی بە پلەیەك و بنچینە وەردەگیرێ، باقی ئینتماکانی تر سانەوینن[1] بۆیە لەو پرۆژەیە پێیان وایە بەرزگاری چینی کرێکار هەموو کێشە نەتەوەیی ونیشتمانی و سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و... چارەسەر دەبێ، ئیتر کیشەیەکی وەك کورد، بەشە(جزء) کیشەی کریکار گشتە(کل)، رێبازی ئەقلی لوجیکیش ئەوەیە کێشەی (کل) چارەسەر بکرێ (جزء) ئۆتۆماتیکی ارە کراوە، بەوشێوەیە گەلێ جار خەباتی کوردایەتی و پرۆژەی سەربەخۆی کوردستان بەداوایەکی رەجعی و برجوازی وهەندێ جاریش بە فاشیانە لەقەلەم دراوە، بۆیە دروشمی چەپیەکانلە وولاتانی داگیرکەری کوردستان ناوەندیانە بوو وەك دروشمی(حشع)(<u>نیشتمانێکی</u> ئازاد و گەلێکی بەختیار)، مەبەستی نیشتمان عێراقە، گەلەکەش گەلی عێراق، زیاتر لەوەش گەلێ جار لەسەر دیوار دەنووسرا (کوردایەتی شەرمەزاریە) ! هەربەو تەرازوەش لینین پشتی(ئەتاتورکی) گرت لە دژی شۆرشەکانی کورد 1920- 1928 دوایش تێك دانی کۆماری مهاباد 1946،پشت گرتنی سۆڤیەت بۆ بەعسی عێراق لە 1972و بە پێی مادەی(8 و9) (معاهدەی عێراقی –سۆڤیەتی)[2] یارمەتی سەربازیشی دا دژ بە شۆرشی کورد بەسەرۆکایەتی بارزانی ، لەویش بەدواوە چەك هەلگرتنی چەپی و شیوعیەکان بۆ عێراق لە دژی شۆرشی کوردی زۆر نموونەی تر[*]، لە راستیدا ناکرێ ئەوە بکرێتە پرۆۆژەی هەموو چەپی، چونکە بەشێکی تر پێیان وابوو کوردستانیش شایستەی سەربەخۆیە، بەپشت بەستن بە پرۆژەی جیهانی و ئەزموونی رزگاری گەلان لەژێر دەستی ئیمپریالیزمی جیهانی دەست کاری یەکێ لە یاسا و پرۆژە

[1]بۆزیاتر بروانە: مارکس وأنجلس- بیان الشیوعی(مانیفیست) ص63-65

[2] ئەو هاوپەیمانیە(معاهدە) لە9ی نیسانی 1972 لە بەغدا لەلایەن ئەلیکسی کۆسیجن سەرۆکی ئەنجومەنی بالای سۆڤیەتی وئەحمەدحسن بکر سەرکۆمار لە بەغدا مۆر کرا پیك هاتبوو لە 14مادە.

[*]گەلێ جار سەدام دووبارەی دەکردەوە بگوایە کاتی کە بریاری ئۆتۆنۆمی درا نوێنەری شیوعی ووتویەتی ((**سیدی لماذا حکم الذاتی** ))،ئەو کاتی پێکەوە لە بەرە بوون وتا ئەو ساتەش حزبی شیوعی نەفی ئەو گۆتەیەی سەدامی نەکردۆتەوە .

بنچینەییەکانی مارکس کراو گۆرا بۆ: دەشێت لەهەندێ بارو دۆخی تایبەتی ناکۆکیە سانەوییەکان وەختیانە جیگەی ناکۆکی پلەیەك بگرنەوە، لەوانە:

خەباتی رزگاری نیشتمانی (لە قۆناغی خۆی) جێگەی پلەیەکی خـەباتی کریکـاران لـە دژی سەرمایە داری بگرێتەوە، بەو شـێوەیە میللـەتانێکی زۆر بـەو هۆکـارە لەئـەفریقا و ئەمریکای لاتینی و ئاسیابوون بە دەولوت و ئەندام لە(UN)، بەو ئایدۆلۆژیایە بـەهێزەی چەپیللەت دە ووروژاو توانای بەرگری و رزگاری دروست دەبـوو، بـەلاّم ئـەو پرۆژەیـە لـە خزمەتی جەنگی ساردو جەنگی ستراتیژی سۆڤیەت دژ بە ئەمریکا دابوو، واتە تەنها ئـەو جۆرە خەبات و پرۆژەیان بەرەوا دەزانی کە لـە دژی راسـتەخۆی رۆژئـاوا بوونـەك گـەلانی سەردەست، هەر بۆیە بینیمان دروشمی چەپیەکانی کوردستانی زیاتر ڕوو لە ئیمپریـالیزمی جیهان بوو، بۆیە لایەنە چەپیەکانی کوردستان لە (ی. ن. ك) و(حسك)، (حزبـی زەحمـەت کێشان)، (حشك)، (حدکا)، (پەکەکە)،..... هەتا (پدك)یش دروشمی بنچینەییان خـەبات بوو لە دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکی و سەرمایەداری و دیموکراسیەکە و بـازاری ئـازاد.... گوایـە بـە داروخـانی سـەرمایەداری مافـەکانی کـورد دەگێرنـەوە بۆیـە زۆر جـار لـە کوردستانیانە وەردەگەران بـۆ عێراقیانـە یـان ئێرانیانـە.....، ئـیتر چارەسـەری کێشـەی کوردیان لە چوارچێوەی ئەو دیڤاکتۆیەی کەلە دوای سـایکس پیکـۆ بـووە هـۆی دروسـت بوونی عێراق و سوریا و تورکیا و ئێران و.... واتە پرۆژەکانیان رزگاری تەواوی کوردستان و یەکخستنەوەی تیانەبوو، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە پرۆژەکانی رزگـاری کـە بـریتی بوون لە:

1- پێك هێنانی حزبی پێشرەو لە کریکاران(واتە لە کریکارانی عێراقی نـەك هـەموو کورد)

2- خۆبەستنەوە بە جەمسەری سۆشیالیستی لە دژی ئیمپریالیزمی جیهانی .

3- جەنگی رەوا و ناکۆکی پلەیەك لەگەلّ برجوازی ناوەکی و ئیپمریـالیزمی جیهانـە، ناکۆکی نەتەوەی ژێر دەستی کورد نەتەوەی سەرەدەست و رژێمی عێراق سانەویە.

4- بانگێشەی برایەتی کورد وعەرەب لە چوارچێوەی عێراق.

بـەو شـێوەیە ئـەو پرۆژەیـە نـەبووە نموونـە بـۆ کێشـەکانی نەتـەوەیی لـە ولاتـانی سۆشیالیستی و چەپی

## دووەم- پرۆژەی لیبرالی بۆ رزگاری کوردستان:

ئەو پرۆژەیە لەسەرەتای سەدەی(20) لەگەڵ سەرهەلدانی عەلمانی لە کوردستان باوی هەبووە، پشتی بەست بە سەروەریەکانی ئەزموونی تەکنیکی و زانستی رۆژئاوا و بە داهێنان و تەنینەوەی فکری ناسیونالیزمی ودوای دەوڵەتی نەتەوەیی و هەلمەتی ئیمپریالیزمی کە لە کۆتاییدا مەینەتی کوردی لیٚ دروست بوو، بۆیە تا پێش رووخانی شیوعیەت و سۆڤیەت و دوای راپەرینی 1991 کەمترحزبە کوردستانیەکان خۆیان بەخاوەنی لیببرالی و پرۆژەکەی دەزانی، بە پێچەوانەوە زۆر بە توندی دژی ئەو پرۆژەیە بووینە بە هەموو ئارستەیەك، وەبگرە ناو هێنانیتوومەت و سزا بوو، نەك هەر لەبەر رزگاری نیشتمانی بەڵکو بەهۆی تەوەری ررزگاری _کۆمەلایەتیش،بۆیە دروشمیان رووخاندنی ئیمپریالیزم ولیبرالی بوو،بەلاٚم ئێستا زۆربەی هەرە زۆری خەلکی کورد چاوی بریوەتە ئەو پرۆژەیە، کە بریتی نیە لە کۆمەڵە بنەما و ستراتیژ و نەخشە و پلان، بەڵکو بریتیەلە ( یانصیب) (بەخت)چونکە بنەماکانیلەسەر بەرژەوەندیدارژاوە، ئەو بەرژوەندیە جا روایە دژت دەوەستیٚ وەك زۆربەی جار لە دژی کورد وەستاوە دواییەکەیان 1975و1991، جاریش وایە دەبتە پالپشت وەك ئیستا، هیچیان هەمیشەیی نیە،بۆیە حزبە لیبرالیەکانی کوردستانیش لەستراتیژیەتی(بینین و دارشتن) ن، هەربۆیەش بە دەگمەن وولات ونەتەوەیەك نادۆزیەوە لە مێژووی هاوچەرخیدووجەمسەریبەو پرۆژەیە رزگاری بوبێت جگە لە (ئیسرائیل) و تایوان،ئەو دووەش لێکدانەوەی تایبەتی هەلدەگریٚ، ئینجا حزب و لایەنەکانی لیبرالی (بە کوردسیتانیەکانیشەوە) بەهۆی ئەو پرۆژەو مدرسەلاوازە ناتوانی جەماوەر بووروژێنیٚبۆ هێنانەدی ئامانجەکانی رزگاری کوردستان، بەپێچەوانەوە بنەماکانی بیٚ ئایدۆلۆژی ئەو پرۆژەیە کۆمەلگەیەکی مادی و بەرژوەند پەرستیوات بۆ دروست دەکا توانای بەرگری و رزگاری نابیٚ، بۆیە هەموو هەول و تیٚ کۆشانت دەبیٚ بکەوێتە سەر رەحم و بەزەیی گەورە وولاتانی جیهان، لەسەردەمی نوێی تاك جەمسەری خەریکە هەندیٚ نموونە دروست دەبیٚ، تەیموری خۆرهەلاٚت، تارەدەیەکیشکۆسۆفۆ، وا هەریەکە لە دارفورو کوردستانیشلە قۆناغی هەلپەساردنن،لە هەمان کوردستانی سەروو زمانی کوردیش قەدەغەیە کەچی رەحمی ئەو پرۆژەیە نایگرێتەوە،ئەگینا بەپێی(سیستەمی نوێیجیهانی) و(مل ملانێی شارستانی ) کەمتربزوتنەوەی رزگاری خوازی لەفەرهەنگی ئەو پرۆژەیە جێی دەبێتەوە، بۆیە بەزۆری

دان بە دیڤاکتۆی بارە سیاسییەکان دەهێنێ، تاکە پرۆژەیەکی واقعی لەو مدرسەیە بەکاربێت لەلایەن کورد(یان هەر میللەتێکی تر) ئەوەیە بانگێشەی دیموکراسی بکەی بۆ وولاتە داگیر کەرەکەت تا دوۆستت بۆ پەیدابێ ئەوەش لە دوا پرۆسە دا نەبە هێزی دیموکراسی و سیاسی نەبەهێزی یاسایی ناتوانێ کوردستانێکی سەربەخۆت پێش کەش بکا، لە باشترین دۆخیدا لە دۆزەخ دەرت دەکا بەلام ناتخاتە بەهەشت، بەلکو هەر بیناکەی (سایکس بیکۆ) موکوم دەکەی کە کوردستانی لەت لەت کردووە.

## <u>سێیەم- پرۆژەی سۆشیال دیموکراسەکان:</u>

ئەوبەشەش کەمتر لە کوردستان پرۆژە بووە، لە دیوی کوردستانی ئێران لە سالانی 1980 بە دواوە جار جار باسی لێوە دەکرا لەلایەن(حدکا)، ئینجا لە دوای راپەرینیش ماوەیەکی کورت نەبێ ئەگینارۆلی ئەمریکا زیاتر لە سۆشیال دۆیموکراسیەکانی ئەورووپا هاتووەوە. ئینجا سۆشیال دیموکراسیش لە شیتەل کردنی دا پرۆژەکانی پێك هاتووە لە توخمەکانی سۆشیالیستی زانستی کە لە چەپی باس کرا، ئەوی تریش لەسەر لیبرال دیموکراسیە کە باس کرا. بەلام هەندێ جۆرە سۆشیالیستی نیشتمانی هەیە کۆمەلێك بنەمای نەتەوەیی و وسەروەری نیشتمانی و ڕەچەلەکی تیایە، ئەویش لەبەر شکست هێنانی ئەزموونەکان شوڤینی لە فرنسا، فاشی لە ئیتالیا، نازی لە ئەلمانیا،فالانژیش لە ئیسپانیا، تۆرانی لە تورکیا، بەعسیەت لە عێراق،سست بونەوە، بەکورتی لە کوردستان پرۆژەیەکی سۆسیالیستیواتە تیرۆتەسەل گەلالە نەبووە تا ئێستا،

**<u>چوارەم- پرۆژەی نەتەوەییەکان</u>:** بیری نەتەوەیی بەرپرسە لەو مەینەتیەی کورد، لە کاردانەوەیدا بیری نەتەوەیی بۆ خەلکی کوردستانیش دروست دەبێ، حزب و لایەنە سەرەکیەکانی کوردستان لە بنچینەدا بۆ ئەو مەبەستە دروست دەبن، بەلامحودی نەتەوایەتی ئایدۆلۆژیا و مدرسە و ڕاڕەو نیە، بۆیە بۆ تەواوکردنی خۆی پەنا دەباتە بەر یەکێ لەو پرۆژانەی پێشوو، ئەگینا بزوتنەوەیەکی رەگەز پەرستی لێ دروست دەبێکەمتر سەرەنجامیان هەبووە، لە کوردستان پرۆژەی ناشیونالیزمی لەماوەی کورت سەری هەلداوە و نقوم بوویتەوە، ئەو پرۆژەیە بەزەق تر و ڕاشکاوەنە تر بانگێشەی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکا بەلامهێزو رێکخستن و بەرنامە و نەخشە و پلانی بێ ستراتیژیەتە و لە کاروانی سەردەمیش تەواو بەجێ ماوە.

**9- 2 پوختــه و ســەرەنجامی پرۆژەكـانی عــەلمانی**: ئـەو پرۆژانــەی ســەروو چــەند خالێكیهاوبەشی لیَ بەدی دەكریَ لەگەلْ سەرەنجامەكانی،لەوانە:

هەلْبەتە مەینــەتی كــورد زادەی بــیری عــەلمانی و نەتەوەگەریــە، لــە كۆبوونەوەیــەكی دەگمەنیهەرسیَ رەهەندی جیهانی و ئیقلیمی و ناوەكی هاتەكایەوە.

جیهانیەكەی: بریتیە لە جم و جـۆلی ئیمپریــالیزمی و داگیركردنــی ناوچــەكە لــەدوای جەنگی جیهانی یەكەم(1914- 1918)و دابــەش كردنــی بــەپێی (ســایكس- پیكـۆ 1916) و دروست كردنی ئەو دەولْەتانە و سەربەخۆ پــیَ دان بــە نەتــەوەكانی تــرو پــیَ نەدانی بە میللەتی كورد تا ئێستاش پابەندن بە پرۆژەو پلانی سایكس پیكۆ .

ئیقلیمیەكەی: بریتە لــە ســەرهەلدانی بزوتنــەوەی عــەلمانی ناشســیونالیزمی تــورك و عەرەب و دروست كردنی دەولْەتی علمانی نەتەوەیىو هەماهەنگی لەگـەلْ ئیمپریــالیزمی جیهانی بــۆ بــەش كردنــی كوردســتان و هێشــتنەوەی بــەو شــێوەیە، وەســتانیان لــە دژی تەقەلاكانی كورد بۆ یەكخستنەوەی كوردستان و سەربەخۆبوون، هەلْبەتــە ئــەو دەولْەتانــە داگیركــەری كوردســتانن كەلــە ســەرەتاوە تــا ئێســتا بــە رێبــازێكی عــەلمانی تونــدرِەوی ناشیونالیزمی بەندن، جگە لــە ئێــران لــە ســالّی 1979 وەرچــەرخا بــەرەو دەســتووری ئیسلامی .

ناوەكیەكەی: بریتیە لەوە پرۆسەیەی بە عەلمانی كردنی بزوتنەوەی كوردایەتی كە زیــاتر كورد دووچاری خنكاندن كردووە زیاتر سایكس —پیكۆ ی پتەو تر كــردووە لــە نــاوەخۆش كۆمەلێك ئاسەواری هەبووە بە كورتی بەوشێوەیە:

1- پرۆژەكانی عەلمانی سەركەوتوو نەبووە دەروازەیەك بەسەر مەینەتی كورد بكاتــەوە لەگەلْ حزمەتێكی زۆریشیان .

2- پرۆژەی عەلمانی بریتی لە پرۆژەیەكی پەرتەوازە و ناكۆك و دیدی جیا جیا و خێــرا گۆراوی.

3- بەهۆی فكری عەلمانی جیاجیای توند گەلیَ جــار ســەرەنجام ئــەو پرۆژەیــە بوویتــە بەشێك لە مەینەتی كورد، بــیَ (ســتراتیژیەت و بەنارمــەی دوورو درێــژ) بوینــە، زۆرجــار خزمەتی دوژمنی خۆیان كردووە، نەیان توانیــوە لــە هاوكێشــەی ئیقلیمــی و جیهانیــەكان سوود وەگرن و بیدۆزنەوە.

4- پرۆژەکانی عەلمانی بریتی بوو لە پۆلینکردنی پشتیوانانی جیهانی و ئیقلیمی لەسەر بنچینەی عەلمانی، کەچی دەبینین جگە لەوەی ئەوان لە بنەچەدا بەرپرسیاربوینە لە مەینەتی کورد ئینجا بەردەوامیەکەش هەر لە(سایکس- پیکۆ 1916)، لۆزان 1923،..... هەتا جەزائیر 1975، 1999،1991پیلان دژی ئۆجەلان .. لەلای رۆژئاوا بووە*، لەلای رۆژهەلاتیش پشتیوانی سۆڤیەتبۆ تورکیای ئەتاتورك، دوای شکستەکەی 1946ی مهاباد، دواتر پشتیوانی سۆڤیەت و شیوعیەکان بۆ بەعسی عێراق لە 1972 بەدواوە، بە پرۆژەی ناشیونالیزمی و زەردەشتیایەتی و ئاریایەتیش پشت بەشای ئێرانی بەسترا لە 975 سەرەنجامی هەرشکست بوو .

لە قۆناغی نوێشدا —کەتائیستا بەردەوامە- زۆربەی لایەنە کوردستانیەکان لاسایی(ی ن ك )یان کردۆتەوە وئاوا دۆست ودوژمنی کوردایەتیان دیاری کردووە، هەروەك لە یەکەم بەیان نامەی (ی ن ك )هاتووە:

دوژمنەکانیبریتین لە :

أ- ئیمپریالیزمی ئەمریکی وئیسرائیل.

ب- هێزی سەرمایەداری جیهانی .

ج- کۆنەپەرستی عەرەب کە سەودا لەگەڵ ئیسرائیل دەکەن .

د- لەناوەخۆش چینەکانی دەرەبەگ وبرجوازی وسەرۆك خێل و وابەستەکانی داگیرکەر و ئەو حزب ولایەنانەش کە نوینەرایەتی ئەو چینانە دەکەن.

دۆستەکانیش بریتین لە :

أ- سەربازگەی سۆشیالیستی ویەکێتی سۆڤیەت و بزوتنەوە رزگاری خوازەکان.

ب- هێزی چەوساوەو کریکاری جیهانی.

ج- هێزە پێش کەوتن خوازەکانی عەرەب و شۆرشی فلستین.

د- لەناوەخۆش کریکار و چینە هەژار و شۆرشگێر ونیشتمان پەروەرەکان،هەڵبەتە ئەوپۆلینە تا راپەرینی 1991ی خایاند کەچی دەرکەوت ئەو جۆرە پۆلینەی دۆست و دوژمن هیچ بنچینەیەکی نەبووە ونیە لەگەڵ ئەو هەموو ماندووبوونەشی بۆ کرا،

---

*یەکەم پەیوەندی بە ئیسرائیل(بە پێی کتێبی مسعود بارزانی- بارزانی وبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ل214)لە حوزەیرانی 1963 بووەو لایەنی عەلمانیەتی کوردی لە دیداری ((بەڕێزان جلال تالەبانی و شەمعون پیرس بە پێناومیر کامەران بدرخان))بوو، دوای(( لە ئایاری 1965دیڤید کەمحی بە نوێنەرایەتی حکومەتی ئیسرائیل گەیشتە کوردستان )).

ئیستاشیەکسەر بازیان داوە بۆپێچەوانەکانی، ئەوەی لای ئـەوان بەدۆسـتیان ریـز کردبـوو وادیارە دوژمن دەرچوو، دوژمنەکانیش دۆست، هەڵبەتە ئەوەش بـەروونی خەلـەلی مـەزن لەستراتیژیەتا پێشان دەدا .

5- ئەو پرۆژەیە نەی توانیوە لەو درشمانە بپەرێتەوە وەك (خودموختاری بۆ کوردستان، دیموکراسـی بـۆ وولاٌتەکـە) یـان (لامرکـزی، ئۆتۆنـۆمی، فیـدرالی،... ) هەڵبەتـە ئـەو داوایانەش نەهاتووتە دی نە دیمەکراسیەکەش بۆوولاٌتەکە چارەسەریە، هەرچی چارەسەریەك لـە چوارچـێوەی :(أ- سـایکس —پیکـۆ ب- دەولـەتی عـەلمانی نەتـەوەییج- بنـەمای بەرژەوەندی لە پەیوەندی جیهانی ) دەربازی کوردستانی تیانابێ و نابتە پرۆژەی رزگاری.

6- بەهۆی گرتنەبـەری پـرۆژە جیاجیاکـانی عـەلمانی ئاسـەواریکی زۆر ترسناکیشـی لەسەر کۆمەلگەی کوردی بەجێ هێشتووە کە پەیوەستە بە تواناو هێزی خـودی کـورد بـۆ رزگاری، ئەو پرۆژەیە بەر پرسەلە دارِزانی بنەماکانی ئـەخلاقی کـوردو سـەرهەلدانی ئـەو هەموو دیاردە دزێـوەی وەك خۆویسـتی وبـێ ئەمـەکی، خۆفرۆشـی، ئـەنتی نیشـتمانی، میکاڤیلیانە،.... بالی بەسەر کۆمەڵگە کێشاوە و توانای بەرگری لەدەست داوە.

**پێنجەم- پرۆژەی ئیسلامی بۆ رزگاری کوردستان:**

ئـەو پرۆژەیـە زۆر کـۆن نیـە، راسـتە لەسـەرە تـای مەینـەتی کوردەوەهـەتا سـالی 1975یشهەر زانای ئاینی سەرپەرشتی جولانەوەکانی کوردی کردووە بەلاٌم کەمتر خاوەن پرۆژەی دارشتراوبووینە، جگە لـە سـەرەتای تەقـەلاکانی شـێخ سـەعیدی پیرانـو هەنـدێ سەرکردەی تری ئەو ساتی کێشەی کوردیان بەستەوە بە پرۆژەی ئیسلامی بـە دروشمی(یـان گەرانەوەی خیلافەتی ئیسـلام یـان کوردسـتانێکی ئیسـلامی سـەربەخۆ ) بـەلاٌم نـەبووە زانستێك وەك (فقهی رزگاری کوردستان) و بناغە و گەشەی پـێ بـدرێ، بۆیـە پرۆژەکـان زیـاتر عـەلمانی بـووە، واتـە کوردایەتیـەك بـەناوەرۆکی لیـبرالی، یـان مارکسـی، یـان سۆشیالیستی...... هەتا تەقینەوەی رابوونی ئیسلامی لە جیهـان لـە دوای هەشـتاکانی سەدەی رابووردوو ئیدی ئیسلامی سیاسیش بووە رەهەندێکی جیهـانی، لەوکاتیـەوە ئـەو پرۆژەیە سەری هەلدا : مانای ئەو پرۆژەیە ئەوەیە کە:

1- چارەنووسی جولانەوەی‌کورد بەچارەنووسی رابوونی ئیسـلامی ببەسـتیەوە،ئەویش لە هەلوەشانەوەی ئاسـەوار میراتـی ئیمپریـالیزم لـە ناوچـەکە کـە کوردسـتان وجیهـانی ئیسلامی پیێ دابەش کردووە .

2- ناوەرۆکی ئەو کوردایەتیە بە بنـەماکانی شـەریعەتی ئیسـلامی پربکەیـەوە، لـە جیاتی‌بنەما عەلمانیەکان.

3- پەیوەندیەکی ئۆرگانیکی لە نێوان(رزگاری- نیشتمانی) و(رزگاری- کۆمەلایـەتی) بە ئیسلامیانە دابرێژی، یاخود بەسـادەتر پەیوەنـدی ئایـدۆلۆجیا بـە کوردایـەتی(تێکـەڵ کردنی سەنگەری ئاینی وکوردایەنی ) .

4- بەپێی شەریعەتی ئیسلامی خەباتی(جهاد) لە پێناو کوردستان رەوایی وەرگریێ .

5- بتوانری لە رێی گوتاری سیاسی وشەرعی دۆسـت لـەجیهانی ئیسـلامی بۆکیشـە رەواکەی کوردستانی دروست بکا .

6- لەکۆتایدا بتوانری فتوای شەرعی لەلایـەن زانایـانی ئـاینی دەربکـریێ لەسـەرەتا سـەری جیهـانی ئیسـلامی بەتایبـەتی لـە خـودی وولاتەداگیرکـەرەکان، تـا ئیسـتا لـە کوردستانیش فتوایەکی روون بۆ ئەو کیشە نیە .

## پاساوەکانی ئەو پرۆژەیە:

1- هەموو جوولانەوەیەکی نیشتمانی (بە کوردستانیشەوە) قاوغێکی بۆ ئایدۆلۆجیاو مدرسە وتیۆرە سیاسیەکان نیە، بۆشاییە، بۆیە هەردەبیێ بە ئایدۆلۆژیایەك پـڕ بکرێتـەوە، جا چـۆن هەریەکـە لـە (لیـبرالی و سۆشیلسـتی و شـیوعی ناشـیونالیزمی..) دەیانـەویێ بەرێگەی خۆیان پری بکەنەوە ئاواش فکری ئیسلامی دەیەویێ ئەو بۆشاییە پربکاتەوەمادام ئەو جۆرە بزوتنەوانە مولکی ئەو فکرانەن کە بەکاریان دەهێنن، لە ڤێتنـامو کـەمبۆدیا و مۆزەمبیق و چین ئەنگۆلا.. بە ناوەرۆکێکی مارکسیانە پرکرایەوە، لە ئەلمانیا و ئیتالیـا و ئیسپانیا و تورکیا.. بە سۆشالیستێکی ناشـیونالیزمی، لـە وولاتـانی عـەرەب و تورکیـا ناشیونالیزمیانەی پەتی...، لە بزوتنەوەکانی نوێش (چیچان، کشـمیر، فلسـتین خـوارووی لبنان... بە ئیسلامیانە پرکرایەوە، کەواتە لە کوردستانیش بۆ هەموو پرۆژەکان دەگـونجیێ بەپێی تەرازووی زانستی خۆی.

2- لەوسـەردەمەدا لـە توانـای بالـەکانی عـەلمانی نـەماوە لەسـەر(زەمین)بەرگری

داگیرکەربکا، بۆیە ئێستا دەبینین زۆربەی بزوتنەوە رزگاریەکانی جیهان بەناوەروکێکی ئیسلامیەوە لە مەیدانن ئەگینا هەر دەبێ خەریکی سەوداو تەنازول بێت، لە راستیدا بزوتنەوەی رزگاری خوازی هاوچەرخ بەسێ قۆناغی بەرگری تێپەریوە:

یەکەم: لەسەرەتادا کە تەکنۆلۆجیای داگیرکەر سادە بوو و لەتوانای بەرگری جەماوەری نەتەوەایەتیبوو بەرگری بکاو ئەنجامیشی بوو .

دووەم: لەگەڵ گەشەی تەکنۆلۆجیا زیاتر ئەوجارە لە توانای ئەو تویژە دەرچوو پەرییەوە بۆ ئایدۆلۆجیای مارکسیەت و بەرگری کرد وئەرکی خۆی بینی .

سێیەم: ئێستا کەتەکنۆلۆجیای سەربازی زۆرگەشەی کردووە لەلایەك لەلایەکی تر قورسایی زیاتر کەوتە شارو بە مەدەنی کردنی ژیان* توانای تێکرای عەلمانیەتیپەك خستوە لەبەرگری داگیرکەر، بەڵکو تەنها لە توانای ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ماوە ئەو بەرگریەبکاجاچ سەلبی بێت یان ئیجابی...

بۆیە دەبێ خاوەنی پرۆژەی رزگاریش بن... ئەوە پاساوێکی گرنگە .

3- داگیرکەرانی کوردستانی ئێستا هەر لەسەر بنەمای عەلمانی و هەم بە رێبازی عەلمانیش بەندن، واتە پرۆوژەکە دەبێ بەلایەن کەمەوە پێچە وانەی ئەو ئایدۆلۆجیایە بێ، بۆ ئەوەی گۆرانکاریەکی ریشەیی بێتەدی کە بناغەکانی ئەو سنورە کۆنکریتی و وولاتە دەستکردانەهەلتەکێنێ .

4- پرۆژەکانی پالپشتی داگیرکەریش لە ئاستەکانی سیاسی و دبلوماسیو یاسایی و سەربازی و هەمان ئەو پرۆژانەن کە دژی پرۆژەی رابوونی ئیسلامیشن، کەواتە یەك بەرە و یەك ئارستە و یەك چارەنووسە، واتە بەدەردو دەرمانیان هاوبەشە.

5- دروست بوونی مەینەتی کورد هاو کات بوو لەگەڵئەو رووداوانەی خوارەوە:

1- داڕووخانی خیلافەت، دابەشی جیهانی ئیسلامی، کزبوونی بیری ئیسلامی و شەریعەت...

2- سەرکەوتنی هاوپەیمانان، داگیرکەری ناوچەکە لەلایەن ئیمپریالیزم، هاتنی بیری عەلمانی و نەتەوەگەری، بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی،.... پەیدابوو، واتە دەبێ بە پرۆژەیەکی ئیسلامی رووبەرووی هەموو ئەو دامەزراو پرۆژانە ببیتەوە، لەسەرەتاوە تا

---

*لار بوونەوەی دانیشتوان بەرەو شار و بە مەدەنی کردنی گیانی شۆرشگێری خەفە دەکاتەوە، بۆیە لایەنە عەلمانیەکان ناتوانن بە هۆی گوتاری نەتەوەگەری خەلکی بجوولێنن، بۆبە لە کۆمەلگەی وادا پێویستی بەئایدیۆلۆژیەکی بە هێز هەیە .

دوای، ئەوەش ناکەوێتە چوارچێوەی هیچ پرۆژەیەکی عەلمانی جگە لـە پـرۆژەی ئیسـلامی کە دەیەوێ هەموو ئەو بینا سیاسـی و فکـری و یاسـایی دەولیانـەوواقعی دیفاکتۆیانـەی لەسەر بنچینەی سایکس- پیکۆدروست بووە هەلی وەشێنێتەوە، ئەوەش هـەمان ئامـانجی ناوەندی پرۆژەی کوردە واتە ئەو تیغەی نیشتمانی کوردستانی پارچە پارچە کردووە هەمان تیغ نیشتمانی ئیسلامی مەزنیشی پارچە پارچە کردووە.

6- لەسەر ئاستی ئیقلیمیش - کە ڤاکتەری تایبەتی بە هێزی ئـالۆزکردن و زینـدانی کردنـی پرۆژەکـانی رزگـاری کوردسـتانە- مـادام بەرژەوەنـدی دابەشـی کوردسـتان لەسەرووی‌هەموو ناکۆکیـەکی نێـوان وولاتـانی داگیرکـەری کوردسـتانە، ئـەو هاوکێشـە خنکێنەرە لەسەرەتای مەینەتی کورد تا شۆرشی ئیسـلامی ئێـران بـێ تەگـەرە بـەردەوام بووە، کەچی لە دوای ئەو شۆرشـە بینیمـان بەهۆی(ئیسـلام) ئـەو هاوکێشـەیە وەرگـەڕاو ناکۆکی نێوانیـان بـەهۆی (بەرژەوەنـدیان لـە دابەشـی کوردسـتان) مـەزن تربـوو، ئیـدی تەکانێکی بێ ووچان و مێژوویی بە جولانـەوەی رزگـاری کوردسـتان دا.... تـا ئێسـتاش بەردەوامە، کەواتە کلیلەکانی دۆزرایەوە... هەر ئـەو فاکتـەر بـوو لـە عێـراق وای کـرد عەرەب دابەش بن لە زۆرایەتی ڕەها بۆ کەمایەتی سوننە و زۆرایەتی شیعە و کورد ئـەو هەموو دەستکەوتانەی بۆ کورد بێتە دی... ئەوە هەموو لە پـرۆژەی ئیسـلامیە نـەك لـە پڕۆژەی ئەمریکی و لیبرالی بێت.

7- هەموو میللەتێك(بەتایبەتی لە قۆناغی رزگاریدا) پێویستی بە توند و تۆل کردنی بینا ئەخلاقیەکانی کۆمەلگەکـەی هەیـە، تـا درزی تـێ نەکـەوێ و توانـای هـەمووجۆرە بەرگریەکانی هەبێ، جا ئێسـتا ئـەو بینـا ئەخلاقیانـەی میللـەتی کـورد بـەهۆی پلانـی داگیرکەر و پرۆژەی عەلمانی کوردی تێك رووخاوە و هێـزی بـەرگری و کۆلەگـەکانی بـوون بەدەولەتوکۆمەلگەی مەدەنی لەدەست داوە، بۆ ئـەوەی جـارێکی تـر کۆمەلگـەی کـورد چاکسازی بکرێتەوە بنـەماکانی ئـەخلاقی لـە (ئەمـەکی، سـپاردەیی، ئـۆقرەیی، وولات پارێزی، دلسۆزی، خۆنەویستی، بەرژەوەندی گشـت ویسـتی، هاریکـاری، بەرپرسـیارەتی، ئازایەتی و پیاوەتی، ..بینابکرێتەوە،ئەوەش پێویسـتی بـە مدرسـەیەکی ئـەخلاق مەزنـە ئەوەش لە مدرەسەکانی عەلمانی بەدی ناکرێ، لەبەر هۆیەکی سادە ئەویش ئەوەیـە ئـەوان ماکینەی بیرو باوەڕیان کز بووە، ڕەنگە سەردەمی بەهاری شـیوعیەت بـەویش بکرابایـە، بەلام ئێستا تەنها ئەو ئەرکە بە ئیسلامی دەکرێ.

8- کەواتە هەر گۆرانێك بە دژی سایکس- پیکۆلە جیهان و ناوچەکە روویـدا قازانجـە بە جوولانەوەی کوردو ستراتیژیەکەی، پێچـەوانەش بـە پێچـەوانە، بـەو شـێوەیە هـەردوو رەهەندی (رزگاری —نیشتمانی) و(رزگاری- کۆمەلایەتی) کوردستان لێرە یەك دەگرێتەوە، تاکە ئایدۆلۆژیایەکە کە تێن و ووزە بە رزگاری بدانـەك ببێتـە بارقوورسـی لەسـەری وەك مارکسیەت و سۆشیالستی و لیبرالی.

9- جگە لە پرۆژەی ئیسلامی پرۆژەکانی تر نابنە هۆی هارکاری میللەتانی ناوچـەکە، هەتا میللەتی(سەردەستیش) لە پێلانی سایکس- پیکۆ زەرەرمەندن و دابـەش و بچـووك کراوو بووینە، هەرەشەی شارستانی و فەرهەنگیان لەسەرە، لە دروست بوونی ئـەو قـەوارە پارچە پارچەیەی وەك عێراق و سوریا و تورکیا.... زەرەرمەندن، دژبەیەکن، دیکتاتۆریەت زالە بەسەریاندا، سەرەرای دواکەوتەیی زانست و تەکنیك و.. کەواتە دلسـۆزانی ئـەوانیش ئامادەن بەشداری پرۆژەیەکی سەرتاسەری و رێشەیی بکەن، ئەوەش تەنها لەو کاتـەدا لـە پـرۆژەی ئیسـلامی خـۆی دەنوێنێـت، هەرتـەنها بـەوەش دەتـوانرێ کێشـەی کـورد وەك کێشەیەکی مرۆڤایەتی رەوا پێشان بدرێ ئەگینا بە دەمارگیر و پیلانی داگیر کـەر وەسـف دەکرێی وبەزالم پێشانت دەدەن کەچی مەزلومیشی .

10- زۆر بەروونی دەرکەوتووە ئێستا پرۆژەی ئیسلامی زانسـتی و مۆدیرنـە، پـەکی پرۆژەکانی نەکەوتووە، چونکە لە بنەچەدا ئیمپریایزم داگیرکەری داهێناوە ئێسـتاش پشـت گیریانە،... هەروەك لە پێش چاو دەبینرێ، نموونـەی پرۆژەکـانی ئیسـلامی لـە خـوواروی لبنان و پرۆژەی عەلمانیلە کوردستانی سەروو (بەنموونە) چەندە لە بەراوردا جیاوازن، بۆیـە بەرەی رزگاری نوێ پرۆژەیەکی ئیسلامیە بە سرۆشتی خۆی.

11- تاکە پرۆژەشە کە بتوانێ زۆرایەتی رەهای خەلکی کوردی لەسەر کوبکرێتەوە .

12- زەق ترین پاساوی پرۆژەی ئیسلامی بریتیە لە نێگەتیڤەکانی پرۆژەی عـەلمانی و سەرەنجامەکەی.

سەرەرای هەموو ئەو خالە بە هێزانەشی هێشتا پـرۆژەی ئیسـلامی جـار نـەدراوە لـە کوردستان لەبەر دوو هۆی تەك ولۆ:

ا- خەتی ئیخوان کۆنن و لە کوردستانیش هەبووینە و شارەزاشن بـەلام پێیـان وابـووە جولانەوەی کورد دەمارگیریە و بانگێشەی ناشیونالیزمیەو، جیاوازی خوازیە لە عێراق،لـە

بلاوكراوەی ژ:3 و12ی سالانی 1963-1965راشكاوانە تر باس لەوە دەكا دروست بوونی دەوڵەتی كوردی دەوڵەتی نەفامی وجیابوونەوەیە لە ئومە ،بۆیە حرامی كردوەو داوای لە ئیخوانی كوردو عەرەب كردوە یارمەتی نەدەن[1]،.... ئیتر فراكسیونی كورد لە ئیخوانی عێراقی نەیتوانیوە و نەیزانیە پێ یان بسەلمێنێ كە عێراق تەنها بریتییە لە دروست كراوی ئیمپریالزمی لە دژی ئیسلام هیچ پیرۆزیەكی ئاینی و فەرهەنگی یاسای و جوگرافی و مێژویی و نەتەوەیی نیە، بوونی لەگەڵ پرۆژە و ستراتیژیەكانی رابوونی ئیسلامی نایەتەوە. ئیتر ئەو فەرمایشتانەی وەك:(كوردو عەرەب بران لەو عێراقە) و(كوردیش هاوولاتیەكە لەو عێراقە)..... (هەموو برای موسلمانین تیایدا)... تەنها پتەو كردنی پرۆژەی ئیمپریالیزمیە لە روژ هەلاتی ناوەراست، هەرچی چاكە بگوترێ لە چوار چێوەی سنووری عێراقی ئێستا ئەوا هەمان دەردی پرۆژەی عەلمانی كوردە لە دروشمی(دیموكراسی بۆ عێراق.... ) (گەلێكی بەختیارو نیشتمانێكی ئازاد.. )كە تیایدا مەجانی خزمەت بە سایكس پیكۆدەكرێ، كە ئیخوانیش بەجۆرێك كەوتۆتە ژێر دیفاكتۆی سایكس- پیكۆ و سنووری نوێ و واقعی ئەو دەوڵەتانەی دروست كراون، چارەسەریەكانی لە سنووری ئەو واقعە نوێ یەی سایكس- پیكۆ یە....

2- هەرچی بەشی دووەمی رابوونی ئیسلامیە لە كوردستان لە دوای هەشتاكان سەریان هەلداو بەشداری شۆرشی كوردیان كردووە، خوازیاری رزگاری كوردستانن بەلام نەیان توانیوە پرۆژەیەكی ئیسلامی بۆ ئەو رزگاریە دابرێژن.

---

[1] الدكتوره ایمان عبدالكریم دباغ-الإخوان المسلمون فی العراق ص590 .

# ئەنجام

# لە ژێر ڕۆشنایی ئەو توێژینەوەیە

## حزبە کوردستانیەکان... لە کوێ ڕادەست پێ بکەن؟

**لەنگی لە ستراتیجیەتی کورد**:مەبەستمان لە ستراتیجئەوەیە کار لەسەر بەرنامەو پلانی دوور خایەنە لەدەروازەکانی چارەی خۆنووس، ئەوەی تێبینی دەکری لایەنی عەلمانی کورد لەسەرەتادا هاوکاری پروژەی دابەشی کوردستانی کردووە بەنەزانی،بەردەوامیشە لە نەگرتنەبەری ستراتیجیەتیکی زانستی تیایدا دەروازەکانی رزگاری دوزیبێتەوە، هەروەك لە نموونەی سەرووشمان دا ولە بەیانی یەکەمی (ی ن ك )چۆن لە دیاری کردنی دۆست ودوژمن بەهەلە داچووبوو ئیستاش هەروا لێی هەلەن، بو دیاری کردنی ستراتیجیەتیکی دروست پیویستە لەمپەرەکۆمەلایەتی وئابووریوسیاسی و یاساییە کوشندەکانی ناوەکی وئیقلیمی و جیهانی دیاری بکەین کە بوویتە هۆی مەینەتی کوردو وبەردەوامییەکەی، بەکورتی ئەوانەن :

1- بوونی ئەونەخشەسیاسیەی روژهەلاتی ناوەراست بە پێی دابەشی سایکس پیکو .

2- نەمانی هیچ بستە خاکیك لەو جیهانە بی سیادەی دەولەتیك، تیایدا کوردستانیش بەپارچە پارچەیی وەبەر سیادەی دەولەتی تر کەوتووە .

3- بەپێی یاسای دەولی سیادە وەك تاپو تەنها بۆ ئەو دەولەتانە پاریزراوە کە ئەندامن لە (نەتەوەیەکگرتووەکان)، بەواتایەکی تر گرفت لەوەیەراستی ئەو دەزگایەدەولەتە یەکگرتووەکانە نەك نەتەوەیەکگرتووەکان .

4- بۆ وەدەست هینانی مافی چارەنووس پیویست بەوە دەکا کە سیادەی هەرچوار وولاتی داگیرکەر تێك بدەی کە بریاری قورسی لەسەرە بەپێی بنەمای یاسای دەولی (مبدأ عدم التدخل فی الشؤون الداخلیة )و(عدم خرق السیادة الدولة)جگە لە مادەکانی( 1) و(55)ی (میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان)ئەوەی تر بەشی هەرە زۆری لە دژی ئەو هەنگاوەیە.

5- پەیوەندی ویاساو نەریتی دەولی زیاتر لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش دروست بووە تیایدا بەرژەوەندی میللەتانی خاوەن دەوڵەتلەگەڵ یەکتر بەهێز ترە لەگەڵ بێدەوڵەتان، کە کورد یەکێکە لەوانە .
6- تائەو وولاتە داگیرکەرانەی کوردستان ئارام و پتەو بن لە ناوەخۆو لەپەیوەندیەکی باشیش بن لەئیقلیمی ودەولی ئەوا زیاتر کورد خنکاو دەبێ، یان بە کورتی هەمووئەو هەڕەشانەی سەر ئاسایشی نەتەوەیی داگیرکەران تەواو پێچەوانەی ئاسایشی کوردستانە .
کەواتە پەیوەندی نێو دەوڵەتی و هاریکای ئیقلیمی وبوونی ئەو دەوڵەتانە نەبوونی مافی چارەی خونووسی کوردە،ئیتر ئیستا زۆر روونە کامە جەمسەر لەبەرژەوەندی کوردەو کامەش دژە، هەروەهاش بەسانایی دەتوانین چارەنووسی کورد لە کام پروژەی مدرەسەکان بدوزینەوە، بێدوودلی دەبینین دەرباز لە چوارچیوەی عەلمانیەت زۆر بەزەحمەت دەست دەکەوێ، بۆیە حوکمی عەلمانیەتی ئەو سەدەیەهەر کۆنکریتی زیندانی کێشەی کوردی قایم کردووە، هەر بویەش سەرکردایەتی کورد هەر لەشیخ سەعید1925 تا مەلا مستەفا1975 ئەو ستراتیجەیان دۆزیبۆوە، کەمتر روویان لە عەلمانی بووە، بەلاّم لەو سەردەمی بدیلی عەلمانی نەبوو،تاراددەیەك ئایدیولوژیای شیوعیەت پیچەوانەی ئەو لەمپەرانە بوو بەلاّم نەشیوعیەکان ونەسەرکردایەتی کوردیش نەیان توانی کوردایەتی بشیوعێنن، هەڵبەتە لە پاش ئەو لێکدانەوە هیچ بەدیلیك نیە جگە لە رابوونی ئیسلامی کەئەوەندە لەسروشتدا هەماهەنگی بزوتنەوەی کورد بیت و ئەوەندەش دژ بەو لەمپەرانە بێت، بەلاّم تا حەدی سەرکردایەتی بارزانیش ئەو فاکتەرە لە گورەپانی جیهانی وئیقلیمی لاواز بوو، کەچی بەروونی دەردەکەوی کەبارزانی ئەوستراتیجیەی دوزیبۆوە بۆیە ناوەرۆکێکی ئاینی بەشۆرش دابوو، ئینجا پەیوەندی لەگەڵ زانایانی ئاینی کوردستان و جیهان —لەوانە مەرجەعەکانی نجف وکەربەلا، خمینی، میسریەکان وا باش بوو،...لەدوای بارزانی و زال بوونی سەرکردایەتی عەلمانی لەکوردستان ئەوجارە رابوونی ئیسلامی بەهێز بوو کەچی بەحوکمی ئایدیولوژیای عەلمانیەتەکەی سەرکردایەتی نوێی کورد سود وەرنەگیراوە تا ئەو ساتەش، هەرچەندە زۆربەروونی دیارە گۆڕانی شای ئێرانی عەلمانی بە کوماری ئیسلامی چەندە تەکانی مەزنی بە شورشی کورد بەخشیوە، بەهەمان شێوە سەرکەوتنی ئیسلامیەکانی ئیراق بوو بۆ یەکەم جار کوردی گەیاندە سەرۆك کۆمار، بەهەمان شێوەش دەرکەوت دەرگا قوفل دراوەکانی تورکیا تەنها بەکلیلی ئیسلامی کراوەودەکریتەوە، ئیتر هەر هەلەیەك لەو ستراتیجیە کورد دەسوتینی، هەروەك مفاوەزاتەکەی 1983 چۆن لەو ململانێیە کورد لاگیری عەلمانیەتی بەعسی گرت و

ئەنفال وکیمیای لی هاتەدی، چونکە ئەو دووپروژەیە لە ناوچـەکە لـەمل ملانـێن لـەدوای رابوون لە 1980وە تا ئەو ساتەش لە ئیراق هەمان ململانێیە، لایەك عروبـی شـوڤینی سیکولار، بەپالپشتی دەسـەلاتداری عـەرەبیو سـایکس پیکـۆو یاسـای دەولی وبنـەمای بەرژەوەندیو..، لاکەی تریش ئیسلامی لەدژی هەمووئەوانـە، کەواتـە کـورد هەلویسـتی چون بیت ؟وەچی بکات؟وەبارەکە چۆن هەلسەنگێنراوە؟

سەرەڕای ئەو هەموو ماندوو بوونەو قوربانیانەی ئەو حزبانە داویانە لەگەڵ ئەو دەرفەتە زێڕینە، هێشتا ئەنجامێکی دڵنیاکەرەوە لە ئاسۆ دیـار نیـە بۆگەیشـتن بـە مـافی چـارەی خۆنووسی ڕاسـتەقینە،لە نـاوە خـۆش نیشـانەی نادیموکراسـی و شـەڕە دەسـەلات و خـۆ هەلکوتانە سەر کورسی پێوە دیارە، خەلەل لە ستراتیژ لەیەکەم ساتی مەینەتی کورد، لـە سیڤەرەوە بۆ لۆزان،و دالدەدانی (ئەتاتورك) تا ڕێکـەوتنی جـەزائیر و ئەوسـاتەش هێشـتا پڕۆژە و ستراتیژیەکی زانستی یەك لاکەرەوە نیـە بـۆ کێشـەی کـورد، سـەرەداوەکانی نـە دۆزرا یێتەوە، هەرچـاندوویەتی و نەیدووریتـەوە... ئـی دی کـاتی ئـەوە هـاتووە ئامـانجی ڕاستەقینەی هەموو لایەك رزگـاری کوردسـتان بێـت، لـەو رەوانگـەوە دەبـا پڕۆژەیـەکی یەکێتی کورد ئامادە بکرێت کە تیایدا:

1. ڕێ لەهەموو ئەو سەرچاوانە بگیرێـت کـە دەبێتـە دووبـەرەکی وەك خۆشەویسـتی بەرژەوەندی و پایە و گیرفان، لە یـەکتر ترسـان، بـێ مەبـدەئی و بەرنامـەی سیاسـی نـە چەسپاو، ..هەموو کێشەکان لەسـەرکردایەتیەکی حزبـی دەسـت پـێ دەکـات، بۆیـە وەك ئەزموونی نوێی گەلانیش پێویستە ڕابەری کـورد دا برِنـرێ لـە حزبایـەنی و خێلایـەتی و بنەمالە و مەدرەسەش بامولکی کورد بێت تەنیا.

2. ئینجا وەك میللەتان با فەرهەنگێکی ئاسایشی کوردستانی هەبێت تیایدا هـەردوو تەوەری رزگاری نیشتمانی و رزگـاری –کۆمەلایـەتی بەسـتاندەر دانرابێـت، لەسـەر ئـەو بنچینە ستراتیژیە.

3. لەسەر ئەو مدرسە کۆببنەوە کە ناسنامە و کەلتوور و فەرهەنگی کوردستانیانەیە، هێـزی یەکخسـتنەوەی لـە هـەمووان بـەکار تـرە، ئینجـا زۆرایـەتی ڕەهـای خـەلکی کوردستانیش دەگرێتە خۆی .

ئەوەش لە دوای هەلسەنگاندنێکی باری جیهانی وئیقلیمی وناوەکی بە سانایی دەسـت نیشان دەکرێ:

**یەکەم-لە ڕووی جیهانی:**

جیهان پێك هاتووە لە: سەرمایەداری جیهانی یەکان، وولاتانی جیهانی سێیەم، وولاتانی شیوعی،un، کۆنگرەی ئیسلامی، سوشیال دیموکراتەکان، .. چەندین پەیمان نامەو یاسای گشتی پێکی بەستوون لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی هاوبەش، تا ئێستا ئەو هاوکێشە ستراتیژیانەکەمتر لە قازانجی کورد بووە، هەرهەمان لایەنەکانی پێکهێنەری (سایکس بیکۆ) و(لوزان) ن، ئێمە لە مەبدەئی(بەرژەوەندی) دۆڕاوین و هەر دوو بارەو چەند بارە لە باشترین دۆخ دا دەکەوینە نێوان دەمە مەقەسەکان لە کۆتاییدا یەکتر نابڕن تەنیا ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان دەبڕدرێن،ئاواش وا بەرەو عەولەمە ملمان کوتاوە، بۆیە وا چاکە نهێنیەکانی ئەو دۆزە بدۆزینەوە خۆببەستینەوە لە بناغەدا(بە پێشڕەوایەتی نەك پاشکۆی) بە تەیارێکی نوێی جیهانی مەبادیئی بێت نەك بەرژەوەندی.

**دووەم- ئیقلیمی:**

دیارە ئەزموونی ئەو سەدەیەی خەباتی کوردایەتی ئەو گرفتانەی بووە وەك لەسەرووش بەدیویکی تر باس کرا:

1. پیرۆزی سنوور لە یاسای دەولی و(مبدأ عدم التدخل).

ب. بەرژەوەندی هاوبەشی ئەو وولاَتانەی کوردیان بەسەر دابەش کراوە گەورەتربووە لە ناکۆکیەکانیان بەرامبەر چارەنووسیکورد.

ج. بە هێزی دەسەلاَتی ناوەندی.

د. لایەنگیری جیهانی بۆ ئەو دەسەلاَتانە.

ئیتر هەر چوار پارچەسنور بوونە چوار دیواری زیندان بۆ کوردستانیەکان، هەرچی گۆڕانێکی پێچەوانە قازانجی کوردە، ئالێرەدا ئەو بنەمایە نامۆیەی(باکۆنین) کە دەلیّ (تحطیم کل ماهو قائم خیر) بۆ کورد ڕەنگەراست بێت، هەرچەندە ئەو بنەمایەی(باکۆنین) بە(فەوزا) بەناوبانەگە، کەچی بۆ کوردخەریکە ڕاست دەرچێت، هەر گۆرانکاریەك لە سایکس- پیکۆئەو(واقع القائم) ڕووبدا قازانج و خێرە،بویە هاتنی جۆرە حکومەتێکی خاوەن ئایدیۆلۆژیای پیچەوانەی ئەو چوار خالە تەنیا لە حکومەتێکی ئیسلامی دەبینریّ لەو سەردەمە، جا جێگەی سەر سوڕمان نیە لەگەلّ ڕووخانی (شاە لە 1979) گەورەترین تەکان بوو بۆپرسی کورد بە هەموو ئاڕستەیەك، هەر دەولّەتێکی داگیرکەر واش بگۆڕیّ هەمان ئەنجامی ئیجابیدەبیّبۆ کورد، بە هەمان بەرەنجام سەورکەوتنی ئیسلامیەکانی ئیراق بوو وای کرد ئەو هەموو دەسکەوتە سیاسیانە بۆ کورد بێتە دی وبگەنە سەرۆکایەتی کۆمار، ئەگەر تەواو نەیقۆزنەوە ئەوا خەلەل لە ناوەکیە

**سێیەم - ناوەکی** :لە ناوەخوش ئەو میللەتە لـە ژێـر سـایەی عەلمانیەتـدا گـیرۆدەی پەرتەوازەیی و بێ متمانەو گەندەلی و دیاردەی دزێوی تر بووینە، بـە سـانایی دەکـڕێن و دەفرۆشرێن، گیانی بەرگری کوردایەتیشی زۆر سست بووە، هەموو ئەو سەلبیاتە جـۆر بـە جۆرانە یەك سەرچاوەی هەیـە، ئـەویش داڕزانـی ئـەخلاقی کوردایەتیـە، کـە خواسـت و بەرنامەی لەمێژینەی داگیر کەران بووە، ئەوەش بە پەروەردەی ئـاینی ڕاسـت دەبێتـەوە، بۆیە هەر تەقەلایەك دژی ئیسلام بچووك یان گەورە لێدانە لە گیانی کوردایەتی .

ئەو پڕۆژەشدوا نهێنی قەیرانی بێ چارەی کوردیشە، هەر بە نموونە: یەکێ لە ئەنجامـەکانی ئەو (ڕابوونە)بۆکوردستانی عێراق ئەو پێش هاتەیـە: لـە سـایکس پیکـۆ دروسـت بـوونی عێراقەوە نەخشەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی لە ژێر سایەی (ڕابوونی نەتەوەیی)وا دروسـت ببو کە تیایدا 74٪ عەرەب و 22٪ کـورد و ئـەویتریش کەمایـەتی، لـەو نەخشـەیە بـە خشکەیی سوننەی عـەرەب کـە ڕێـژەیان کـەمترە لـە 22٪ خۆیـان شـاردبۆوە لـەنێو دوو هاوکێشەی ڕەگەزی و تایفی، کاتێ ڕەگەزی بوایە ئەوا وەك عەرەب زۆرایەتی بوون بەرامبەر کورد، کاتێ تایفی و مەزهەبیش بوایە لەگەڵ کورد زۆرایەتی پێشان دەدرا بەرامبەر شـیعە. لە هەردوو باریشدا بە سەرۆکایەتی سوننەی عەرەب(بەرگی عروبی) تەواو دەبوو، هەریەکـە لەجامیعەی عـەرەبی و زلهێزانـی جیهـانیش یارمەتیـدەریان بـوون، کـورد لـەو نەخشـەیە خنکابوو.بەو شێوەیە نەخشەی کۆمەلایەتی کلاسیکی عێراق لـە ژێـر سـایەی (ڕابـوونی نەتەوایەتی) کە وەلائی سیاسی کۆمەلایەتی جووت بـوون تـا سـاڵی 1980 بـەردەوام بوو،لەوی بە دوا(ڕابوونی نەتەوایەتی ) وەرگـیردڕا لەسەردەسـتی (ڕابـوونی ئیسـلامی) و نەخشە کۆمەلاتیەکان گۆڕان بۆدۆخێکی تری : لە ٪20 سوننەی عەرەبی دەسەلاتدار لـە ٪55 شیعە،لە ٪22، لەوەوە ئەو دەسکەوتە مەزنانە بۆ کورد هاتتە دی .

دیارە ئەو نەخشەیەی دوایش هەرگیز ئارامی نابێت، حەتمـەن عێـراق هەڵدەوەشـێتەوە وەك فشارێکی مێژوویی نەك ویستی کورد..،دووبارە پێویسـتی بـە داڕشـتنەوەی عێـراق هەیە لەسەر بنچینەی ئارەزوومەندانە،ئەوەش بە ڕابوونی ئیسلامی هاتۆتـە کایـەوە نـەك ڕابوونی ناشیۆنالیزمی عەلمانی بەویش بەردەوامی دەبێت ، ئەوەش دەروازەیەکە بۆ ڕزگار بوونی کورد کە پێویستە (ڕابەرانی کورد) و(فەرهەنگی ئاسایشی کورد) ئیشی بۆ بکـات، لەگەڵ ڕەچاوی باری نیو دەوڵەتی ...بالێرە دەست پێ بکەن.

**مسعود عبدالخالق**

+ له سالی 1957له كەندیناوەی هەولێر له دایك بوه .

+ سەرەتایی وئامادەی له هەولێر تەواو كردووه .

+ سالی 1980- 1981زانكۆی سلێمانی تەواوكردوه .

+ له دوای ڕاپەڕین ماجستێری له فەلسەفەی زانسته سیاسیەكان له زانكۆی جیهانی له لەندەن هێنایەوه .

+ ئیستاش 2009 خاوەن ئیمتیازی گۆڤارو ڕۆژنامەی ستاندەره له هەولێر .

+ئیمەیل:abdkaliq@yahoo.com

له بەرهەمەكانی نوسەر

1– هەڵبژاردن لەنێوان عەلمانی وئیسلامیەكان (مەسعود عبدالخالق)

2– دەقەكانی سیڤەر وخویندنەوەیەكی تر (سەلام ناوخۆش) (مسعودعبدالخالق) بەهاوكاری (یەكێتی پەرلەمانتالرانی كوردستان) .3جار چاپكرایتەوه .

3– چارەنوسی فیدراڵی له دوای دەرچو ونی عێراق له بەندی (7)–مسعود عبدالخالق

4– كێشەی ئافرەت له ڕوانگەی ئاینی و عەلمانی، بەهاریكاری یەكێتی خوشكانی یەكگرتووی كوردستان . مسعود عبدالخالق

5– ڕۆڵی عەلمانیەت له دروست بوونی مەینەت كورد (مەسعود عبدالخالق) .

6– كوردستانیەتی كەركوك وناوچە دابڕێنراوەكان به پێی بەلگەنامه نێودەولەتیەكان– مسعودعبدالخالق –لەلایەن (ی پ ك)بلاْوكرایتەوه ،لەو زوانه بەمەولەتی بەڕێزیان دەبێته زنجیرەی 11ی ستاندەر .

7- مەوسوعەی جودی - مسعود عبدالخالق

8- ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان – مسعود عبدالخالق

9- ناسنامەی کەرکوك بە پێی بەلگەنامە نیودەولەتیەکان – مسعود عبدالخالق

10- رەوشی فلسفی لەسەدەی 21 – مسعود عبدالخالق

11- بە عربی: الأسلام والعلمانیە واپرهما فی نشأە الدولە العراقیە الحدیپە – مسعود عبدالخالق

12- سەری سال ..ئەو نامیلکەیە والەبەر دەستت دایە .

# ناوەڕۆك

بەرهەمە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر/ 07504671394

| ژ | ناوی کتێب | نوسەر | وەرگێر |
|---|---|---|---|
| 1 | خەلیفەکانی پێغەمبەر@ | خالد محمد خالد | م. محمد حسن سەرگەنێڵی |
| 2 | خۆراك و چارەسەری | عبدالکریم ئەحمەد | ... |
| 3 | ئاوێنەی دەروون ( تەزکیەی نفس ) | د. عبداللە | ... |
| 4 | پرشنگدار. ( فتح القریب ) | أحمد بن الحسین/ابی شجاع | عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی |
| 5 | ( منهاج الطالبین ) کوردی ( 5 ) بەرگ | إمام النواوی | عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی |
| 6 | گەردون ناسی. | م. محمد حسن سەرگەنێڵی | ... |
| 7 | کانیاوی بڕواداران و وتار بێژان | د. محمود احمد | عبدالرحمن طە |
| 8 | چرای مینبەر. | یاسین ملا عبداللە چۆمبارۆکی | ... |
| 9 | ئەهلی بەهەشت | یوسف حاج احمد | ابراهیم حسن سعید |
| 10 | بانکی زانیاری. | محمود برهوم/محمد غروب | مستەفا سعید علی |
| 11 | هەگبەی زانیاری. | سالار هەولێری | ... |
| 12 | شەریعەتی ئیسلامی ( 4 ) بەرگ | م. عبدالکریم مدرس | ... |
| 13 | هەزار گوڵ لە باخچەی فەرمووده | عوێز حاج علی | ... |
| 14 | تاوانە گەورەکان لە ڕوانگەی ئیسلام | عبدالرحمن طە | ... |
| 15 | مێرگەی خوا ناسان. | سید اکرم جبار کپرانی | ... |
| 16 | ڕێنمایی سێکسی لە ئاینی ئیسلام دا. | م. محمد حسن سەرگەنێڵی | ... |
| 17 | ئامۆژگاری لە وتەی دانایان و زانایان بەسەرهات | سەردار ڕەزا | ... |
| 18 | 1000 ئامۆژکاری لە چیرۆکی ڕاستەقینەدا. | ملا عبدالخالق شوانی | ... |
| 19 | پوختەی ژیانی پێغەمبەر@. | ملا عبدالخالق شوانی | ... |
| 20 | چل حەدیسەکەی پێغەمبەر@ | إمام النواوی | عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی |
| 21 | الاربعین النواوی/عەرەبی- کوردی- ئینگلیزی | إمام النواوي | سەرهەنگ قاسم |
| 22 | بەهەشت ( ڕێگاو خۆشی و شادی و ناز و نیعمەتەکانی ) | علی حسن حلب | شوان ڕابەر |
| 23 | دۆزەخ ( خەڵك و سزاو تاڵی و ناخۆشیەکانی ) | علی حسن حلب | شوان ڕابەر |
| 24 | پەند وەرگرە لە ( 50 ) بەسەر هاتی شەیتان | م. محمد حسن سەرگەنێڵی | ... |
| 25 | پەند وەرگرە لە ( 50 ) بەسەر هاتی خۆشەویستی | م. محمد حسن سەرگەنێڵی | ... |
| 26 | تەنها بۆ ژنان. | فدوی حلمی | عبدالحکیم زراری |
| 27 | شیفای قورئانی. | صابر صالح حسین | ... |
| 28 | 30 هۆکاری بەختەوەری. | ... | زانا علی محمد |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 29 | بۆ ئەوەی بەختەوەرترین کەس بیت. | عائض قرني | زێوەر ئەنوەر |
| 30 | ( العقيدة الطحاوية ). | الامام الطحاوى | عبدالله عبدالعزيز هەرتەلى |
| 31 | ژیان لە چەند وتەیەکی نەمردا. | عماد گوانی | ... |
| 32 | رۆڵە بچکۆڵەکەم پێغەمبەر@ تۆی خۆشدەوێ. | عبدالله بن حمود | عماد گوانی |
| 33 | لە ئادابەکانی ئیسلام | صابر صالح حسين | ... |
| 34 | خەون نامەی إبن سيرين. | محمد ابن سيرين | محمد حسن |
| 35 | سەرەتایەك بۆ فێربوونی کۆمپیوتەر: + CD– 1 | مهدی علی | ... |
| 36 | ( زمان ) فێربوونی ئینگلیزی. | هۆشەنگ محمد | ... |
| 37 | سرودەکانی سامی یوسف: + CD– 1 | طه خضر | ... |
| 38 | کۆدی مۆبایل: + CD– 1 | کامەران طه | ... |
| 39 | نوێژ فێربوون دەست نوێژ شوشتن. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 40 | چۆن موسلمان بووم. | هاله صلاح | بەختيار عبدالرحمن |
| 41 | ئاشکرابوونی موعجیزەی زانستی.... | يوسف حاج احمد | بەختيار عبدالرحمن |
| 42 | متمانە بەخۆ بوون . | أنوەر احمد | ... |
| 43 | کەسێتی داهێنەر. | هانى السليمان | عبدالحكيم احمد |
| 44 | گوڵفرۆش- چیرۆکی: E- ك. | ریچارد پریسکۆت | کارزان نوری |
| 45 | نۆ چیرۆك لە بارەی خەڵکەوە: E- ك. | سەلام ناو خۆش | ... |
| 46 | بەسەرهاتی تۆبە کاران. | عەمر خاليد | عبدالجليل على |
| 47 | چاکسازی دڵان. | عەمر خاليد | عبدالجليل على |
| 48 | زیکرو دوعاکان لە قورئان و فەرمودە ڕاستەکان. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 49 | شورەی موسلمانان. | سعيد بن على/القحطاني | شوان ڕابەر |
| 50 | بەرەو خودا/ هۆنراوە. | فەرهاد برادۆستی | ... |
| 51 | بەکامەرانی بژی و چێژ لە ژیان وەرگرە. | ئەدوارد هاوزەر | هۆشەنگ محمد |
| 52 | لەوحەی فێربوونی نوێژ. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 53 | لەوحەی پیرۆزی پێغەمبەر@. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 54 | کارتی جۆراو جۆری ئاینی. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 55 | لە یاساکانی تەجوید ( هداية المستفيد ). | محمد المحمود | ملا ئادەمی قەسرێ |
| 56 | کۆمەڵە چیرۆکی ڕاستەقینە. | فەرمان نەجار | ... |
| 57 | بەختەوەری. | حاجی کاروان | ... |
| 58 | تەقوا. | ملا شێرزاد عبدالوهاب | ... |
| 59 | گەشتێ بە ناخی مرۆڤدا. | ملا شێرزاد عبدالوهاب | ... |
| 60 | با پەند وەرگرین. | ملا شێرزاد عبدالوهاب | ... |
| 61 | زاڵبوون بەسەر نەفس. | ملا شێرزاد عبدالوهاب | ... |
| 62 | شەش صەحابەکە چۆن شەهید کران. | ملا شێرزاد عبدالوهاب | ... |

| 63 | چوار ئیمامەکەی ئیسلام. | عماره محمد عماره | فاروق بالیسانی |
|---|---|---|---|
| 64 | هەگبەی دێرین. | هۆشیار نوری لەك | ... |
| 65 | نیشانەکانی ڕۆژی دوایی. | یوسف بن عبدالله | عبدالرحمن طه |
| 66 | پوختەی شەریعەت. | عبدالعظیم البدوي | محمد حسن |
| 67 | لە کلێساوە بۆ بۆ مزگەوت. | سەرباز شێخانی | ... |
| 68 | بەتایبەتی بۆ گەنجان. | عائض عبدالله القرني | شەوبات عبدالله |
| 69 | پوختەی ژیانی پێغەمبەران. | مەروان فایەق | ... |
| 70 | هێنانەوەی ئاو بە دەست (الاستمناء). | محمد حسن سەرگەنێلی | ... |
| 71 | خەتەنەی کوران و کچان. | محمد حسن سەرگەنێلی | ... |
| 72 | (هاوڕێیانم) هۆنراوە بۆ منداڵان. | بروا محمدی | ... |
| 73 | بوك و زاوای موسڵمان. | باوکی ئاوارە | ... |
| 74 | زانستخوازی. | عائض عبدالله القرني | قاسم علی عثمان |
| 75 | لەگەڵ هەنگاوەکانی پێغەمبەری@ خۆشەویست. | عەمر خالد | بختیار عبدالرحمن شوانی |
| 76 | ناتەواوییە جنسیەکان و چارەسەرکردنیان بە خۆراك. | شهریار یار بخت | هێرش محمد ابراهیم |
| 77 | هاوسەرێتی و ژیانی جنسی. | د. محمد مهدی موحدی | هێرش محمد ابراهیم |
| 78 | تەوژمی جنس و هەرەسی لاوەکان. | استاژ محمد زمانی | هێرش محمد ابراهیم |
| 79 | 200 فەرمووده بۆ ئافرەتان. | حوێز حاجی علی | ... |
| 80 | چل فەرموودەی قودسی. | عبدالخاق حسن شوانی | ... |
| 81 | ئامانج/ مەزنترین هۆکاری سەرکەوتن. | زانا علی محمد | ... |
| 82 | چۆن دەبیتە خۆشەویستی مێردەکەت. | عبدالقهار | ... |
| 83 | ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر@ . | عبدالعزیز علاءالدین کۆیی | ... |
| 84 | شەو ڕۆیی پێغەمبەر@( إسراء والمعراج ). | خالد خادم سروچی | ... |
| 85 | بالاَ پۆشی لە سایەی قورئان و فەرموودەو زانستدا. | م. محمد حسن سەرگەنێلی | ... |
| 86 | دەردو دەرمان (الداء والدواء) | إبن قیم جوزي | جلال علی سەنگاوی |
| 87 | چەمکێك لە ئاکارو ڕەوشتی پێغەمبەر@. | محمد جمیل زینۆ | علی بەردە گۆزی |
| 88 | (الروح) بەکوردی. | إبن قیم جوزي | مصدق محسن |
| 89 | جزء عم + سیپارە + مەشق. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 90 | چارەسەری دەروونی بە قوروانی پیرۆز. | شێخ ابراهیم نعمة | شوان ڕابەر |
| 91 | 500 پرسیار و وەڵامی ئاینی. | نوسیبة محمود | شەوبات عبدالله |
| 92 | یادی خوداو دوعاکان. | عبدالرحمن عبدالله | ... |
| 93 | پەندو ئامۆژگاری لە بەسەرهاتی پیاو چاکان. | محمد حسین | ... |
| 94 | ژیانێکی تەندروست و ئاسودە لە سایەی قورئان و فەرموودە. | ڕازیە نوح بەگ | ... |
| 95 | سك ئێشە. | لیژنەیەك لە پزیشکان | هۆشەنگ محمد |
| 96 | پشت ئێشە. | لیژنەیەك لە پزیشکان | هۆشەنگ محمد |
| 97 | چیرۆکەکانی مامە محمود. | محمودالمصری | عبدالکریم احمد |
| 98 | ڕەوشتی موسلمانانە . | سید احمد عبدالوهاب | |
| 99 | (تیسیر مصطلح الحدیث) زانستی زاراوەکانی | محمد الطحان | عبدالله ملا احمد |

|  | فەرموودە. |  |  |
|---|---|---|---|
| 100 | کەسێتی خۆشەویست. | عطا برکات | عبدالحکیم احمد |
| 101 | نامیلکەکانی عمر عبدالکافی | عمر عبدالکافی | عبدالجلیل علی |
| 102 | لە خەڵوەتدا. | قانع خورشید |  |
| 103 | (ژن) لە ئایین و چاخە جیاوازەکاندا. | محمد عبدالمقصود | حیدر عبدالله |
| 104 | ئەمانە بخۆ تەندروست بە. | محمد عزت عبدالقادر | ... |
| 105 | گەردیلە ناسی. | م. محمد حسن سەرگەنێلی | ... |
| 106 | فەرهەنگی قوتابی. | د. هۆشەنگ محمد | ... |
| 107 | چیرۆکە کاریگەرەکان بۆ کوڕانی لاو. | احمد سالم بادویلان | حسین محمود هەلە بجەیی |
| 108 | چیرۆکە کاریگەرەکان بۆ کچانی لاو. | احمد سالم بادویلان | حسین محمود هەلە بجەیی |
| 109 | لێکۆلینەوەیەک سەبارەت بە ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە. | فاتح سەنگاوی | ... |
| 110 | هاوسەرگیری سمبوڵی خۆشەویستی و هێلانەی وەفا داریە. | ئارام نبی محمود | ... |
| 111 | وەسیەتەکانی پێغەمبەر@ بۆ ژیانێکی بەختەوەر. | عبدالرحمن طه | ... |
| 112 | نیشانەکانی دونیا وێران بوون. | ملا خالد فریزی | ... |
| 113 | رۆڵی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەتی کورد. | مسعود عبدالخالق | ... |
| 114 | گولاوی زانیاری لە هەزار پرسیارو وەلامی ئاینی | حیدەر محمود حسن | ... |
| 115 | موعجیزەی قورئان و زانستی سەردەم | محمد عبدالرحمن محمد رشید | ... |
| 116 | فێڵەکانی شەیتان | وتاری:ملا جەمیل عەلی | ... |
| 117 | بەرەو بەهەشت | بانگخواز حاجی کاروان | ... |
| 118 | نهێنی ژیانی قورئان خوێنان | سوهەیب جەمیل عەلی | ... |
| 119 | فێربە چۆن بەئینگلیزی قسە دەکەی؟ | لێژنەیەک | ئارام حمد |
| 120 | گە نجینەکانی شەوی قەدر لەسورەتی﴿القدر﴾. | ڕە قیب ڕەسول ڕوستایی . | ... |
| 121 | کتێبی سەوز | معمر قەزافی . | ... |
| 122 | پێشلەیەکی زیندانیکراو | ... | حیدر عبدالله |
| 123 | پیاوێکی چاك و سەگێکی تینوو | ... | حیدر عبدالله |
| 124 | پێغەمبەر و وشترێك | ... | حیدر عبدالله |
| 125 | شوان و گورگ | ... | حیدر عبدالله |
| 126 | چۆلەکەیەکی گریاو | ... | حیدر عبدالله |
| 127 | چێلێکی قسەکەر | ... | حیدر عبدالله |
| 128 | گەشتیارێکی سەرگەردان و وشترێك | ... | حیدر عبدالله |
| 129 | مەریێکی ژەهراوی کراو | ... | حیدر عبدالله |
| 130 | مە یمونێکی زیرەك و شیر فرۆشێك | ... | حیدر عبدالله |
| 131 | مامزێکی وەفادار | ... | حیدر عبدالله |
| 132 | مەولودنامەی پێغەمبەری پێشەوا | عبدالحمید صالح چۆمانی | ... |
| 133 | پێبکەنە( 535 )نوکتەی هەڵبژاردە | سالار هەولێری | ... |